سیاسی

# کۆتایی سەردەمی هێز



لە هۆڵەکانی کۆبوونەوەوە بۆ ئەنجومەنەکانی بەڕێوەبردن و گۆڕەپانەکانی جەنگ و کڵێساکان و وولاتان بۆچی هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی وەک جاران نەماوە؟

نووسینی
د. موسى نعيم

وەرگێڕانی
د.کۆزان



arta

چاپی یەکەم
٢٠٢٢

# کۆتایی سەردەمی هێز

لە هۆڵەکانی کۆبوونەوەوە بۆ ئەنجومەنەکانی بەڕێوەبردن و گۆڕەپانەکانی جەنگ و کڵێساکان و وڵاتان بۆچی هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی وەک جاران نەماوە؟


نووسینی

د. موسی نعیم

وەرگێڕانی

د. کۆزان



چاپی یەکەم

٢٠٢٢

ناوەندی بڵاوکراوەی ئارتا

**ناوی کتێب:** کۆتایی سەردەمی هێز

**ناوی نووسەر:** د. موسی نعیم

**ناوی وەگێڕ:** د. کۆزان

**دیزاینی ناوەوە:** ئەیاد نادر

**دیزاینی بەرگ:** ئەیاد نادر

**بابەت:** سیاسی

**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە

**چاپ: یەکەم ٢٠٢٢**

..........................................................................

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی ( ٢٧٦٤ ) پێدراوە

## سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ئیمارات

سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ئیمارات لە ١٤ی ئازاری ساڵی ١٩٩٤ دامەزرا، بەئامانجی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئەکادیمی بۆ بابەتە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی پەیوەست بە وولاتی ئیمارات و هەرێمی کەنداو و جیهانی عەرەبی. سەنتەرەکە بەنیازە لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی کتێب و توێژینەوەو کۆنفرانس و سیمینارەکان، ناوەندێکی گونجاو بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕای زانستی لەم بابەتانە دابین بکات. هەروەها سەنتەری ئیمارات بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ستراتیژییەکان هیواخوازە بەشێوەیەکی کاریگەر بەشداری بکات لە بەرەوپێشبردنی پرۆسەی گەشەپێدان لە وولاتی ئیمارات.

سەنتەرەکە لەچوارچێوەی سێ بواردا کاردەکات: توێژینەوەو لێکۆڵینەوە، و بواری ئامادەکردنی کادرەکانی لێکۆڵینەوە و ڕاهێنان پێکردنیان، وهەروەها بواری خزمەتگوزاری کۆمەڵگە، ئەمەش بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانە کە پێکهاتووە لە هاندانی توێژینەوەی زانستی کە لە ئاوات و پێویستیەکانی کۆمەڵگە سەرچاوەی گرتووە، وە ڕێکخستنی کۆڕی ڕۆشنبیری، و بەدواداچوونی پێشکەوتە زانستیەکان و ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەکان بۆ دوارۆژ، و گرتنەخۆی ئەو بەرنامانەی کە پشتگیری پێشکەوتنی کادر و توێژینەوەکان دەکات، هەروەها بایەخدان بە کۆکردنەوەی داتا و زانیاری و دۆکیۆمێنت و هەڵگرتن و شیکردنەوەیان بە شێوازێکی زانستی هاوچەرخ، و هەماهەنگی لەگەڵ دەزگاکانی دەوڵەت و دەزگا سیاسییە هەمەجۆرەکانی لە بوارەکانی خوێندن و توێژینەوەی زانستیەکان.

# پێشەکی

## ئەم کتێبە چۆن هاتووە؟ تێبینیەکی کەسی

ڕەنگە هێز وەک چەمکێکی ڕووت دەربکەوێت، بەڵام بۆ ئەوانەی کە باشتر ئەیناسن — بەتایبەت بەهێزەکان خۆیان — لەوانەیە لە لەرەلەرەکەی کاریگەرییەکی قووڵی هەبێت. چونکە ئەو کەسانەی کە پلەو پایەی گەورەی دەسەڵاتیان هەیە خۆیان باشترین کەسن کە سنوری کاریگەری خۆیان دەزانن و هەست بە نائومێدی دەکەن بەهۆی ئەو بۆشاییەی کە لە نێوان ئەو هێزەی کە پێگەکەیان پێیان دەدات و ئەو هێزەی کە لە ڕاستیدا هەیانە. لە پیشەی خۆمدا، لە شویاتی ١٩٨٩دا تووشی ئەو جۆرە کۆت و بەندیانە بووم، چونکە ئەوکات وەک وەزیری گەشەپێدان لە حکومەتی وڵاتەکەم، فنزویلا، دامەزرام. ئەو کات وڵاتێکی دیموکراسی بوو و منیش تەمەنم ٣٦ ساڵ بوو، هەر لەو کاتەی کە دەسەڵاتمان گرتەدەست پاش سەرکەوتنە مەزنەکەمان لە هەڵبژاردن، بەرەنگاری ئاژاوەکان بووینەوە لە شاری کاراکاسی پایتەخت — کە نیگەرانی دروست کرد سەبارەت بە پلانەکانمان بۆ کەمکردنەوەی پشتگیریەکان و بەرزکردنەوەی نرخی سوتەمەنیەکان- شارەکە بەهۆی توندوتیژی و ترس و ئاژەوەوە پەکی کەوت. بەڵام لەناکاو، سەرەرای ئەو سەرکەوتنە و ڕێگەپێدانە ڕوونەی کە بەدەستمان هێنا، ئەو بەرنامە چاکسازیە ئابووریەی کە بەرگریمان لێدەکرد مانایەکی تری وەرگرت، لە جیاتی ئەوەی ئاماژە بە هیواو خۆشگوزەرانی بدات، ئێستا بەو چاوە سەیردەکرێت وەک ئەوەی کە سەرچاوەیەکی توندو تیژی سەر شەقام و زیادبوونی هەژاری و کەڵەکەبوونی نایەکسانی بێت.

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەڵام ئەو دیمەنە قوڵەی کە لەو کاتەدا هەمبوو، دیمەنێک بوو دوای چەند ساڵێک ئەوجا تێگەیشتم لێی. خۆی ئەدۆزیەوە لەو بۆشاییە گەورەی لە نێوان تێگەیشتنی من لە هێزەکەم و ڕاستی هێزی من. چونکە لایەنە دیارەکەی، من وەک یەکێک لە وەزیرە ئابووریە سەرەکیەکان، هێزێکی گەورەم لەدەست بوو. بەڵام لە لایەنی کرداری هیچ شتێکم لە دەست نەبوو جگە لە هێزێکی سنوردار لە ڕێکخستنی داهات و پڕکردنی تاکەکان و ڕێکخراوەکان، وە بە شێوەیەکی گشتیتر بەدەستهێنانی ئەوەی کە خۆمان ئەیخوازین. هاوڕێیەکانم، تەنانەت سەرۆکیش، هەمان هەستیان هەبوو، لەگەڵ ئەوەش ڕقمان لەوەبوو کە دان بنێین بەوەی کە حکومەتەکەمان زەبەلاحێکی شەلە. ئارەزووی ئەوەم دەکرد کە ئەم حالەتە بگێڕمەوە بۆ خودی فنزویلا: بێ گوومان هەستکردنمان بە بێ دەسەڵاتی پەیوەندی هەبوو بەو بارە لاوازی و ناهاوسەنگیە زەقەی کە دامەزراوەکانی وولاتەکەمان پێوەی دەناڵاند. وە ئەم بارە لاوازیەش ناکرێت بارێکی جیهانی بێت.

بەڵام دواتر تێگەیشتم کە ئەم لاوازیە لە ڕاستیدا بارێکی جیهانیە، یان نزیکە لەوە، لە نێوان ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتیان هەبووە. فرناندو هینریک کاردوسو - سەرۆکی بەرازیلی پێشوو و باوکی دامەزرێنەری سەرکەوتنی وولاتەکەی — ئەم بارەی بۆ پوختکردمەوە بە ووتنی. : " بەردەوام تووشی سەرسورمان دەبم لەو ڕادەیەی کە خەڵک وایان زانیوە من بەهێز بووم"، وە کاتێک من چاوپێکەوتنم لەگەڵی کرد بۆ مەبەستی ئەم پەرتووکە پێی ووتم : " تەنانەت ئەو تاکانەی کە ڕۆشنبیریان بەرزبوو ئەهاتن بۆ ئۆفیسەکەم و داوای کاری وایان لێدەکردم کە نیشانەی ئەوەی بوو ئەوان وایان دائەنا کەوا من هێزێکی زۆر گەورەترم هەیە لەوەی کەوا لە ڕاستیدا هەمە. وە بەردەوام بەخۆم ئەووت خۆزگە ئەیانزانی تا چ ڕادەیەک هێزی سەرۆک لەم ڕۆژگارەدا سنوردارە. وە کاتێک چاوم بە سەرۆکی وولاتانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

تر ئەکەوێت بەردەوام یەکترڕائەکێشین بۆ قسەکردن لەبارەی ئەو یادگاریانەی کە زۆر هاوشێوەی ئەم حالەتانەن. ئەم بۆشاییەی کە لە نێوان هێزی ڕاستیمان و ئەوەی کە خەڵک لێمان چاوەڕێ دەکات سەرچاوەی زەحمەتترین پەستانە کە دەبێت هەر سەرۆکێک ڕووبەڕووی ببێتەوە.

وە شتێکی هاوشێوەم بیست لە جوشکا فیشر، یەکێک لە سیاسەتمەدارە هەرەبەناوبانگەکانی ئەلمانیا و جێگری پێشووی ڕاوێژکاری ئەلمانیا و وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەلمانیا، کاتێک پێی وتم " لە منداڵیەوە شەیدا و سەرسامی هێزم . وە یەکێک لە شۆکە گەورەکان کە تووشی بووم ئەوە بوو کە زانیم کۆشکە گرانبەها حکومیەکان و ڕازاندنەوەکانی تری حکومەت هەموو لە ڕاستیدا شوێنی بەتاڵن. ئەندازیاری تەلارسازی ئیمپراتۆریەت کە کۆشکە حکومیەکانی پێدەناسرێنەوە ڕاستی هێزێکی سنورداری ئەو کەسانە ئەشارێتەوە کە لەم شوێنانە کاردەکەن".

وە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات زۆر تێبینی هاوشێوەم کۆکردەوە، نەوەک تەنها لە سەرۆکی وولاتان و وەزیرە حکومیەکان، بەڵکو لە خاوەن کارەکان و سەرۆک دامەزراوەکان و ڕێکخراوە گەورەکانیش لە زۆربەری بوارەکان. بە خێرایی ڕوونبۆوە کە شێتکی زیاتر لەمە ڕوودەدات، وە ڕاستیەکەش ئەوە نەبوو کە بەهێزەکان تەنها خەمخواردنیان بۆ ئەو بۆشاییە بێت کە لە نێوان هێزی ڕاستیان و هێزی خەیاڵیان هەیە. بەڵکو خودی هێزەکە بەرەنگاری هێرشێک دەبێتەوە کە پێشتر وا نەبووە. وە لە ساڵی ١٩٩٠ وە، هەموو ساڵێک بەردەوام بووم لە ئامادەبوونی کۆبوونەوەی ساڵانەی سەکۆی ئابوری جیهانی لە دافوس، کە بەهێزترین کەسایەتیە جیهانیەکان لە بوارەکانی ئیشکردن و حکومەت و سیاسەت و ڕاگەیاندن و

## کۆتایی سەردەمی هێز

ڕێکخراوە تا حکومیەکان و زانستەکان و ئایین و ڕۆشنبیری ئامادەی دەبوون؛ وە لە ڕاستیدا من زۆر بە بەخت بووم کە ئامادەبم و بە نزیکەیی لە هەموو ڤیستیڤاڵەکانی هێز لە جیهان قسەبکەم، لەوانە کۆنگرەی بیلدربیرغ، و کۆبونەوەی ساڵانەی گەورە ڕاگەیاندکاران لە سەن فالی، و کۆبونەوە ساڵانەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی. وە هەموو ساڵێک تێبینیەکانم لەگەڵ هاوڕێیە بەژداربووەکانم گومانەکانمی پشت ڕاست دەکردەوە: بەهێزەکان بە دەست کۆتی گەورەتر لە هێزەکەیان دەناڵێنن. وە کاردانەوەکان لەسەر دۆزینەوەکانم بەردەوام بە یەک ئاراستە ئەڕۆیشتن: هێز زیاتر لاوازتر و سنووردارتر بووە و خێراتریش لەناو دەچێت.

بەڵام ئەمە بانگەوازێک نیە بۆ هەستکردن بە خەمباری بۆ ئەو کەسانەی کە لە پێگەی هێزدان. چونکە گومان نیە لەوەی کە خەمباری بەهێزەکان لە بێ دەسەڵاتیان هۆیەک نیە بۆ پەشیمان بوونەوە لەو جیهانەی کە سەرکەوتووەکان دەست بەسەر هەموو شتێکدا دەگرن. لە جیاتی ئەمە، ئامانجی من ڕوونکردنەوەی کاریگەری لەناوچوونی هێزە. لە پەڕەکانی داهاتوو پرۆسەی ئەم لەناوچوونە ئەخەمەڕوو — هۆیەکان و ڕووکارەکان و کاردانەوەکانی — بە گوێرەی ئەو ڕێگایانەی کە نەک کاریگەری هەیە لەسەر ئەو کەمینەیەی ( ١% ) کە سەرەوەی هەرەمەکەی گرتووە، بەڵکو، وە لەوەش گرینگتر، لەسەر چینی فراوانی ناوەند، ئەوانەی کە زەحمەت و ئازار دەکێشن بۆ مانەوە بۆ ڕۆژێکی تر.

موسی نعیم
مارس ٢٠١٣

# کۆتایی سەردەمی هێز

## بەشی یەکەم
## هەڵوەشانەوەی هێز

ئەم پەرتووکە دەربارەی هێز دەدوێت. بەتایبەتی دەربارەی ئەوەی کە چۆن هێز - توانا لەسەر ئاراستەکردنی کەسانی تر بۆ کردنی شتێک یان وەستان لەسەر کردنی – گۆڕانکاریەکی مێژووی بەخۆوە دەبینێت کە لەوانەیە جیهان بگۆڕێت.

هێز ڕوو لە بڵاوبوونەوەیە، وە یاریزانە گەورەکان ڕووبەڕووی بەرەنگاری زیاتر دەبنەوە لەلایەن یاریزانانی نوێتر و بچووکتر – وە ئەوانەی هێزیان هەیە لە جاران زیاتر بەستراونەتەوە بەو ڕێگایانەی کە ئەتوانن ئەو هێزە بەکار بێنن.

وە زۆرجار بەهەڵە تێئەگەین لە قەبارە و سروشت و زیانەکانی ئەو گۆڕانکاریە، یان بە تەواوی لە هەموو ئەمانە بێ ئاگا ئەبین. وە شتێکی سەرنج ڕاکێشە کاتێک یەکێک سەرنج بداتە سەر کاریگەری ئەنترنێت و تەکنەلۆژیاکانی تر لەسەر ئاراستەی گۆڕانی هێز لە یاریزانێکەوە بۆ یەکێکی تر، یان پرسیارکردن لەسەر ئەوەی ئاخۆ هێزی ڕۆشنبیری " نەرم " وای لێهاتوو هێزی سوپاکان " ڕەق " لاببات. بەڵام ئەم بیرکردنەوانە تەواو نین، وە بێ گومان دەکرێت تێگەیشتنمان بۆ ئەو هێزە سەرەکیانە تێکبدات کە دەستیان کردووە بە گۆڕینی چۆنیەتی بەدەستهێنانی هێز و بەکارهێنانی و پاراستنی و لەدەستدانی.

ئێمە دەزانین کە هێز دەستی کردووە بە گواستنەوە لە ماسولکەکان بۆ مێشکەکان، وە لە باکور بۆ باشور، وە لە ڕۆژئاوا بۆ ڕۆژهەڵات، وە لە کۆمپانیا زەبەلاحە کۆنەکان بۆ کۆمپانیا نوێ و جوانەکان، و لە دیکتاتۆرەکان بۆ

## کۆتایی سەردەمی هێز

خەڵکانێک لە گۆڕەپانەکانی شارەکان و بۆشایی سیبرانی. بەڵام ئەوەندە بەس نیە بڵێیت کە هێز دەستی کردووە بە ڕۆیشتن لە قارمیەک یان وولاتێک بۆ یەکێکی تر.. یان دەستی کردووە بە جیابوونەوە لە نێوان زۆربەری یاریزانەکان. هێز گۆڕانکاریەکی ڕاستەقینە بەخۆیەوە دەبینێت زۆر گەورەتر لەوەی بەشێوەیەکی پێویست هەستی پێبکرێت یان لێی تێبگەیت. وە لەگەڵ ئەوەی کە وولاتە ڕکابەرەکان، و کۆمپانیاکان، و پارتە سیاسیەکان، و بزوتنەوە کۆمەڵایەتیەکان، و دامەزراوەکان، یان پێشەوا تاکەکان، هەموویان لە پێناو بەدەستهێنانی هێز ڕکابەری دەکەن هەروەک چۆن لە هەموو سەردەمەکان کردوویانە، بەڵام هەر خودی ئەو هێزە – کە بە متمانەوە شەری لەسەر دەکەن بۆ بەدەستهێنانی – دەستی بەوە کردووە کە سنوردار بکرێت و هەڵبوەشێتەوە.

بە سادەیی هێز هەمان ئەو پێگایە بۆ خاوەنەکەی بەدەست ناهێنێت هەروەک پێشتر بەدەستی ئەهێنا؛ چونکە لە سەدەی بیست و یەک دەستکەوتنی هێز کارێکی ئاسان بوو، بەڵام زۆر بە زەحمەت بەکار دەهات، و زۆر بە ئاسانیش لە دەست ئەچوو. چونکە لە ژوورەکانی ئەنجومەنەکانی بەڕێوەبردن و ناوچەکانی جەنگەوە بۆ بۆشایی سیبرانی شەڕەکان بەریەک نەکەوتن لە پێناو هێز بەڵام بە ئەنجامێکی ناکۆک بەدەست نەکەوت. زیانەکانی ئەم جەنگانە زیاتر و زیاتر سروشتی لەناوچووی خودی هێزەکە ئەشارێتەوە. تێگەیشتم لەوەی کە چۆن دەسەڵات دەستی کردووە بە لە دەستدانی پێگاکەی – و ڕووبەڕووبوونەوەی بەرەنگاریەکان لە دەرەنجامی ئەمە – ئەمانە سەرەتای سەرەکینە بۆ تێگەیشتنی یەکێک لە گرینگترین ئەو ئاراستانەی کە پێکهاتنی جیهان دووبارە دەکاتەوە لە سەدەی بیست و یەک.

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە هێز لەناوچووە یان ئێستا هیچ کەسانێک نیە هێزێکی زۆریان هەبێت. چونکە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یان چین، و بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیای جی بی مۆرگان یان کۆمپانیای " شل "ی نەوتی، وە هەروەها سەرنووسەری جێبەجێکاری ڕۆژنامەی نیۆیۆرک تایمس، و سەرۆکی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، و پاپای ڤاتیکان: ئەمانە هێشتا هێزێکی بێ پایانیان هەیە بەڵام کەمتر لەوانەی کە لە پێش ئەوان هەبوون. خاوەنەکانی پێشووی ئەم پلە و پایانە تەنیا بەرەنگای ڕکابەرێکی لە خۆیان کەمتر نەدەبوونەوە بەڵکو بەرەنگاری کۆت و پەتی کەمتریش دەبوونەوە — لە شێوەی چالاکی سیاسی لەلایەن هاوولاتیان، و بازارە جیهانیەکان، و چاودێریکردنی میدیا و ڕاگەیاندنەکان — لە بەکارهێنانی ئەو هێزەی کە هەیانە. دەرەنجامی ئەمەش ئەمرۆ دەبینین کە خاوەن هێزەکان زۆربەی جار لە بەرامبەر هەڵەکانیان زیانەکانیان خێراتر و گەورەترە لەوانەی کە پێشە خۆیان هەبوون. کاردانەوەی خاوەن هێزەکان بۆ ئەم واقیعە نوێیە دووبارە هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی هێزن دروست دەکاتەوە، و پاشان کارلێکێکی یەک لە دوای یەک ڕوودەدات هەموو لایەنەکانی کارلێکی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. لەناوچوونی هێز دەستی کردووە بە گۆڕینی جیهان. وە ئەم پەڕتووکەش ئامانجی سەلماندنی ئەم بانگەشە چاونەترسانەیە.

### ئایا گوێت لە جیمس بلاک جونیور بووە ؟

ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی جولاندنی هەڵوەشاندنەوەی هێز جۆراوجۆر و تێکئالاون و پێشتر نەبوونە. وە بۆ ئەوەی بزانیت بۆچی کلاوزفیتز، و پۆلینەکانی فۆرشن ٥٠٠، و کەمینە زەنگینەکانی گەلی ئەمریکی (١%) کە دەستیان گرتووە بەسەر بەشێکی گەورەی نەگونجاو لە داهاتی وولات، پشتگوێخران ئەوا

## کۆتایی سەردەمی هێز

حالەتی جیمس بلاک جونیور بێنە بەرچاو، یاریزانی شەترەنج کە سەر بە خێزانێکە لە چینی کرێکاران کە لە گەڕەکی بدفورد ئەژیا — ستایفسانت لە بروکلین، نیویۆرک.

کاتێک جیمس بلاک جونیور تەمەنی بوو بە ١٢ ساڵ نازناوی " ماستەر" ی لە یاری شەترەنج بەدەست هێنا، ئەمەش نازناوێکە کەمتر لە ٢% ی ئەندامانی یەکێتی شەترەنجی ئەمریکی کە ژمارەیان ٧٧٠٠٠ کەسە بەدەستیان هێناوە، وە تەنیا ١٣ کەس لە هەڵگرانی ئەم نازناوە تەمەنیان لە خوارووی ١٤ ساڵە. ئەمە لە ساڵی ٢٠١١ بوو، وە بلاک نزیک بوو لە بەدەست هێنانی نازناوی " گراند ماستەر "، ئەمەش نازناوێکە کە یەکێتی شەترەنجی جیهانی دەیبەخشێت بە پێی ئەدای یاریزانەکە لە یاریەکان لەگەڵ ئەو یاریزانانەی کە خاوەن نازناون. لە هەمان کاتدا ئەمە بەرزترین نازناوە کە دەکرێت هەر یاریزانێکی شەترەنج بەدەستی بێنێت. وە هەرکاتێک بە دەستی هێنا تا کۆتایی ژیان لای ئەمێنێتەوە.

کاتێک جیمس بلاک جونیور بووە هەڵگری نازناوی ماستەر، لەسەر ڕێڕەوی بچووکترین یاریزان ئەڕۆیشت کە هەڵگری نازناوی " گراند ماستەر " بوو لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەویش ڕای ڕۆبنسۆن بوو لە وویلایەتی فلۆریدا، ئەو کەسەی کە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٩ پێش دوو هەفتە لە پازدەهەمین جەژنی لەدایک بوونی ئەم نازناوەی بەدەستی هێنا.

بلاک بەخۆی خۆی فێری یاری دەکرد بە بەکارهێنانی یاریەکی شەترەنجی پلاستیکی هەرزان کە لە دووکانەکانی " کیم مارت " کڕیبووی، زۆر بە خێرایی چووە سەر کتێب و بەرنامەی کۆمپیوتەری تایبەت بە شەترەنج. قدوەکەی لەم یاریە

## کۆتایی سەردەمی هێز

میخائیل تالی ڕوسی بوو، ئەو کەسەی کە پاڵەوانی جیهان بوو لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەم. جگە لەوەی کە بلاک چێژی لە یاری شەترەنج وەردەگرت، بەڵام ئەوەی کە زیاتر هانی ئەدا ئەو هێزە بوو کە ئەم یاریە پێی ئەبەخشی. هەروەک کە بۆ پەیامنێرێکی ڕاگەیاندن ووتی " ئەمەوێت ئەوە بسەپێنم بەسەر یاریزانی بەرامبەر ئەو شتە بکات کە دەمەوێت بیکات "؛ ئەمەش ڕوونترین قسەیە کە دەکرێت گوێبیستی ببین لەو ئارەزووە زگماکەی بۆ بوون بە خاوەنی هێز.

بەڵام دەستکەوتەکانی جیمس بلاک و ڕای ڕوبنسون چیتر تایبەت نەمانەوە؛ ئێستا ئەوان بەشێکن لە ئاراستەی جیهانی و دیاردەیەکی نوێن کە جیهانی ڕووبەڕووبوونەوەی شەترەنجی داگیرکردووە لەو کاتەی ئەو جیهانە بۆ ماوەیەکی زۆر داخراو بوو. ئەم دوو یاریزانە دەستیان کرد بە فێربوونی یاریەکە و زۆر کارامە بوون لێی لە تەمەنێکی زۆر زوو. چونکە ئەمڕۆ ژمارەی ئەو کەسانەی کە نازناوی " گراند ماستەر " هەیە زیاترە لە هەموو کاتەکانی پێشوو: ١٢٠٠ یاریزان بەرامبەر ٨٨ یاریزان لە ساڵی ١٩٧٢. وە لەگەڵ سەرکەوتنی یاریزانە نوێیەکان بەسەر پاڵەوانە جێگیرەکان بە شێوەیەکی زۆرتر، ئەوا ئەو ماوەیەی کە باشترین یاریزانانی جیهان چالاکیەکانیان تێدا ئەنجام دەدەن ڕوو لە کەمبوون دەکات. زیاتر لەمەش، ئەمڕۆ هەڵگرانی نازناوی " گراند ماستەر " ڕەچەڵەکیان زۆر زیاتر جۆراوجۆرە لەوانەی پێشتر. هەروەک نووسەری دی تی ماکس لە ساڵی ١٩٩١ تێبینی کرد، لەو ساڵەی کە یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشاوە، نۆ یاریزانە باشترینەکانی جیهان لە یەکێتی سۆڤیەت بوون. لەو کاتە یاریزانە ڕاهێنراوەکانی یەکێتی سۆڤیەت بە درێژایی چل و سێ ساڵی پێشوو پاڵەوانیەتی جیهانیان بەدەست هێنا، جگە لە سێ ساڵ نەبێت. بەڵام لەمەودوا وانابێت، چونکە ئێستا زۆربەری

## کۆتایی سەردەمی هێز

ڕکابەرەکان توانای سەرکەوتنیان هەیە بۆ لوتکەی پاڵەوانیەتەکانی شەترەنج، وە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەیەکی فراوان لە وولاتان و ناوچەکان. بەڵام هەر کە گەیشتنە لووتکە، ئەوا دووچاری زەحمەتی دەبنەوە لە مانەوە لەو شوێنە. هەروەک کە میگ گرینگارد ئەڵێت، کە نووسەرێکە لە بواری شەترەنج، " دووسەد کەسمان هەیە بەسەر ئەم هەسارەیە ئەسوڕێنەوە، و بەهێزێکی پێویست یاری دەکەن کە توانایان پێ دەدات سەربکەون بەسەر پاڵەوانی جیهان، بە بێ ئەوەی هیچ یارمەتیەکی وەربگرن کە شایەنی باس بێت". بە مانایەکی تر، خودی هێز لە نێوان هەڵگرانی نازناوی " گراند ماستەر" ی ئەمڕۆ چیتر وەک جاران نەماوە. ئەی چ شتێک ئەم گۆڕانکاریانەی ڕیزبەندی هەرەمی جیهانی یاری شەترەنج لێک ئەداتەوە ؟ ئەمە شۆڕشی تەکنەلۆژیایە ( تەنیا بەشێکی ). چونکە ماوەیەک پێش ئێستا یاریزانانی شەترەنج بەرنامەی کۆمپیوتەریان دەستکەوت کە توانایان پێ دەدات ملیۆنەها یاری بکەن بەو ئاستەی کە باشترین یاریزانی جیهان ئەنجامی ئەدات. وە دەتوانن ئەو بەرنامانە بەکار بهێنن بۆ زانینی کاردانەوەکان بۆ ئەگەری هەر جوڵەیەکیش؛ بۆ نموونە ڕکابەرەکان ئەتوانن هەر یاریەک دووبارەبکەنەوە و خوێندنەوەی جوڵەکان بکەن لەژێر سیناریۆی جیاواز و خوێندنەوەی مەیلە ناوازەکانی یاریزانان. بەم شێوەیە تۆڕی ئەنتەرنێت بووە هۆی بەرفراوانبوونی شەبەقی یاریزانانی شەترەنج لە هەموو شوێنەکانی جیهان — هەروەک چیرۆکی جیمس بلاک شایەدی بۆ ئەمە ئەدات — و توانای نوێی تەرخان کرد بۆ یاریزانان لە هەموو چینەکانی تەمەن و ڕەچەڵەکە کۆمەڵایەتیە ئابوریەکان؛ چونکە هەندێک ماڵپەڕی شەترەنج هیچ کۆتێکی لەسەر نیە و هەموو زانیاریەکان و هەڵی یاریە ڕکابەریەکانی تەرخان کردووە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە پەیوەندیان بە تۆڕی ئەنتەرنێتەوە هەیە.

بەڵام ئەم چیرۆکە تەنها پەیوەندی بە تەکنەلۆژیاوە نیە. بۆ نموونە، حالەتی پاڵەوانی گەنجی نەرویجی مانگوس کارلسین وەرگرە، دیاردەیەکی تر لە جیهانی شەترەنج، ئەو کەسەی کە لە ساڵی ٢٠١٠ بوو بە یاریزانی ژمارە یەک لە جیهان و تەمەنی تەنها نۆزدە ساڵ بوو. وە بە گوێرەی نووسەر دی تی ماکس، کە بۆ رۆژنامەی نیۆیۆرکەر نووسیبووی لەسەری، سەرکەوتنی کارلسین زیاتر پەیوەست بوو بە ستراتیژیە ناوازە نالاسییەکەی ( بەشێکی بە پشت بەستن بە بیرە تیژەکەی ) نەوەک تەنها بە ڕاهێنان لەسەر کۆمپیوتەر: " لەبەرئەوەی کارلسین کاتێکی کەمتری لە ڕاهێنان بەسەر دەبرد بەراورد بە هاوڕێیەکانی؛ بۆیە کەمتر دووچاری یاریکردن دەبۆوە بەو ڕێگایەی کە ئەوان یاریان دەکرد. ئەو زیاتر پشتی دەبەست بە تێڕوانین و خەملاندنە تایبەتەکانی. وە ئەمەش وایکرد کە یاریزانێکی بەزەحمەت بێت بۆ ڕکابەرەکانی ئەوانەی کە پشتیان بە بەرنامە و ڕێساکانی زانیاری ئەبەست لە پلانەکانیان ".

تێکچوونی پێکهاتەی هێز لە جیهانی شەترەنج هەڵدەقوڵێت لە گۆڕانکاریەکانی ئابوری جیهانی و سیاسەت و شێوازەکانی دیمۆگرافی و کۆچکردن. چونکە سنورە کراوەکان و تێچووە هەرزانەکانی گەشتکردن هەلێکی نوێی ڕەخساندووە بۆ یاریزانی زیاتر تاکو یاری بکەن لە هەر شوێنێکی جیهان بێت. هەروەها ئاستە بەرزەکانی فێربوون و بڵاوبوونەوەی فێربوونی خوێندنەوە و لێکدان و چاودێری تەندروستی منداڵان گردبوونەوەیەکی گەورەی بەرپاکرد لەو کەسانەی کە ئەگەری هەڵگرتنی نازناوی " گراند ماستەر" یان هەیە. وە ئەمڕۆش، وە بۆ یەکەم جار لە مێژوو، ژمارەیەکی گەورەتر لە خەڵک لە شارەکان دەژین وەک لە دێیەکان. وە ئەمەش، لەگەڵ ئەو ماوە درێژەی گەشەکردنی ئابوری کە زۆربەری وڵاتە هەژارەکان بەخۆیانەوە بینی لەوەتەی ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستەم،

## کۆتایی سەردەمی هێز

پێشکەوتنێکە دەرگای نوێی کردەوە بۆ ملیۆنەها خێزان ئەوانەی  کە شەترەنج لایان یاریەکی گرانبەهای دوانەهاتووە یان تەنانەن نەناسراوە. بەڵام ئەوەندە ئاسان نیە کە یەکێک ببێتە یاریزانی شەترەنجی جیهانی ئەگەر لە کێڵگەیەکی دابڕاو لە وولاتێکی هەژار بژییت کە کارەبای نەبێت، یان کۆمپیتەری تێدا نەبێت، یان کاتژمێرێکی زۆری ڕۆژانەی تەرخان بکات بۆ دابینکردنی خواردن، یان گواستنەوەی ئاو بۆ ماڵەکەی. چونکە پێش ئەوەی ئەنتەرنێت بتوانێت جادووە بەتواناکەی بڵاوبکاتەوە پێویستە زۆر مەرجی تر لەبەرچاو بگیرێت.

### لە  بۆردی شەترەنج بۆ هەموو شتێک لە دەورویەرمان

شەترەنج   ووشەیەکی کلاسیکی ڕەمزیە بۆ دەربڕینی هێز بە سروشتی خۆی. بەڵام ئەوەی بەسەر شەترەنج هات داخورانی، وە هەندێک کات بزربوونە، ئەو بەربەستانەیە کە وایکرد جیهانی پاڵەوانەکانی ناو یاریەکە لە پێشوو جیهانێکی بچووک یان خۆگر یان جێگیر بێت. ئەو بەرباستانەی کە بەرامبەر تێگەیشتنی تەکتیکەکان و بەرەوپێشبردنی یاریکردن، و هەروەها هەموو ئەر بەربەستانەی کە سنور دادەنێن بۆ گەیشتن بە لوتکە، هەبوون ئێستا ڕێگریان کەمتربووە. وە ئەوەی بەسەر شەترەنجدا هاتووە بە شێوەیەکی گشتی بەسەر هێزیشدا هاتووە، چونکە دارمانی بەربەستەکان دەستی کردووە بە گۆڕانێک لە سیاسەت و جیوپۆلیتکی ناوەخۆ، وە ڕکابەری لەسەر بەکارهێنەران و ئەوانەی باوەڕیان هەیە بە ئایینە گەورەکان، و پێشبڕکێی نێوان ڕێکخراوە ناحکومیەکان و دامەزراوە فیکریەکان و ئایدیۆلۆجیەکان و قوتابخانەکانی بیری فەلسەفی و زانستەکان. بۆیە لە هەرکوێیەک هێزێکی گرنگ هەبێت ئەوا ئەو هێزە لە لەناوچوونیشدایە.

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

وە هەندێک لە نیشانەکانی ئەم گۆڕانکاریانە ڕوونە وەک ڕووناکی ڕۆژ؛ وە هەندێکیان لە لایەن شیکردنەوەکانی پسپۆڕان و توێژینەوە ئەکادیمیەکان پەردەی لەسەر لابرا. با بە جیۆپۆلیتیک دەست پێ بکەین؛ ژمارەی وولاتان بۆ چوار هێندە زیادی کردووە لەوەتەی سالآنی چلەکانی سەدەی بیستەم؛ جگەی لەوەی کە ئێستا ڕکابەری دەکەن یان دەجەنگن یان دانوسان دەکەن نەوەک تەنها لەگەڵ یەکتر، بەڵکو لەگەڵ زۆربەری ڕێکخراوە بێ سنورە نیشتیمانیەکان و ڕێکخراوە ناحکومیەکانیش. وە لە ڕاستیدا لە دایکبوونی دەوڵەتی باشوری سودان لە ساڵی ٢٠١١ بە سیفەتی نوێترین دەوڵەتی جیهان لەسەر دەستی دەیەها ڕێکخراوی ناحکومی بوو، بە تایبەت کۆمەڵە کریستیانە ئینجلیزەکان وەک ڕێکخراوی " ساماریتانز بیرس " کە فرانکلین گراهام بەڕێوەی دەبات، یەکێکە لە کوڕەکانی بانگخوازی دیاری ئەمریکی بیلی گراهام.

وە لە ڕاستیدا، لەو ڕۆژانە کاتێک دەوڵەتە نەتەوەییەکان بۆ جەنگ دەچن، هێزی سەربازی زەبەلاح ئەنجامێکی کەمتر بەدەست دەهێنێت وەک لەوەی پێشتر. چونکە جەنگەکان زیادیان نەکرد بەرەو نائەندازەیی، کە هێزێکی گەورەی زەبەلاح دژی هێزێکی تری بێ ئەزموون و بچووک بوەستێت، وەک تەنها لە یاسا دەرچووەکان و میلیشیاکان. وای لێهاتووە لایەنی سەربازی لاوازتر زیاتر سەردەکەوێت وەک لەوەی پێشتر. بە پێی توێژینەوەیەکی گرینگ کە زانکۆی هارڤارد ئەنجامی دا؛ لەو جەنگە نائەندازەییانەی کە لە نێوان ساڵانی ١٨٠٠ و ١٨٤٩ دا هەڵگیرسا، لایەنە لاوازەکە ( لە ڕووی سەرباز و چەک ) ئامانجە ستراتیجیەکانی بەدەست هێناوە لە ١٢% جەنگەکان. بەڵام لەو جەنگانەی کە لە نێوان ١٩٥٠ و ١٩٩٨ دا هەڵگیرسا، لایەنە لاوازەکە لە زۆربەی کاتەکان بەسەر کەوتووە لە ٥٥% جەنگەکان. ئەنجامی جەنگە نوێیە نائەندازەییەکان زۆربەی جار

## کۆتایی سەردەمی هێز

بە کارلێکی ئیستراتیجیە سیاسی و سەربازیە پێچەوانەکان دەست نیشان دەکرێت نەوەک تەنیا هێزی سەربازی، ئەمەش لەبەر هۆکاری جیاواز، بۆیە سوپای پێشکەوتوو و زەبەلاح هەر خودی خۆی چیتر دڵنەوایی نادات کە دەوڵەت ئامانجە ستراتیژیەکانی بەدەست دەهێنێت. وە یەکێک لە هۆکارە گرینگەکانی دوای ئەم گۆڕانکاریە زیادبوونی توانای لایەنی لاوازە بۆ پێگەیاندنی زیانوزەرە بە ڕکابەرەکەی بە نرخێکی کەمتر. ڕەنگە بەکارهێنانی بۆمبە چێنراوەکان لە ئەفغانستان و عێراق باشترین نموونە بن بۆ ئەمە. یەکێک لە جەنەڕاڵە دەریاوانەکان لە ئەفغانستان ئاماژەی بەوەدا کە ٨٠% ی پێکانەکان لە یەکە سەربازیەکەی بەهۆی بۆمبە چێنراوەکان بوو، وە لە ماوەی چەند ساڵێک لە عێراق بۆمبە چێنراوەکان هۆکارێک بوون بۆ پێکانی چارەگێکی سوپاکانی هاوپەیمانان. وە ئەم ئاستە لە پێکان بەردەوام بوو هەرچەندە وەزارەتی بەرگری ئەمریکا ( بنتاگۆن) وەبەرهێنانێکی زەبەلاحی کرد لە پێداویستیەکانی دژ بەم بۆمبانە، لەوانە ١٧ ملیار دۆلار بۆ کڕینی ٥٠،٠٠٠ ئامێر بۆ تەشویش خستنە سەر ئەو لەرەلەرە ڕادیۆیانەی کە کاردەکەن لەسەر لابردنی کاریگەری ئامێرەکانی کۆنترۆڵکردنی لە دوورە سەرەتاییەکان ( مۆبایل و سویچەکانی دەرگای گەراجەکان) کە بەکار دەهاتن بۆ تەقاندنەوەی بۆمبەکان.

هەروەها ستەمکارەکان و سەرۆک پارتەکان کەمبوونەوە لە هێز و ژمارە بەخۆیانەوە دەبینن. لە ساڵی ١٩٧٧ تێکڕای ژمارەی ئەو وڵاتانەی کە ستەمکارەکان بەڕێوەیان دەبرد ئەگەیشتە ٨٩ وڵات؛ بە تێپەڕینی ساڵی ٢٠١١ ژمارەکە کەمبۆوە بۆ ٢٢ وڵات. وە ئەمڕۆش زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی جیهان لەژێر سێبەری نیزامی دیموکراسی ئەژین. هەموو خەڵک هەستیان بە لەرینەکانی بەهاری عەرەبی کرد لە هەموو ئەو ناوچانەی جیهان کە هەڵبژاردن بە شێوەیکی

ڕاست و پاک تێیدا ئەنجام نادرێت، چونکە کەسێک یان چەند کەسێکی خاوەن دەسەڵات هەوڵ دەدات تاهەتایە لە دەسەڵات بمێنێتەوە. تەنانەت لە سیستەمە نادیموکراسیەکانیش کە ڕێگە دەدەن بە بوونی پارتە سیاسیەکان ئەبینین کە پارتە کەمینەکان ئێستا نوێنەرایەتیان سێ جار زیاترە لەوەی کە هەیان بووە لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم. وە لە هەموو ناوچەکان جیهان ئەمڕۆ ئەبێت سەرۆک پارتەکان بە جددی کاربکەن چونکە ڕکابەری دەکەن لەگەڵ کاندیدەکان و ئەو سەرۆکانەی کە لە جیهانێکەوە هاتوون دووربووە لە دەسەڵات و ڕازاندنەوەکانی. وە ئەمڕۆ نزیکەی نیوەی پارتە سەرەکیەکان لە دامەزراوەکانی دیموکراسیەت ڕێگای هەڵبژاردنی پێشوەختە بەکار دەهێنێت، یان ڕێگایەکی تر بۆ نوێنەریکردن؛ بۆ ئەوەی هەڵی زیاتر بدات بە جەماوەری گشت پارتەکان تاوەکو دەنگی خۆیان بدەن لە هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان. لە شیکاگۆ بۆ میلان، و لە نیودلهی بۆ برازیلیا، سەرۆک کیانە سیاسیەکان پێت دەڵێن کە توانایان لەدەست داوە لە بەدەست هێنانی دەنگەکان و دەرکردنی بڕیارەکان لەکاتێک ئەمانە شتی ئاسایی بوو بۆ ئەوانەی پێشە خۆیان.

جیهانی کارکردنیش بەم ئاراستەیە کاریگەری لەسەر دەبێت. وە هیچ گومانێک نیە لەوەی کە داهات کەمتر بۆتەوە و دەوڵەمەندەکان سامانێکی زۆر و بێ پایان کۆدەکەنەوە، وە هەندێکیان پارە بەکار دەهێنێت بۆ بەدەستهێنانی هێزی سیاسی. بەڵام ئەم ئاراستەیە، بەقەدەر ئەوەی کە جێگای نیگەرانیە پەسەندیش نیە، ئەمە تەنیا هۆکارێک نیە کە ئەو ڕێگایەنەی بەکارهێنانی هێز پێک دێنێت لەنێوان سەرۆک کۆمپانیاکان و وەبەرهێنەرە دەوڵەمەندەکان.

وە لەڕاستیدا تەنانەت ئەو ڕێژەی ١%ی دەوڵەمەندەکان لە دانیشتوانی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوورنین لە گۆڕانکاریە لەناکاوەکان لە سامان

و هێز و پێگە. لەگەڵ ئەوەی نایەکسانی لە داهات لە زیادبووندایە، بەڵام لە دارِمانە گەورەکەی ئابوری جێماوەیەکی ڕاستکردنەوەی لە دوای بەجێهێشت، چونکە ئەمە کاریگەری لەسەر داهاتی دەوڵەمەندەکانیش کرد بە ڕادەیەکی نایەکسان. وە بە گوێرەی مامۆستای ئابوری لە زانکۆی کالیفۆرنیا بیرکلی، ئیمانویل سایز، ئەم دارِمانە گەورەی ئابوری بووە هۆی نزمبوونەوە داهاتی ڕێژەی ١%ی دانیشتوان کە دەوڵەمەنترینەکانی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکان بە ڕێژەی ٣٦.٣% بەراورد بە کەمبوونەوەیەک بە ڕێژەی ١١.٦% لە داهاتی ٩٩%ی دانیشتوانەکی تر. وە بە گوێرەی ئەو لێکدانەوانەی کە ستیڤن کابلان کردوویەتی، لە کۆلێژی بۆث بۆ بەڕێوەبردنی کار لە زانکۆی شیکاگۆ، ئەوا ئەو بەشەی داهات کە ئەم ١% دەوڵەمەندانەی ئەمریکا دەستیان بەسەر داگرتووە لە لوتکەیەوە نزم بۆتەوە بۆ ٢٣.٥% لە داهاتی گشتی لە ساڵی ٢٠٠٧ وە بۆ ١٧.٦% لە ساڵی ٢٠٠٩. وە بەگوێرەی ئەو داتایانەی کە سایز کۆیکردوونەتەوە، ئەم بەشە داهاتە بەردەوام بوو لە دابەزین لە ساڵەکانی داهاتووش. هەروەک ڕۆبرت فرانک لە ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرنال باسی کردووە " ئەوانەی کە زۆر دەوڵەمەندن تووشی ڕاتەکانی گەورە بوونەوە، چونکە ژمارەی ئەو ئەمریکیانەی کە ملیۆنێک یان زیاتر بەدەست دەهێنن کەمبۆتەوە بۆ ڕێژەی ٤٠% لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٧ و ٢٠٠٩ بۆ ئەوەی بگات بە ٢٣٦٨٨٣، لە کاتێکدا کە تێکڕای داهاتیان نزم بۆوە بۆ نزیکەی ٥٠%، ئەمەش ڕێژەیەکە زۆر بەرزترە لە ڕێژەی نزمبوونەوەی تێکڕای داهاتی ئەو کەسانەی کە ٥٠٠٠٠ دۆلار یان کەمتر بەدەست دەهێنن، بە مانای کەمتر لە ٢%، ئەمەش بە گوێرەی ئامارەکانی دەزگای داهاتە ناوەخۆییەکان. بەهەرحاڵ هیچێک لەمانە مانای ئەوە نادات کە داهات و سامان لە زۆرێک لە وولاتە دیموکراسیە پێشکەوتووەکان، بەتایبەت وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، زیادەیەکەی گەورەی بەخۆوە بینیبێت. بەڵکو بە

شێوەیەکی بێ پایان زیادی کردووە. بەڵام لە ڕاستیدا پێویستە ڕاستیەکان پەردەپۆش نەکەین بەوەی هەندێک لە کەسایەتی و خانەوادە زەنگینەکانیش زەرەرمەند بوون لەو قەیرانە داراییە، و لە ئەنجامی ئەمەش کەمبوونەوەیەکی بەرچاوەی لە سامان و هێزی ئابوری بەخۆیەوە بینی.

زیاتر لەمەش داهاتی کەسی و سامان تەنها سەرچاوەی هێز نین. چونکە سەرۆکی کۆمپانیا گەورەکان زۆرجار خاوەن هێزێکی زیاترن لەو کەسانەی کە تەنها زەنگینن. لەم ڕۆژگارە سەرۆک کۆمپانیا گەورەکان قازانجێکی زۆر زیاتر دەکەن لەوانەی پێشە خۆیان، بەڵام ماوەی مانەوەیان لە لوتکە لەرزۆکە و جێگیر نیە هەروەک مانەوەی پاڵەوانەکانی شەترەنج لە لوتکە. لە ساڵی ١٩٩٢ ئەگەری ماناوەی هەر سەرۆکێکی جێبەجێکاری ئەمریکی لە پۆستەکەی بۆ پێنج ساڵی داهاتوو لە هەر کۆمپانیایێکی پۆلینکراو لە لیستی " فورتشن ٥٠٠" ئەگەیشتە ٣٦%، وە لە ساڵی ١٩٩٨ ئەگەرەکە کەمبۆوە بۆ ٢٥%. وە بە هاتنی ساڵی ٢٠٠٥ مامناوەندی مانەوەی هەر سەرۆکێکی جێبەجێکار لە پۆستەکەی کەمبۆوە بۆ شەش ساڵ؛ ئەمەش دۆخی ئاراستەی جیهانیە. چونکە لە ساڵی. ٢٠١١، ١٤.٤% ی سەرۆکە جێبەجێکارەکان لە ٢٥٠٠ کۆمپانیا گەورەکان لە جیهان کارەکانیان بەجێهێشت. تەنانەت لە یابانیش، ئەو وولاتەی کە بەناوبانگە لەسەر جێگیریەکی ڕێژەیی لە بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکان، جولانەوەی بەزۆرەملێی یەک لە دوای یەک لە نێوان سەرۆکی کۆمپانیا گەورەکان بۆ چوار هێندە زیادی کرد لە ساڵی ٢٠٠٨.

ئەم شتەش لەسەر خودی کۆمپانیاکان جێبەجێ دەبێت؛ چونکە لە ساڵی ١٩٨٠ هەر کۆمپانیایێکی ئەمریکی لە نێو پێنج کۆمپانیا یەکەمەکان لە بواری

## کۆتایی سەردەمی هێز

خۆی دووچاری دەرچوون دەبێتەوە لەو پۆلینە تەنها بە ڕێژەی ١٠% بۆ پێنج ساڵ. وە پاش دوو دەیە لە کات ئەم ئەگەر زیادی کرد بۆ ٢٥%. ئێستاش بە لێکدانەوەیەکی سادە بۆ پێنج سەد کۆمپانیای ئەمریکی و جیهانی کە پێش ١٠ ساڵ بوونیان نەبووە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە چۆن کۆمپانیا نوێیەکان بە نزیکەیی دەستیان کردووە بە لادانی کۆمپانیا زەبەلاحە کۆنەکان. وە بواری دارایی بانکەکان دەستیان کردووە بە لەدەستدانی هێزو پێگەیان لە بەرژەوەندی جزدانەکانی پاراست کە زیاتر پێشکەوتوو و خێران: لە نیوەی یەکەمی ساڵی ٢٠١٠، لە میانەی چوونەوەیەکی زۆری ئابوری، دە یەکەمەکانی جزدانی پارستن — و زۆربەیان نەناسراون بۆ خەڵکانی گشتی — زیاتریان بەدەست کەوت لە گەورەتین شەش بانکی جیهان بەیەکەوە. تەنانەت زەبەلاحترینی ئەم جزدانانە، ئەوەی کە ڕێژمیەکەی زۆر گەورەی پارە بەڕێوە دەبات و قازانجێکی بێ پایان دەکات، کارەکانی تەنها بە چەند سەد فەرمانبەرێک بەڕێوە دەبات.

وە لە هەمان کاتدا کۆمپانیاکان زیاتر دووچاری " کارەساتەکانی نیشانەی بازرگانی " دەبنەوە کە کاریگەری لەسەر ناوبانگ و داهات و پۆلینکردنەکانی هەیە. چونکە توێژینەوەیەک دەریخست کە مەترسی ئەم جۆرە کارەساتانە لە ماوەی پێنج ساڵ بۆ ئەو کۆمپانیایانەی کە نیشانەی بازرگانی جیهانیان هەیە و زیاتر بەناوبانگن لە ماوەی کۆتا دوو دەیەی پێشوو لە ٢٠% بۆ ٨٢% زیادی کردووە. چونکە سامانەکانی کۆمپانیاکانی " بریتش پترولیوم " و " تایگر وودز " و " دامەزراوەی نیوز کۆرپۆرەیشن " کە خاوەنەکەی ڕۆبەرت مردۆخە، هەمووی بە نزیکەیی لە نێوان شەوو ڕۆژێکدا کەمیکرد لە ئەنجامی ئەو ڕووداوانەی کە ناوبانگی زڕاند.

## کۆتایی سەردەمی هێز

وە لە دیمەنێکی تری دیمەنەکانی پەرتەوازە بوونی هێز لە بواری کارکردن ئەبینین کە هەندێک ئەندام لە جۆری نوێ ( کۆمپانیا نوێیەکانی وولاتانی کەمتر پێگەیشتوو ) دەستیان بەسەر هەندێک لە گەورەترین کۆمپانیا جیهانیەکاندا گرت یان لایان بردن. چونکە ئەو وەبەرهێنانانەی کە لەلایەن وولاتە گەشەکردووەکان دروست بوون لە ١٢ ملیار دۆلارەوە لە ساڵی ١٩٩١ بۆ ٢١٠ ملیار دۆلار لە ساڵی ٢٠١٠ بەرزربۆوە؛ بۆ نمونە گەورەترین کۆمپانیای پۆڵا لە جیهان، کۆمپانیای " ئەرسیلۆر – میتال "، ڕەگەکانی دەگەڕێتەوە بۆ کۆمپانیای " میتال ستیل " کە کۆمپانیایەکی هیندیە و لە ساڵی ١٩٨٩ دامەزراوە. وە کاتێک ئەمریکیەکان بیرە بەناوبانگەکەیان دەخۆنەوە، بدوایزر، لە ڕاستیدا ئەوان بیرەیەک نۆش دەکەن کە کۆمپانیایەک بەرهەمی دەهێنێت لە ساڵی ٢٠٠٤ هاتۆتە بوون لە ئەنجامی لێکدانی کارگەی بیرەی بەرازیلی و بەلجیکی، ئەو دوو کۆمپانیایەی کە سەرکەوتوو بوون لە کۆنترۆڵکردنی ئەنهیسر-بۆش لە ساڵی ٢٠٠٨، بەمەش بەیەکەوە گەورەترین کۆمپانیای بیرەیان پێک هێنا لە جیهان. وە بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیا، کارلۆس بریتو، خەڵکی بەڕازیلە.

ئەم ئاراستانە دوورتر لە گۆڕەپانە ئاساییەکانی هێز– جەنگ و سیاسەت و کارکردن – درێژدەبنەوە بۆ بوارەکانی کارە خێریەکان و ئایین و ڕۆشەنبیری و هێزی کەسی تاکەکان. ژمارەی ملیاردێرە نوێیەکان ژمارەیەکی پێوانەیی تۆمارکرد لە ساڵی ٢٠١٠، وە لە هەموو ساڵێک هەندێک ناو بزر دەبن لە لیستەکە و تاکە هاتووەکان لە هەموو پارچەیەکی جیهان جێیان دەگرنەوە کە پێشتر هیچ بەناوبانگ نەبوونە.

چیتر کارە خێریەکان لە پسپۆری هەندێک دامەزراوە گەورەکان و ڕێکخراوە گشتیەکان و جیهانیەکان نیە. چونکە تەقیەوە بۆ ئەوەی بگۆڕێت بۆ کۆمەڵێک

## کۆتایی سەردەمی هێز

لە دامەزراوەی بچووک و شێوازی خێرکردنی نوێ کە لە زۆربەی حالەتەکان ڕاستەوخۆ بگونجێت لەگەڵ بەژداربوان و سودمەندەکان، کە پێش مۆدێلە کۆنەکەی دامەزراوە خێریەکان کەوت. قەبارەی خێرکردنی جیهانی کە تاک و دامەزراوە ئەمریکیەکان پێی هەڵدەستن بۆ چوار ئەوەندە زیادی کرد لە ساڵانی نۆوەتەکانی سەدەی بیستەم، پاشان جارێکی تر دووهێندە بۆوە لە ساڵی ١٩٩٨ بۆ ساڵی ٢٠٠٧، کە گەیشتە ٣٩.٦ ملیار دۆلار، ئەمەش بڕێکە زیاترە بە ڕێژەی ٥٠%ی پابەندبوونەکانی ساڵانەی بانکی نێودەوڵەتی. هەروەها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ژمارەی دامەزراوە خێریەکان لە ٤٠٠٠٠ لە ساڵی ١٩٧٥ زیادی کرد بۆ زیاتر لە ٧٦٠٠٠ لە ساڵی ٢٠١٢. چونکە هونەرمەندەکان و وەرزشوانەکان و گەورە بەخشەرەکانی تری وەک ئۆپرا وینفری و بیل کلینتون و ئەنجیلینا جۆلی و بونو پاڵپشتیەکی گەورەی دا بە بەخشینی بەناوبانگەکان. وە بێ گومان، ئەو دامەزراوە زەبەلاحە نوێیانەی کە لە لایەن بێل و ملیندا گیتس و وارن بافێت، وجۆرج سوروس پارەیان پێ دەدرێت دەستیان کردووە بە هەڵوەشاندنەوەی ڕێگە تەقلیدیەکان کە کاری پێدەکرێت لە جیهانی دامەزراوە گەورەکان. هەروەها هەزارەها لە ئیمپراتۆرەکانی تەکنەلۆژیا و بەڕێوەبەرەکانی جزدانەکانی پاراستن کە لە دەوڵەمەندە نوێیەکانن بە خێراییەکی زۆر دەستیان کردووە بە چوونە ناو جیهانی " پێدان و بەخشین " پارەیەکی زۆر زیاتر لە جاران دەبەخشن. " کاری خێری دەستپێشخەر " بووە هۆی بەرپابوونی چالاکی نوێ کە ئامانجی پێشکەشکردنی ڕاوێژکاری و پاڵپشتی و پێدانی پارەیە. ئاژانسی پەرەپێدانی نێودەوڵەتی ئەمریکا و بانکی نێودەوڵەتی و دامەزراوە فۆرد هەموویان تەنیا بەرەنگاری ئەو ڕکابەرانە نابنەوە کە ئەنتەرنێت و تەکنەلۆژیاکانی تریان فەراهام کرد بۆ بەرژەوەندی خۆیان، بەڵکو دووچاری ووردبینی و مەرجی گشتی زیاتر دەبنەوە لەلایەن چالاکوانان و چاودێران و حکومەتە میواندارەکان.

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

وە لەسەر هەمان ئەم ڕێڕەوە، ئەو هێزە فەراهام کراوەی کە ئایینە سەرەکیەکان بەر لە ماوەیەکی زۆر بەردەوام چێژیان لێوە دەبینی دەستی کردووە بە پەرتەوازە بوون بە ڕادەیەکی خێرا و بە شێوەیەکی تێبینیکراو. بۆ نموونە کەنیسە پەنجاییەکان دەستیان کرد بە بڵاوبوونەوە لەو وڵاتانەی کە پێشتر قەڵا بوون بۆ کەنیسەکانی فاتیکان و بروتستانتیە سەرەکیەکان. هەروەک لە بەرازیل دواکەوتوانی کەنیسە پەنجاییەکان و کەنیسە کارزماتیەکان تەنیا ٥% دانیشتوانیان پێک دەهێنا لە ساڵی ١٩٦٠، بەراورد بە ٤٩% لە ساڵی ٢٠٠٦. وە ئێستاش ئەوان ١١% پێک دێنن لە کۆریای باشور، و٢٣% لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، و ٢٦% لە نێجیریا، و٣٠% لە شیلی، و ٣٤% لە باشوری ئەفریقا، و ٤٤% لە فلیپین، و ٥٦% لە کینیا، و ٦٠% لە گواتیمالا. کەنیسە پەنجاییەکان بەوە دەناسرێنەوە کە عادەتەن بچووکن و بۆ دواکەوتووە ناوەخۆییەکان دیزان دەکرێن، بەڵام هەندێکیان فراوان دەکرێن و لە سنور لادەدەن، نموونەش بۆ ئەمە کەنیسەی مەلکوتی خوای جیهانیە لە بەڕازیل کە چوار ملیۆن ئەندام لەخۆ دەگرێت، و کەنیسەی خوای مەسیحیە دڵسۆزەکانە لە نەیجیریا. وە یەکێک لە قەشە نەیجیریەکان کەنیسەیەکی هەیە لە پایتەختی ئۆکرانیا " کییڤ" ٤٠ هەزار ئەندام لەخۆ دەگرێت. وە لەهەمان کاتدا، ئەو کەنیسانەی کە پسپۆڕان ناویان لێناوە " کەنیسە بە ئەندامەکان" — بە مانای ئەوەی ئەو کەنیسانەی کە دروست دەبن لە ناوەندی کۆمەڵگاکان و کاردەکەن لەسەر ئاستی بنەمای جەماوەری و هیچ ڕێزبەندێکی هەرەمی نیە — لە ژوورەوە بەرەنگاریەک ئەنوێنن بۆ کاثۆلیکی و کەنیسە لە ئینگلتەرا. وە ئیسلامیش، کە وەک سەرەتا هیچ پێشڕەوێکی مەرکەزی تێدا نیە، لێکترازانەکانی هێشتا بەردەوامە چونکە زاناکان و ئیمامەکانی ڕوونکردنەوەی دژبەیەک دەدەن لەسەر مینبەرەکانی تەلەفزیۆن.

## کۆتایی سەردەمی هێز

وە بۆ ئەوانەی پێشوو ئاراستە هاوشێوە تێبینیکراوەکان زیاد دەکرێت لە کار و فێرکردن و هونەر و زانست — و تەنانەت لە وەرزشی پیشەیی - بۆ ئەوەی دیمەنەکە تەواو بێت. ئەمە دیمەنی هێزێکی پەرتەوازە و دابەشکراوە لە نێوان ژمارەیەکی زیادبوو لە یاریزانە نوێیە بچووکەکان کە لە ڕەچەڵەکی جۆراوجۆر و نا پێشبینیکراو هاتوون، هەروەک ئەیبینین لە یاری شەترەنج. وە ئەم یاریزانانەش پلانی ئیستراتیجیەکان بەکاردەهێنن بۆ یاریکردن کە جیاوازە لەو پلانە ئیستراتیجیانەی کە یاریزانە تەقلیدیەکان بۆ ماوەیەکی زۆر پشتیان پێ دەبەست.

وە بزانە گووتنی ئەوەی کە هێز ئێستا وای لێهاتووە زیاتر لاواز و بێ دەسەڵاتە، ئەمە لەگەڵ تێگەیشتنی باو یەک ناگرێتەوە، چونکە ئێمە لە ڕۆژگارێک دەژین وای لێهاتووە هێز زیاتر چڕ بۆتەوە، وە ئەوانەی کە هەیانە ئەوانەن کە بەهێزترین و زۆرتر جێگیرن زیاتر لە هەموو کاتەکانی پێشوو. وە لە ڕاستیدا زۆر لە خەڵکی باوەڕیان وایە کە هێز وەک پارەیە، بەدەست هێنانی ئەگەری هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی بڕێکی زۆرتر زیاد دەکات. وە لەم ڕوانگەیەوە، سوڕی چڕی هێز و سامان، کە خۆی بەردەوامی بەخۆی دەدات، دەکرێت وەک هاندەرێکی مەرکەزی بۆ مێژووی مرۆڤایەتی هەژمار بکرێت. وە بێ گومان جیهان پڕە لە کەسایەتیەکان و دامەزراوەکان کە هێزێکی بێ شوماریان هەیە و لەسەر لێواری لەدەست دانی نین. بەڵام پەرەکانی داهاتوو ڕوون دەکاتەوە کە سەیرکردنی جیهان لە ڕێگای ئەم دیمەنەوە زۆر لایەنی گرینگ لە لایەنەکانی ئەو ڕێگایە دەشارێتەوە کە شتەکانی پێ دەگۆڕدرێت.

وە دوایی ئەبینیت ئەوەی کە دەگوزەرێ زۆر زیاترە لەوەی کە گواستنەوەیەکی سادەی هێز بێت لە کۆمەڵێک یاریزانی کاریگەر بۆ کۆمەڵێکی تر. گۆڕانی هێز

گشتگیری فراوانتر و زۆر ئاڵۆزترە. چونکە خودی هێز زیاتر فەراهام بووە، وە بێ هیچ گومانێک زۆر لە خەڵک خاوەن هێزن لەم جیهانەی ئێستا. بەڵام ئاسۆیەکانی هێز چۆتەوەیەک، وە هەر کاتێک بەدەست هێنرا بەکارهێنانی گرانتر دەبێت. بۆ ئەمەش ڕوونکردنەوە هەیە.

## چ شتێک گۆڕا ؟

هێز فەراهام دەبێت لە ئەنجامی ئەو بەربەستانەی کە خاوەنەکەی لە ڕکابەرەکانی دەپارێزێت، وە ئەم بەربەستانەش نەک تەنیا ڕێگە لە گۆڕانی ڕکابەرە نوێیەکان ناگرێت بۆ ڕکابەرێکی ترسناک، بەڵکو زاڵبوونی یاریزانە جێگیرەکانیش بەرزدەکاتەوە. ئەم بەربەستانە بەستراوەن بە هەموو شتێکەوە؛ لەو یاسایانەوە کە هەڵبژاردنەکان کۆنترۆڵ دەکات، تا جبەخانەکانی سوپاکان و هێزەکانی پۆلیس، وە بۆ توانای دارایی و بەکارهێنانی تایبەتی داهاتەکان و بودجەی ڕێکلامەکان و تەکنەلۆجیا تۆمارکراوە تایبەتەکان، و لۆگۆی بازرگانیە سەرنجڕاکێشەکان، و تەنانەت دەسەڵاتی ڕەوشتی سەرکردەکان یان کاریزمای کەسێتی هەندێک لە سیاسیەکان. بەڵام لە ماوەسی سێ دەیەی ڕابردوو ئەم بەربەستانە بە ڕادەیەکی زۆر خێرا هێزیان لاوازکرد، و وایکرد کە کەمکردنەوە و خۆلێ لادان و زاڵبوون بەسەری ئاسانتر بێت. هەروەک کە مژارەکەمان لەسەر سیاسەتە ناوەخۆییەکان و نێودەوڵەتیەکان و بوارەکانی کارکردن و جەنگ و ئایین و بوارەکانی تریش ڕوونی دەکاتەوە، کە هۆکارە شاراوەکانی دوای ئەم دیاردەیە پەیوەندی نیە تەنها بە گۆڕانەکانی دیموگرافی و ئابوری و بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆژیای زانیاریەکان، بەڵکو پەیوەندی بە گۆڕانکاریە سیاسیەکان و گۆڕانە قووڵەکان لە پێشبینیەکان و نەریتەکان و هەڵسەنگاندنە کۆمەڵایەتیەکانیش هەیە. تەکنەلۆژیای زانیاری ( ئەوەی کە ئەنتەرنێت دەگرێتەوە و بەتەنها وەری ناگرێت )

## کۆتایی سەردەمی هێز

ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە دیاریکردنی چۆنیەتی گەیشتن بە هێز و بەکارهێنانی. بەڵام باشترین ڕوونکردنەوە بۆ ئەو هۆکارەی کە وایکرد بەربەستەکانی هێز زیاتر لاواز بێت پەیوەندی بەو گۆڕانانە هەیە کەبەسەر هۆکارە جۆراوجۆرەکان هات وەک گەشەی خێرای ئابوری لە زۆربەی وڵاتە هەژارەکان، و ڕادەی کۆچکردن، و بواری بزیشکی و چاودێری تەندروستی، و خوێندن، و تەنانەت هەڵسوکەوت و نەریتە کۆمەڵایەتیەکانیش. بە کورتی پەیوەندی هەیە بە گۆڕانکاریەکان لە ژیان و بارودۆخ و تواناکانی مرۆڤ.

گرینگترین شت کە ژیانی ئەمڕۆمان لە ژیان باووباپیرانمان جیا دەکاتەوە ئامێرەکان نیە کە بەکاریان دەهێنین یان ئەو یاسایانەی کە کۆمەڵگە بەڕێوەدەبات، ئەوەی کە ژیانمان جیادەکاتەوە ئەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە ژمارەمان زۆرترە لەسەر ڕووی زەوی؛ و زۆرتر دەژین؛ و جێژ لە تەندروستیەکی باشتر دەبینین؛ و خوێندەوارتر و ڕۆشنبیرترین؛ و ژمارەیەکی بێ شومار لە ئێمە کەمتر نیگەرانە دەربارەی دەستکەوتنی خواردن و کاتێکی فراوانتری هەیە و پارەیەکی زیاتری هەیە بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکانی تر؛ و کاتێک هەست بە نارەزایی دەکەی لە پێگەی ئێستامان؛ زۆر ئاسان و هەرزانە ئێستا؛ لە هەموو کاتێکی پێشوو، کە کەسێک بڕوات و هەوڵی ژیانکردن بدات لە شوێنێکی تر. وە بە زیادبوونی نزیکبوونەوەمان و چڕیمان بەهۆی زیادبوونی ماوەی ژیانمان و دەوڵەمەندیەکانی، پەیوەندیمان بەیەکتریش زیادی کردووە، ئەو شتەی کە ئاواتەکان و چانسەکانمانی زیادکردووە. وە بێ گوومان تەندروستی و خوێندن و گەشەکردن هەمووی دوورە لەوەی ئەمڕۆ گشتگیربێت، چونکە دیاردەکانی هەژاری و نایەکسانی و جەنگ و نەخۆشیەکان و ئازارە کۆمەڵایەتیەکان و ئابوریەکان هێشتا هەر بەردەوامە، بەڵام ئامارە گشتیەکان، ئەوانەی پەیوەندیان بە درێژی ژیان و نەخوێندەواری و مردنی

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

کۆرپەلە و خواردن و ئاستەکانی داهات و دەستکەوتە زانستیەکان و گەشەکردنی مرۆڤایەتی هەیە، ئاماژە بە جیهانێک دەکەن کە گۆڕانی قووڵی بەخۆوە بینیوە — لەگەڵ لایەنی پێشبینیەکان و بارودۆخەکان — بەجۆرێک کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ئەو مەرجانەی کە هێزییان پێوە بەدەست دێت و پارێزگاری لێ دەکات و هەروەها لەدەستی دەدات.

وە سێ بەشی داهاتوو ئەم بیرۆکەیە بە تێروتەسەری ڕوون دەکاتەوە؛ کاتێک بەشی دووەم ڕێگای ڕوون و پراکتیکی پێشکەش دەکات بۆ بیرکردنەوە دەربارەی هێز کە لە هەموو بوارەکان جێبەجێ دەکرێت، وە گفتوگۆ لەسەر ڕێگا جیاوازەکان دەکات کە لەوانەیە تێیاندا هێزی تێدا بەکاربهێنرێت، و جیاوازیەکانی نێوان لایەنەکانی هێز ڕوون دەکاتەوە وەک دەسەڵات و باوەڕپێکردن و زۆرلێکردن و فەرمانکردن، و ئەوە نیشان دەدات کە چۆن هێز خۆی لە دوای بەربەستەکان دەشارێتەوە کە ڕێگای پێدەدات فراوانتر و چڕتر بێت، تا وای لێدێت ئەو بەربەستانە داخورێن و چیتر بە ئەرکی پاراستن هەڵناستن. و بەشی سێیەم ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن هێز لە زۆربەی بوارە جیاوازەکان گەورە بووە. وە من پرسیار دەکەم : بە شێوەیەکی پراکتیکی بۆچی هێز یەکسان بووە لەگەڵ قەبارەی ئەو ڕێکخراوانەی کە پشتگیری دەکەن؟ وە بۆچی ڕێکخراوە گەورەکان ئەوانەی زنجیرەی هەرەمی و بەڕێوەبردنی مەرکەزیان هەیە ئەو ئامێرەی زاڵبوونن کە پێشتر — وە ئێستاش — لە ڕێگەیانەوە هێز بەکار دێت؟ ئەم بەراوردەی نێوان هێز و قەبارەی دامەزراوەکە وایکردووە بگاتە بەرزترین لوتکەی لە ماوەی سەدەی بیستەم. ئەو دیمەنەی کە هێشتا زاڵە بەسەر گفتوگۆکان و مژارەکانی ئەمڕۆ، لەگەڵ ئەوەی ڕاستیەکان ئێستا زۆر بە ڕوونی گۆڕاون.

## کۆتایی سەردەمی هێز

وە بەشی چوارەم بە ووردی ئەوە دەخاتە ڕوو کە چۆن گۆڕانکاریە گەورەکان لە ژیانمان بەرەنگاری نوێی دەرکردووە کە وادەکات زەحمەت بێت ئەو بەربەستانەی هێز بونیادبنێرت کە ڕکابەرەکان دووردەخاتەوە، و بەرگری لەو بەربەستانەش بکرێت. ئەم گۆڕانکاریانەش لە سێ سەرچاوەی شۆڕشگێڕی هەڵدەقوڵێن کە ڕووخساری سەردەمی ئێستامان دیاری دەکات: یەکەم، شۆڕشی زۆری، کە جیادەکرێتەوە بە زیادبوون لە هەموو شتێک، لە ژمارەی وولاَتەکانەوە بۆ قەبارەی دانیشتوان و ئاستەکانی بژێو و تێکڕای نەخوێندەواری و برەکانی بەرهەمهێنان کە لە بازارەکان خراونەتەڕوو. دووەم، شۆڕشی گواستنەوە کە وایکردووە خەڵک و کاڵاکان و پارەکان و بیرۆکەکان و نەریتەکان بجوڵێنەوە و بگوازرێنەوە بۆ هەموو سوچێکی جیهان ( تەنانەت ئەو شوێنانەش کە دوورە دەست بوون و پێیان نەدەگەیشتین ) بە ڕادەیەک کە هێشتا لە خەیاڵدا نیە. سێیەم، شۆڕشی مێنتاڵیتەکان کە ڕەنگدانەوەی گۆڕانکاریە گەورەکان دەکات لە ڕێکخراوەکانی مێشک و ئەو ڕێگایانەی بیرکردنەوە و پێشبینی کردن و ئاوات خواستن کە لەگەڵ ئەم گۆڕانکاریانە دێت.

وە هەندێک لە لایەنەکانی ئەم سێ شۆڕشە دواتر بۆ خوێنەر بەدیار دەکەوێت، بەڵام ئەوەی نادیارەکە، ئەوەی کە بە قووڵی خوێندنەوەی بۆ نەکراوە، ئەوەیە کە هەریەکێک لەم شۆڕشانە ئاسانتر هێزیان دەست کەوتووە بەڵام بەکارهێنان و پارێزگاری کردن لێی گرانترە. وە بەشی چوارەم بە دیاریکراوەی ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن ئەم شۆڕشە قووڵ و هاوکاتانە دەستیان کردووە بە لاوازکردنی هێز و زیادکردنی زەحمەتی بەکارهێنانی بە شێوەیەکی چالاک. وە ئەنجامەکەی خنکاندنی ڕێکخراوە نوێیە گەورەکانە ئەوانەی کە بەڕێوەبردنی مەرکەزیان چیتر لە ڕەچەڵەکێکی زەبەلاحەوە نەهاتووە کە دڵنیایی زاڵبوونی پێ بدات، بەڵکو

وایلێهاتووە ئەم ڕەچەڵەکانە لە زۆر کاتدا بوونەتە بەربەست. وە لە ڕاستیدا ئەو بارودۆخانەی کە لەژێر سێبەرەکەی جۆرەها شێوەی هێزیان تێدا دەردەبڕدرێت — وەکو زۆرلێکردن و پابەندبوون و باوەڕپێکردن و هاندان —بۆ چەند ڕێگایەک گۆڕاون کە بە پلەیەکی دیاریکراو سنور دادەنێت بۆ سودەکانی قەبارە، یان بە تەواوی هەڵیدەوەشێنێتەوە.

**لەناوچوونی هێز: ئایا ئەمە دیاردەیەکی نوێیە؟ یان ڕاستی یە؟ وە چی لەمەدا هەیە؟**

ئەو گۆڕانکاریانەی کە دواتر دەیاندۆزینەوە لە زۆر بوار سوودی هەبووە بۆ داهێنەران و کەسە هاتووە نوێیەکان، لەوانەش، بەداخەوە، چەتەکان و تیرۆرستەکان و لە یاسا دەرچووەکان و چەتەکانی ئەنتەرنێت و قاچاخچیەکان و تەزویرچیەکان و تاوانبارەکانی بۆشایی سیبرانی. وە چەند هەڵێکی بۆ چالاکوانان و پشتگیریخوازانی دیموکراسی ڕەخساندووە — وە هەروەها بۆ پارتە سیاسیە پشتگوێخراوەکانیش ئەوانەی کە ئەجێندای تەسک و توندڕەویان هەیە — و ڕێڕەوی جێگرەوەی کردەوە بۆ دەسەڵاتی سیاسی کە بناغەی فەرمی پتەوی ناوخۆی دامەزراوە سیاسیەکان تێدەپەڕێنێت یان تێکی دەشکێنێت، لە وڵاتە دیموکراسیەکان و سەرکوتکردووەکان بەهەمان ئاست. وە کەس چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد تەنیا بەشێکی کەمی خەڵک نەبێت کە کاتێک کۆمەڵێکی بچووکی چالاکوانانی مالیزی لە هاوینی ساڵی ٢٠١١ بڕیاریاندا گۆڕەپانی داتاران لە کوالالمبور داگیربکەن، بە لاسایی کردنەوەی جوڵانەوەی " ناڕازیەکان " لە گۆڕەپانی بویرتا دیل سول لە مەدرید، جولانەوەیەکی هاوشێوە دروست دەبێت بۆ

## کۆتایی سەردەمی هێز

داگیرکردنی وۆل ستریت و ئاگری جوڵانەوەی هاوشێوە له ٢٦٠٠ شار لە سەرانسەری جیهان بەرپا دەکات.

وە لەگەڵ ئەوەی ئەم گۆڕانە سیاسیە هەستپێکراوانەی کە جوڵانەوەکانی " داگیرکەن " بەرپایان کرد کەمبوو، بەڵام کاریگەریەکانی تێبینیکراو بوون. هەروەک مێژوونووسی بەناوبانگ لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەم تێبینی کرد، تود گیتلین، " ئەو گۆڕانکاریە فراوانەی کە لە گفتوگۆی ساڵ ڕوویدا سێ ساڵی خایاند بۆ ئەوەی پێشبکەوێت لە ماوەی ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەم — دەربارەی جەنگی دڕندانە، و زۆربوونی پێداویستی و ئارەزووەکان و پێشبینی کردنەکان، و سیاسەتی پڕوپووت، و هیوای دیموکراسی خنکێنراو — بەڵام لە ساڵی ٢٠١١ تەنها سێ هەفتەی خایاند. وە بە گوێرەی خێرایی و کاریگەری و شێوازە نوێیەکان لە ڕێکخستنی ئاسۆیی، جوڵانەوەکانی " داگیرکەن" داخورانی دەست بەسەرداگرتنەکانی پارتە تەقلیدیەکانیشیان، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان چێژیان لێ ئەبینی، بەدەرخست بۆ ئەو کەناڵانەی کە ئەندامی خێزان بوون لە ڕێگایانەوە ستەم لێکردنیان و ئاواتەکانیان و داواکانیان ئەگواستەوە. بەهاری عەرەبی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە لە ساڵی ٢٠١٠ دەستی پێکرد، هیچ نیشانەیەکی گەڕانەوە بەدەرناخات، بەڵکو لەجیاتی ئەمە بەردەوام بوو لە بڵاوبوونەوە، وە هەموو نیزامە سەرکوتەکان لە هەموو ناوچەکانی جیهان هەستیان بە کاردانەوەکان و دەنگدانەوەکانی کرد.

وە پێشتر ئاماژەی پێکرا : نزیکەی هەمان شت لە جیهانی کارکردن ڕوودەدات؛ چونکە هەندێ کۆمپانیای بچووک تازە هاتوو لەو وڵاتانەی کە هەربەحاڵ بازارەکانی تێدا کراونەتەوە توانیان بازێک بۆ پێشەوە بدەن، و لە

# کۆتایی سەردەمی هێز

هەندێک حاڵەت زاڵبن بەسەر کۆمپانیا زەبەلاحە جیهانیەکان و مارکە بازرگانیە باوەکان کە لەلایەن گەورەی پێشڕەوانی پیشەسازی دروست کراون لە ماوەی چەند دەیەیەکی پێشوو.

وە لە بواری جیۆسیاسی یاریزانە بچووکەکان – جا چ وولاتی بچووک یان کیانە ناحکومیەکان – هەڵی نوێیان بەدەست هێنا بۆ شکاندنی هەوڵەکانی " هێزە گەورەکان " و ڕێکخراوە فرەلایەنەکان، وەک سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، و چوونە ناویان و دووبارە ئاراستە کردنیان و بەگشتی دامرکاندنیان. نموونەش بۆ ئەمە: ڕەتکردنەوەی سیاسەتی یەکێتی ئەوروپا لەلایەن پۆلەندا بۆ کەمکردنەوەی دەرچووەکانی کاربۆن، و هەوڵەکانی تورکیا و بەڕازیل بۆ ئاستەنگ خستنە ناو دانوستانەکانی هێزە گەورەکان لەگەڵ ئێران دەربارەی بەرنامەی ناوەکیەکەی، و بەدەرخستنی نهێنیە دبلۆماسیەکانی ئەمریکا لەلایەن ویکیلیکس، و ڕکابەری دامەزراوەی گیتس بۆ سەرکردایەتی کردنی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە بەرەنگاری بوونەوەی مەلاریا، و گەندەڵەکان بە جۆرەها شێوە و قەبارە لە دانوستانە جیهانیەکان دەربارەی بازرگانی، و گۆڕانی کەش و هەوا، و زۆر حاڵەتی تریش.

ئەم " یاریزانە نوێیانە"، ئەوانەی گرینگیان ڕوو لە زیادبوونە، هەریەکەیان لەگەڵ ئەوەی تر جیاوازیەکی زۆریان هەیە، هەروەها ئەو بوارانەی کە ڕکابەریش دەکەن لەسەری جیاوازن، بەڵام لەوە یەکدەگرنەوە کە ئەوان چیتر پێویستیان بە قەبارە یان مێژوو یان نەریتە جێگیرەکان نیە بۆ ئەوەی جێگای پەنجەیان دابنێن و ئەوە ئەنجام بدەن تا دان پێدانان بەدەست بهێنن، ئەوان نوێنەری بەرزبوونەوەی جۆرێکی نوێ لە هێز دەکەن – ناوی بنێ هێزی بچووک – کە پێشتر هیچ هەڵێکی ئەوتۆی نەبوو بۆ سەرکەوتن. وە ئەم پەڕتووکەش وا ئەبینێت کە ئەوەی

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەمرۆ جیهان دەگۆڕێت زیاتر پەیوەندی بە بەرزبوونەوەی هێزە بچووکەکان و تواناکانیان لە بەرەنگاری یاریزانە گەورەکانەوە هەیە نەوەک تەنها پەیوەندی هەبێت بە کێبڕکێی نێوان یاریزانە گەورەکان.

لەناوچوونی هێز مانای نەمانی ئەو یاریزانە گەورانە ناگەیەنێت؛ لەبەرئەوەی حکومەتە گەورەکان و سوپا زەبەلاحەکان و کارە گەورەکان و زانکۆ گەورەکان زیاتر لە هەر کاتێکی پێشوو دەورەدراون و بەستراون، بەڵام بێ گومان ئەمانە هەر بە گرینگی ئەمێننەوە و کار و بڕیارەکانیان سەنگێکی گەورەی خۆی هەیە، بەڵام نەوەک بەو ڕادەی کە پێشتر هەیان بوو. وە نەک بەو ڕادەش کە ئەیانەوێت. وە نەک بەو ڕادەش کە چاوەڕوان دەکرێت. وە لەگەڵ ئەوەی وا دەردەکەوێت شتێکی باش بێت بەهێزەکان هێزیان لە پێشتر کەمتر بێتەوە ( چونکە هێز کاولکەرە، ئەی وانیە؟ )، بەڵام کەمبوونەوەی تواناکانیان لەوانەیە ببێتە هۆی ناسەقامگیری و ئاژاوە و پەکەوتەیی لە بەرەنگاریبوونەوەی گرفتە ئاڵۆزەکان.

بەشەکانی داهاتوو ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە چۆن لەناوچوونی هێز خێرا بووە، لەگەڵ ئەوەی ئاراستەکان وادەردەکەون بەیەکداچوو بن، وەک " گەڕانەوەی گەورەکان" و پڕۆسەکانی ڕزگارکردنی ئەو دامەزراوانەی کە ناونراون بەوەی " گەورەترە لەوەی فەشەل بێنێت" لە کۆتایی دەیەی پێشوو، و ئەو زیادکردنانەی بودجەی سەربازی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چین، و حالەتە ڕوولە زیادبوونەکانی گەڕاندنەوە لە داهات و سامان لە هەموو ناوچەکانی جیهان، بەڵام لەناوچوونی هێز، لە ڕاستیدا، بابەتێکی زیاتر گرینگە و جێماوەکەی درێژترە لە ئاراستەکان و پێشکەوتنە ڕووکەشەکان کە لەم ڕۆژگارەدا باڵی کێشاوە بەسەر گفتوگۆکانی نێوان دامەزرێنەرانی سیاسەتەکان و (محلل)ەکان.

# کۆتایی سەردەمی هێز

ئەم پەڕتووکە بە دیاریکراوەی دوو لە ووتە گرینگە تەقلیدیەکان لەخۆ دەگرێت دەربارەی هێز: یەکێکیان سەرنجدانە لەسەر ئەنتەرنێت وەک شیکەرەوەیەک بۆ گۆڕانکاریەکانی هێز، بەتایبەت لە بواری سیاسەت و کار. وە دووەمیان خۆخەریکردنە بە خولیای گۆڕانی جیوسیاسی، بە شێوەیەک کە دابەزینی هەندێک وولات ( بەتایبەت وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ) و بەرزبوونەوەی وولاتانی تر ( بەتایبەت چین) وانیشان دەدرێن ئاراستەی زاڵن بن کە جیهان دەگۆڕێت لەو سەردەمەی ئێستاماندا.

لەناوچوونی هێز بە شێوەیەکی دیاریکراو لەلایەن ئەنتەرنێت و بە شێوەیەکی گشتیش لەلایەن تەکنەلۆژیای زانیاریەکان بەڕێوەنابرێت. وە ناکرێت ڕۆڵی ئەنتەرنێت و کەرەستەکانی تر ڕەتکرێتەوە لە گۆڕانی سیاسەت و چالاکی سیاسی و کارەکان و هێزیش بەهەر حاڵ. لەگەڵ ئەمەش ئەم ڕۆڵە سەرەکیە زیادەڕۆیی لە هەڵسەنگاندنی کراوە و زۆرجار بە هەڵە لێی تێنەگەن. تەکنەلۆژیای زانیاریە نوێیەکان کەرەستەن، وە بۆ ئەوەی کاریگەریان هەبێت، دەبێت بەکارهێنەریان هەبێت کە ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە پێویستیان بە ئامانج و ئاراستەکردن و پاڵنەر هەبێت. فەیسبوک و تویتەر و نامە تێکستیەکان کەرەستەی سەرەکین بۆ بەتواناکردنی خۆپێشاندەران لە بەهاری عەرەبی. بەڵام خۆپێشاندەران، و ئەو بارودۆخانەی کە پاڵی پێوەنان بێنە سەر جادەکان، لەلایەن بارودۆخی ناوەخۆو دەرەکیەوە ئەجولێنران کە هیچ پەیوەندی بە کەرەستەکانی زانیاریە نوێیەکانەوە نەبوو کە لەژێر دەستیان بوو، ملیۆنەها لە خەڵک بەژداریان لەو ڕاپەڕینانە کرد کە حوسنی موبارەکی ڕووخاند لە میسر، بەڵام چاکەی هاندان بۆ خۆپیشاندان بۆ ماڵپەری فەیسبوک گەڕایەوە کە ژمارەی ئەندامەکانی نەئەگەیشتە تەنها ٣٥٠ هەزار کەس کاتێک لەو پەڕی چالاکی بوو. لە ڕاستیدا توێژینەوەیەکی نوێ هەیە لەسەر جوڵانەوەی چالاکی

## کۆتایی سەردەمی هێز

تویتەر لە میانەی هەردوو ڕاپەڕین میسر و لیبیا، ئەوە دۆزراوە کە زیاتر لە ٧٥% لەو کەسانەی کە چوونە بەستەرە ئەلیکترۆنیەکانی تویتەر کە پەیوەندیان بەو دوو خۆنیشاندانە هەبوو لە دەرەوەی نیشتمانی عەرەبی بوو. وە لە توێژینەوەیەکی تریش کە پەیمانگای وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئاشتی ئەنجامی دا بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر پلەکانی بەکارهێنانی تویتەر لە ماوەی بەهاری عەرەبی، پوختکراوەکەی ئەوەیە کە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنە نوێیەکان " وا دیار نیە کە ڕۆلێکی گرینگی گێڕا لە کردەوە کۆمەڵیەکانی ناو وولات یان لە بڵاوبوونەوەی هەرێمی بۆ ڕاپەڕین.

یەکەم پاڵنەری سەرەکی نێوان پاڵنەرەکانی خۆپیشاندان واقیعی دیموگرافی گەنجەکانە لە وولاتەکانی وەک تونس و میسر و سوریا؛ گەنجەکان باشترینن لە ڕووی تەندروستی و خوێندەواری لە زیاتر هەموو کاتێک، بەڵام بێ ئیشن و زۆر خەمباریشن. لەمەش زیاتر، خودی تەکنەلۆژیای زانیاریەکان کە توانا بە هاونیشتیمانیە سەدەکانیش دەدات ئامرازی نوێی هێناوە بۆ چاودێری و سەرکوتکردن و کۆنترۆڵکردنی گشتی، بۆ نموونە، یارمەتی ئێرانی دا لە دیاریکردنی بەژداربووان لە " شۆڕشی سەوز" ی لەناوچوو و لە زیندانی کردن. وە بەڕاستی لووتبەرزیە نکۆڵی بکرێت لەو ڕۆڵی یەکلاکەرەوەیەی کە تەکنەلۆژیای زانیاریەکان دەیگێڕن، بەتایبەت دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی ڕاگەیاندن، لەو گۆڕانانەی کە ئەیبینین، هەروەها لووتبەرزیە والێکبدرێتەوە کە ئەم گۆڕانانە لە ئەنجامی تەنیا هەڵگرتنێکی فراوانی ئەم تەنەلۆژیایانەیە.

هەروەها پێویستە تێکەڵاوی نەکەین لە نێوان داخورانی هێز و هەر گۆڕانکاریەکی سەردەمیانە لە هێز، وەک ئەوەی شیکرەوە سیاسیەکان و

## کۆتایی سەردەمی هێز

شرۆڤەکاران بە ووردی ڕوونیان کردۆتەوە، لە کاتەی پاشەکشێی ئەمریکا و سەرکەوتنی چینی بووەتە شتێکی ئاسایی بەوەی کە گۆڕانی جیوسیاسی سەرەکی دەنوێنێت لەم سەردەمە؛ ئەم گۆڕانە کە شانازی پێوە دەکرێت یان گلەیی لێدەکرێت یان خۆئاگادارکردنەوەی لێ دەکرێت بە پلەی جۆراوجۆر لە جیاوازیەکان بە پشت بەستن بە تێڕوانینی نووسەر. هەڵسەنگاندنی پاشەکشێی ئەوروپا و بەرزبوونەوەی کۆمەڵەی بریکس ( بەرازیل و ڕووسیا و هند و چین و باشوری ئەفریقا ) و " وولاتانی تریش" بۆتە گۆڕەپانی مشتومڕێکی گەورە لە نێوان شیکرەوە پیشەگەرەکان و ئاساییەکان. بەلام لەگەڵ ئەوەش کە ڕکابەریەکان لە نێوان وولاتان لە بارێکی بەردەوامی گۆڕاندایە ( وە بەردەوام هەروابووە)، بۆیە سەرنجدان لەسەر ئەوەی کێ لە باری پاشەکشەدایە و کێ لە باری بەرزبوونەوەدایە سەرلێشێواندنێکی گەورە و ترسناک دەنوێنێت؛ ئەمە سەرلێشێواندنە چونکە هەموو دەستەیەکی نوێ لە براوەکان شتێکی بێزارکەر دەردەخات، بە دیاریکراوی ئەوەیە کە ئەو کەسانەی کە دەبنە خاوەن هێز لە دوارۆژ خۆیان نابیننەوە کە سەربەخۆییان بەستراوەتەوە و چالاکیان سنوردار بووە بە شێوەیەک لەوانەیە خۆیان چاوەڕوانیان نەکردووە و باوانیشیان دووچاری نەبوونە.

وە زیاتر لەمەش؛ جێماوەی کەڵەکەبوونی ئەم گۆڕانکاریانە لە ڕادەی داخورانی دەسەلاتی رەوشتی و شەرعیان بە شێوەیەکی گەورە خێراکردووە. پاشەکشەی متمانەی باوەڕپێکراو بە پیشەکان و دامەزراوە گشتیەکان یەکێکە لە دیاردەکانی ئەم ئاراستەیە. تەنیا سەرکردەکانی کۆمەڵگە زۆرترین لاوازی نابینن بەڵکو ئەوانەی کە سەرکردەکانی کۆمەڵگە کۆنترۆڵی کردبوون ئاگاییان زیاتر بووە بە توانا و ئەگەرە جیاوازەکان، وە زیاتر تێگەیشتوون لە داواکاریە کەسیەکانیان. وە ئەمڕۆ پرسیار ناکەین ئایا دەتوانین چ شتێک پێشکەشی

وولاّتمان بکەین ؟ بەڵکو دەپرسین: ئایا وولاّتمان یان ئەوانەی کاریان بۆ دەکەین یان فرۆشیاری خوردنە خێراکان یان کۆمپانیای فرۆکەوانی دەتوانێت چیمان پێشکەش بکات ؟

شکست هێنان لە سەیرکردنی دوورتر لە جەنگە ساتیەکان و بینینی گەورەترین هەڵوەشاندنەوە لە هێز تێچووی گرانبەها لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت. ئەمە بەشداری دەکات لە حالەتی شلەژان، و هیچ پێشکەوتنێک بەدی ناکات لە چارەسەرکردنی کێشە سەرەکیە ئاڵۆزەکان کە پێویست دەکات لەسەرمان گرینگی خێرای پێ بدەین؛ لە قەیرانە داراییەکان و بێ کاری و هەژاریەوە بگرە تا کەمبوونەوەی داهاتەکان و گۆڕانی کەشوهەوا. ئێمە لە سەردەمێک دەژین ئەبێت خۆمان زیاتر بە ئاگا بکەین بەو کێشانە و باشتر تێیان بگەین لە هەموو کات زیاتر، بەلاّم، پێدەچێت ئێمە توانامان نەبێت لە بەرەنگاری کردنی بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە و کاریگەر، هۆکاری ئەمەش لەناوچوونی هێزە.

### بەلاّم هێز چی یە؟

هەر پەڕتووکێک لەسەر هێز پێویستە پێناسەیەکی بۆ دابنێت، و هۆکارێک دیاری بکات بۆ باسکردنی ئەم بابەتە سەرەکیە کە زیاتر نادیار و ناڕوونە لە هەندێک لایەنەکانی.

هێز کاردەکات لەسەر سەرنجدانی هەڵسوکەوت و جولانی کێبڕکێ لە کاتی بەدەرکەوتنی کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکان. بە گوێرەی ئەرستۆ هێز و سامان و پەیوەندیە هاورێیەتیەکان سێ پێکهاتەن بۆ دروستبوونی خۆشی مرۆڤ. وە نیمچە هاوڕاییەک هەیە لە بواری فەلسەفە لەسەر گریمانی قسەکەر کە " مرۆڤ بە

# کۆتایی سەردەمی هێز

سروشتی خۆی هەوڵ دەدات بۆ هێز لەسەر ئاستی کەسێتی، وە دەسەڵاتدارەکانیش هەوڵی جێگیری و فراوانبوونی دەسەڵاتیان دەدەن. لە سەدەی شازدەهەم نیکۆلا ماکیافیللی لە پەرتووکەکەی " شازادە"، کە ئەمە یەکەم پەرتووکیەتی لەسەر هونەری دەسەڵات، نووسیویەتی " بەدەست هێنانی زەوی و کۆنترۆڵکردنی سیاسەت لەڕاستیدا شتێکی سروشتی و زۆر ئاساییە، و بەردەوام پیاوەکان ئەوە دەکەن کە پێیان دەکرێت"، وە لە سەدەی حەڤدەهەم فەیلەسوفی ئینگلیزی تۆماس هوبز ئەم بابەتەی هەنگاوێک بۆ پێشەوە برد لە پەرتووکەکەی " لیڤایاثان " لەسەر سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵگە، کاتێک نووسیویەتی " من مەیلێکی گشتی دەبینم لە هەموو مرۆڤەکان کە خۆی دەنوێنێت لە ئارەزوویەکی بەردەوام هێمن نابێتەوە لە دەست کەوتنی هێز دوای هێز، وە هەرگیز ناوەستێت تا پاش مردن". وە پاش دوو سەدە و نیو، لە ساڵی ١٨٨٥، فریدریک نیتشە لە پەرتووکەکەی " بەم شێوەیە زرادشت قسەی کرد " ئەڵێت: " لە هەر شوێنێک شتێکی زیندووم دۆزیبێتەوە ئارەزوویەک لە دەست کەوتنی هێزم تێدا دۆزیوەتەوە؛ وە تەنانەت لە خزمەتکارەکانیش ئارەزووم بینیوە ببن بە گەورەکان.

وە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ژیانی مرۆڤ کورت دەبێتەوە تەنها بۆ هێز، بێ گومان خۆشەویستی و سێکس و ئایین و ئارەزووەکان و سۆزەکانی تریش ڕۆڵیان هەیە، بەڵام بێ گومان هێز ویستراوێکە بەردەوام خەڵکی جولاندوەو تاهەتایە هەروا دەبێت. هێز، هەروەک بەردەوام وایکردووە، کۆمەڵگە ڕێک دەخات و یارمەتیدەرە لە بەڕێوەبردنی پەیوەندیەکان و ڕێکخستنی چالاکیەکانی نێوان خەڵک و ناوەوەی کۆمەڵگەکان و وولاتان و نێوان خۆیان. ئەو لە هەموو گۆڕەپانەکانی مامەڵەکردنمان یان ڕکابەریمان یان ئەوانەی خۆمان لێی ڕێکدەخەین بەدەرئەکەوێت: سیاسەتە نێودەوڵەتیەکان و جەنگ، سیاسەتی ناوەخۆ، بوارەکانی کارکردن، و

توێژینەوەی زانستی، و ئایین، و کاری کۆمەڵایەتی وەکو کاری خێری و چالاکیە گشتیەکان، و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و ڕۆشنبیریەکان بە هەموو جۆرەکانی. وە دەکرێت وابڵێین کە هێز لە پەیوەندیە خۆشەویستیە هەرە نزیکەکان و پەیوەندیە نهێنیەکانیشمان خۆی بەدەرئەخات، وە هاروەها لە زمانەکەمان و تەنانەت لە خەونەکانیشمان. ئەم دووریانە دوایی دەکەوێتە دەرەوەی سنوری ئەم پەڕتووکە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دابڕاوە لەو ئاراستانەی کە هەوڵی ڕوونکردنەوەیان ئەدات.

من لێرە بەدوای شێوازێکی زانستی ئەکەوم، ئامانجەکەش ئەوەیە تێگەیاندنی ئەوەی پێویستە بۆ دەستکەوتنی هێز و پارێزگاری لێ کردنی و لەدەست دانی. ئەم شتەش پێناسەیەکی زانستی دەوێت، و لێرە پێناسەیەک ئەهێنمەوە: هێز ئەو توانایەیە لە ئاراستەکردن یان ڕێگری کردن لە کردەوەکانی ئێستا یان دوارۆژ کە کۆمەڵەکان و تاکەکانی تر بەکاری دەهێنن. یان، بە دەربڕینێکی تر، هێز ئەوەیە کە لەسەر ئەوانی تر بەکاری دەهێنین، و وایان لێدەکەین بەو ڕێگایانە هەڵسوکەوت بکەن کە خۆیان نەیان دەکرد بەبێ ئەو هێزەی بەسەریان دەسەپێنین.

ئەم ڕێگا زانستیە بۆ سەیرکردنی هێز ڕێگایەکی نوێ نیە یان شایەنی مژاربێت: وە لەگەڵ ئەوەی هێز بە سروشتی خۆی بابەتێکی ئاڵۆزە، ئەوا زۆربەری پێناسە زانستیەکان کە زانا کۆمەڵایەتیەکان بەکاری دێنن لەم پێناسەی ئێرە دەچێت. بۆ نموونە، شێوازی من لە توێژینەوەیەکی کۆنی بەناوبانگ دەچێت کە مامۆستای زانستە سیاسیەکان ڕۆبرت دال لە ساڵی ١٩٥٧ نووسیویەتی بە ناوی " چەمکی هێز ". بە گوێرەی دال: " کەسی A هێز بەکاردێنێت بەسەر کەسی B بەشێوەیەک دەتوانێت وای لێبکات کە شتێک بکات پێشتر هەرگیز نەیدەکرد

ئەگەر ئەو هێزە نەبووایە". ڕێگا جیاوازاکان بۆ بەکارهێنانی هێز و دەربڕینە جیاوازەکان لە هێز، وەک دەسەڵات و باوەڕپێکردن و زۆرلێکردن — کە دوایی لە بەشی چوارەم باسیان دەکەین — لە ناو ئەم دەقە ڕوودەدات: یەکێک لە لایەنەکان زۆر لە لایەنەکەی تر دەکات، یان شکست دەخوات لە زۆرلێکردنی، کە بە شێوازێکی دیاریکراو هەڵسوکەوت بکات.

وە لەوانەیە هێز پاڵنەرێکی پێویستە بێت هەمووومان هەڵیگرین لە ناخی ژوورەوەمان، هەروەک فەیلەسوفەکان دەڵێن؛ بەڵام لە واقیعی پراکتیکی بە سروشتی خۆی ڕێژەییە، بۆیە ناکرێت هێز بپێوین تەنها بە بەکارهێنانی پێکاتە نزیکراوەییەکان، وەکو کێ خاوەنی گەورەترین سوپایە یان دەوڵەمەندترین قاسەیە یان زۆرترین ژمارەی دانیشتوانە یان پڕداهاتترینە. هیچ کەسێک ئەو بڕە جێگیرەی نیە لە هێز کە بتوانرێت بە شێوەیەکی ڕێژەیی بپێورێت چونکە هێزی هەر کەسێک یان دامەزراوەیەک لە ڕاستیدا جیاوازە لە بارێک بۆ بارێکی تر. وە بۆئەوەی هێز کاریگەری هەبێت پێویستە کارلێک یان گۆڕینەوە هەبێت لە نێوان دوو یان سێ لایەن: گەورە و خزمەتکار، یان دەسەڵاتدار و هاووڵاتی، یان خاوەن کار و فەرمانبەر، یان باوک و منداڵ، یان مامۆستا و قوتابی، یان پێکهاتەیەکی تێکەڵاو لە تاکەکان و پارتەکان و سوپاکان و کۆمپانیاکان و دامەزراوەکان، وە تەنانەت وڵاتەکانیش. وە هەروەک یاریزانەکان لە بارێک بۆ بارێکی تر جووڵەدەکەن، ئەوا توانای هەرکەسێک بۆ ئاراستەکردن یان ڕێگریکردن لە هەڵسوکەوتی کەسانی تریش — بە مانایەکی تر هێزی کەسانی تر - دەگۆڕێت. وە هەرچەندە کۆڕانی یاریزانەکان و سیفاتە ناوازەکانیان کەمتر بێت دابەشکردنی هێزی دیاریکراو سەقامگیرتر دەبێت، بەڵام کاتێک ژمارەی یاریزانەکان و

ئاواتەکانیان و پاڵنەرەکانیان و تواناکانیان و سیفاتەکانیان دەگۆڕێت دەبەشکردنی هێزیش لەگەڵی دەگۆڕێت.

ئەمەش تەنها بیرۆکەیەک نیە؛ ئەوەی مەبەستە ئەوەیە کە هێز کارێکی کۆمەڵایەتی هەیە، و ڕۆڵەکەشی کورت ناکرێتەوە تەنها لەسەر دەست بەسەرداگرتن و ئەژمارکردنی سەرکەوتووەکان و شکست خواردووەکان؛ بەڵکو هێز کۆمەڵگاکان و بازاڕەکان و جیهانیش ڕێک دەخات. هۆبز ئەم بابەتەی بە باشی ڕوونکردۆتەوە، کاتێک بینی کە مرۆڤ بە سروشتی خۆیان دووچاری ناکۆکی و ڕکابەری دەبنەوە، لە ئەنجامی بوونی ئارەزوویەکی ڕەسەن بۆ هێز. وە ئەگەر ڕێگە بە مرۆڤ بدرێت ئەم سروشتەی خۆیان دەربڕن بەبێ بوونی هێزێک ڕێگریان لێبکات یان ئاراستەیان بکات، ئەوا دەست بە شەڕکردن دەکەن تا هیچ شتێک نامێنێت شەڕی لەسەر بکەن. بەلام ئەگەر نوێنەرایەتی " هێزێکی هاوبەش" بکەن، ئەوا لەوانەیە تواناکانیان ئاراستە بکەن بەرەو بنیادنانی کۆمەڵگە نەوەک تێکدانی. هۆبز نووسیویەتی " لەو ماوەیەی کە خەڵک تێیدا دەژین بە بێ بوونی هێزێکی هاوبەش کە هەموویان بترسێنێت، ئەوا لە حالەتێک دەژین پێی دەڵێین جەنگ، وە ئەم جەنگەش هەروەک خۆی هەموو پیاوێک دژی پیاوێکی تر دەوەستێت" .

## لەناوچوونی هێز: هەموو شتێک دووچاری مەترسی دەبێتەوە ؟

ڕووخانی بەربەستەکانی هێز ڕێگایەکی نوێی کردەوە بە ڕووی یاریزانە نوێیەکان لە جۆری ئەوانەی کە یاری شەترەنجیان گۆڕی، وە ئێستا دەستیان کردووە بە گۆڕانکاری لە گۆڕەپانە سەرەکیەکانی تری ڕکابەری مرۆڤایەتی، هەروەک بەشەکانی داهاتوو بە ووردی ڕوونیان دەکاتەوە. وە ئەم یاریزانە نوێیانە ئەو هێزە بچووکانەن کە پێشتر باسمان کردن. وە هێزەکانیشیان لە جۆرێکی تازەیە؛

## کۆتایی سەردەمی هێز

چونکە هێزێکی گەورەی تێکشکێنەر و یەکلاکەرەوە نیە لەزۆربەی جارەکان، وەک ئەوەی ڕێکخراوە تایبەتمەندە گەورەکان هەیانە، بەڵکو هێزێکی بەرپەرچ دانەوەیە کە سەرچاوە دەگرێت لە توانا بۆ بەرهەڵستی کردن و نەهێشتنی ئەو کارانەی کە یاریزانە گەورەکان دەیکەن. بەڵێ، ئەمە ئەو هێزەیە کە لە داهێنان و دەستپێشخەریەوە دێت، بەڵام لە شێوازەکانی ڕەتکردنەوە و دواکەوتن و سەرلێشێواندن و دەست تێوەردان دێت کە لەم دواییانە سنورەکانیشی فراوان بووە. ئەو تەکتیکە کۆنانەی کە یاخیبووەکان لە جەنگەکان بەکاریان دەهێنا ئێستا بەردەستە و کاریگەرە لە زۆربەی گۆڕەپانەکانی تر، وە ئەمەش مانای ئەوەیە کە دەتوانرێت ئاسۆی نوێ بکرێتەوە نەوەک تەنها بۆ داهێنەرە پێشکەوتووەکان، بەڵکو بۆ توندڕەوەکان و جوداخوازەکان و ئەوانەش کە پابەند نابن بە بەرژەوەندی گشتی. زۆری ئەو یاریزانانە، هەروەک ڕوونە ڕوو لە زیادبوونە، دەبێت هەندێک مەترسی جددی بجولێنێت دەرباری ئەوەی کە ڕوودەدات ئەگەر لەناوچوونی هێز پشتگوێخراو و وازی لێهێنرا بە بێ هیچ بەستنەوەیەک.

ئێمە هەموومان دەزانین کە زۆر سەرنجدان بۆ هێز دەبێتە هۆی زیانی کۆمەڵایەتی، بەلایەنی کەمە لەو بوارانەی کە تەرکیز دەکاتە سەر کاری خێر بە شێوەیەکی ئاشکرا، سەیری ئەو ئابڕوچوونانەی کەنیسەی کاسۆلیکی بکەن. ئایا چی ڕوودەدات کاتێک هێز پەرتەوازە دەبێت و دابەش دەبێت و لە ڕەگەوە لەناو دەچێت؟ فەیلەسوفەکان هەر پێشتر وەڵامی ئەم پرسیارەیان زانیوە: تێکشلەژان و فەوزا. جەنگی هەمووان دژی هەمووان کە هۆبز پێشبینی کرد تاکە دژە بەرامبەر خۆشحاڵی کۆمەڵایەتی. و لەناوچوونی هێزیش مەترسی دروست دەکات بۆ بەرهەم هێنانی ئەم جۆرە سیناریۆیە بە تەواوی. جهانێک یاریزانەکانی هێزی پێویستیان هەبێت بۆ ڕێگری کردن لە دەستپێشخەری ئەوانی تر، و بەڵام هیچ کەسێکی لێ

## کۆتایی سەردەمی هێز

نەبێت هێزی هەبێت بۆ سەپاندنی ڕێڕەوی کارکردنی خوازراو، ئەوا ئەو جیهانە هیچ بڕیارێکی تێدا نادرێت، یان لە کاتی بەسەرچوو دەدرێت، یان کەمدەکرێتەوە بۆ ڕادەی لەدەستدانی کاریگەری و چالاکیەکەی. وە بەبێ توانای پێشبینی کردن و سەقامگیری کە بە شێوەیەکی گشتی دێنەجێ بە سەپاندنی یاساکان و دەسەڵاتە خوازراوەکان، ئەبینین تەنانەت ئازادترین داهێنەر و زۆرترینیان لە بەرهەم هێنانە هونەریەکان و میوزیک و ئەدەب ئەو شتانەیان لا نابێت کە ئاواتەکانیان بێنێتە دی، وەک توانای ژیانکردن لە بەرهەمی ئیشەکەیان بە ڕێگەیەکی ڕێک و پێک ( بە مانای جۆرێک لە پارێزگاری لە خاوەندارێتی فکری ). زانین و ئەزموون کە بەسەر یەکەوە کۆکراونەتەوە لە لایەن پارتە سیاسیەکان و کۆمپانیاکان و کەنیسەکان و سوپاکان و دامەزراوە ڕۆشنبیریەکان لە ماوەی چەند دەیەیەک ئێستا دووچاری مەترسی لەناوچوون بوونە. وە هەرچەندە هێز زیاتر ناجێگیر بێت ژیانمان زیاتر دووچاری مەترسی و پاڵنەری ماوە کورت دەبێت، و وامان لێهاتووە کە توامان کەمتر بێتەوە لەسەر خشتەی چالاکیەکانمان و پلاندانان بۆ دوارۆژمان. وە ئەم کۆمەڵە مەترسیانە دەکرێت ببێتە هۆی دوورکەوتنەوە و لێکترازان. ماوەیەکی زۆرە دامەزراوە بەهێزەکان بەردەوامن لە ژیان لە نێوانمان، بەربەستە تەقلیدیەکانی هێزیش زۆر بەرزبوون بە جۆرێک مانای ژیانمان - و هەڵبژاردنەکانمان خۆمان دامانڕشتوە دەربارەی ئەوەی کە دەبێت بیکەین، وە دەربارەی ئەوەی کە دەبێت قبولی بکەین یان بەرەنگاری ببینەوە و قبولی نەکەین — لە چوارچێوەی هەڵسەنگاندنی و ئەنجامەکانی. وە ئەگەر زیاتر هەست بە دووریەکان و لێکترازانەکان بکەین، لەوانەیە نەمانی هێز لەناوبەربێت.

ئێمە زۆر پێویستیمان بە تێگەیشتن هەیە لە سروشتی ئەم لەناوچوونە و ئەنجامەکانی و بەرەنگاربوونەوەی. وە لەگەڵ ئەوەی ئەم مەترسیانەی کە ئاماژەی

# کۆتایی سەردەمی هێز

پێکرا ناگاتە ڕادەی ئاژاوەیەکی تەواو، بەڵام ڕوونە کە بە ڕاستی دەستی کردووە بە بەرهەڵستی کردنی تواناکانمان لە چارەسەرکردنی کێشە گەورەکان لەم سەردەمەماندا. جیهان دووچاری ڕکابەری ئاڵۆزی زیاتر دەبێتەوە؛ وە چارەسەرکردنی پێویستی بە لایەنی جۆراوجۆر و کاریگەری زۆرتر هەیە زیاتر لە جاران، لە گۆڕانی کەشوهەواوە تا بڵاوبوونەوەی ناوەکی، و قەیرانە داراییەکان، و کەمبوونەی داهاتەکان، و شوێنەوارەکان، و بەردەوامبوونی هەژاری " ملیار کەس وەک کەمترین ڕادە لە دانیشتوانی جیهان "، و تیرۆر، و قاچاخچێتی، وتاوانە سیبرانیەکان، و زۆری تریش. لەناوچوونی هێز شتێکە خۆشی بەرپادەکات بەگوێرەی ئەوەی کە ڕووبەڕێک فەراهام دەکات بۆ پڕۆژە نوێیەکان، بەڵام کاریگەریەکانی لەسەر سەقامگیری پڕە لە مەترسی، بۆیە چۆن دەتوانین بەردەوام بین لە پێشوازیکردن لە بەدیهێنانی فرە دەنگەکان، و بیروبۆچوونەکان، و دەستپێشخەریەکان و داهێنانەکان، بەبێ ئەوەی لەهەمان کاتدا خۆمان پاڵ نێین بۆ پەککەوتن کە بە خێرایی ئەم پێشکەوتنە پوچەڵ کاتەوە؟ تێگەیشتن لە لەناوچوونی هێز یەکەم هەنگاوە بەرەو دۆزینەوەی ڕێگاکەمان بۆ پێشەوە لە جیهانێک کە تازە لەدایک دەبێتەوە.

## بەشی دووەم

## تێگەیشتن لە هێز: چۆن کار دەکات؟ و چۆن پارێزگاری لێ دەکرێت

وادانێ کە دەنگی ئاگادارکەرەوەکەت لە کاتژمێر ٦:٤٥ لێیدا پێش کاتی خۆی بە نیو کاتژمێر، ئەمەش چونکە سەرۆکەکەت لە کار پێداگری کردووە کە ئامادەبیت لە کۆبونەوەیەک لەبەرچاوی تۆ هیچ گرینگ نیە. بەڵام بەخۆت دەڵێیت کە هەفتەی داهاتوو هەڵسەنگاندنی ساڵانە دەکرێت، و وە تۆش ناتەوێت مەترسی بکەت لە هەڵی پلە بەرزکردنەوە. وە لە ڕادیۆی ئاگادارکەرەوەکەت گوێت لە ڕێکلامی ئۆتۆمۆبێلی تۆیۆتا بریوسی نوێ دەبێت کە دەڵێت: " ئەمە باشترین چووستی هەیە لە سەرفکردنی سوتەمەنی لە هەر ئۆتۆمۆبێلێکی تر لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا". وە تۆش بێزاربووی لە پێدانی پارەیەکی زۆر بۆ پڕکردنی تانکی سوتەمەنی ئۆتۆمۆبێلەکەت هەموو هەفتەیەک. و دراوسێیە نزیکەکانیشت ئۆتۆمۆبێلی بریۆسیان هەیە، باشە بۆچی تۆش دانەیەکت نیە؟ بەڵام تۆ ئەو پارەیەت نیە بۆ پێدانی پێشەکی. وە لە میانەی خواردنی نانی بەیانی لەگەڵ کچەکەت، تێبینی ئەوەت کرد کە ئەو لەوێ دانیشتووەو هێدفۆنی لە گوێیەکانی داناوە، و پۆپ کۆڕن بە قاوە دەخوات، لەگەڵ ئەوەی تۆ پێش هەفتەیەک پێت گوتووە کە ڕێگەی پێ دەدەی گوێ لە مۆسیقا بگرێت بەو هێدفۆنانە ئەگەر گرانولا بخوات لە جیاتی پۆپ کۆڕنی بە قاوە. وە تۆ لەگەڵ هاوسەرەکەت دەمەقاڵێت کرد دەربارەی کێ لە ئێوە زووتر لە کارکردن دەردەچێت بۆ هێنانەوەی کچەکەتان لە قوتابخانە، وە تۆ دەمەقاڵێەکەت بردەوە. بەڵام هەستت بە تاوان کرد بۆیە ڕازی بووی لەسەر پیاسەکردن بە سەگەکە وەک لێخۆشبوونێکی پێکهاتنەوە لەلایەن تۆوە. وە تۆش چووی بۆ دەرەوە لەگەڵ سەگەکە، و کەش

## کۆتایی سەردەمی هێز

وەهەواش باراناوی بوو، و سەگەکە ڕەتی کردەوە بجوڵێت، و تۆش هیچ شتێکت بۆ نەدەکرا تا وای لێبکەیت بجوڵێت.

هەروەک چۆن زۆر لە بڕیارە گەورە و بچووک دەدەین کە ژیانی ڕۆژانەمان پێویستیەتی، وەک هاووڵاتیەک یان فەرمانبەرێک یان بەکارهێنەرێک یان وەبەرهێنەرێک یان ئەندامێکی خێزان، پێویستە لەسەرمان بەردەوام بازنەی سنوری هێزمان لەیاد بێت. و ئینجا ڕکابەریەکە چ بەدەستهێنانی مووچەی زیاتر بێت یان پلە بەرزکردنەوە یان هەڵسانمان بە کارێک بە ڕێگەیەکی دیاریکراو، یان پەستان خستنە سەر بەرپرسێکی بەربژێر بۆ ئەوەی دەنگ بدات لە بەرژەوەندی پڕۆژەیەکی یاسایی کە پشتگیری دەکەین، یان پلان دانان بۆ بەسەربردنی پشووییەک لەگەڵ هاوسەر، یان فێرکردنی چۆنیەتی نانخواردنی منداڵ بە ڕێگەیەکی ڕاست، ئێمە بەردەوام، بە ئاگایی یان بێ ئاگایی، قەبارەی هێزمان دەپێوین لەسەر زۆرلێکردنی ئەوانی تر بۆ هەڵسوکەوت کردن وەکو ئەوەی دەمانەوێت. ئێمە دڵتەنگ دەبین بە هێزی کەسانی تر و پاشماوە بێزارکەر و ماندووبووەکەی: چۆن سەرۆکەکەمان لە کار - یان حکومەت یان پۆلیس یان بانک یان دابینکەری مۆبایل و کێبلەکانی تەلەفزیۆن- وامان لێدەکات هەڵسوکەوتێک یان شتێکی دیاریکراو بکەین یان واز لە شتەکانی تر بێنین؟ بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەردەوام بەدوای هێز دەگەڕێین، بە چەند ڕێگایەک کە بڕێکی زۆر لە ئاگایی تێدایە، بەتەیابەت لە هەندێک حالەت.

وە لە هەندێک حالەتی تریش ئەزموونکردنی هێز دڕندانەو یەکلاکەرەوەیە بە پلەیەک کە پاشماوەکەی بۆ کاتێکی زۆر درێژە دەکێشێت، چونکە لەگەڵ ئەوەی صدام حسین و معمر قەزافی لە دونیا نەمان، بەڵام گومان لەوەدا نیە کە

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

قوربانیەکانیان هێشتا دەلەرزن کاتێک ناویان دێت، وە ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی هاوبەشە لە نێوان ڕزگاربووانی تاوانە دڕندانەکان پاش ئەوەی ئەو کەسانەی پێی هەڵسان پاش ماوەیەکی زۆر دەست بەسەر کران. وە لە پێشوو یان ئێستامان هەست بە بوونی هێز دەکەین، تەنانەت کاتێک بە نەرمی بەکار دێت یان تەنها دەخرێتەڕوو.

بەڵام ڕادەی بوونی هێزهەرچەند بێت بەوەی کە بەشێکە لە ژیانی ڕۆژانەمان یان لە ناو مێشکمان، کەچی ئەو نایەوێت لە ئێمە بگات. بەڵام لە کاتی ئەپەڕی تەنگانە، وەک مەترسی کەلەپچەکان یان پێبژاردنەکان یان کەمکردنەوەی پلە یان ناوزڕاندن یان لێدان یان سزاکانی تر، ئەوا ئێمە مەیلی هەستکردن بە هێز دەکەین بەوەی کە بەزۆر خراوتە سەرمان لە ڕووی ویژدانەوە نەوەک لە ڕووی هێزی جەستەیی. وە لەبەرئەوەی هێز، بە ووردی، لە ژیانی ڕۆژانەمان سەرەکیە، بۆیە بەدەگمەن ئەوەستین بۆ شیکردنەوەی؛ بۆ دیاریکردنی ئەوەی کە لە چی دەچێت و چۆن کار دەکات، و ئەو ڕادەیەی کە دەتوانێت پێی بگات و چی ئەیوەستێنێت لە ڕۆیشتن بۆ مەودایەکی دوورتر.

هۆکارێکی زۆر گونجاو هەیە بۆ ئەمە: زەحمەتە هێز قیاس بکرێت. لە ڕاستیدا، و بە دەربڕینێکی وورد، مەحاڵە بپێورێت. چونکە ناتوانیت پۆلینی بکەیت و بیژمێریت. تەنیا دەتوانیت ئامرازەکان و سەرچاوەکان و دیاردەکانی پۆلین بکەیت. کێ گەورەترین ڕادەی پارەی هەیە لە بانک؟ ئەو کۆمپانیایەی کە دەتوانێت کۆمپانیایەکی تر بکڕێت، یان گەورەترین بودجەی گشتی هەیە؟ ئەو سوپایە کامەیە کە گەورەترین ژمارەی هەیە لە سەربازو تانک و فڕۆکە جەنگیەکان؟ ئەو پارتە کامەیە کە زۆربەی دەنگەکانی بەدەست هێنا لە دوا

هەڵبژاردن، یان دەستی بەسەر زۆرترین کورسی دا گرتووە لە پەرلەمان؟ هەموو ئەم شتانە دەکرێت ئەژمار بکرێت و بنوسرێتەوە، بەڵام پێوەری هێزی پێ ناکرێت. ئەمانە تەنها ئامراز و ناوەندگیرێکن، و ناتوانرێت پشتیان پێ ببەسترێت وەکو پێوەرێک بۆ هێز. وە تەنانەت کاتێک دەپێورێن و بەیەکەوە کۆدەکرێنەوە، ئەوا تەواوی چیرۆکەکە باس ناکات دەربارەی ڕادەی هێزی کەسێک یان شتێک.

لەگەڵ ئەوەش، هێز لەگەڵ هەموو شتێکدا هەیە، لە نیزامی وولاتان بۆ بازارەکان و سیاسەت؛ بەمانای هەموو حالەتێک خەڵک یان ڕێکخراوەکان ڕکابەری تێدا دەکەن؛ یان کەسەکان تێیدا کارلێک دەکەن. وە لە هەر شوێنێک ڕکابەری ڕوودات دابەشبوونی هێزیش هەیە کە بەردەوام پەیوەندیەکی هەیە بە تاقیکردنەوەی مرۆڤ. وە ئەگەر گەڕان بەدوای هێز تاکە پاڵنەر نەبوو لە پشت ئەم تاقیکردنەوەیە، ئەوا بێگومان یەکێکە لە گرینگترین پاڵنەرەکان. ئینجا چۆن دەتوانین گفتوگۆیەکی بەسوود بکەین لەسەر هێز؟ ئەگەر بمانەوێت لە چۆنیەتی بەدەستهێنانی هێز بگەین یان چۆنیەتی بەکارهێنانی یان لەدەستدانی، ئەوا پێویستمان بە ڕێگایەک هەیە کە نادیار یان قورس یان سەرلێشێوێن نەبێت بۆ قسەکردن لەبارەی. بەڵام، بەداخەوە، زۆربەی گفتوگۆکان دەربارەی هێز لەڕاستیدا هەرگیز سەرکەوتوو نەبووە لە تێپەڕاندنی ئەم بەربەستانە.

## چۆن گفتوگۆ دەربارەی هێز دەکەین؟

ڕێگایەک هەیە بۆ قسەکردن لەبارەی هێز بە شێوەیەکی بەرهەمهێن. بەڵێ، قسە نیە لەسەر ئەوەی کە خودی هێز بەشێکی ماددیە، بەشێکی سایکۆلۆجیە، و بەشێکی هەستپێکراوە، و بەشێکیشی شتێکە کار لە خەیاڵەکان و بیروباوەڕەکانمان دەکات. وە قورسە هێز و بڕەکی دیاری بکرێت، بەڵام دەتوانرێت هەڵسەنگاندنی بۆ

بکرێت و سنورەکانی دیاری بکرێت بە سیفەتی ئەوەی کە دینامیکیە و ئەو شێوەیە دیاری دەکات کە لەسەریەتی.

بۆ نموونە، دیمەنی سەرۆک وولاتان و حکومەتەکان وەرگرە ئەوانەی کە کۆدەبنەوە لە لووتکەی کۆمەڵەی هەشت وولاتەکان، لێرە سەرۆکی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕاوێژکاری ئەڵمانیا و سەرۆکی فەرەنسا و سەرۆک وەزیرانی یابان و سەرۆک وەزیرانی ئیتالیا و ئەوانی تریش دەبینیت، هەریەک لەوان لە دەسەلاتە. ئەمانە لەم ڕووەوە هاوشێوەن، وە هەریەکەیان بڕێکی زۆر لە هێزی هەیە. بۆیە ئایا ئەم هێزە لە هەیبەتی پۆستەکە و مێژووەکەی و کەشە ئایینیەکەی کە لەگەڵی دێت سەرچاوە دەگرێت؟ یان لە بردنەوەیان لە هەڵبژاردنەکان؟ یان لە پێشڕەویکردنیان لە خزمەتی شارستانی و سوپا گەورەکان؟ یان لە تواناکانیان، بە نوکە قەلەمێک، لە ئاراستەکردنی خەرجکردنی ملیارەها دۆلار کە لە باجە سەپێنراوەکانی سەر کاری هاوولاتیان و بازرگانیەکانیان دەست کەوتووە؟ ڕوونە کە ئەمە تێکەڵەیە لە هەموو ئەو هۆکارانە و هی تریش. ئەم هێزە وەک توانا ڕوونە، بەڵام گرانە جیابکرێتەوە و بڕەکەی دیاری بکرێت.

لەگەڵ دانانی هەمان ئەم دیمەنە لەبەر چاوت، ئێستا خەیاڵی سنوری ئازادی هەڵسوکەوتکردن بکە کە هەریەک لەو سەرۆکانە هەیانە و هەروەها ئەو بەربەستانەی کە دووچاریان دەبنەوە لە بوارە جیاوازەکان. چی ڕووی دا لە میانەی خودی کۆبوونەوەی لووتکە؟ ئەی ئەو کێشانە چی بوون کە قسەی لەسەر کرا و ئەو ڕێککەتنانە چی بوون کە ئەنجامدرا؟ وە ویستی کێ لە هەموو ئەم حالەتانە بەسەرکەوت؟ ئایا سەرۆکی ئەمریکی، کە بەردەوام وا باس دەکرێت کە بەهێزترین پیاوی جیهانە، لە هەموو حالەتێک بردیەوە؟ وە ئەو هاوپەیمانیەتانە چی بوون کە

پێکهێنران؟ ئەی ئەو تەنازولانە چی بوون کە پێشکەش کران؟ وە کێ پێشکەشی کردن؟ پاشان بێنە پێش چاوت هەموو سەرکردەیەک لەوان بۆ وولاتەکەی گەڕاوە و گفتوگۆی لەبارەی کێشە ناوەخۆییەکان کرد: وەک کەمبوونەوەی بودجە، و بەربەرەکانی کرێکاران، و تاوان، و کۆچکردن، و ئابرڕوچوونەکانی گەندەڵی، و بڵاوبوونەوەی سەربازی، و هەر کێشەیەکی تر کە لەوانەیە ڕوویدات لە ناوچەیەکی دیاریکراو. هەندێک لەو سەرکردانە زۆریەنە بەهێزەکەی پەرلەمان بەڕێوەدەبەن؛ وە هەندێکیشیان پشت بە هاوپەیمانیە شلۆقەکان دەبەستن. وە هەندێکیشیان، لە ڕێگەی پۆست، چێژ لە فەرمانڕەوایییەکی فراوان دەبینن بەهۆی سەپاندن و جێبەجێکردنی فەرمانەکان؛ و هەندێکی تریان ئەمانەی نیە. وە هەندێکی تریشیان کەسایەتیەکی گەورەو زاڵبوو یان جەماوەری بەرزیان هەیە؛ وە هەندێکیش دەورەدراون بە ئابروچووەکان یان سیاسیە لاوازەکان. هێزە ڕاستیەکەیان — وەرگێڕانێکی زانستی بۆ هێزی پۆستەکەیان- پشت بە هەموو ئەو بارودۆخانە دەبەستێت، و لە کێشەیەک بۆ کێشەیەکی تر دەگۆڕێت.

تەنانەت ئەگەر نەمانتوانی قەبارەی هێز وەک بڕێک دیاری بکەین، بەڵام زۆر بە ڕوونی دەتوانین چۆنیەتی کارکردنی بزانین. لەبەرئەوەی هێز بە بەراورد کردن لەگەڵ کەسانی تر کاردەکات. چونکە هەرچەندە یاریزانەکان و مەترسیەکانمان بە شێوەیەکی ووردتر دیاری کرد هێزەکە ڕوونتر بەدەرئەکەوێت: هیچ شتێک بە شاراوەیی نەماوە، وە ئێستا دەتوانرێت ببینرێت بەوەی کە ناوەندگیرەکە بۆ کۆمەڵێک کردەوە و ئەگەرەکان بۆۆ داڕشتنی بارودۆخێکی و گۆڕانی، لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو و سنورێکی ڕاست.

ئەگەر تێبگەین کە هێز چۆن کار دەکات، دەتوانین تێبگەین کە چی وا دەکات بە باشی کار بکات، و پاشان خۆی بەهێز دەکات و زیاد دەکات، هەروەها

# کۆتایی سەردەمی هێز

ئەوەی کە شکستی پێدەهێنێت و پاشان پەرتەوازە دەبێت یان پاشەکشە دەکات یان تەنانەت ووندەبێت. وە ئەگەر ئێمە حاڵەتێکی دیاریکراو وەربگرین، هێزەکە تاچەند ئیفلیج یان سنورداركراوە؟ هەر یاریزانێک چ توانایەکی هەیە بۆ گۆڕینی دۆخەکە؟ لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەمیپێشبڕکێ یان ململانێ بەپێی ئەم داتا کردارییانە، دەتوانین دەست بکەین بە زانینی ئەوەی کە ڕووداوەکان بەرەو کوێ دەچن. کەڵەکەبوون و ئەزمونکردنی هێز لە ئێستادا بەرەو ئەو ئاراستانە دەڕۆن کە باس نەکراون. وەک لە لاپەڕەکانی خوارەوەدا دەیبینین

## هێز چۆن کار دەکات؟

لە بەشی یەکەمدا پێناسەیەکی پراکتیکی پێشکەش کرا: هێز توانای ئاراستەکردنە یان ڕێگرتنە لە کردارەکانی ئێستا یان داهاتوو کەلەلایەن گرووپەکان یان تاکەکانی ترەوە ئەنجام دەدرێت. وە ئەمە پێناسەیەکی ڕوونە، و باشتریش لەمە ئەوەیە کە خۆی لە توخمە ناوەندگیرەکان لادەدات، وەکو قەبارە و سەرچاوەکان و چەک و ژمارەی لایەنگرەکان. بەڵام پێویستی بە فراوانبوون و ووردەکاری هەیە؛ لەبەرئەوەی لە کۆتاییدا دەکرێت بە چەند شێوازێک کارەکانی ئەوانی تر ئاراستە بکرێن یان ڕێگریان لێبکرێت. لە لایەنی پراکتیکی، هێز لە ڕێگەی چوار شێوازەوە دەردەبڕێت؛

یەکەم، ماسولکەکان: یەکەم کەناڵی هێزە و دیارترین و باوترینە. ماسولکەکان — یان هەڕەشەی بەکارهێنانی - ئامرازێکی بێ وێنەن کە لە ڕێگەیانەوە لە هەندێک حاڵەتدا ئەزموونی هێزی پێ دەکرێت. ماسولکەکان دەتوانن لە شێوەی سوپایەکی زاڵ بن، یان هێزێکی پۆلیس بە کەلەپچەوە، یان قوتابیەکی گێچەڵچی

نە قوتابخانە، یان چەقۆیەک لە مل، یان جبەخانەی ناوەکی بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکان، یان توانای کەسێک لەسەر بوونە هۆکار بۆ مایەپوچبوونی کۆمپانیاکەت، یان دەرکردنت لە کارەکەت، یان لە کەنیسەکەت. هەروەها خۆی دەنوێنێت لە دەست بەسەر داگرتنی ڕاستەوخۆی خودی داهاتە زیندەکاریەکان کە دەکرێت ببەخشرێت یان ڕێگری لێ بکرێت ( پارە، نەوت، دەنگدەرەکان). بوونی ماسولکەکان هەمیشە شتێکی خراپ نیە؛ چونکە هەموومان شانازی بە هێزەکانی پۆلیس دەکەین ئەوانەی کە تاوانبارەکان دەستبەسەر دەکەن تەنانەت ئەگەر ئەمە پێویستی بە بەکارهێنانی ماسولکەکان کردن لە هەندێک حالەت. بەکارهێنانی یاسایی بۆ توندوتیژی مافێکە هاوولاتیان لە بەرامبەر پارێزگاری و سەقامگیری بە دەولەتی دەبەخشن، بەلام ئەگەر ماسولکەکان کاریان بۆ خزمەتی سەرکردە ستەمکارەکان کرد، دواجار پشت بە زۆرلێکردن و ناچاریکردن دەبەستن، تۆ گوێڕایەڵی دەبیت چونکە دەرەنجامەکانی گوێڕایەڵی نەکردن زۆر خەراپتر دەبێت لە دەرەنجامەکانی گوێڕایەڵی کردن.

دووەم، نەریت: بۆ کاثۆلیکەکان بەژداری قوداس دەکەن، جولەکەکانیش پابەندی تقوسەکانی ڕۆژی شەمە دەبن، و موسڵمانەکانیش ڕۆژانە پێنج نوێژ دەکەن؟ بۆچی چەندین کۆمەڵگا ڕوودەکەن بەسالاچووە ژیرەکان بۆ نێوەندگیری لە ناکۆکیەکان، وە بڕیارەکانیشیان بە دادپەروەرانە و دانایەنە وەردەگیرێت؟ چی وا لە خەڵک دەکات پەیڕەوەی " یاسای زێڕین" بکەن و خۆیان بەدوور بگرن لە ئازاردانی ئەوانی تر تەنانەت کاتێک هیچ یاسا یان سزایەک نیە ڕێگریان لێ بکات؟ وەلامەکان دەکرێت بدۆزرێنەوە لە ڕەوشت و داب و نەریتە ڕۆشەنبیریەکان و پێشبینیە کۆمەلایەتیەکان و بیروباوەڕە ئاینیەکان و ئەو بەهایانەی کە خەڵک نەوە دوای نەوە بۆی دەمێنێتەوە یان لە قوتابخانەکان منداڵەکانیان فێر دەکەن.

ئێمە لە جیهانێکی نەریتدا دەژین کە هەندێ جار پێوەی پابەندین، وە هەندێ جاریش لێی بەدوورین. ئێمە ڕێگە بە کەسانی تر دەدەین کە ڕێنمایی ڕەفتارەکانمان بکەن لە ڕێگای هێنانیان بۆ ئەم نەریتانە. نەریت، وەک کەناڵێکی هێز، زۆرداری بەکار ناهێنێت، بەڵکو هەست بە ئەرکی ئەخلاقیمان دەهەوژێنێت. ولعل المثال الأفضل هو "الوصایا العشر" التي من خلالها تخبرنا بوضوح قو علیا لا ریب فیها کیف نتصرف.

سێیەم، ڕێگای خستنەڕوو و پێشکەشکردن: زۆر گوێت لە هێزی ڕیکلام دەبێت، وە چاکەکە بۆ ئەو دەگێڕدرێتەوە کاتێک خەڵک لە ماکدۆناڵدەوە دەگۆڕن بۆ بێرگەر کینگ، یان کاتێک هۆندا فرۆشتنی بەرز دەبێتەوە، لە کاتێکدا فۆلکس واگن فرۆشتنی بەرەو خوارەوە دەڕوات. بە ملیارەها دۆلار خەرج دەکرێت بۆ وەبەرهێنان لە بەرنامەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و بیلبۆرد و وێبسایتەکان و گۆڤارەکان و یاریە ڤیدیۆییەکان و هەموو ڕێگایەکی تر بۆ ئەوەی وا لە خەڵک بکات کارێک ئەنجام بدەن کە ئەنجامیان نەدەدا، ئەویش کڕینی بەرهەمەکەیە. چۆنیەتی خستنە ڕوو پێویستی نە بە هێز هەیە و نە بە یاسایەکی بە ڕەوشت. پاڵمان پێوە دەنێت بۆ گۆڕینی بیرکردنەوە و پێشبینیەکانمان، وە باوەڕمان پێ دەکات کە کاڵایەک یان خزمەتگوزاریەک کە شایەنی هەڵبژاردنە زیاترە لە جێگرەوەکانی تر. ڕێگای پێشکەشکردن ئەوەیە کە بتوانیت ئەوانی تر قایل بکەیت بۆ بینینی بارودۆخەکە بەجۆرێک کە ئەوان دەبات بەرەو گەیشتن بە ئامانجی ئەو لایەنەی کە بەرژەوەندی تێدایە یان باوەڕیان پێدەکات. بریکارەکانی خانووبەرە کە هانی کڕیارەکان دەدەن لەسەر بەرزنرخاندنی سوودەکانی ژیان لە گەڕەکێکی دیاریکراودا، هێز یان فشاری ئەخلاقی بەکارناهێنن، یان پێکهاتەی دۆخەکە ناگۆڕن (بۆ نموونە بە دابەزاندنی نرخ). ئەوان هەڵسوکەوتی کڕیارەکان دەگۆڕن لە

ڕێگای گۆڕینی تێڕوانین و بینینیان بۆ بارودۆخەکە.

چوارەم، پاداشت: چەند جار گوێت لە کەسێک بووە دەڵێت: "من ئەوە ناکەم ئەگەر پارەشم پێ بدەیت"؟ بەڵام عادەتەن پێچەوانەکەی ڕاستە: خەڵک پاداشت قبوڵ دەکات بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە نەیاندەکرد. چونکە هەر کەسێک بتوانێت پاداشتی سەرنجڕاکێش پێشکەش بکات توانایەکی زۆری دەبێت لە بەدەستهێنانی ئەوانی تر بۆ ئەوەی بەو ڕێگایانە هەڵسوکەوت بکەن کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی یەکن. ڕەنگە باوترین بەکارهێنانی هێز لە شێوەی دابینکردنی نەوتی سووتەمەنی بۆ کۆریای باکوور بێت لە بەرامبەر ڕێگەدان بە پشکنینی کاراکتەرە ناوکیەکانی، یان زیادکردنی سەدان ملیۆن دۆلار بۆ بودجەی یارمەتی دەرەکی بۆ کڕینی پشتگیری لە دەوڵەتێکی تر، یان موزایەدەکردن لەسەر بانکدارێکی گەورە یان گۆرانیبێژێک یان پرۆفیسۆرێک یان پزیشکێک، یان ئاماژەدان بە سوودە داراییەکان بە ئامانجی ڕازیکردنی بۆ پەیڕەوکردنی ڕێڕەوێکی دیاریکراو.

الوسائلئەم چوار کەناڵە - ماسولکەکان و نەریت و ڕێگای پێشکەشکردن و پاداشت - ئەوانەن کە زانایانی کۆمەڵایەتی ناویان ناوە ئامرازە نموونەییەکان، ئەمانە ئامرازی ناوازەن لە لایەنی شیکاری، وە بەرجەستەکردنێکی قووڵە بۆ ئەو گروپەی کە هەوڵی نوێنەرایەتیان دەدات. بەڵام لە لایەنی کرداری - یان بە شێوەیەکی وردتر - لە ئەزموونکردنی هێز لە بارودۆخێکی دیاریکراودا - زیاتر مەیلی تێکەڵبوونی هەیە و بەدەگمەن بەتەواوی ڕوون دەردەکەوێت. بۆ نموونە، بیر لە هێزی ئایینن بکەوە کە لە ڕێگەی چەند کەناڵێکەوە کار دەکات. باوەڕ یان نەریتی ئەخلاقی - چ وەک دەقێکی ئایینی کۆن بپارێزرێت یان دواتر لەلایەن

## کۆتایی سەردەمی هێز

وتاربێژێک یان مامۆستایەکی ڕۆحییەوە بڵاوبێتەوە،- بەشێکی زۆری ئەو فاکتەرانەیە کە باوەڕی ڕێکخراو بە شوێنکەوتووانی پەیدا دەکات و هەروەها پابەندبوونیان بە کات و باوەڕ و ئامادەبوونیان لە بۆنە ئاینییەکان و پێدانی باجە دەییەکان، و کارەکانیان. بەڵام کاتێک کڵێسا و پەرستگا و مزگەوتەکان پێشبڕکێ دەکەن بۆ بردنەوەی ئەندامان، زۆرجار لەسەر بنەمای شێوازی خستنەڕوو و نمایشکردن، وەک لە پیشەسازی ڕیکلامدا، ئەو کارە دەکەن. لە ڕاستیدا، زۆرێک لە دامەزراوە ئاینییەکان هەڵمەتێکی پلان بۆ دانراو بەڕێوەدەبەن کە لەلایەن کۆمپانیا تایبەتەکانی ڕیکلامەوە بەڕێوەدەبرێت، هەروەها خەڵاتیش پێشکەش دەکەن، ئەمە تەنها پاداشتێکی ناماددی نیە کە تەنها بەڵێنی ڕزگاربوون بێت، بەڵکو سودە هەستپێکراو و ساتیەکانە، وەک دەستگەیشتن بە شوێنی دامەزراندن کە گرووپە ئاینییەکان بەڕێوەی دەبەن، یان چاودێری منداڵ، یان تەرخانکردنی شەوان بۆ سینگڵەکان، یان گەیشتن بە تۆڕێکی ئەندامان ئەوانەی لە پلەو پایەی زۆر گەورەدان. وە لە هەندێک کۆمەڵگادا، بەشداریکردنی ئایینی لە ڕێگەی ماسولکەوە خۆی سەپاندووە، بۆ نموونە، یاسای هەندێک وڵات بێنە بەرچاوت کە پێویستی بە شێوازی دیاریکراوی هەڵسوکەوت هەیە، و شێوازەکانی تر سزا دەدات، و درێژیی پۆشاک بۆ ئافرەتان یان ڕیش بۆ پیاوان دەسەپێنێت، یان دەرکردنی ئەو پزیشکانەی کە لەبارچوون ئەنجام دەدەن.

هەرچۆنێک بێت، هەریەک لەم چوار کەناڵە - ماسولکەکان، نەریتەکان، ڕێگەی پێشکەشکردنەکان و پاداشتەکان - بە شێوەیەکی جیاواز کار دەکەن. تێگەیشتن لەم جیاوازیانە سەرنجێکمان پێ دەدات لەو پێکهاتە وردەی هێز. پێناسەی من بۆ ئەم چوار کەناڵە پابەندە بەو چوارچێوە قەناعەت هێنەرەی کە بۆ یەکەم جار پێشکەشی کرا لە لایەن بیرمەندێکی ناوازەی باشوری ئەفریقا لە بواری کار و

بەڕێوەبردن، ئیان ماکمیلان، کە لە قوتابخانەی وارتۆنی بەڕێوەبەردنی بازرگانی لە زانکۆی پێنسلڤانیا کار دەکات (بڕوانە شێوەی ژمارە ۲.۱). مکمیلان لە کتێبی داڕشتنی ستراتیژی ساڵی ۱۹۷۸ی خۆیدا، هەوڵیدا قوتابیە بازرگانییەکان لە بارەی ئاڵۆزییەکانی دەسەڵات و دانوستانەوە پەروەردە بکات. ئاماژەی بەوەدا کە لەهەر کارلێککردنێکی هێزدا لایەنێک دۆخەکە بەجۆرێک دەستکاری دەکات کەکاریگەری لەسەر کردەوەکانی لایەنی تر بکات. بەڵام چەندین جۆر لە دەستکاریکردن بەردەستە بە پشتبەستن بە وەڵامی دوو پرسیار:

یەکەم، ئایا دەستکاریکردن پێکهاتەی دۆخەکە دەگۆڕێت، یان لە جیاتی ئەوە هەڵسەنگاندنی لایەنی دووەم دەگۆڕێت؟

دووەم، ئایا دەستکاریکردن پێشکەوتنێک بۆ لایەنی دووەم دابین دەکات، یان وا دەکات ئەنجامێک قبوڵ بکات کە لەجیاتی ئەوە چاکبوونەوەیەک نیشان نەدات؟

ڕۆڵی ڕێژمی ماسولکەکان (زۆرکردن)، نەریتەکان (پابەندبوون)، و ڕێگەی پێشکەشکردن (ڕازی کردن)، و پاداشت (هاندان)، وەڵامی ئەم دوو پرسیارە لە هەر حاڵەتێکی ڕاستەقینەی دیاریکراودا دیاری دەکات.

ڕێبازی پرۆفیسۆر ماکمیلان بە سێ سوودی گەورە دەناسرێتەوە، یەکەم، ڕاستەوخۆ دەچێت بۆ لایەنی پراکتیکی هێز - کاریگەری لەسەر دۆخی ژیانی ڕاستەقینە، بڕیارەکان و ڕەفتارەکان. پرۆفیسۆر ماکمیلان لە هەڵسەنگاندنی ئەو هێزەدا کوێر نابێت بە وێنەی سەرکردە وەستاوەکان لەسەر فەرشی سوور، کە هەیبەتی پۆستەکانیان نیشان دەدەن، لە جیاتی ئەوە مەکمیلان دەپرسێت: (ا) چ ئامرازێک هەیە بۆ هەر سەرکردەیەک- و بۆ دژبەرەکانی و هاوپەیمانەکانی- لە بەرامبەر ڕکابەریەکی تایبەتدا؟ ب) ئەگەرەکان چین و چ سنوورێک هەیە بۆ

گۆڕینی بارودۆخەکە؟

دووەم، لەبەر ئەوەی ڕێبازەکەی ستراتیژیە و وەک دینامیکێک تیشک دەخاتە سەر دەسەڵات، دەتوانرێت بە نزیکەیی لە هەموو بوارێکی تر جێبەجێ بکرێت، لە دەرەوەی جیۆپۆلەتیک، یان شیکاری سەربازی یان پێشبڕکێ لە نێوان کۆمپانیاکاندا. ماکمیلان چوارچێوەیەکی لە بوارە تایبەتەکانی خۆی داهێنا - بازرگانی و بەڕێوەبردن- و لەبەر ئەوە بۆ خوێندنی دینامیکی هێز لە ناو کۆمپانیاکاندا بەکاری دەهێنێت. بەڵام هیچ هۆکارێک نییە ڕێگریێت بۆ جێبەبێکردنی ڕێبازەکەی لە بوارەکانی تر، وە ئەمە ئەو کارەیە کە من لەم کتێبەدا دەیکەم.

سێیەم: ئەم ڕێبازە وامان لێدەکات جیاوازی بکەین لە نێوان چەمکەکان وەک هێز و ڕێگەگرتن و گەورەیی و هێز و دەسەڵات و دەستڕۆیی. بۆ نمونە، خەڵک عادەتەن هێزو دەستڕۆیشتن تێکەڵ بەیەک دەکەن. ئەمە ئەو شوێنەیە کە چوارچێوەی چەمکی ماکمیلان زۆر بەسوود دەبێت. چونکە هێز و دەستڕۆیشتن دەتوانێت هەڵسوکەوتی ئەوانی تر بگۆڕێت، یان بە شێوەیەکی دیاریکراوتر، وا لە کەسانی تر دەکەن کە کارێک بکەن یان واز لە ئەنجامدانی بێنن. بەڵام دەستڕۆیشت هەوڵی گۆڕینی بینینی بارودۆخەکە دەدات نەوەک خودی بارودۆخەکە. بۆیە چوارچێوەی ماکمیلان یارمەتی ئەو ڕوونکردنەوەیە دەدات کە دەستڕۆیشتن تەنیا بەشەکە لە هێز، بەو مانایەی کە هێز نەک هەر کردارێک دەگرێتەوە کە دۆخەکە دەگۆڕێت، بەڵکو ئەو کارانەش کە شێوازی بینینی دۆخەکە دەگۆڕن. دەستڕۆیشت جۆرێکە لە جۆرەکانی هێز، بەڵام ڕوونە کە هێز دەتوانێت بە مانای جیا لە دەستڕۆیشتن، پیادە بکرێت.

وە بۆ ڕوونکردنەوە: ستایشکردنی باشیەکانی گەڕەکێک لە گەڕەکەکانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

دانیشتوان بۆ گۆڕینی وێنەی کڕیار لە نرخی مامەڵەکە بەشێوەیەک کە ببێتە هۆی ئەنجامدانی مامەڵەکە جیاوازە لە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە بە دابەزاندنی نرخی خانووەکە. بریکاری خانووبەرە کە تێڕوانینی کڕیار دەگۆڕێت دەستڕۆیشتن و کاریگەری هەیە بۆ ئەو کارە، لەکاتێکدا خاوەنەکەی کە نرخەکەی بۆ فرۆشتنی خانووەکە دادەبەزێنێت توانای گۆڕینی پێکهاتەی مامەڵەکەی هەیە.

### بۆچی هێز دەگۆڕێت، یان بە جێگیری دەمێنێتەوە؟

بیر لە هێز بکەوە بە گوێرەی کاریگەری توانای یاریزانە جیاوازەکان لەسەر ئەنجامی سازڕکردنێک. چونکە هەر ڕکابەریەک یان ململانێیەک جا چ لە جەنگێک یان شەڕێک بێت بۆ بەدەستهێنانی پشکی بازار یان گفتوگۆی دیپلۆماسی، یان جەمسەرگیری باوەڕداران لە لایەن کەنیسە ڕکابەرەکان یان تەنانەت گفتوگۆیەک دەربارەی ئەوەی کێ دوای نانی نیوەڕۆ قاپ و قاجاخەکان دەشوات، پەیوەستە بە دابەشکردنی هێزەوە. ئەم دابەشکردنەش ڕەنگدانەوەی توانای لایەنە ڕکابەرەکانە بۆ پشتبەستن بە هەندێک پێکهاتەی ماسولکە،و نەریت، و ڕێگەی پێشکەشکردن و پاداشت بۆ ئەوەی ئەوانی تر بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکەن کە دەیەوێت. وە لە هەندێک حالەت دابەشکردنی هێز بۆ ماوەیەکی درێژ بە جێگیری دەمێنێتەوە. "هاوسەنگی هێز"ی کۆن لە سەدەی نۆزدەیەم لە ئەوروپا باشترین نموونەیە بۆ ئەمە، کیشوەرەکە خۆی لە شەڕێکی سەرتاسەری دوورخستەوە و سنووری دەوڵەت و ئیمپراتۆریەکان کەمێک گۆڕان یان تەنها بە ڕێککەوتن. وە ئەمەش هەمان دۆخ بوو لە لوتکەی جەنگی سارددا: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت، بە بەکارهێنانی ماسولکەیەکی زۆر و هەروەها پاداشتی زۆر، ناوچەی جیهانی زۆریان دامەزراند

کە خۆیان دەستڕۆیشتووبوون تێیدا و پارێزگاریشیان لێکرد، وە ئەم ناوچانە بە شێوەیەکی بەرچاو بە خۆڕاگری مانەوە، سەرەڕای ناکۆکی ناوخۆیی لێرە و لەوێ.

نموونەیەکی تر لەسەر دابەشکردنی هێزی جێگیر یان نەگۆڕاو، لانی کەم پێکهاتەی بازاڕەکانی کۆلا (کۆکا کۆلا و پێپسی کۆلا)، و سیستەمەکانی کارپێکردنی (کۆمپیوتەر و ماکینتۆش)، و فڕۆکەی گەشتیار بۆ ماوە دوورەکان (بۆینگ و ئێرباس)، لە هەریەکەی ئەم نموونانە دوو یاریزانی زاڵن و چەند یاریزانێکی لاوەکی هەیە. بەڵام هەرکاتێک لایەنێکی نوێ بتوانێت بە خێرایی توانا بەدەست بێنێت بۆ ئەوەی ماسولکەکان بە شێوەیەکی کاریگەرتر پرۆژە بکات، یان داب و نەریتە مۆراڵییەکان بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێشتر بەکاربخات، یان خەڵاتێکی زیاتر پێشکەش بکات، ئەوا هێزەکە دەگۆڕێت و دووبارە دیمەنەکە ڕێکدەخاتەوە، وە ڕەنگە بە شێوەیەکی ڕادیکاڵ. دواتر شتەکان سەرنج ڕاکێش دەبن، کاتێک دەرفەتەکان سەرهەڵ دەدەن، پیشەسازیەکان دەگۆڕێن، وسیستەمە سیاسیەکان قەڵب ئەبنەوە، و کلتورەکانیش دەگۆڕێن. لە ڕاستیدا، کاتێک گۆڕانکاری تەواو لە یەک کاتدا ڕوو دەدات، ژیانی ڕۆژانە بۆ هەموومان دەگۆڕێت. |

بەڵام چی وا لە دابەشکردنی هێز دەکات بگۆڕدرێت؟ ئەمە دەکرێت ڕوو بدات لەگەڵ دەرکەوتنی هاتوویەکی نوێی بەهرەمەند و داهێنەر، وەک ئەلێکساندەری گەورە یان ستیف جوبز، یان دەرکەوتنی داهێنانێک دیمەنەکە بگۆڕێت وەک سەرنشینەکان (زین)، یان چاپەمەنی، یان خولگە یەکخراوەکان یان یوتوب. وە ڕەنگکە بە سروشتی خۆی لە ڕێگەی جەنگەکانەوە ڕوودات. کارەساتی سروشتیش لەوانەیە ببێت هۆیەک لەمە؛ گەردەلولی کاترینا، بۆ نموونە، بووە هۆی تەختکردنی ئەنجومەنەکانی قوتابخانە ناوەخۆییەکان لە نیو ئۆرلیانز، کە جارێک

## کۆتایی سەردەمی هێز

بە هێز بوو لە کاتی پێشوو، وە بەرزبوونەوەی جولانەوەی قوتابخانە سەربەخۆکان. مرۆڤ نابێت ڕۆڵی بەختی پاک یان ڕێکەوت کەم بکاتەوە، چونکە لەوانەیە یەکێک لە خاوەن دەسەلاتەکان لە ڕابردوودا پلانێکی ستراتیژی یان هەڵەی تاکەکەسی ئەنجام دابێت کە ببێتە هۆی کەوتنەخوارەوەیەکی بەهێز. تایگەر وودس یان دەیڤد پێترایۆست لە بیر بێت. وە هەندێک جاریش نەخۆشی و پیری دابەشکردنی دەسەلات لە لوتکەی کۆمپانیا و حکومەت و سوپا یان وەرزش دەگۆڕێت.

لە لایەکی ترەوە، هەموو داهێنانێکی زیرەک کاریگەری نییە، وە هەموو کۆمپانیایەکی نوێ کە بە باشی بەڕێوە دەچێت و بەرهەمی ئارەزوومەندانەی و پلانی تەواوی هەیە ئەو دەرفەتەی پارەپێدان یان فرۆشتنە بەدەست ناهێنێت کە پێویستە بۆ ئەوەی جێگای پەنجەی لەسەر دیمەنەکە دابنێت. چونکە هەندێک لە کۆمپانیا یان دامەزراوە زەبەلاحەکان بە لاوازی بەرامبەر ڕکابەرەکانی نیشان دەدرێت، و هەندێکی تریش بەربەرستی دەکرێن وەک چۆن بەربەرستی مێش دەکرێت. وە ناشتوانرێت پێشبینی هەموو گۆڕانێک بکەیت لە هێزدا. ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت و هەڵگیرسانی بەهاری عەرەبی و پاشەکشێی ڕۆژنامە زەبەلاحەکانی وەک واشنتن پۆست و دەرکەوتنی لەناکاوی تویتەر وەک دابینکەری زانیاریەکان، هەموویان شایەتحاڵن بۆ ناجێگیربوونی ناسینی هەر گۆڕانێکی نزیک لەدەسەلاتدا.

### گرنگیی بەربەستەکانی دەسەلات

هەرچەندە پێشبینیکردنی گۆڕینە دیاریکراوەکان لە دەسەلاتدا درێژە ناخایێنێت و بێ سوودە، بەڵام تێگەیشتنی ئەو ڕەوتانەی کە هێز دابەش دەکەن یان

سروشتەکەی دەگۆڕن وانین. ئەوەی گرنگە تێگەیشتنە لە بەربەستەکانی هێز لە ناوچەیەکی دیاریکراودا. ئەو تەکنەلۆجیایە، یاسا، چەک، سامان یان سەرمایە بێهاوتایە چیە کە وا دەکات بەدەستهێنانی هێز قورس بێت بۆ خاوەن پۆست و پێگەکان؟ کاتێک ئەم بەربەستانە بەرزدەبنەوە و لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە، خاوەنی ئەم پێگە و پۆستانە لە شوێنەکانی خۆیان دەچەسپێن و کۆنترۆڵی خۆیان بەهێز دەکەن. وە کاتێک ئەم بەربەستانە دەکەون یان دادەڕمێن، یاریزانە نوێیەکان توانای پێشبڕکێ بەدەست دێنن و دەتوانن بەرەنگاری پێکهاتەی هێزی بەردەست ببن. هەرچەندە داخورانی بەربەستەکانی هێز تیژتر بێت، یاریزانە نوێکان نائاساییتر یان چاوەڕوان نەکراوتر دەبن و خێراتر بەرەو لوتکە سەردەکەون. ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بەربەستەکانی دەسەڵات دیاری بکات، ئەگەر لە هەڵکشاندا بێت یان لە کەمبوونەوەدا، مرۆڤ دەتوانێت بەشێکی زۆر لە نهێنییەکانی دەسەڵات چارەسەر بکات.

قۆرخکاریەکان و سیستەمە تاک حیزبیەکان و دیکتاتۆرییە سەربازیەکان و ئەو کۆمەڵگایانەی کە بە فەرمی پشتگیری لە ڕەگەزێکی دیاریکراو یان باوەڕێکی تایینی دەکەن، و بازاڕەکانی پڕ لە ڕیکلامە بەرهەمهێنەرە زاڵەکان، و کارتێلەکانی وەک ڕێکخراوی ئۆپیک و سیستەمە سیاسیەکانی وەک سیستەمی ئەمریکی کە دوو پارت تێیدا دەستی بەسەر هەڵبژاردنەکاندا گرتووە و پارتە بچووکەکان جێگای پێیان تێدا نیە، هەموویان ئەو حالەتانە دەنوێنن کە بەربەستەکانی هێز تێیاندا زۆر بەرزن، بەلایەنی کەم لەم کاتەی ئێستادا. هەرچۆنێک بێت، دەکرێت قەڵاکان بشکێنرێن، یان لەبەر ئەوەی کە بەرگریەکانیان وەک خۆیان بەهێز نین، یان لەبەر ئەوەی ئامادە نین بۆ جۆرە هێرشبەرە نوێیانە، یان لەو چوارچێوەیەدا، چونکە ئەو گەنجینەی کە دەیانپاراست لە بنچینەدا بەهای خۆیان لە دەست داوە. لەم جۆرە حاڵەتانەدا، ئێستا ڕێگاکانی بازرگانی ئەمانەی

تێپەڕاندووە، و چیتر گرینگی نامێنێت بۆ سوپا داگیرکارەکان.

بۆ نمونە، دامەزرێنەرانی گووگڵ بەنیاز نەبوون دەسەڵاتی نیو یۆرک تایمز یان هیچ کام لە کۆمپانیا میدیاییە بەهێزەکانی تر لاواز بکەن، بەڵام ئەمە ئەو شتە بوو کە ئەوان لە ڕاستیدا ئەنجامیان دا. ئەو چەکدارانەی کە بۆمبە چێنراوەکان بەکاردێنن لە ئەفغانستان، یان چەتەکانی چەتەی سۆماڵی کە بەلەمی داپۆشراو و چەکی کلاشینکۆف بەکار دێنن بۆ فڕاندنی کەشتییە گەورەکان لە کەنداوی عەدەن، هەمووی فێڵکردنە لەو بەربەستانەی کە زاڵبوونی سوپای پێشکەوتووی تەکنەلۆجیا و هێزی دەریایی مسۆگەر کردووە. ئەنجامەکەش گۆڕینێک نەبووە لە هێزی ئەم سوپا و هێزە دەریاییانەدا بەڕادەی ئەوەی کە تەحەدایەکە بۆ سروشتی ئەو هێزە.

بەربەستەکانی هێز دەتوانێت ئەو بارودۆخانە جیابکاتەوە کە کە لە ڕاستیدا هاوشێوە دەردەکەون، چونکە گرووپێکی بچووکی کۆمپانیاکان لەوانەیە بتوانن کۆنترۆڵی زۆربەی بازاڕەکان بکەن لە پیشەسازییەکی تایبەتدا، لەبەر هیچ هۆکارێک نیە تەنیا ئەوەی کە سەرچاوەی پێویست، یان بەرهەمێکی سەرنجڕاکێش، یان تەکنەلۆجیایەکی بێهاوتایان هەیە. لەوانەیە ئەم کۆمپانیایانە فشارێکی سەرکەوتوویان لە بەرژەوی خۆیان ئەزموون کردبێت یان پارە بە سیاسەتمەداران دراوە بۆ جێگیرکردنی یاساکان و ڕێساکان کە وادەکات قورس، یان مەحاڵ، بێت بۆ ڕکابەرەکانی تا بێنە ناو بازار. چونکە تەکنەلۆجیای خاوەنداری تۆمارکراو، و دەستگەیشتن بە سەرچاوەکان، و پاراستنی یاسادانان، و بوونی پەیوەندی لەگەڵ گەندەڵکارێک کە ئاگای لە ناوەڕکەکانی شتەکان لە ناوخۆ هەیە، چوار جۆری جیاوازی سوود نیشان دەدات. وە ئاشکرایە کە

گۆڕانکاریەکانی هێز کاتێک ڕوودەدات، کە کۆنترۆڵکردنی هەندێک لە سەرچاوە دەگمەنەکانە، گرنگیەکی زیاتری هەیە بۆ پێشبڕکێ لە بازاڕێکی دیاریکراودا، یان کاتێک جێگرەوە هەیە کە وادەکات ئەم سەرچاوە دەگمەنانە بەربەستێک نەبن بۆ ئەوانی تر، یان کاتێک تەکنەلۆژیاییەکی نوێ دێتە ئاراوە کە وادەکات بۆ زۆرێک لە ڕکابەرەکان چوونە ناو بازاڕ ئاسانتر بێت.

لە کاتێکدا ئەم گۆڕانانە بیرۆکەیەکی ناسراو لە جیهانی بازرگانیدا بەرجەستە دەکەن، لەگەڵ ئەوەش ئەم بیرۆکەیە زۆر لە سیاسەت و لە پێشبرکێی نێوان دەوڵەتە نەتەوەییەکان یان کەنیسەکان یان دامەزراوە خێرخوازیەکاندا جێبەجێ نەکراوە.

بۆ نموونە، ڕەچاوی هەر سیستمێکی پەرلەمانی بکەن کە ژمارەیەک لایەنی بچووک کورسییان تێدا بێت، و بەشداری لەپێکهێنانی هاوپەیمانێتییەکی فەرمانڕەوا بکات. ئایا کەمترین سنور هەیە، وەک لە ئەڵمانیا، کە پێویست بکات هەر لایەنێک ٥% ی کۆی دەنگدانی نەتەوەیی بەدەست بهێنێت بۆ ئەوەی مافی نوێنەرایەتی لە پەرلەماندا هەبێت؟ ئایا لە جیاتی ئەوە یاسایەک هەیە کە بە پێی ئەو یاسایە هەر لایەنێک پێویست بکات بە بەدەستهێنانی کەمترین ڕێژەی دەنگەکان لە چەند پارێزگایەکی جیاوازدا؟ یان با سەیری پێشبڕکێکە بکەین لە نێوان باشترین زانکۆکاندا، ئایا متمانەپێدان بە زانکۆ و کۆلێژەکان زەحمەتە، یان کۆمپانیا و کۆلێژەکانی خوێندنی باڵا چیتر گرینگی نادات بە متمانەپێدانی ئەکادیمیی ئەو کۆلێژانەی کە دەرچووەکانیان ڕادەکێشێت؟

لەوانەیە بەربەستەکانی هێز لە شێوەی یاساکان و ڕێساکان وابکات ئاسانتر یان گرانتر دووبارە دانرێتەوە یان بە دەوری بسوڕێیتەوە. وە لەوانەیە لە شێوەی تێچوون بن - بۆ سەرمایەی سەرەکی، یان داهاتەکان، یان کار یان بازاڕکردن - کە زیاد یان

کەم دەبێتەوە. وە لە وانەیە لە شێوەی دەستکەوتنی هەلی گەشەکردن، یان کڕیار، یان کرێکار، یان سەرچاوە ستوونەکان یان پەیڕەوە ئایینیەکان بێت. وردەکاریەکان بەپێی بوارەکە دەگۆڕێن. بەڵام وەک یاسایەکی گشتی، هەرچەند یاسادانانی زۆرتر و توندتر زیاتر دەبێت، نرخی بەرهەمهێنانەوەی ئەو سوودانەی کە لە لایەن هەڵگرانی پێگە و پۆستەکانی ئێستاوە چێژیان لێوەردەگیرێت بەرزتر دەبێت، وە هەتا سامانە سەرەکیەکان سنووردارتر یان دەگمەنتر بێت، ئەو بەربەستانەی کە ڕێگە لە یاریزانانی نوێ دەگرن لە بەدەستهێنانی شوێنی پێ بەرزتر دەبن، واز لە بەدەستهێنانی سودە بەردەوامەکان بۆ خۆیان بێنە.

### هێڵکاری یەکەم: ڕوونکردنەوەی هێزی بازاڕ

چەمکی بەربەستەکانی هێز کۆگا کراوە لە ئابووریدا، و بە تایبەتی، بیرۆکەی بەربەستەکان بۆ چوونە ناو بازاڕ - چەمکێکی شیکاریە کە لەلایەن ئابووریناسانەوە بەکاردێت بۆ تێگەیشتن لە دابەشکردنی کۆمپانیاکان لە پیشەسازیەکی دیاریکراو وە ڕەفتار و ئاسۆیەکانی - وە لە دابەشکردنی هێزیش بەکاری دەهێنن. وە هیچ کێشەیەک نییە لە فراوانکردنی چەمکەکە بەم شێوەیە: بیرۆکەی بەربەستەکان بۆ چوونە ناو بازاڕ لە ئابووریدا بەکاردێت بۆ ڕوونکردنەوەی جۆرێکی دیاریکراو لە هێز؛ هێزی بازاڕ. وە هەروەک دەزانین، دۆخی نموونەیی لە ئابووریدا ڕکابەریەکی تەواوە، چونکە لە ژێر ڕکابەریەکی تەواو کۆمپانیایەکی زۆر و جیاواز هەن کە کاڵایەکی تەواو بۆ ئاڵوگۆڕ پێشکەش دەکەن، و بەکارهێنەران دەیانەوێت هەموو ئەو بەرهەمانە بکڕن کە ئەم کۆمپانیایانە پێشکەشیان کردووە. هیچ تێچوونێک بۆ مامەڵەکان نیە - و تەنها تێچووی تێکردن نەبێت - وە هەموو کۆمپانیاکان بە ئازادی دەستیان دەگات بە هەمان زانیاری. ڕکابەری تەواو مانای ژینگەیەکی تەندروستە کە هیچ کۆمپانیایەک

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەتەنها ناتوانێت کاریگەری لەسەر نرخی کاڵاکان بکات لەو بازاڕەی کە تێیدا کاردەکات.

ڕاستیەکە زۆر جیاوازە، بێگومان، هەردوو کۆمپانیای ئێرباس و بۆینگ دەستیان گرتووە بەسەر بازاڕی فڕۆکەی زەبەلاح بۆ گەشتە درێژ خایەنەکان، و چەند کۆمپانیایەکی کەمی تریش هەن کە فڕۆکەی بچووک دروست دەکەن. بەڵام کۆمپانیای بێشومار هەیە کە کار دەکەن لە دروستکردنی تیشێرت یان گۆرەو. وە زۆر زەحمەتە فڕۆکە دروستکەرێکی نوێ بچێتە بازاڕەوە، بەڵام دەتوانیت کراس دروست بکەیت بە کۆکردنەوەی چەند بەرگدرووێک لە کارگەیەک بۆ ئەم مەبەستە. هەروەها بەرهەمهێنەرە بچووکەکانی تیشێرت دەتوانن بە ناوی گەورەوە پێشبڕکێ بکەن، یان بەلایەنی کەمەوە شوێنێک بدۆزنەوە کە چالاکییەکەیان گەشە بکات، کەچی دروستکەری فڕۆکە ڕووبەڕووی دەرفەتێکی کەمتر سەرنجڕاکێش دەبێتەوە.

ئەو پیشەسازیانەی کە پێکهاتەی جێگیری تەسکیان هەیە، کە خاوەن دەسەڵاتەکانی ئێستا زاڵن و پێشبڕکێکارانی نوێ تێدەکۆشن، توانای بازاڕێکی بەرچاویان پیشان داوە لە هێزی بازارکردن. بە دەربڕینێکی ڕوون، ئەمە مانای توانایە بۆ پشتگوێ خستنی پێشبڕکێ و قازانجکردنە لەگەڵ ئەوەشدا. کەچی لە بازاڕە ڕکابەریە تەواوەکان، ئەگەر کەسێک بە نرخێکی بەرزتر لە تێچووی پەراوێزی بفرۆشێت (نرخی بەرهەمهێنانی یەک یەکەی زیادە، کە وابڕیارە بۆ هەموو بەرهەمهێنەرانی ئەو پیشەسازیە یەکسان بێت، کەسی لێی ناکڕێت) چونکە هەموو پێشبڕکێکارەکانی تر نرخەکانیان لە ژێر نرخەکانی ئەودایە. هەرچەندە کۆمپانیایەک هێزی بازاڕکردنی زیاتر بێت، دەتوانێت نرخەکانی خۆی دیاری

بکات بەبێ ئەوەی نیگەران بێت لە ڕکابەرەکانی. وە هەرچەندە هێزی بازاری کردنی نێوان کۆمپانیاکان زایتر بێت ڕێزبەندی هەرەمەی نێوانیان جێگیرتر دەبێت. جیاوازی، لە بواری کۆمپانیا پێشبڕکێکارەکان، نێوان سێکتەرەکان، وەک ناگالێبوون و چاودێری تەندروستی - کە ڕیزبەندی هەندێک لە کۆمپانیاکانی وەک پرۆکتەر و گامبل، کۆلگەیت-پالمۆلیڤ و ئەوانی تریش لە کۆمپانیا سەرەکیەکان، لە چەند دەیەیەکدا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی نەدیوە - و پیشەسازی کۆمپیوتەرە کەسیەکان - کە پلەبەندی کۆمپانیاکانی بە بەردەوامی گۆڕاوە - زۆر پەیوەندی بە هێزی بازاڕەوە هەیە.

هێزی بازاڕ لە کۆتاییدا دوورخراوەیە، وە لە پاشان پێچەوانەی ڕکابەریە. بەڵام تەنانەت بۆ ئەو کۆمپانیایانەش کە پێشتر شوێنێکیان لە ناو ئەو قەڵایە هەبووە کە بە بەربەستەکانی چوونەژوورەوەی یاریزانی نوێ پارێزراوە، ئەوا چێژوەرگرتن لە ژیانێکی ئاسان یان تەنانەت توانای مانەوەش دوورە لە مسۆگەرکردن، چونکە ڕکابەرەکان لە گۆڕەپانەکەدا ڕەنگە هێزی بازاڕ بەدەست بهێنن، و هەڵدەگەڕێنەوە دژی ئەوانی تر و دەسەڵاتیان بەسەر بازار بەکار دێنن بۆ کڕینی کۆمپانیاکانیان یان پاڵیان پێوە دەنێن بۆ ماوەپوچبوون. پلاندان و دوورخستنەوە لە بابەتە باوەکانە لە نێوان ئەو کۆمپانیایانەی کە لە کەرتەکاندا کار دەکەن، یان ئەو دەوڵەتانەی کە ڕکابەری کراوە سەرکوت دەکات. بازرگانەکان حەزیان لە شکۆدارکردن و ستایشکردنی پێشبڕکێیە، بەڵام هەر بەڕێوەبەرێکی کۆمپانیایەکی دەسەڵاتدار زیاتر حەزی لە پاراستنی هێزی بازاری کۆمپانیاکەی دەبێت.

ئەم ڕەچاوکردنانە زۆرجار، بە شێوەیەکی بەرچاو، بۆ دینامیکی هێز لە نێوان پێشبڕکێکارەکان لە بوارەکانی تر جێبەجێ دەکرێت، بەمانای بۆ لایەنە چالاکەکان جگە لەو کۆمپانیایانەی کە هەوڵی گەورەکردنی قازانجەکان دەدات. دواتر ئەم کۆمەڵە بیرۆکەیە جێبەجێ دەکەین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی بەسەر هاوشانەکانی

# کۆتایی سەردەمی هێز

"هێزی بازاڕ" دێت لە ململانێی سەربازی و سیاسەتی حزبایەتی و چالاکییەکانی تردا.

## بەربەستەکانی چوونەژوورەوە: توخمێکی گرنگی هێزی بازاڕ

سەرچاوەکانی هێزی بازاڕ چین؟ لە جیهانی بازرگانیدا، هۆکارەکان چین بۆ ئەوەی هەندێک لە کۆمپانیاکان زاڵ بن و بۆ ماوەیەکی زۆر بێ ململانێ بمێننەوە؟ وە بۆچی هەندێک لە سێکتەرەکان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی قۆرخکاری یان پاوانخوازی دوولایەنە یان ژمارەیەکی کەم لە کۆمپانیاکان کە دەتوانن سیاسەتی نرخەکانیان یان ڕێگە ڕێکخەرەکان ڕێکبخەن، لە کاتێکدا هەندێک سێکتری تر بە کراوەیی دەمێننەوە بۆ ژمارەیەکی بێشوماری کۆمپانیا بچووکەکان کە بە توندی پێشبڕکێ دەکەن؟ بۆچی شێوەی کۆمپانیاکان لە هەندێک پیشەسازیدا بە درێژایی کات تا ڕادەیەک وەستاو دەبێت، کاتێک بە بەردەوامی لە هەندێک پیشەسازیتردا دەگۆڕێت؟

سەبارەت بە پسپۆڕانی ڕێکخەرانی پیشەسازی ئەوانەی کە هەوڵدەدەن تێبگەن چۆن کۆمپانیاکان توانیان سوودێکی زیاتر لە ڕکابەرەکانیان بەدەست بێنن، ئەوا ئەو هۆکارانەی کە وادەکات زەحمەت بێت بۆ هەر یاریزانێکی نوێ بچێتە ناو کەرتێکی تایبەت و بە سەرکەوتووی ڕکابەری بکات بە هۆکارە یەکلاکەرەوەکان دادەنرێت. بۆ مەبەستی ئێمە لێرە، ئەم هۆکارانە دەتوانن ئەوە ڕوون بکەنەوە کە چۆن هێز بەدەست دەهێنرێن، و چۆن پارێزگاری لێ دەکرێت، و چۆن لەدەست دەچێت، جا چ لە ناو بازار بێت یان لە شوێنەکانی تر بێت.

هەندێک لە بەربەستەکانی چوونە ژوورەوە لە بارودۆخ و حالەتەکانی پشت سروشتی ئەم جۆرە چوونە ژوورەوە سەرچاوەیان هەیە، ئەمان بارودۆخێکن بە

تایبەتمەندییە تەکنیکییەکانی پیشەسازییەوە بەستراونەتەوە، پیشەسازی ئەلەمنیۆم، بۆ نموونە، پێویستی بەو توێنەرەوە گەورانە هەیە کە بنیادنانیان تێچووی زۆرە و وزەیەکی زۆر بەکار دەهێنێت. ئەم مەرجانە لەوانەیە ڕەنگدانەوەی ئەو ڕادەیەش بێت کە پیشەسازی بە شوێنێکی جوگرافی دیاریکراوەوە بەستابێتەوە. بۆ نمونە، ئایا تۆ پێویستیت بە سەرچاوەی سروشتی هەیە کە تەنها لە چەند شوێنێکی کەمدا هەبێت؟ یان ئایا پێویستە بەرهەمەکە دروست بکرێت و پاکێج بکرێت لە نزیک ئەو ناوچەیەی کە تێیدا دەفرۆشرێت، وەک لە باری چیمەنتۆدا؟ یان بەستوو بکرێت وەک لە حالەتی ڕۆبیانی بەرهەمێنراو لە چین، یان گۆشتی بەرخ لە نیوزلەندا، یان سەوزە لە مەکسیکۆ کە بۆ هەموو جیهان دەنێردرێت؟ وە ئایا پێویستە شارەزایی تایبەتی مرۆڤ هەبێت، وەک دکتۆرا لە فیزیا یان زمانێکی بەرنامەڕێژی کۆمپیوتەری تایبەت؟ هەموو ئەم پرسیارانە ئاماژە بەو پێداویستیانە دەکەن کە بۆچی کردنەوەی چێشتخانەیەک یان کۆمپانیایەکی بڕینی گیایی یان کۆمپانیای پاککەرەوەی نوسینگەکان، بۆ نموونە، ئاسانترە لە چوونە ناو پیشەسازی پۆڵایین، کە مرۆڤ تەنها پێویستی بە سەرمایە و کەرەستەی گرانبەها و کارگەی گەورە و تێکردنی بەرهەمهێنانی گرانبەها نیە، بەڵکو لەوانەیە خەرجیە گەورەکانی گواستنەوەش بگرێتە ئەستۆ.

وە بەربەستی تر دروست دەکات بەرامبەر چوونەژوورەوە لە یاسا و مۆڵەت و مۆرکە بازرگانیەکان، نمونەکانیش لەسەر ئەمە هەریەک لە ئەندامێتی یەکێتی پارێزەران، و مۆڵەتی پزیشک بۆ ئەزمونکردنی پیشەی پزیشکی، و دابەشکردنی ناوچەکان، و سیستەمی تەندروستی، و مۆڵەتی فرۆشتنی مەی، و پشکنینی ئاسانکارییەکان و بەربەستەکانی تر دەگرێتەوە کە لەوانەیە ڕووبەڕووی هەر کەسێک ببێتەوە هەوڵی کردنەوەی چێشتخانە دەدات. ئەم بەربەستانە - چ لە

قەبارەی چالاکیەکەوە سەرچاوەیان گرتوە، یان لە ڕێگای گەیشتن بە داهاتەکان، یان لە ڕێگای گەیشتن بە تەکنەلۆجیا، یان لە ڕێگای پێویستیە یاساییەکان و ڕێکخستنەکان - بەربەستی پێکهاتەیین کە ڕووبەڕووی هەر کۆمپانیایەک دەبێتەوە کە بیەوێت ڕکابەری بکات لە بازاڕدا. تەنانەت بۆ ئەو کۆمپانیایانەش کە پێشتر لەو بازاڕەدا کار دەکەن، ئەم بەربەستانە زۆر زەحمەتە بگۆڕێن، هەرچەندە ئەو کۆمپانیایانەی کە گەورە و بەهێز بوونە زۆرجار دەتوانن کاریگەری لەسەر ژینگەی ڕێکخستنەکەیان بکەن.

جگە لەم بەربەستە پێکهاتەییانە کە زیاتر دەمێننەوە، بەربەستی ستراتیجی هەیە بۆ چوونە ژوورەوە، ئەوانەی ئێستا لە پۆستە و پێگەکانن بەربەستی ستراتیژی نوێ دروست دەکەن بۆ ڕێگەگرتن لە ڕکابەرە نوێیەکان لە دەرکەوتن، وە هەروەها ڕێگەگرتن لە ڕکابەرە کۆنەکان لە گەشەکردن. نموونەکان بریتین لە ڕێکەوتنی تایبەت بە بازاڕکردن (بۆ نموونە ڕێکەوتنی نێوان ئەی تی ئاند تی و ئەپڵ کاتێک ئایفۆن خرایە بازاڕەوە)، و گرێبەستە درێژ خایەنەکان ئەوانەی دابینکەرەکان بە فرۆشیارەکان دەبەستنەوە (بۆ نمونە، بەرهەمهێنەرانی نەوت و خاوەنی پاڵاوگەکان)، و ساختەکاری و جێگیرکردنی نرخ (بۆ نمونە هەوڵدانی قێزەونی ئارچر دانیالس میدلاند و کۆمپانیاکانی تر بۆ جێگیرکردنی نرخی زیادەخۆراکی ئاژەڵان لە ساڵانی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم)، و ئەو سیاستمەدارانەی کە ئەزموونی پەستان دەکەن بۆ بەدەستهێنانی سودە حکومیە تاکەکان (بۆ نمونە بەدەستهێنانی مۆڵەتێک بۆ کارپێکردنی کاسینۆ وەک چالاکیەکی تاکڕەوی لە هەرێمێکی تایبەت). هەروەه ڕیکلام کردن، و شاڵاوە تایبەتەکانی برەوپێدان، و ڕیکلامە نا نەریتیەکان بۆ بەرهەمەکان لە ڕێگای برەوپێدانیان لە بەرنامەکانی میدیاوە، و دابەزاندنی نرخەکان بۆ کڕیارە هەمیشەییەکان، و ئامرازەکانی بازاڕکردنی هاوشێوە کە چوونەژوورەوەی بازاڕ

قورس دەکات بۆ ئەوانەی کە خوازیارن پێشبڕکێ بکەن. لە ڕاستیدا، چوونە ژوورەوە قورسە، تەنانەت لەگەڵ سەرنجڕاکێشترین بەرهەم، کاتێک مرۆڤ پێویستی بە بودجەیەکی ڕیکلامی زۆر بەرز هەیە بۆ ئەوەی کڕیارە شاراوەکان ئاگادار بکاتەوە کە بەرهەمەکەی لە بازاڕدایە، و بودجەیەکی گەورەتر بۆ قایلکردنیان بۆ ئەوەی لە ڕاستیدا تاقی بکەنەوە.

## لە بەربەستەکانی چوونەژوورەوە بۆ بەربەستەکانی هێز

جێگای سەرسوڕمان نییە کە خواستێکی گەورەی ڕکابەری، وەک لە جیهانی بازرگانی و هەروەها لە بوارەکانی تریشدا، ئاراستە دەکرێت بەرەو دروستکردن یان شکاندنی بەربەستەکانی هێز، بە مانای کاریگەری لەسەر یارییەکە بە گۆڕینی یاسا و مەرجەکانی. ئەمە بەتایبەت لەجیهانی سیاسەتدا جێبەجێ دەبێت، کە زۆرجار حیزب و کاندیدەکان وزەیەکی زۆر خەرج دەکەن بۆ شەڕکردن لەسەر نەخشەکێشانی بازنەکانی هەڵبژاردنی تایبەت بە کۆنگرێس (ئەو ئەزموونە خراپەی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناسراوە بە ساختەکردنی هەڵبژاردنەکان بە مەبەستی دەست خستنی زۆرترین دەنگەکان )، یان دەربارەی لێکۆڵینەوە لەسەر یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەز لە پەرلەمان و لیستی کاندیدەکان، هەروەک لە ئەرجەنتین و بەنگلادیش ڕوویدا، کاتێک کۆمەڵێک لە کورسیەکانی پەرلەمان بۆ ئافرەتان دیاری کرا. وە لە هیندستان، ژمارەیەک کورسی لە پەرلەمان و ئەنجومەنە هەرێمییەکانی گروپی دالیت (ئەوەی کە ناسراو بوو بە ڕەوتی گۆشەگیرەکان ) پارێزراون، شەڕی سەختی سیاسی و یاسایی لەسەر فراوانبوونی ئەم تایبەتمەندییە بەرپابوو بۆ ئەوەی ئەوەش بگرێتەوە کە ناسراوە بە چینە دواکەوتووەکانی تر. لە زۆر وولاتاندا سەرکردە دەسەڵاتخوازەکان بەدوای دوورخستنەوەی ڕکابەرە سیاسییەکاندا بوون، لە هەمان کاتدا پارێزگاریکردن لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

ڕووکەشێکی دیمۆکراسی فێڵبازانە بە ئەنجامدانی هەموارکردنی یاسای هەڵبژاردن کە وادەکات ڕکابەرەکان لە بواری تەکنیکیەوە شایستەی ئەنجامدانی نەبن. هەروەها جەنگەکان لەسەر بەشداری کۆمپانیاکان بۆ سیاسەت، و پروپاگەندەی سیاسی، و مەرجەکانی ئاشکراکردن، و دەستگەیشتن بە ئاژانسەکانی میدیا، زۆرجار توندترە لە شەڕەکانی دەربارەی سیاسەتەکان. چونکە ئەو لایەنانەی کە جیاوازن لەسەر کێشە سەرەکیەکانی سیاسەت لەوانەیە هەموویان خۆیان بدۆزنەوە کە بەرگری لەو یاسایانە بکەن کە پشکی شێری کورسییان پێ دەبەخشێت. لەگەڵ ئەمەش، ئەوانەی هەڵبژاردن دەدۆڕێنن هەمیشە دەتوانن جارێکی تر بیبەنەوە، بەڵام یاسا نوێکان یاریەکە دەگۆڕن.

لە کۆتاییدا، بەربەستەکانی هێز ئەو بەربەستانەن کە ڕێگە لە یاریزانانی نوێ دەگرن ماسولکە و نەریت وڕێگەی خستنەڕوو و پێشکەشکردن و پاداشت یان هەر تێکەڵەیەک لەمانە بەکاربێنن، بۆ بەدەستهێنانی هێزی ڕکابەری، ئەمە ڕێگە بە کۆمپانیاکان، و پارتەکان، و سوپاکان، و کەنیسەکان، و پەیمانگاکان، و زانکۆکان، و ڕۆژنامەکان، و یەکێتیەکان ( یان هەر جۆرێکی تر لە ڕێکخراوەکان) کە لە ساتی ئێستادا دەستیان بەسەر هێزدا گرتووە پارێزگاری لە زاڵبوونەکیان بکەن.

دەیان ساڵە، تەنانەت سەدە، بەربەستەکانی هێز سوپا و کۆمپانیا و حکومەت و حیزب و دامەزراوە کۆمەڵایەتی و ڕۆشەنبیریەکانی پاراستووە. ئێستا ئەم بەربەستانە دەستیان بە ڕووخان کردووە، یان دادەخورێن یان تەرەزیان بردووە، یان خەریکە وا بێ سوود دەبن. وە بۆ ئەوەی تێبگەین ئەم گۆڕینە چەندە قووڵە و چۆن ناراستەی ڕێڕەوەی مێژوویی گۆڕیوە، پێویستە چاو بەو هۆکارانە و چۆنیەتانە بخشێنینەوە کە هێزیان لە بنچینەوە گەورەکرد. بەشی داهاتوو دەریدەخات کە چۆن بە هاتنی سەدەی بیستەم جیهان گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە هێز پێویستی بە قەبارە

هەیە - بە پێی دانایی ئاسایی -- وە چۆن هیچ ڕێگایەکی کاریگەرتر و بەردەوامتر نەبوو بۆ پیادەکردنی هێز باشتر لە پیادەکردنی لە ڕێگەی ڕێکخراوە گەورەکانەوە کە خاوەن بەڕێوەبردنی مەرکەزی و پلەبەندی هەرەمیە.

## بەشی سێیەم

## هێز چۆن گەورە بوو؟

### گریمان هیچ ناکۆکییەک لەبارەی سەرهەڵدانیەوە نییە

دەزانی کەی چیرۆکەکە دەستی پێکرد؟ ئایا لە ساڵی ١٦٤٨ دەستی پێکرد کە پەیمانی ئاشتی وێستفالیا لەگەڵ دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرن هات بۆ جێگرتنەوەی سیستەمی شار و میرنشینەکان کە لە سەردەمی دوای سەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵ بوو؟ ئایا لە ساڵی ١٧٤٥ دەستی پێکرد کاتێک ووتیان کە ئەرستۆکراتیەکی و کاربەدەستێکی بازرگانی فەرەنسی بە ناوی ڤینسنت دێ گۆرنای دەستەواژەی بیرۆکراسیان داناوە؟ یان لەوانەیە لە ساڵی ١٨٨٢ دەستی پێ کردووە کاتێک کۆمەڵێک کۆمپانیای نەوتی بچووک لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێکەڵ بوون بۆ ئەوەی ببێتە کۆمپانیای ستاندارد ئۆیلی زەبەلاح، لە نێوان گەورەبوونی پیشەسازیە نوێە قەبارە گەورەکان، وە گورزەیەک لە شەپۆلی یەکگرتنی نێوان کۆمپانیاکان پاش دە ساڵ لە کاتەی کە دەکرا کۆتایی بە گەشەی سەرمایەداری کۆمپانیا خێزانیە بچووکە ناوەخۆییەکان بهێنێت، و لە جێگای ئەوە سیستەمێکی نوێ جێگیربکات لەسەر بنەمای کۆمپانیا زەبەلاحەکان؟

هەرچۆنێک بێت، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ئەوە ڕوون بوو کە ئەم پێشکەوتنە سەرەکیانە هەمووی ڕەنگدانەوەی پێشکەوتن و زانست و داهێنانی مرۆڤن و خزمەت دەکەن بۆ چەسپاندنی کۆدەنگیی زاڵ لەسەر چۆنیەتی کەڵەکەبوونی هێز و پارێزگاری لێکردنی و پیادەکردنی. تا ناوەڕاستی سەدە، سیفاتی قەبارە گەورە سەرکەوت، تاکەکان، و خاوەن پیشەکان، و کۆمپانیا

خێزانیەکان یان دەوڵەت- شار، یان هەر گرووپێکی ڕەنگاوڕەنگ لە کەسانی هاوشێوە لە بیرکردنەوە چیتر نەیانتوانی پێگەی خۆیان بپارێزن و بەرگەی بەرژەوەندیە زاڵەکانی هەر ڕێکخراوێکی هەرەمی و مەرکەزی بەهێز بگرێت.

ئینجا چ دامەزراوەی ناوبراو "جەنەراڵ مۆتۆرس" بێت، یان کڵێسای کاسۆلیک یان سوپای سوور، لەبەرئەوەی پرسیاری کرداری ئەوە بوو: ڕێکخستن چۆن دەکرێت بە شێوەیەک وابکات کە زۆرترین هێز بەدەست بهێنرێت و پارێزگاری لێ بکات؟ وەڵامی ئاشکرای ئەم پرسیارە ئەوەیە: دەبێت قەبارەی گەورە بێت.

وە بۆ ئەوەی تێبگەین کە بیرۆکەی قەبارەی گەورە چۆن ڕەگی گرت، پێویستە بە هەندێک باکگراوندی مێژوویی خێراوە دەست پێ بکەین. بە تایبەتی، پێویستە هەندێک کات بەسەرببەین بۆ ناسینی جەنەڕاڵی ئەمریکی بۆ مێژووی بازرگانی، و باوکی ئەڵمانی بۆ زانستی کۆمەڵایەتی هاوچەرخ، و ئابووریناسی ئینگلیزی ئەوەی کە خەڵاتی نۆبڵی بەدەست هێنا بۆ ڕوون کردنەوەی بۆچی زۆر جار گەورەترین قەبارە لە بواری بازرگانی باشترینە. ئەم سێیانە بەیەکەوە کارەکانیان ئەوە دەردەخات کە چۆن ناساندنی بیرۆکراسییەتی مۆدێرن پراکتیزەیەکی کاریگەرە بۆ دەسەڵات و چۆن کۆمپانیا سەرکەوتووەکان لە جیهاندا و دامەزراوە خێرخوازیەکان و کڵێساکان و سوپاکان و پارتە سیاسییەکان و زانکۆکان ڕاهێنانی بیرۆکراتیکی هێزیان بەکار هێنا بۆ ئەوەی ڕکابەرکانی لەناو ببات و بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی بەدەست بێنێت.

مێژووناسان بنچینەی بیرۆکراسیی مۆدێرنیان لە سیستەمەکانی فەرمانڕەواییدا ناساندووە کە دەگەڕێتەوە بۆ چین و میسر و ڕۆمای کۆن، لە هەردوو بواری سەربازی و پەیڕەکردنە ئیداریەکاندا، ڕۆمەکان بە چڕی وەبەرهێنانیان لەو ڕێکخراوە ئاڵۆزە گەورەدا کردووە کە بە لایەنی مەرکەزیەوە بەڕێوەدەبرێت. وە پاش ئەمە بە کاتێکی زۆر، وە بۆ تێگەیشتن لە وانەکانی ڕۆشنگەری، ناپلیۆن

## کۆتایی سەردەمی هێز

بۆناپارت و ئەوانی تر لە ئەوروپا پابەند بوون بە سیستەمی بەڕێوەبردنی ناوەندی پیشەیی وەک شێوازی پێشکەوتنخوازی عەقلانی بۆ بەڕێوەبردنی هەر حکومەتێک. بە ئیلهامی ئەو مۆدێلە، و گونجان لەگەڵ دوو نموونەی ئەمریکی و ئەوروپی، یابان لە سەردەمی میجی بیرۆکراتیپرۆفیشناڵ دامەزرا، کە لە سەرووی هەموویانەوە، وەزارەتی پیشەسازی - کە لە ساڵی ١٨٧٠ دامەزرا- لەخۆگرتبوو، بۆ ئەوەی دووبارە کۆمەڵگاکەی ڕێکبخاتەوەو بگات بە ڕۆژئاواییەکان. لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا، ئەو دەوڵەتە نەتەوەییەی کە حکومەتێکی ناوەندی و خزمەتگوزاری شارستانی یەکگرتوو هەبوو نموونەی دەوڵەتێکی نموونەیی بوو لە جیهاندا، بە داگیرکەرانیشەوە. لە هیندستان، بۆ نموونە، بەریتانیەکان ئەو خزمەتە مەدەنییەیان دامەزراند کە لە دوای سەربەخۆیی بەردەوام بوو وەک خزمەتێکی بەڕێوەبردنی هیندی پایەبەرز کە چینە خوێندەوارەکان هیوایان نەخواست کاری تێدا بکەن. وە تاکە جیاکەرەوەی هاوبەشی نێوان وولاتان لە جیهان - چ سەرمایەداری یان سۆسیالیست، لەلایەن لایەنێکەوە بەڕێوەدەبرێت یان لەلایەن سیستمێکی دیموکراسی بەهێزەوە بەڕێوەدەبرێت- پابەندی ئیدارەیەکی گەورەی ناوەندی بوو، واتە پابەندبوونی بیرۆکراسی.

هەمان شت لە ژیانی ئابووریدا ڕوویدا، لە ئەنجامی تەوژمی تەکنەلۆجیا و داواکاریەکان بۆ بنیادنانی پیشەسازییە گەورەکان و دەرکردنی یاسادانانی نوێ، کۆمپانیا بچووکەکان ڕێگەیان خۆشکرد بۆ کۆمپانیا گەورە فرە یەکەکان کەە بە شێوەیەکی پلەبەندی بەڕێوەدەچن، وە ئەم جۆرە کۆمپانیایانە لە بوون نەبەەن پێش ساڵی ١٨٤٠ . لە ماوەی ئەو شتەی کە بیرمەندان پێی دەڵێن یەکەم جوڵانەوەی یەکگرتنەکانی کۆمپانیا سەرەکیەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا - کە دەیەیەکی تەواو بەردەوام بوو لە ساڵی ١٨٩٥ بۆ ساڵی ١٩٠٤ - بەلایەنی کەمەوە ١٨٠٠ کۆمپانیای بچووک لە شەپۆلی یەکگرتنەکان دیار نەمان. ناوی زۆرێک

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئە مارکە سەرەکیە ناسراوەکان مێژووی بەدەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە. جنەراڵ ئەلیکتریک لە ساڵی ١٨٩٢ لە ئەنجامی یەکگرتنێک دامەزرا، هەروەها کۆکا کۆلا لە هەمان ساڵدا، و کۆمپانیای پیپسی لە ساڵی ١٩٠٢. کۆمپانیای تەلەفۆن و تەلەگرافی ئەمریکی (کۆمپانیای پێشووی دایک ئەی تی ئاند تی)، لە ساڵی ١٨٨٥ دامەزراوە، و کۆمپانیان یستینگهاوس لە ساڵی ١٨٨٦، جەنەراڵ مۆتۆرس لە ساڵی ١٩٠٨، وە بەم شێوەیە. تا ساڵی ١٩٠٤، ٧٨ کۆمپانیا هەبوو کە زیاتر لە ٥٠%ی بەرهەمهێنانی پیشەسازی کۆنترۆڵ کردبوو لە بواری خۆیان و ٢٨ کۆمپانیا کۆنترۆڵی زیاتر لە ٨٠% کردبوو. نوسەری ئەمریکی هێنری ئادامز بە لێدوان لەسەر ئەو شۆڕشەی کە لەلایەن ئەم دامەزراوە نوێیانەوە نوێنەرایەتی دەکرێت گوتی" یەکێتی و دامەزراوە مۆنۆپۆلیستیەکان بەشێکی زۆری ئەو دەسەڵاتە نوێیە بوون کە لە ساڵی ١٨٤٠ەوە سەریهەڵداوە، کە ئەمانەش دامەزراوەی قێزەوەن بوون بە هۆی توانا بەهێزەکەی کە دوور لە پرنسیپ و ویژدان بوو. ئەمە شۆڕشێکی نیگەران و بێزارکەرە بۆ هەموو نەریت و بەها کۆنەکان، هەروەک چۆن بزماری کەشتیە هەڵمیەکانی زەریا دەبێت ماسیەکانی ڕەنجە بێزاربکات.

ئەم "شۆڕشە بەڕێوەبردنە"، وەک مێژوونووسێکی گەورە ئەلفرێد چاندلەر وەسفی کرد، لەوی کە ناوی نابوو "لانەی خۆڵەکەی" لە ئەمریکاوە بڵاوبۆوە بۆ هەموو جیهانی کاپیتالیستیش؛ لەبەرئەوە پیشەسازی ئەڵمانیا زاڵبوون بەسەریدا زیاترو زیاتر دەبوو لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانی وەک کۆمپانیای کارەبایی گشتی، بایر، باسف، سیمنس و کروپ - کە زۆرێک لەو کۆمپانیایانە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا دامەزران - کە خۆیان چوونە ناو یەکێتیە تاکرەو و فەرمی و نافەرمیە گەورەترەکان. پەیوەست بوون. لە یابان، بە هاوکاری حکومەت، کوتلە پیشەسازی و داراییەکانی (زایباتسۆ) فراوان بووەوە و چووە ناو

## کۆتایی سەردەمی هێز

پیشەسازییەکانی وەک چنین و پۆڵا و دروستکردنی کەشتی و هێڵی شەمەندەفەر. چاندلەر بە قەناعەتەوە گوتی کە بەکارهێنانی پلان بۆ داڕێژراوی وزەی هەڵم لە کەرتی بەرهەمهێنان لە ماوەی سەدەی نۆزدەیەم، و هەروەها گشتاندنی کارەبا، و داهێنانەکان لە بواری بەڕێوەبردندا، هەمووی بووە هۆی شۆڕشی پیشەسازی دووەم کە کۆمپانیایەکی زۆر گەورەتری لێکەوتەوە لەوەی کە لە کاتی شۆڕشی پیشەسازی پێشتر بەدەرکەوتن. ئەم کۆمپانیا پیشەسازییە نوێیانە سەرمایە و کرێکار و بەڕێوەبەرێکی زۆریان بە شێوەیەکی بەرچاو بەکارهێناوە. لە ئەنجامدا فراوانبوونی قەبارەی کۆمپانیا بووەتە مەرجێکی پێشەکی بۆ سەرکەوتنی، و قەبارەی گەورەش بوو بە مانای هێزی کۆمپانیا. چاندلەر لەکتێبە بلیمەتەکەیدا " دەستی بینراو" گوتی دەستی بەڕێوەبەرە بەرچاوە بەهێزەکان وەک بزوێنەرێکی سەرەکی بازرگانی مۆدێرن دەستی هێزەکانی بازاڕی شاراوەیان گۆڕیوە. چونکە هێز و بڕیارەکانی ئەو بەڕێوەبەرە پرۆفیشناڵانە، کە کۆمپانیا زەبەلاحەکان، یان بەشە گەورەکانی ناو کۆمپانیاکان، بەڕێوەدەبەن چالاکی ئابووری و ئەنجامەکانیان داڕشتووە بەو ڕادەیەی کە سنوری ئاڵوگۆڕی بازرگانیەکان دیاری دەکەن، ئەگەر زیاتریش نەبێت.

سەرهەڵدان و زاڵبوونی ئەم کۆمپانیا پیشەسازییە گەورانە وای لە چاندلەر کرد کە سێ مۆدێلی جیاوازی سەرمایەداری دیاری بکات، کە هەریەکەیان پەیوەست بوون بە یەکێک لە سێ قەڵا سەرەکیەکانی سەرمایەداری لە ماوەی ئەم شۆڕشە پیشەسازییە دووەمە: (١) "سەرمایەداری تاکەکەسی" کە لە بەریتانیای گەورە سەری هەڵدا، (٢) "سەرمایەداری ڕکابەری" ( یان بەڕێوەبردنی بەناوبانگ لە ویلایەتەی یەکگرتووەکانی ئەمریکا). (٣) " سەرمایەداری هاوکاری" لە ئەڵمانیا. بەبۆچوونی چاندلەر، تەنانەت کۆمپانیا گەورە سەرکەوتووەکانی پیشەسازیش لە بەریتانیا بە سروشتی خێزانیی ئەو خانەوادە زاڵە سەرمایەدارانە

قەتیس کرابوون کەخاوەنی بوون و بەڕێوەیان دەبردن، چونکە ئەوان ئەو هاندەرو بەخشندەیی و ئاواتەیان تێدا نەبوو کە هاوتا ئەمریکییەکان تێیاندابوو. لە بەرامبەردا، جیاکردنەوەی خاوەنداری و بەڕێوەبردن، کە چاندلەر پێی دەوت "کاپیتالیزمی بەڕێوەبردن"، وای لە کۆمپانیاکانی ئەمریکا کرد فۆرمی نوێی ڕێکخستن بگرنە بەر- بەتایبەتی پێکهاتە فرە بەشەکان - زۆر زیاتر سەرکەوتوو لە کۆکردنەوەی و تەرخانکردنی سەرمایە، و ڕاکێشانی بەهرەکان، و داهێنانەکان و وەبەرهێنان لە بەرهەم هێنان و بازارکردن. سیستەمی پێکهاتەی فرە-بەش، کە پێویستی بە بوونی یەکێتیەک هەیە لە نێوان بەرهەمە نیمچە خۆبەڕێوەبەرەکان یان گرووپە جوگرافییەکان لەناو ئۆفیسێکی ناوەندیدا، ڕێگەی بە کارامەیی زیاتر داوە نە ئەنجامدانی کردارە گەورەکان، وە جۆرە کۆمپانیایەکی دروست کرد کە خێراتر گەشەیان دەکرد. لە لایەکی ترەوە مەیلی کۆمپانیا ئەڵمانییەکان بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ سەندیکاکانی کرێکاران بووە هۆی سیستەمێک کە چەندلەری ناوی نابوو "کاپیتالیزمی هەرەوەزی"، کە لە کۆتاییدا بە "هاوکاری لە نێوان کرێکاران و بەڕێوەبردن لە دروستکردنی سیاسەتدا" ناسرا. کۆمپانیا ئەڵمانییەکان هەوڵیاندا کە بەشداری زیاتر بکەن بە خاوەن بەرژەوەندیەکان لە پێکهاتەی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکان لەو کەسانەی کە خاوەن پشک نەبوون یان بەڕێوەبەرە گەورەکان.

هەرچەندە ئەم سێ سیستەمە لە زۆر ڕووەوە جیاوازن، بەڵام یەک ڕووی نیمچە دیاریان هەبوو: لە هەر یەکێکیاندا، هێز لە دەستی کۆمپانیا قەبارە گەورەکاندا بوو. وە قەبارەی گەورەش بووە هۆی بەدەستهێنانی هێز، و پێچەوانەکەشی ڕاستە.

وە جا چ پێی بڵێین بازرگانی گەورە، یان حکومەتی گەورە، یان کاری گەورە، ئەوا ئەم سەرکەوتنەی دامەزراوە قەبارەی گەورەکان بەدەستیان هێنا، کە

بەڕێوەبردنێکی ناوەندیان هەبوو، ئەو گریمانە باوانەیان پشت ڕاستکردەوە و زیادیان کرد کە قەبارەی گەورە باشترینە و بەدەستهێنانی هێز لە هەر بوارێکی پەیوەندیداردا کارێکی گونجاوتر بوو بۆ جۆرێکی دیاریکراوی دامەزراوەی مۆدێرن کە چوستیان زیاتر دەبێت کاتێک زەبەلاح و خاوەن بەڕێوەبردنی ناوەندین. وە ئەگەر ئەم بیرۆکەیە ناسراو بوو بێت بە هێز و متمانە، ئەوا هۆکاری سەرەکیەکەی ئەوەبوو کە پشتگیری بیری باوەڕپێکراوی لە ئابووری و کۆمەڵناسی و زانستە سیاسییەکاندا دۆزییەوە. هەموو ئەم پشتگیریانە بە شێوەیەکی سەرەکی لەو کارە داهێنەرانە سەرچاوەیان گرتووە کە لە لایەن کۆمەڵناسی دیار ماکس وێبەرەوە نووسراوە.

ماکس فیبەر یان بۆچی فاکتەری قەبارە مانای هەیە؟

ماکس فیبەر زیاتر لە کۆمەڵناسێکی ئەڵمانی بوو، یەکێک بوو لە بیرمەندە دیارەکانی سەردەمی خۆی، زانایەکی سەرسوڕهێنەر بوو لە بواری ئابووری و مێژوو و ئایین و کلتور و زیاتر لەمانەش. سەبارەت بە مێژووی ئابووری و یاسایی ڕۆژئاوا نووسیویەتی، توێژینەوەی زۆری لەسەر ئایینە هیندی و چینی و جوولەکە و بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکان، و ژیانی شار نووسیووە و لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٩٢٢، دوو ساڵ دوای مردنی، کتێبێکی گەورەی بەناوی " ئابوری و کۆمەڵگە" بڵاوکرایەوە. وەک ئەوە کە ئالان وۆڵف زانای سیاسی و کۆمەڵناسی گوتی، ماکس فیبەریش "بیرمەندی پێشەنگ بوو لەسەر کێشەکانی دەسەڵات و هێزی سەدەی بیستەم" و ئێمەش لێرە پشتی پێ دەبەستین. لە ڕاستیدا، پشت بەستن بە باکس فیبەر و بیردۆزەکانی دەربارەی بیرۆکراتیبە شتێکی زۆر گرنگ و یەکلاکەرەوە دادەنرێت بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتی بەکارهێنانی هێزی ڕاستەقینە.

ماکس فیبەر لە ساڵی ١٨٦٤ لە ئەڵمانیا لە دایک بووە، وە لە تەمەنی پێگەیشتنی بوو کاتێک ئەڵمانی لە کۆمەڵێک میرنشینە هەرێمیەکان دروست

بوو، لەلایەن ڕاوێژکاری پروسی ئۆتۆ ڤۆن بیسمارک و بوو بە دەوڵەتێکی پیشەسازی هاوچەرخ. هەرچەندە ماکس وێبەر بیرمەند بوو، بەڵام لە چەند ڕۆڵێکدا بەشداری ئەم نوێکردنەوەیەی کرد نەک تەنیا وەک کەسێکی ئەکادیمی، بەڵکو وەک ڕاوێژکاری بۆرسەی بەرلین و ڕاوێژکاری گروپە چاکسازییە سیاسییەکان و ئەفسەرێکی یەدەگ لە سوپای قەیسەر. بۆ یەکەم جار سەرنجی ڕای گشتی ڕاکێشا بەهۆی لێکۆڵینەوەیە سەرنج ڕاکێشەکەی لەسەر نەهامەتی کرێکارانی کشتوکاڵی ئەڵمانی کە ئاوارە کۆچبەرە پۆڵەندیەکان بەلاوەیان نابوون، کاتێک لەو توێژینەوەیەدا گوتی دەبێت خانووبەرەی گەورەی ئەڵمانی دابەش بکرێت بۆ چەند پارچەیەک کە بتوانرێت بدرێتە کرێکارەکان وەک هاندانێک بۆ مانەوەیان لە ناوچەکە. دوای ئەوەی لە زانکۆی فرایبێرگ کارێکی وەرگرت، جارێکی تر گەڕایەوە سەردووبارەکرنەوەی مشتومڕ بە پێشکەشکردنی چەند پێشنیارێک کە داوای لە ئەڵمانیا کرد پەیڕەوی ڕێبازی "ئیمپریالیزمی لیبرالی" بکات بۆ بنیاتنانی پێکهاتە سیاسی و دامەزراوەییە پێویستەکان بۆ دەوڵەتی مۆدێرن.

وە لە ساڵی ١٨٩٨، ماکس ویبەر تووشی دارمانی دەمارگیری بوو لە دوای دەمەقاڵێەکی خێزانی گەرم کە مردنی باوکی بەدواوە هات، وە جۆرێک لە شەکەتبوونی دەماریی پێوە دیاربوو کە لە زۆرجاران توانای وانە ووتنەوەی نەبوو. وە لە ماوەی چاکبوونەوەی لەم نەخۆشیە، لە ساڵی ١٩٠٣ بانگهێشت کرا لە لایەن هوگو منستربیرگ، مامۆستای زانستی دەروونی پراکتیکی لە زانکۆی هارڤارد، بۆ بەژداریکردن لە کۆبونەوەی زانا نێودەوڵەتیەکان لە سانت لویس لە ویلایەتی میزوری. فیبەر ئەو بانگهێشەی پەسەند کرد، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پێکهاتە ئابووری و سیاسییەکانی فریوی دابوو کە بە ڕادەیەک بە دواکەوتووی دەزانی، و بە دەرفەتێک بۆ چوونە ناو قووڵایی مەزهەبی پوریتانی (و پاش ماوەیەکی کورت لە کتێبەکەی " ڕەوشتی بروتستانتی و گیانی

سەرمایەداری" بەدەرکەوت)، وە هەروەها پاڵنەری پاداشتێکی گەورەش. وەک مێژوونوسی ئەڵمانی وۆلفگانگ مۆمسین دواتر ووتی، " گەشتەکە سەلماندی کە زۆر گرنگ بوو بۆ بیرۆکە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکەی".

لە کاتی سەردانەکەی ویبەر بۆ ئەمریکا لە ساڵی ١٩٠٤دا، بانگهێشتی فراوان کرد بۆ ئەوەی وانەیەکی پێشکەش بە گەشتێکی گەورە بکات بۆ کۆکردنەوەی داتا و تێبینی لە زۆربەی بەشەکانی ئەو وڵاتە. زیاتر لە ١٨٠ کاتژمێری بەسەر برد لەسەر شەمەندەفەرەکان لەماوەی نزیکەی سێ مانگدا، کاتێک سەردانی نیویۆرک، سانت لویس، شیکاگۆ، مەککۆی، ئۆکلاهۆما (بۆ بینینی هیندییەکان)، و ماونت ئیری لە ویلایەتی باکوری کارۆلینا (کە کەسوکاری هەبوو لەوێ) و چەندین شوێنی تر (وەک چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ ویلیام جەیمس لە کامبریج، لە ویلایەتی ماساتچوستس). فیبەر لە دەوڵەتێکی مۆدێرنەوە هاتبوو بۆ دەوڵەتێکی مۆدێرنتر. لە ڕاستیدا وەک فیبەر بینی، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نوێنەرایەتی "دوایین جار لە مێژووی دوورودرێژی مرۆڤایەتیدا کرد کە مەرجەکانی تێدا بەردەست بوو بۆ پێشکەوتنی ئازادی گەورە"، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرمایەداریترین کۆمەڵگا بوو کە فیبەر بینیبووی، و زانی کە ئەم کۆمەڵگایە مزگێنیەکی خەرە لە دوارۆژ. ئاسمان شکێنەکانی نیویۆرک و شیکاگۆ لە "قەڵاکانی سەرمایەداری" دەچوون، ئەو سەرسام بوو بە دیمەنەکانی پردی بروکلین، شەمەندەفەرەکان، ترام و بەرزکەرەوەکان لە هەردوو شارەکە.

لەگەڵ ئەوەش فیبەر ئەوەشی دۆزیەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کە شایەنی نیگەرانی بوو ، چونکە بارودۆخەکانی کارکردن توشی سەرسورمانی کرد و نەبوونی سەلامەتی لە شوێنی کارکردن و گەندەڵی بەربڵاو لە نێوان بەرپرسانی شارەکان و سەرکردە باڵاکان و ناتەواویی توانای فەرمانبەران بۆ ڕێکخستنی ئەم

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

هەموو ئاژاوەیە و بەردەوامبوون لەگەڵ ئابوری دینامیکی. لە شیکاگۆ، کە بە یەکێک لە سەیرترین شارەکانی وەسفی دەکرد، بە نێو مەڕومالاّت و خانووبەرە و شەقامەکاندیدا ئەسوڕایەوە لە کاتی کارکردن و یاریکردنیان سەیری دانیشتوانی دەکرد، پلەبەندی ڕەگەزییەکەی تۆماردەکرد (ئەڵمانییەکانی ساقی بوون، ئیتالییەکان هەڵکەندەکان بوون، کەنالەکان و بانکەکانی ئاو، سیاسەتمەدارەکان ئیرلەندی)، و چاودێرێک بوو بۆ نەریتە ناوەخۆییەکان. ئەو تێبینی کرد کە شارەکە وەک مرۆڤێکە کە پێستی لابراوە و ڕیخۆڵەکانی بەدەرکەوتوون لەکاتی کارکردنی. پاشان ئاماژەی بەوەدا کە چەرخی گەشەکردنی سەرمایەداری بە خێرایی دەجوڵێتەوە و هەموو شتێک " دژی کلتوری سەرمایەداری زۆر بەهێزی پێی ئەکەوێ کە نەتوانرێت ڕێگری لێ بکرێت".

ئەوەی فیبەر لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بینی بیرۆکەکانی لە بارەی ڕێکخراو و هێز و دەسەلاّت دووپات کردەوە و بەهێزتری کرد، و لەوێوە بەردەوام دەبێت بۆ دروستکردنی کارێکی گەورە کە پێگەی " بنیاتنەری زانستی کۆمەلاّیەتی هاوچەرخ"ی بۆ دەستەبەر دەکات. بیردۆزی دەسەلاّتی فیبەر کە لە کتێبی ئابووری و کۆمەڵگەکەیدا باسی کردووە، بە هێز دەستی پێکرد، ئەو بنەمایەی کە پاساوی بۆ هێنایەوە و ئەزموونکردنی زاڵبوون دەکرد. وە بە پشت بەستن بە بنەمای زانینی ئینسایکلۆپیدیای خۆی دەربارەی مێژووی جیهان، گوتی بەشێکی زۆری دەسەلاّت لە ڕابردوودا "نەریتی" بووە، واتە خاوەنەکانی میراتییان گرتووە و دواکەوتیەکانیان قبوڵیان کردووە. سەرچاوەی دووەمی دەسەلاّتیش "کاریزما" بوو، کە شوێنکەوتوان پێیان وابوو کەسی سەرکردە بەهرەیەکی تایبەتی هەیە. بەلاّم شێوازی سێیەمی دەسەلاّت - کە گونجاوە لەگەڵ سەردەمی مۆدێرندا - دەسەلاّتی "بیرۆکراسی" و "عەقلاّنی" ە کە لە یاساکاندا ڕەگی گرتووە و لەلایەن پێکهاتەیەکی ئیدارییەوە کۆنترۆڵ دەکرێت کە توانای سەپاندنی یاسا و ڕێسای

ڕوون و سەختی هەیە. فیبەر نوسیویەتی کە ئەم دەسەڵاتە لەسەر بنەمای "بڕواکردن بە ڕەوایەتی یاسادانانی یاسایی و لێهاتوویی پیشەیی لەسەر بنەمای ئەو یاسایانەی کە بە شێوەیەکی عەقڵانی پەرەیان پێ دراوە" بنیادنراوە.

بەم شێوەیە فیبەر لەو باوەڕەدا بوو کە کلیلی هەبوونی دەسەڵات لە کۆمەڵگای مۆدێرندا ڕێکخراوی بیرۆکراتییە. چونکە بۆ فیبەر، بیرۆکراتی زۆر دوور بوو لەو مانا پیسەی کە گەیشتۆتە ئەمڕۆ. بەوەی کە باشترین شێوەی ڕێکخراوەیی بوو کە لەلایەن مرۆڤ بەدیهێنرا بێت و گونجاوترینە بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگای سەرمایەداریی. وە فیبەر تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی ڕێساکانی بیرۆکراتیلیست کرد: کاری دیاریکراو لەگەڵ ماف و ئەرک و بەرپرسیارێتی و بواری دەسەڵات و هەروەها سیستەمێکی ڕوون لە سەرپەرشتی و هەماهەنگی و یەکەی سەرکردایەتی. وە هەروەها ئەم ڕێکخراوانە بە قورسی پشت دەبەستن بە پەیوەندیە نووسراوەکان و بەڵگەنامەکان و ڕاهێنانی ستافەکان بەپێی پێداویستی و لێهاتوویی هەر پۆستێک. لەوەش گرنگتر کاری ناوخۆی ڕێکخراوە بیرۆکراسییەکان لەسەر بنەمای جێبەجێکردنی ڕێسای ڕێک و پێک و گشتگیرە بۆ هەر تاکێک، بەبێ ڕەچاوکردنی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری، خێزان، ئایین یان پەیوەندییە سیاسییەکان. بۆیە پرۆسەکانی دامەزراندن و بەرپرسیاریەتی و پلە بەرزکردنەوەکان لەسەر بنەمای شایستەیی و ئەزموونن، نەک لەسەر پەیوەندی خێزانی و شەخسی، وەک ڕابردوو.

ئەڵمانیا لە پێشەنگی هەوڵەکانی ئەوروپادا بوو بۆ دامەزراندنی خزمەتگوزاری شارستانی هاوچەرخ، لە ڕووسیاوە دەستی پێکرد لە سەدەکانی ١٧ و ١٨. لە ڕۆژەکانی فیبەردا، ئەو پرۆسەیە پەرەی سەند لەگەڵ پێشکەوتنە هاوتەریبەکان لە وڵاتەکانی تر کە بووە هۆی سنووردارکردنی لە مەودای ئەژمارکردندا. کۆمسیۆنی خزمەتگوزاری مەدەنی بەریتانیا کە لە ساڵی ١٨٥٥دامەزراوە،

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

نمونەیەکی لەو شێوەیە بوو، ئەوی تریان کۆمسیۆنی خزمەتگوزاری شارستانیی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو، کە لە ساڵی ١٨٨٣ دامەزراوە، بە ئامانجی کۆنترۆڵکردنی بەژداریکردن لە ڕیزەکانی خزمەتگوزاری فیدراڵی. ساڵی ١٨٧٤ یەکەم هەنگاوی بە ئاراستەی دامەزراندنی خزمەتگوزاری مەدەنی نێودەوڵەتی بینی بە پێکهێنانی یەکێتی پۆستەی جیهانی.

فیبەر شایەتی شۆڕشێکی هاوتەریبش بوو لە ڕێکخستنی بیرۆکراتی لە نێوان پێشەنگە نوێیەکانی بازرگانی لە ماوەی گەشتی ئەمریکادا. چونکە لەنێو مەڕومالاّتەکانی شیکاگۆ - ئەو شوێنەی کە کارگەکانی پڕکردن لە پێشەوەی میکانیکی هێلّەکانی کۆکردنەوە و تایبەتمەندیەکان بوون کە ڕێگەیان ئەدا بە بەڕێوبەرایەتیەکە ئەدا بۆ ئەوەی کارمەندی ناکارامە بگۆڕێت بە کارمەندە پیشەگەرە بالاّکانەوە - فیبەر سەرسام بوو بە "چڕی کاری گەورە" ، تەنانەت لە ناوەڕاستی " کوشتارە بە کۆمەڵەکان و دەرياکانی خوێندا"، مێشکە چاودێرەکەی ماندوو بوو.

لەوکاتەوەی مانگای ئارام دەچێتە ناو حەوشەی سەربڕینەوە، بە چەکوشێک لێی دەدرێت و دەڕووخێت، پاشان یەکسەر بە ئاسنێکی هەڵگرەوە هەڵدەواسرێت و دەست بە گەشتەکەی دەکات، ئەو لە جوڵەی بەردەوام دایە، کاتێک بەلای کرێکاری نوێدا دەڕوات ناو هەناوو پێستەکەی لێدەکەنەوە... هتد. بەلاّم هەمیشە (هاوئاهەنگن لەگەڵ ڕیتمی کارەکە) گرێدراون بەو ئامێرەی کە پاڵ بە گیانەوەرەکەوە دەنێت کە پێیدا تێپەڕدەبێت، لەو شوێنە مرۆڤ دەتوانێت بەدوای بەرازێک بکەوێت لە کێڵگەوە بۆ قۆناغی سوجوق و قوتوکردن.

سەبارەت بە بەڕێوەبەران، بەرهەمهێنانی پیشەسازیی گەورە لە بازاڕدا بە شێوەیەکی زیاتر دەگۆڕا بۆ بازاڕێکی نێودەوڵەتی پێویستی بە سوودەکانی تایبەتکردنی بیرۆکراتیو پلەبەندی هەبوو، یان وەک فیبەر ئەژماری کردبوو:

"وردبینی، خێرایی، ڕوونی، زانیاری فایلەکان، بەردەوامبوون، پێشبینیکردنی باش، گوێڕایەڵی توند، و سنووردارکردنی بەریەک کەوتن و خەرجیە ماددی و کەسیەکان. ئەمەش تەنها بۆ حکومەتی پێشکەوتوو باش نەبوو، بەڵکو بۆ بازرگانی پێشکەوتووش باش بوو. ویبەر نوسیویەتی" عادەتەن کۆمپانیا گەورەکانی سەرمایەداری مۆدێرن خۆی لە خۆیدا مۆدێلی بێهاوبەشی ڕێکخستنی بیرۆکراتی توندن".

بە هێنانەوەی چەند نموونەیەک، فیبەر نیشانی دەدات کە پێکهاتە عەقڵانییە تایبەتمەندەکان ئەوانەی پلە و پایە و سەرکردایەتی ناوەندییان هەیە لە هەموو بوارەکاندا لە بەرزبوونەوەدان، لە پارتە سیاسییە سەرکەوتووەکانەوە تا سەندیکاکانی کرێکاران و " پێکهاتەکانی کەنیسە" و زانکۆ باوەڕپێکراوەکان. وێبەر نوسیویەتی: (بیرۆکراتیزیان ناگەیەنێت ئەگەر دەسەڵاتەکەی بە دەسەڵاتی "تیابەت" یان "گشتی" ناونرابێت). لە کۆتایدا ووتی: "لەو شوێنەی کە بیرۆکراسییەتی بەڕێوەبردن بە تەواوی پێکدێنێت، جۆرێک لە پەیوەندی هێز دروست دەبێت کە لە پراکتیکدا لەناوناچێت".

## جیهان چی لێهات بە گرتنەبەری بیردۆزەکانی فیبەر؟

هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم یەکێک بوو لە هاندەرانی بڵاوبوونەوەی بیرۆکراتی کە فیبەر لە سەرەتادا پشتگیری کرد بەڵام دواتر بە تاڵی پەشیمان بوویەوە. کۆکردنەوەی جەماوەری ملیۆنان پیاو و ملیۆنان تۆن لە جبەخانە سەربازیەکان پێویستی بە داهێنانی ئیداریی بوو لە مەیدانی جەنگ و لە بەرەکانی ناوەخۆدا. بە سەیرکردنی سروشتی بەردەوامی شەڕی خەندەقەکان، بۆ نمونە، دەتوانرێت بوترێت کە گەیاندنی کەرەستەی چەک و تەقەمەنی بووەتە گەورەترین

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

بەربەست لەبەردەم ئۆپەراسیۆنەکاندا. وەک یەکێک لە لایەنەکانی تەحەدای ڕێکخستن کە ئەمە تەنها شت بوو ئەینواند، پێویستە لەسەر مرۆڤ سەرنج بداتە سەر بەرهەمهێنانی فەرەنسیەکان بۆ تۆپە ٧٥ ملیمەتریەکان. چونکە پێش جەنگ، پلاندانەرەکان ئامانجێکیان دانا بۆ بەرهەمهێنانی ١٢ هەزار مووشەک لە ڕۆژێکدا. وە دوای ماوەیەکی کەم لە هەڵگیرسانی شەڕەکە، بەرهەمهێنان بۆ ١٠٠ هەزار مووشەک لە ڕۆژێکدا زیادی کرد. وە تا ساڵی ١٩١٨ زیاتر لە ٧.١ ملیۆن پیاو و ژن و گەنج ( کە لەوان بەندکراوانی جەنگ و شارەزایانی کەمئەندام و سەربازە بیانیەکانیشیان تێدابوو) تەنیا لە کارگەی چەک و تەقەمەنی فەرەنسا کاریان دەکرد. هەروەک مێژووناس ویلیام مکنیڵ باسی کردووە "پێکهاتەی بیرۆکراتی بێشومار، کە جارێک بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە نێو پەیوەندیەکانی بازاڕدا کاریان دەکرد، یەکخرابوون بۆ یەک دامەزراوەی نەتەوەیی تاک کە تایبەت بوو بە هەڵگیرسانی جەنگ"، و ئەم بارودۆخە لە هەموو دەوڵەتێکی شەڕدا سەریهەڵدا.

فیبەر دوو ساڵ دوای کۆتایی جەنگ بەهۆی نەخۆشی سییەکان کۆچی دوایی کرد. بەڵام هەموو ئەو شتانەی کە لە دەیەکانی دوای مردنیدا ڕوویاندا، دووپاتی کردەوە کە تێڕوانین و پێشبینییەکەی سەبارەت بە باڵادەستیی بنەڕەتی سیستەمی بیرۆکراتی گەورە جێی بایەخ بوون. وێبەر زۆر بە پەرۆش بوو لە بەدەرخستنی کاریگەری ئەم سیستەمانە لەسەر دامەزراوە ناسەربازی و بازرگانییەکانی تر، و ئەمەش بەڕاستی سەلمێنرا کە ڕاستیەکەیە. وە سیستەمی کارگێڕی بە خێرایی درێژبۆوە بۆ کاری خێرخوازی، بۆ نمونە، چونکە ئەو پیاوە پیشەسازییە بەهێزانەی کە خۆیان بازرگانی مۆدێرنیان دروست کرد هەر ئەوانەش بوون ئەو بنەمایانەیان دۆزیەوە کە بۆ ماوەی سەدەیەک زاڵ دەبن بەسەر کاری خێرخوازەی. تا ساڵی ١٩١٦ زیاتر لە ٤٠ هەزار ملیۆنێر لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەبوو، پاش ئەوەی کە تەنها ١٠٠ کەس بوون لە حەفتاکانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

سەدەی نۆزدەدا. زۆر لە گەورە سەرمایەدارەکانی وەک جۆن دی رۆکفلر و ئەندرو کارنیگی لەگەڵ چاکسازیە کۆمەڵایەتیکان یەکیان گرت بۆ تەرخانکردنی پارە بۆ زانکۆکان و بنیادنانی پەیمانگا سەربەخۆکانی وەک پەیمانگای روکفیلد بۆ توێژینەوە پزیشکیەکان کە بووە نموونەیەک بۆ پەیمانگا هاوشێوەکانی. وە تا ساڵی ١٩١٥، ٢٧ دامەزراوە بۆ پێویستیە گشتیەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەبوون - ئەمەش داهێنانێکی ئەمریکی ناوازە بوو - شارەزا نیشتەجێبووەکان توێژینەوەی سەربەخۆیان ئەنجام ئەدا دەربارەی کۆمەڵەیەکی جۆراوجۆر لە کێشە کۆمەڵایەتیەکان و بەرنامەیان بۆ دائەڕێشت بۆ کەمکردنەوەیان. تا ساڵی ١٩٣٠ ئەو ژمارەیە بۆ زیاتر لە ٢٠٠ دامەزراوە زیادی کرد. وە سەرکەوتنی دامودەزگا سەربەخۆ بەهێزەکان لەگەڵ دەرکەوتنی کارە خێرخوازە جەماوەریەکان بوو، بەتایبەتی لەو بوارەکانی وەک تەندروستی گشتی، کاتێک چاکسازەکان داهاتی کۆمەڵایەتیان تەرخان کرد بۆ ئامانجە کۆمەڵایەتیە فراوانەکان. بۆ نمونە لە ساڵی ١٩٠٥دا، تەنیا ٥٠٠٠ ئەمریکی کات و پارەیان بەخشیوە بۆ شەڕی دژی نەخۆشی سیل، ئەو کارەساتەی کە بووە هۆی ١١٪ ی هەموو مردنەکانی ئەمریکا. تا ساڵی ١٩١٥، بە سەرۆکایەتی ڕێکخراوەکانی وەک کۆمەڵەی نەتەوەیی بۆ لێکۆڵینەوە و نەهێشتنی نەخۆشی سیل ( لە ساڵی ١٩٠٤ دامەزرا) بەلایەنی کەمەوە ٥٠٠ هەزار بەخشەر هەبوون، کە زۆربەیان بەشدار بوون لە هەڵمەتی بەناوبانگی "مۆرەکانی کریسمەس" کە لەلایەن دانیمارکیەکانەوە داهێنرابوو و لەلایەن چاکخواز جیکوب ڕیس لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڵاوکرایەوە.

پەیوەندی هەموو ئەمانە بە هێزەوە چی یە؟ پەیوەندی بە هەموو شتێکەوە هەیە، ئەوەندە بەس نیە کە کۆنترۆڵی سەرچاوە زەبەلاحەکانی دەسەڵات بکەین، وەک پارە و چەک و شوێنکەوتوان. ئەم سەرچاوانە مەرجێکی پێویستن بۆ هێز،

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەڵام لە نەبوونی ڕێگایەکی کاریگەر بۆ بەڕێوەبردنیان، ئەو هێزەی کە دەیهێنێت کاریگەری کەمترە یان خێراتر لەناو دەچێت، یان هەردووکیان. پەیامی ناوەندی فیبەر ئەوە بوو کە بەبێ سیستەمێکی باوەڕپێکراو کە بەباشی کاربکات، یان بە دەربڕینی خۆی، بەبێ بیرۆکراتی، هێز بە شێوەیەکی کاریگەر بەکارناهێنرێت.

ئەگەر فیبەر یارمەتی داین لە تێگەیشتن لە مەنتیقی بیرۆکراتی و کارەکانی لە پیادەکردنی دەسەڵاتدا، ئەوا ئابووریناسی بەریتانی ڕۆناڵد کۆوس یارمەتی داین لە تێگەیشتن لەو سوودە ئابوریانەی کە بیرۆکراتیبە کۆمپانیاکان دەدات. لە ساڵی ١٩٣٧دا کۆس کرانەوەیەکی چەمکی داهێنا و ڕوونی کردەوە کە چۆن ڕێکخراوە گەورەکان نەک هەر عەقڵانین بە پێی بیردۆزی گەورەکردنی قازانج، بەڵکو لە ڕاستیدا زۆرێک سەلمێندراوە کە کاریگەرترن لە جێگرەوەکانی تر. وە ڕێکەوت نییە کە کۆس، کە هێشتا لە زانکۆ بووە (١٩٣١-١٩٣٢)، توێژینەوەیەکی کردووە بۆ ئامادەکردنی پەڕە بەناوبانگەکەی خۆی بە ناوی "سروشتی دامەزران" لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. پێشتر، ئەو بەر سۆسیالیزمیدا هەڵدەگووت و سەرسام ببوو بە لێکچوونە ڕێکوپێکەکانی نێوان کۆمپانیاکانی ئەمریکا و سۆڤیەت، بە تایبەتی بە پرسیارکردن دەربارەی هۆکاری بەدەرکەوتنی پیشەسازییە گەورەکان کە دەسەڵات تێیدا زۆر مەرکەزییە - وەکو یەک لە هەردوو لای دابەشبوونی ئایدیۆلۆجیدا.

ڕوونکردنەوەی کۆس - کە پاش چەند دەیەیەک هۆکارێک دەبێت بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتی نۆبل لە ئابوری - ئاسان و شۆڕشگێڕ بوو لەهەمان کاتدا. ئاماژەی بەوەدا کە کۆمپانیا مۆدێرنەکان ڕووبەڕووی تێچوونێکی زۆر بوونەوە کە کەمتر بوون، کاتێک کۆمپانیاکە ئیشەکانی خۆی گواستەوە بۆ ناوەوە، لە

تێچوونی ئەو مامەڵەکردنەی کە لە دوورییەوە ئەیکرد لەگەڵ کۆمپانیاکانی تر. وە لە نێوان ئەم تێچوونانە، تێچوەکانی داڕشتن و جێبەجێکردنی گرێبەستی

فرۆشتنە، کە لە سەرەتادا کوس ناوی نابوو "تێچووەکانی بازاڕکردن" و دواتر دووبارە ناوی نانەوە بە "تێچووەکانی مامەڵەکان". بە دیاریکراوی، چەمکی تێچووی مامەڵە یارمەتی دا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە بۆچی هەندێک لە کۆمپانیاکان لە ڕێگەی یەکخستنی ستوونییەوە گەشەیان کرد - بە مانای لە ڕێگای کڕینی دابینکەرەکانیان یان دابەشکەرەکانیان - لە کاتێکدا ئەوە ڕووی نەدا لە کۆمپانیاکانی تر. بۆ نمونە، بەرهەمهێنەرە گەورەکانی نەوت حەز دەکەن خاوەنی پاڵاوگە تایبەتەکانی خۆیان بن، لەو شوێنەی کە نەوتەکەیان چارەسەر دەکرێت، چونکە ئەم ڕێکارە کەمتر مەترسیدار و کاریگەرترە لەوەی پشت بە هەر پەیوەندیەکی بازرگانی ببەستێت لەگەڵ خاوەن پاڵاوگە سەربەخۆکان کە کۆمپانیا نەوتیەکان ناتوانن کۆنترۆڵی هەڵسوکەوتیان بکەن. بە پێچەوانەوە، فرۆشیارەکانی جلوبەرگی گەورە، وەک کۆگاکانی زارا، و کۆمپانیا کۆمپیوتەرییەکان، وەک ئەپڵ یان دێڵ، کەمتر ناچارن ببنە خاوەنی ئەو ئاسانکاریانەی کە بەرهەمەکانیان دروست دەکەن. ئەوان لە ناوەوە گرێبەست دەکەن (کارەکان بە کۆمپانیا دەرەکیەکان دەسپێرن) بە شێوەیەک کە دروستکردن ئەدات بە کۆمپانیایەکی تر و خۆی تیشک دەخاتە سەر تەکنەلۆجیای بەرهەمەکانی، و دیزاین، بازاڕکردن و فرۆشتن بە پارچە. ئەم مەیلی کارکردنە لە ڕێگەی کۆمپانیایەکی بە ستوونی یەکخراوەوە هاندراوە لەلایەن پێکهاتەی بازاڕەوە بۆ کڕیار و فرۆشیارانی چالاک لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی پیشەسازیدا، و جۆرەکانی وەبەرهێنانی پێویست بۆ چوونە ناو جیهانی بازرگانیەوە. بە کورتی، نرخەکانی مامەڵە پێناسەی کۆکراوەی کۆمپانیاکە و شێوازی گەشەکردن و سروشتی دەکەن.

لەکۆتایدا، هەرچەندە دیدی کۆس بۆتە کۆڵەکەیەکی گرنگ لەتێگەیشتنی ئابووری بەگشتی، بەڵام کاریگەرییە سەرەتاییە سەرەکیەکانی لەبواری ڕێکخستنی پیشەسازیدا بووە، کە تیشک دەخاتە سەر ئەو فاکتەرانەی کە هاندەرن

یان ڕێگرن لەکێبڕکێی نێوان کۆمپانیاکان.

ئەو بیرۆکەیەی کە نرخی مامەڵەکان قەبارە و سروشتی ڕێکخراوەکە دیاری دەکات دەکرێت بۆ زۆرێک لە بوارەکان جگە لە پیشەسازی جێبەجێ بکرێت بۆ ئەوەی ئەوە دەربخرێت کە بۆچی دەستە حکومیەکان و سوپا و کلێساکانیش قەبارەیان گەورەیە و بەڕێوەبردنیان مەرکەزیە، نەوەک تەنها کۆمپانیا مۆدێرنەکان. وە لە هەموو حاڵەتەکاندا، ئەنجامدانی ئەو کارە عەقڵانی و کاریگەر بوو.

چونکە بەرزبوونی تێچووی مامەڵەکان هاندەری بەهێز دروست دەکات بۆ هێنانی چالاکیە گرنگەکان بۆ ناو ڕێکخراوەکە کە لەلایەن کەسانی ترەوە کۆنترۆڵ دەکرێن بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکە گەشە بکات. وە لەسەر هەمان نەسەق، هەردووکیان وایان کرد کە ڕیتمی تێچووەکانی مامەڵەکانی ڕێکخراوەکان گەشە بکات و گەورە بێت لە ڕێگەی یەکخستنی ستوونییەوە، ئەم گەشەکردنە بووەتە بەربەستێکی قورستر بۆ ڕکابەرە نوێیەکان کە هەوڵی بەدەستهێنانی شوێن پێ دەدەن. لەبەر ئەوە زەحمەتە بۆ هەر ڕکابەرێکی نوێ بەرەنگاری کۆمپانیایەکی ئێستا ببێتەوە کە کۆنترۆڵی سەرچاوەی سەرەکی ماددە خاوەکان بکات، بۆ نمونە، یان تێکەڵکردنی کەناڵە سەرەکیەکانی دابەشکردن یان زنجیرەی تاکفرۆشی لەناو چالاکییەکانیدا. هەمان شت بۆ ئەو حاڵەتانە دەگونجێت کە سوپایەک پیادەی دەکات بە کۆنترۆڵکردنی تایبەتی لەسەر کڕینی چەک و تەکنەلۆجیاکانی، لەوانەشە یەکێکی تر کە ناچار دەکرێت پشت بە پیشەسازی چەک ببەستێت لە دەوڵەتێکی تردا، نوێکان بۆیە تێچووەکانی مامەڵەکان، کە هەندێک لە ڕێکخراوەکان دەتوانن کەمی بکەنەوە لە ڕێگای " یەکخستنی " کڕیارەکان یان دابەشکەران یان کۆنترۆڵکردنیان، ئەبێتە بەربەستێک لە بەرامبەر ڕکابرەکان، و بەرامبەر بەدەست هێنانی هێز بە شێوەیەکی گشتی؛ چونکە قەبارەی ئەو

کۆمپانیایەی کە بە یەکخراوی ئەستونیەوە بەهێز بوو وەک بەربەستێکی پاراستنی بەرز ئەوەستێت بۆ کۆمپانیا خاوەن هێزەکان و هەلێکی کەمتر لە ڕکابەری و سەرکەوتن بۆ کۆمپانیا بچوکەکان بەجێ دەهێلێت. جێی تێبینیە تا سالانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم، زۆربەی حکومەتەکان ئارەزوویان لە "یەکخستنی" خاوەندارێتی و کارپێکردنی هێڵە ئاسمانیەکان و تونێلە رەوەکان و کارگەکانی چیمەنتۆ و بانکەکان بووە. لە ڕاستیدا زۆرجار هەوڵی حکوومەتەکان بۆ کاریگەری و سەربەخۆیی زۆربەی جار پاڵنەرەکانی تری شاردۆتەوە، وەک دابینکردنی پیشە لە کەرتی گشتی و دەرفەتەکان بۆ نیپۆتیزم و گەندەڵی و گەشەسەندنی هەرێمایەتی و هاوشێوەکانی تر.

هەرچەندە نرخی مامەڵەکان بە شێوەیەکی ئاسایی وەک ئەوە ڕەچاو ناکرێت، بەڵام بە ڕاستی قەبارەی ڕێکخراوەکە دیاری دەکەن و زۆرجار هێزی خۆی دیاری دەکات. وەک لە خوارەوە باسکراوە، ئەو بەربەستانەی کە بەکارهاتوون بۆ پاراستنی بەهێزەکان لە ڕکابەرەکانیان، دەست دەکەن بە دارمان، ئەمەش چونکە سروشتی تێچوونەکانی مامەڵەکان دەگۆڕێن و کاریگەریان کەمتر بۆتەوە. وە ئەمەش تەنها لە بواری ڕکابەری بازرگانی ڕوونادات.

### ئەفسانەی نوخبەی دەسەلات!

لە ڕێڕەو و دەرئەنجامدا، جەنگی جیهانی دووەم هاوکێشەی قەبارە و هێز بەهێزترکرد، لە کاتێک "جبەخانەی دیموکراسی" ی ئەمریکا پشتگیری سەرکەوتنی هاوپەیمانانی دەکرد، قەبارەی ئابووری ئەمریکای لە ماوەی جەنگدا بە نزیکەیی دوو هێندە کرد، وە کۆمپانیا زەبەلاحەکانیشی بەهێزتر کەد کە مۆدێلێکی نموونەیی بوون لە بەرهێنانی گەورە. وە ئەوەی براوەی کۆتایی ئەم جەنگە بوو تەنیا وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت بوون --

# کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

ئەو دوو وڵاتەی کە ناوچەکانیان نوێنەرایەتی تەواوی کیشوەرەکان دەکەن - ئەوەک ووڵاتانی دوورگەیی وەک یابان و تەنانەت بەریتانیای گەورەش، ئەوانەی بە تێچوونی جەنگەکە هەژار بوون و بەرەو پلەی دوو چوون. لە کۆتایی جەنگدا، داواکاری بەکاربەرانی ئەمریکا بە پاڵپشتی پاشەکەوتەکانی کاتی جەنگ و بەرنامە بەخشندەکانی حکومەت، ڕێگەیان دا کۆمپانیا گەورەکان گەشە بکەن و گەورەتر بن لەوەی پێشتر. وە بە شێوەیەکی فراوانتر و زیاتر ئاگادارکردنەوە بە خراپە، لەگەڵ گواستنەوەی "شەڕی باش" ئەو شتەی جۆن ئێف کەنەدی پێی دەوت "خەباتی درێژ و بێکۆتایی"، پێشبڕکێی نێوان ڕۆژئاوای سەرمایەداری و ڕۆژهەڵاتی کۆمۆنیست بووە هۆی سەرهەڵدانی دامەزراوە ئەمنییە گەورەکان لە هەردوو لای جەنگی سارد، و هەر لایەنێک پەنای بۆ ئایدیۆلۆجیە تایبەتەکەی خۆی دەبرد و پابەندە بیرۆکراتیخۆی هەیە کە بۆ زۆر دوورتر لە بواری سەربازی درێژدەبۆوە بۆ ئەوەی بڕوات بەناو زانستەکان و خوێندن و ڕۆشنبیری. وە هەروەک مێژوونووس دیرک لیبێرت لە کتێبی (برینی پەنجا ساڵیەکان)، کە تێیدا چاودێریەکی تەواوی خەرجیەکانی جەنگی ساردی دەکرد و گوتی: "پێویستی وایکردن هەڵکشان بۆ چەمکی زەبەلاح و قەبارەی گەورە دروست بێت کە ئەنجامی قۆناغی سەرەتای پیشەسازی بوونبوو، و نەبوونی ئارامیەکی قوڵ بەهۆی ئەو پاشەکشەی بە کۆمپانیا بچووکەکانەوە کەوت، و دۆخی کاری هاوبەش کە دەستی بەسەر جەنگی جیهانیدا کێشابوو: سەندیکا و کۆمپانیا و حکومەتە زەبەلاحەکان بەبێ ئەوەی گرینگی بە ناوهێنانی بازار بدات.

بە کورتی، نیشانەی قەبارە و مەودا -- بە مانای بیرۆکەی ئەوەی کە ئەو پرۆژانەی کە گەورەترین پیشەی سەرکەوتن و خۆڕاگرییان هەیە بە شێوەیەک لە شێوەکان گەورەترینەکانن -- لە تێگەیشتنی جەماوەر بەڕاستی لە هەموو شوێنێکە. وە ڕەنگە گەورەترین بینای ئۆفیسی لە جیهان (بەراورد بە ڕووبەری زەوی)،

## کۆتایی سەردەمی هێز

پێنتاگۆن، کە لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا لە ساڵانی ١٩٤١ تا ١٩٤٣ دا دروستکراوە، هێمای نموونەیی ئەم بنەمایەیە لە ساڵانی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی بیستەم. هەروەها کەلتورە هەرەمییە بەناوبانگەکەی ئای بی ئێم، کە تایبەتمەندییە هەرەمی و تەقلیدییەکانی لە خزمەتی ئامانجی ئەندازیاریی پێشکەوتوودا داناوە. لە ساڵی ١٩٥٥، کۆمپانیای جەنەراڵ مۆتۆرس، یەکێک لە یەکەم کۆمپانیاکان بوو کە مۆدێلی پێکهاتەی بەڕێوەبردنی فرە بەشی بگرێتە بەر، یەکەم کۆمپانیای ئەمریکی بوو کە قازانجی ساڵانەی زیاتر لە ١ ملیار دۆلار بەدەست هێنا، هەروەها گەورەترین کۆمپانیا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕووی داهاتەکەی وەک ڕێژەی سەدی لە دەرەنجامی تێکڕای ناوەخۆ (نزیکەی ٣٪)، وە زیاتر لە ٥٠٠ هەزار کرێکاری بە تەنها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای دامەزراند، ٨٥ مۆدیلی جیاوازی بۆ بەکارهێنەران تەرخانکردبوو تا لە نێوانیان هەڵبژێرن، وە نزیکەی پێنج ملیۆن ئۆتۆمۆبێل و شاحینەی فرۆشت. هەروەها پرەنسیپەکانی بەرهەمهێنانی بە کۆمەڵی فراوانتر کرد بۆ ئەوەی چالاکی تر لەخۆبگرێت، وەک دروستکردنی خانوو لە لایەن بازرگانانی وەک پیل لێفیت، کارمەندی پێشووی دروستکردنی باڵەخانە لە هێزی دەریایی ئەمریکا ئەو کەسەی کە کرێکارەکانی خستە نێو گەشەپێدانی قەراغەکانی شار لە ڕێگای بنیادنانی خانوو بۆ چینە مامناوەندەکان بە نرخێکی گونجاو و کە لە توانای هەزاران لە دانیشتواندا بێت.

بەڵام سەرکەوتنی ئاشکرای ڕێکخراوە زەبەلاحەکان کە ئەم زۆربوونی کەلوپەل و خزمەتگوزاریانەی لە ماوەی جەنگی ساردا بەرهەم هێنا، نیگەرانیشی دروست کرد. چونکە ڕەخنەگرانی تەلارسازی، وەک لویس مفۆرد، نارەزاییان دەربڕی دژی شارە نوێیەکانی لیڤیت و بە تاکڕەوی و بێزارکەر وەسفیان کرد و بیناکانی ئەوەندە بەربڵاوە کە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی ڕاستەقینە تێیدا قورسە.

## کۆتایی سەردەمی هێز

نیرڤینگ هۆو، شرۆڤەکارێکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی، ساڵەکانی دوای جەنگی وەک " سەردەمی لەگەڵ ڕۆیشتن" ئیدانە کرد. لە ساڵی ١٩٥٠ دا، کۆمەڵناس دەیڤد ڕەیسۆن لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بە ناوی " قەڵەباڵغییە دابڕاوەکان"، خەمبار بوو بۆ لەدەستدانی تاکەکەسی لە ژێر فشاری دامەزراوەیی.

ئەمانە تەنیا ئەو نیگەرانیانە نەبوون، چونکە لە هەر ناوچەیەک کە ڕێکخراوە گەورەکان زیاتر کۆدەبوونەوە لە هەموو بوارەکان، و بە ڕوونی مەچکی گرتنیان بۆ لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤ بەهێز دەکەن، ڕەخنەگرانی کۆمەڵایەتی هەستیان بە نیگەرانی کرد لەوەی کە ئەو پلەبەندیانەی دروستیان کردووە ببنە هەمیشەیی؛ کە نوخبەی دەستڕۆیشتوو لە سیاسی و بازرگانانەکان جیابکاتەوە لە کەسانی تر، و هێز تەنها بۆ کۆمەڵێک یان چینێکی فەرمانڕەوا بێت، لە هەمان کاتدا هاندان بۆ پاڵپشتیکردنی مەنتیقی قەبارە گەشەی زیاتر و زیاتر بە ڕێکخراوەکان بکات و یەکتر قووت بدەن، ئەگەر پێویست بوو، لە ڕێگەی یەکگرتن یان دابەشکردنی سامانەکان لە کارتێلەکان و یەکێتیەکان. وە بەنسبەت هەندێک کەس، فراوانکردنی بەرنامەکانی حکومەت لە خەرجی سەربازیەوە بۆ خەرجی کۆمەڵایەتی، و گەشەکردنی بیرۆکراسییەکان کە بەرپرسیارن لە بەڕێوەبردنی ئەم بەرنامەیە - نەک تەنها لە کۆمەڵگە چەپەکان یان سۆسیالیستەکان - بە هەمان ڕادە ڕەوتێکی نیگەرانکەریان ئەنواند. وە هەندێکی تر هەستیان بەوە کرد کە چڕبوونەوەی دەسەڵات تەنیا بەرهەمی ئابووری سەرمایەدارییە لە پلەی یەکەمدا.

ئەم ترسانە، بە جۆرێک یان بە جۆرێکی تر، بیروباوەڕی کارل مارکس و فرێدریک ئەنگێلسە، کە لە کۆمۆنیستی "منفیستۆ" (١٨٤٨) دا گوتبوویان کە حکومەتەکان لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا درێژکراوەی سیاسەتی بەرژەوەندی بازرگانەکانن. نوسیویانە" دەسەڵاتی جێبەجێکاری دەوڵەت هیچ نییە جگە لەکۆمسیۆنێک بۆ بەڕێوەبردنی سەرجەم کاروبارەکانی بۆرجوازی". لە ماوەی

چەند دەیەی دواتردا، زۆرێک لە شوێنکەوتوەکان مشت و مڕ و بۆچوونی زۆریان پێشکەش کرد کە هاوبەش بوون لە بابەتە سەرەکیەکە. چونکە مارکسیەکان گوتیان کە فراوانبوونی سەرمایەداری دابەشبوونی چینایەتی بەهێز کردووە، و لە ڕێگەی ئیمپریالیزم و بڵاوبوونەوەی سەرمایەی دارایی لە هەموو جیهاندا، ئەم دابەشبوونە چینایەتیانە کۆپی بوونە لەناو دەوڵەت و نێوان دەوڵەتەکاندا.

بەڵام بەرزبونەوەی ڕێکخراوە هەرەمییە گەورەکان ڕەخنەی زۆر تایبەتی هێنا چاکەکە بۆ سەرنجی ماکس فیبەر و بۆ مشتومڕەکەی بۆ کارل مارکس دەگەڕێتەوە. چونکە لە ساڵی ١٩٥١ دا، پرۆفیسۆری کۆمەڵناسی زانکۆی کۆلۆمبیا، سی ڕات میلس، توێژینەوەیەکی بە ناوی "یاقەی سپی: چینی ناوەندی ئەمریکی" بڵاو کردەوە. هەروەک ڕۆناڵد کۆس، میلز سەرسام بوو بە بەرزبوونەوەی کۆمپانیا سەرەکیەکانی بەڕێوەبردن. لە بەدواداچوونەکانی بۆ قەبارەی گەورە و کارامەیی، گووی ئەو کۆمپانیایانە چینێکی فراوانی کرێکاریان دروست کردووە کە ئەرکە دووبارەییەکان و میکانیزمێک ئەنجام دەدەن لە کۆتاییدا خەیاڵ و توانای بەژداربوونی تەواویان لە کۆمەڵگە گۆڕیوە. بە کورتی، میلز ووتی کە کرێکاری کۆمپانیا کۆمەڵگا کراوەتەوە. وە زۆرێک وای ئەبینن ئەم لێکردنەوەیە لە ئاگادارکردنەوە چاپکراوەکانی سەر کارتە کونکراوەکانی هۆلەریث دەربڕدراوە-- بۆ ئەمەش سوپاس ئەگەڕێتەوە بۆ ئای بی ئێم و کۆمپانیاکانی تری داتا پرۆسەکردن -- کە بوون بە هێما و کۆڵەکەی ژیانی بیرۆکراتی لە ماوەی ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان: "ڕێگە نادرێت بە چەماندن، یان ترۆل کردن یان شێواندن".

وە لە ساڵی ١٩٥٦، میلز ئەم بیروباوەڕی لە بەناوبانگترین کارەکانی "نوخبەی هێز" پەرەپێدا، ئەو ڕێگایانەی تێدا دیاری کرد کە هێزیان تێدا کۆدەبێتەوە لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر دەستی چینێکی داخراو کە زاڵبوو

بەسەر کێشە کۆمەڵایەتی و پیشەسازی و سیاسیەکان. بەڵێ، میلز ووتی کە ژیانی سیاسەتی ئەمریکی دیموکراسی و فرەییە؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەش چڕی هێزی سیاسی و ئابوری بووە هۆی دانانی نوخبەیەک لە پێگەیەکی بەهێزتر لە هەموو کات زیاتر کە بتوانێت پارێزگاری لە باڵادەستی بکات. وە ئەم بیرۆکانە میلزی کردە ڕەخنەگرێکی کۆمەڵایەتی، بەڵام بەهەر حاڵ بیروبۆچوونەکانی ڕادیکالی نەبوون لە سەردەمی خۆی. پاش پێنج ساڵ، سەرۆک دوایت ئایزنهاور هەمان بیروباوەڕی دەربڕی لە ووتاری ماڵئاوایی کە بۆ گەلی ئەمریکی خوێندەوە، کاتێک ئاگاداری کردنەوە لەو هێزە بەردراوەی کە هیچ چاودێریەکی لەسەر نیە، و هەروەها لەو " دەستڕۆیشتنە بێ شومارەی " کە کۆمەڵەی پیشەسازی و سەربازی هەیانە.

وە لە ماوەی شەستەکانی سەدەی بیستەم، گومان لە ڕێکخراوە ئابوریە مۆدێرنەکان دەکرا، کە بە سروشتی خۆی، نایەکسانی و نموونەیەکی نوخبەیەکی جێگیری دەرکردبێت کە زیاتر لە نێوان زاناکانی کۆمەڵایەتی و دەروناسی بڵاوبۆتەوە. لە ساڵی ١٩٦٧، جەی ویلیام دی مەهۆف، پرۆفیسۆر لە زانکۆی کالیفۆرنیا، لە سانتا کروز، کتێبێکی بڵاو کردەوە بە ناوی "کێ حوکمی ئەمریکا دەکات؟" لەو کتێبە دی مەهۆف ئەوەی بەکارهێنا کە ناوی نابوو " چوار تۆڕەکان " بۆ ئەوەی ڕوونبکاتەوە کە ژیانی ئەمریکی خاوەن کۆمپانیا گەورەکان و بەڕێوەبەرە گەورەکان کۆنترۆڵی دەکەن. دی مەهۆف بەردەوام بوو لە نوێکردنەوەی کتێبەکە لە چاپە تازەکانیدا، هەموو شتێکیشی لە جەنگی ڤێتنامەوە بۆ هەڵبژاردنی باراک ئۆباما لەخۆ گرتبوو بۆ پشتیوانیکردن لە ڕای خۆی.

ئەو ڕاستییەی بوونی نوخبەیەک یان دامەزراوەیەکی چەسپاو خۆی بۆتە شمشێرێک لە دەستی ئەو کەسانەی دەیانەوێت بچنە ڕیزەکانیەوە، جا چ سیاسەتمەدار بن دژی سیاسەتەکانی واشنتن یان کۆمپانیا تازە پێگەیشتووەکان کە

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەدوای ڕووخاندنی ڕکابەری گەورەتر و بەهێزترەکاندا دەگەڕێن. وە نموونەیەکی باشی دوایین جۆر (کۆمپانیا تازە پێگەیشتووەکان) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٤ کە ئەپڵ سەرکەوتنێکی ڕیکلامی بەدەست هێنا لەگەڵ کۆمپیوتەرە کەسیە بەناوبانگەکەی ماکینتۆش: لە وێنەیەکدا کە لە ئیلهامی ڕۆمانەکەی جۆرج ئۆروێلی وەرگیرابوو، ژنێک دەردەکەوێت لەلایەن کۆمەڵێک پۆلیسەوە بە پێڵاوی قورسەوە ڕاودەنرێت، و ئافرەتەکە چەکشوێک ئەوەشێنێتە شاشەیەکی گەورە کە نامەیەک لە نامەکانی " برا گەورە " بڵاودەکاتەوە بەسەر ڕیزێک لە مرۆڤە ڕۆبۆتە سڕبووەکان و ئازادیان دەکات. ئەم ڕیکلامە بە مەبەستی ئاتەواوی ئاراستە کرابوو بۆ کۆمپانیای ئای بی ئێم، ئەو ڕکابەر زاڵەی کۆمپانیای ئەپڵ لە بازاڕی کۆمپیوتەردا. بە دڵنیاییەوە، ئای بی ئێم ئەمڕۆ لە بازاڕی کۆمپیوتەرە کەسیەکان دەرچووە، و نرخی بازارەکەی لە دژی ئەپڵ کەم بووەتەوە، کە ئەمەش لە بەرامبەردا ڕووبەڕووی ڕەخنەی پارێزگاری لە هێشتنەوەی چنگی برا گەورەکەی" بۆتەوە لەسەر سیستەمی کارپێکردنی، وئامێرەکانی، وکۆگاکانی و ئەزموونی لەگەڵ بەکاربەرەکانی. بەڵام کۆمپانیای گووگڵ کە لە ساڵی ١٩٩٨ بە ڕۆحی هاککەری نافەرمی و دروشمی "خراپ مەبە" دامەزراوە، ئێستا یەکێکە لە گەورەترین کۆمپانیاکانی جیهان (بەراورد بە بەهای بازاڕ)، و لەلایەن هەندێک ناوەند وەک مەسیحی دەجال دانراوە، کاتێک بە تەنیا توانی ڕۆژنامەکان تێکبشکێنێت و ڕکابەرەکانی لەناوببات و تایبەتمەندی بەکاربەرەکانی ببەزێنێت.

زیادبوونی سامان و نایەکسانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ماوەی ٢٠ ساڵی ڕابردوو، لەگەڵ ڕەوتە جیهانییەکان بەرەو پێدانی مووچەی زەبەلاح بۆ بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکان و پاداشتی گەورە بۆ خاوەن بانکەکان، ئەو باوەڕەیان بەهێزتر کرد کە ئەوانەی دەگەنە لووتکەی سەرەوە لەوێ دەمێننەوە، دوورن لەو نیگەرانیانەی کە دووچاری مرۆڤی پلە نزم دەبنەوە. وە تیۆریزان کریستۆفەر

لاش، کە لە ساڵی ١٩٩٤ کۆچی دوایی کرد، ئەو سیاسەت و ڕەفتارانەی ڕۆژئاواییانەی کە وای کرد ئەم ڕەوتانە بێنە دی -- هەڵگرتنی بەربەستەکان، و فەراهامکردنی هەڵبژاردنی کۆمەڵایەتی وەک قوتابخانە تایبەتەکان، ئاسایشی تایبەت و هاوشێوەکانی -- ناساندی بە " شۆڕشی نوخبەکان". ئەم دیاردەیەی وەک جۆرێک لە وازهێنانی ئەو کەسانە باسکردن کە تا پلەیەک دەوڵەمەندن کە وایان لێدەکات ئەو کارە ئەنجام بدەن بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی. لاش لە ووتارێکی لە ڕۆژنامەی هاربرز پرسیاری کردبوو بە ناونیشانی " ئایا دڵسۆزیان بۆ ئەمریکا هەڵوەشاندۆتەوە؟ " .

بیرۆکەی " شۆڕشی نوخبەکان " دەنگدانەوەی هەبوو. سەرەڕای نادیاریی ئەوەی کە مانای نوخبە پێناسەی دەکات (ئایا سامانە، یان ئەو پلەو پایەی بە جۆرێکی تر دەپێورێت یان پیشەیەکی دیاریکراوە؟)، بەڵام بیرۆکەی بوونی نوخبەیەکی سەرکەوتوو کە بەردەوامە لە توندکردنی دەستگرتنی لەسەر حکومەت هێشتا زۆر زیندووە، لە ساڵی ٢٠٠٨دا، چەند ڕۆژێک دوای ڕاگەیاندنی پاکێجێکی گەورە بۆ ڕزگارکردنی بانکەکانی ئەمریکا، و چەند هەفتەیەک دوای ڕووخانی بانک لیان براثرز و ڕزگاربوونی کۆمپانیای بیمەی زەبەلاح " گرووپی جیهانی ئەمریکی"، ڕەخنەگر ناعومی کلاین، ئەو سەردەمەی بە "شۆڕشی نوخبەکان و سەردەمێکی سەرکەوتوو بەشێوەیەکی باوەڕپێنەکراو" وەسف کرد، ئەو گووتی ئەو پشتگوێ خستنە درێژەی چاودێری دارایی و ئەو ڕزگارکردنە لەناکاوەی بانکەکان کۆنترۆڵکردنی نوخبەی بۆ سیاسەت پێچەوانە کردەوە، وە ئەو وای دەبینی کە ئاراستەیەکی باو هەیە لە تیشک خستنە سەر هێز وولاتە گەورەکانی لەگەڵ خۆی بەستەوە کەوا دەردەکەوێت سیستەمەکانی سیاسی و ئابووری ناکۆکبن. ئەو لە نیویۆرک بە گوێگرانی گووت: "من سەیری ڕۆژچوونێک دەکەم بۆ سەرمایەداری دەسەڵاتخواز کە لەلایەن ویلایەتە

## کۆتایی سەردەمی هێز

یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ڕوسیا و چینەوە هاوبەش کراوە و من ناڵێم ئێمە هەموومان لە یەک قۆناغداین، بەڵام ڕەوتێک دەبینم بەرەو تێکەڵەیەکی زۆر بێزارکەر لە هێزی کۆمپانیا گەورەکان و هێزی دەوڵەتە گەورەکان و ئەوان هاوکاری یەکترن لە پێناوی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی نوخبەکان ". بیروباوەڕێکی یاوەری ئەوە هەیە کە وا دەبینێت جیهانگیری بۆتە هۆی زیادبوون لە چڕبوونەوەی هێز تەنیا لە پیشەسازیەکان و سێکتەرە ئابوورییە تاکەکەسیەکان، چونکە سەرکردەکانی بازاڕ دەستیان لە پۆستە باڵاکاندا بەهێز کردووە.

ڕووداوەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی نیگەرانی ئەوەیان نوێ کردەوە کە دەسەڵات دەستی بەسەر داگیراوە لە زۆر یان زۆربەی وولاتەکان لە لایەن ئۆلیگارکیەکانەوە -- چەند یاریزانێکی پایەبەرز کە کۆنترۆڵی ناگونجاویان هەیە بەسەر سامان و سەرچاوەکان و بەرژەوەندیەکانیان زۆر بە پتەوەی بەستراوە لەگەڵ سیاسەتی حکومەتدا، جا چ بە ڕێگە ئاشکراکان یان شاراوەکان بێت. سایمۆن جۆنسن، پرۆفیسۆر لە پەیمانگای ماساچوستس و گەورە ئابووریناسێکی پێشووی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، بە پشت بەستن بە ئەزموونەکەی دەڵێت لە هەموو شوێنێک کە داوای دەست تێوەردانن لە سندوقی نێودەوڵەتی کراوە، ئۆلیگاریەکانمان ئەدۆزیەوە هەوڵی پارێزگاریکردن لە خۆی ئەدا و زەحمەتیەکانی چاکسازی ئەخستە سەرشانی هاوولاتیەکانی تر ( یان بیانیە قەردارەکان). جۆنسن لە وتارێکیدا کە لە ڕۆژنامەی ئەتلانتیک لە ساڵی ٢٠٠٩ بڵاوەی کردبۆوە، جەختی لەوە کردەوە کە ئۆلیگارکیەکان لە تایبەتمەندیەکی ناوازەن لە بازارە بەرزبووەکان، بەڵام سنوردار نین تەنها بۆ ئەم ئابووریانە. وە لە ڕاستیدا، جۆنسۆن وادەبینێت کە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە لوتکەی ئەم بەخشینەش وەستاوە: " بە هەمان شێوەی ئەوەی کە خاوەن ئابوری و سوپا و پێشکەوتوترین تەکنەلۆجیاین لە جیهان، بەڵام ئێمە خاوەنی پێشکەوتووترین ئۆلیگارکیەکانیش نین

". وە ئاماژەی کرد بە کۆمەڵەکانی پەستان، و لابردنی بەربەستە داراییەکان یان سوککردنیان، و بەریەکچوونی نێوان وۆڵ ستریت و واشنتۆن، و داوای " هەڵوەشانەوەی نوخبەی کۆن"ی کرد.

ئەم شیکاریانە پێشبینی بوونی بیروباوەڕێکی گشتی دەکەن ئەوەندە بەربڵاوە کە خەریکە بۆتە غەریزەیەکی بەکۆمەڵ: "هێز و سامان زیاتر مەیلی چڕبوونەوە دەکەن و دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر دەبن و هەژاران بە هەژاری دەمێننەوە". ئەم دەربڕینەی بیرۆکەکە زیاتر لە کاریکاتێر دەچێت، بەڵام ئەمە گریمانەیەکی بەردەوامە لە پشت ئاڵوگۆڕەکانی پەرلەمانەکان، و لەسەر مێزی ملیۆنان نانی نێوارە، و لە هۆڵەکانی زانکۆکان و لە کۆبوونەوەکانی هاوڕێیانی دوای چەند کاتژمێرەکانی کارکردن، و لە کتێبە قووڵەکان، و لە زنجیرە تەلەڤیزیۆنییە بەناوبانگەکاندا. تەنانەت لەنێو دەمارگیرەکانی بازاڕی ئازادا، وا باوە مرۆڤ ئەو دەنگدانەوانەی بیرۆکەیەی مارکسی بدۆزێتەوە کە دەڵێت هێز و سامان ئارەزوویان لە سەرنجە. چونکە لە دەیەک یان دوو دەیەی ڕابردوودا، ڕووماڵکردنی میدیایی لەبارەی ئەو سامانە زۆرەی کە کەمینەیەک لە ئۆلیگارکیە ڕووسیەکان، و شێخی نەوتییەکان، و ملیاردێرە چینییەکان، و بەڕێوەبەرەکان، وسەرمایەکانی ئەمریکا و بازرگانانی ئینتەرنێت بە پەرۆشیەوە پێشکەش کراون و بەکاریان هێنراوە. وە کاتێک زەبەلاحەکانی دارایی ئەیانخەنە ناو سیاسەتەوە - هەروەک ئەو حاڵەتەی سیلفیو برلسکونی لە ئیتالیا، یان تاکسین شیناواترا لە تایلاند، یان ڕۆبرت مردوخ و جۆرج سوروس - یان هەوڵی بیل گیتس و ئەوانی تر بۆ داڕشتنەوەی سیاسەتە گشتیەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و هەموو جیهان، جەماوەر جارێکی تر ئەوەی بیر دێتەوە کە پارە و هێز یەکتر بەهێزدەکەن، بۆیە بەربەستێکی بەرهەڵستکار دروست دەکەن بەرامبەر ڕکابەرەکان کە بە نزیکەیی ناتوانرێت ببڕدرێت.

## کۆتایی سەردەمی هێز

وە ئەو پەندە نەریتییەی کە دەڵێت کە نایەکسانی ئابووری دوارۆژی مانەوەیە و لەوانەیە خراپتریش بێت کە وامان لێدەکات هەموومان تاڕادەیەک مارکسی بین. بەڵام چی دەبێت ئەگەر مۆدێلی ڕێکخستن، کە ماکس فیبەر و میراتگرەکانی لە ئابووری و کۆمەڵناسیدا وەک گونجاوترین مۆدێل بینیان بۆ ڕکابەریکردن و بەڕێوەبردن لە ژیانی هاوچەرخدا، لە بەروار دەرچوون؟ ئەی چی ڕوودەدات ئەگەر هێزەکە دابەش بێت و لە فۆرمی نوێدا جێگیر بێت و لە ڕێگەی میکانیزمی نوێوە لە دەستی کۆمەڵێک یاریزانی گەنجی پەراوێزخراوی پێشوودا بێت، لە کاتێکدا سوودی هێزی دامەزراوەی بیرۆکراتی گەورە کەم دەبێتەوە؟ بەرزبونەوەی هێزی بچووکتر بۆ یەکەم جار ئەم جۆرە پرسیارانە دروست دەکات و ئەگەری ئەوە دەکاتەوە کە هێزەکە بەشێوەیەکی دیار جیاببێتەوە لە قەبارە و مەودای دامەزراوەکە.

## بەشی چوارەم

## چۆن هێز کاریگەری خۆی لە دەست دا؟

## شۆڕشەکانی زۆربوون و گەڕان و عەقڵییەتەکان

خافییێر سۆلانا، وەزیری دەرەوەی ئیسپانیا، کە لە ناوەڕاستی نۆوەتەکانی سەدەی بیستەم بوو بە سکرتێری گشتی ناتۆ، و پاشان ڕێکخەری سیاسەتی دەرەوەی یەکێتی ئەوروپا، بە منی گوت: "لە ماوەی چارەکی سەدەی ڕابردوو - کە سەردەمێک بوو قەیرانی بالکان و عێراق و دانوستانەکان لەگەڵ ئێران و کێشە ئیسرائیلی و فەلەستینیەکان، و زۆر گرفتی تری تێدابوو - ببینە چۆن هێزەکان و هۆکارە نوێیە جۆراوجۆرەکان تەنانەت دەوڵەمەندترین هێزەکان و زیاتر پێشکەوتووەکانی دامرکاندووە لە لایەنی تەکنەلۆجیا. ئەو - و مەبەستم خۆمان - چیتر ناتوانێت ئەوە بکات کە دەیەوێت جگە لە هەندێکی دەگمەن ".

سۆلانا ڕاستی کرد لەوەی کە گووتی ؛ یاخیبوان و پارتە سیاسیە پەراوێزخراوەکان و کۆمپانیا داهێنەرە مۆدێرنەکان و چەتەکانی ئەنتەرنێت و چالاکوانە ڕێکخراوەکان و میدیای هاوولاتیە تازە پێگەیشتووەکان و گەنجانی گۆڕەپانی شارەکان ئەوانەی سەرکردایەتیان نیە، و ئەو تاکانەی کە خاوەن کاریزمان کە پێدەچێت " لە شوێنێکی نادیارەوە هاتبن"، هەموویان سیستەمی کۆن و روکنەکانی دەهەژێنن. هەموو ئەم دیاردانەش دڵخۆشکەر و قبوڵکراو نیە؛ بەڵام هەر یەکەیان بەژدارە لە هەڵوەشانەوەی هێز دەریاییەکان و هێزەکانی پۆلیس و تۆڕەکانی تەلەفزیۆن و پارتە سیاسیە تەقلیدیەکان و بانکە زەبەلاحەکان.

ئەمانەش هێزە بچووکەکانن: لایەنی کاریگەر و بچووکن یان نەناسراون یان پێشتر ناویان نەهاتووە، چەند ڕێگایەکی دۆزیوەتەوە بۆ لاوازکردنی یاریزانە

## کۆتایی سەردەمی هێز

گەورەکان - ڕێکخراوە بیرۆکراسیە زەبەلاحەکان کە دەستیان بەسەر بوارەکان دا گرتووە لە ڕابردوو - یان دەورەدانیان یان پەکخستنیان. وە بە پشت بەستن بە بناماکانی ڕابردوو، پێویستە ئەم هێزە بچووکانە لادانێک بن لە ڕێڕەوی جێگیر؛ چونکە قەبارە، یان هاوئاهەنگی یان داهات یا ناوبانگی پێشوەختەیان نیە، تەنانەت نابێت لە چوونە ژوورەوەی یاریەکەش سەرکەوتوو بن، یان بە لایەنی کەم بۆ ماوەیەکی درێژ سەرکەوتوو نەبێت پێش ئەوەی لە لایەن ڕکابەرێکی زاڵەوە پانبکرێتەوە یان دەستی بسەردا بگرێت، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاستە. لە ڕاستیدا ئەم هێزە بچووکانە یاریزانە چەسپاوەکان بێ بەش دەکات لە هەڵبژاردنە جۆراوجۆرەکان، تەنانەت لە هەندێ حاڵەت ئەم هێزە بچووکانە لە ڕکابەریەکانیش دژی یاریزانە گەورەکان سەرکەوتوو دەبن.

بۆیە ئایا ئەم هێزە بچووکە نوێیانە ئەمە بەدەست دەهێنن لە ڕێگای بردنەوەی ڕکابەری و دەرکردنی کۆمپانیا گەورەکان لە بواری کارەکانیان؟ بەدەگمەن ئەمە ڕوودەدات، چونکە ئەمانە ئامادەکراو نین بۆ پرۆسەکانی دەست بەسەر داگرتنە فراوانەکان، و باشیەکەی بە دیاریکراوی ئەوەیە کە ئەو باری قورس نەکراوە بە بارگرانیەکانی قەبارە و مەودا و پلەبەندی و داهاتەکان و بەڕێوەبردنی ناوەندی و پێهاتە ڕەچەڵەکیەکان؛ بە مانای ئەو ڕێکخستنانەی کە یاریزانە گەورەکان بەکاریان هێناوە و کات و کۆششێکی زۆریان خەج کردووە لە پێشخستن و بەڕێوەبردنی. وە هەر چەندە هێزی بچووکەکان ئەم تایبەتمەندیانە بەدەست بێنن، زیاتر دەگۆڕێن بۆ ئەو جۆرە دامەزراوەیانەی کە هێزە بچووکە نوێیەکانی تر بەهەمان کاریگەری هێرشیان دەکەنە سەر. وە لە جیاتی ئەوە، هێزە بچووکە سەرکەوتووەکان سوود لە کۆمەڵێک سوود و ڕێگای نوێ وەردەگرن. ئەوە یاریزانە گەورەکان ماندوو دەکەن، و بەربەست دەخاتە پێشیان، و لاوازیان دەکات، و لەناویان دەبات و بە جۆرێک دەوریان دەدەن خۆیان دەبیینەوە ئامادەنین بەرەنگاریان ببنەوە

سەرەرای سەرچاوە زەبەلاحەکانیان. کاریگەری ئەم میتۆدانە لە شێواندنی سەقامگیری کۆمپانیا گەورە چەسپاوەکان و لادانیان مانای ئەوە دەگەیەنێت کە دارمانی هێز وای لێهاتووە ئاسانتر دەبێت، و بە هێزکردنی زەحمەترە. بانگەشەکان سەرسامکەرن. ئاماژە بە ماندووکردنی بیرۆکراسیەکانی فیبەر ( بە گوێرەی فیبەر) دەکات. ئەو سیستەمە دامەزراوییەی کە سودەکان، و هەروەها تراژیدیەکانیشی، هێنا لەسەدەی بیستەمدا. جیاکردنەوەی هێز لە قەبارە، و پاشان جیاکردنەوەی توانا لەسەر بەکارهێنانی هێز بە شێوەیەکی کاریگەر لە کۆنترۆڵکردنی بیرۆکراتیفیبەری زەبەلاح، دەستی کردووە بە گۆڕینی جیهان. وە ئەم جیاکردنەوەیەش ئەمانبات بۆ بیرکردنەوەیەکی بێزارکەر: ئەگەر ئایندەی هێز لە لەناوچوون و لادان بێت نەوەک لە بەڕێوەبردن و چەسپاندن، ئایا هەرگیز دەتوانین چاوەڕێی ئەوە بکەین کە جارێکی تر چێژ لە سەقامگیری ببینینەوە؟

## کەواتە چی گۆڕا؟

قورسە ئەو ساتە دیاری بکرێت کە هێز تێیدا دەستی کرد بە پەرتەوازەبوون و هەڵوەشانەوە، و مۆدیلی بیرۆکراتیفیبەری گەڕاوە دواوە، و قورستریش دیاریکردنی بەو ڕێگە ووردەی کە پێی دیاری کراوە، بۆ نموونە، شاعیر فیلیپ لارکینن لە هاتنی شۆڕشی سێکسی :" لە نێوان کۆتایی قەدەغەکردنی ڕۆمانی لەیدی تشاترلی" و یەکەم ئەلبومی کە لە لایەن گرپی بیتلز بڵاوکرایەوە.

هەرچۆنێک بێت، ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩ - کەوتنی دیواری بەرلین- دەکرێت بە ساتێکی باش بژمێردرێت بۆ دەستپێکردن، چونکە دەرچوونی نیو کیشوەرێک لە چنگی ستەمکاری و کردنەوەی سنوور و بازاڕە نوێکان و کۆتایی جەنگی سارد و ململانێی ئایدۆلۆژی و بوونیەکان هەموویان هۆکار بوون بۆ لاوازکردنی بوونی دەوڵەتێکی ئەمنی نەتەوەیی فراوان و ئەو شتانەی کە پەنیان

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەدا لە داهاتە ئابوری و سیاسی و ڕۆشنبیریەکان. هەموو خەڵک لە کۆت و بەندی ڕزگاریان بوو، لە کودەتایەک دژی ڕژێمەی ئەوکات کە دەربڕدرا لە ڕووداوەکانی وەک لە سێدارەدانی ژاو سیسکۆ لە ڕۆمانیا لە ڕۆژی کریسمەس ١٩٨٩ و چوونەناو بارەگای سەرەکەی دەزگای هەواڵگری لە ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا لە کانوونی دووەمی ١٩٩٠. وە ئەو ئابووریانەی کە لە سیستەمێکی زۆر داخراودا قفڵ کرابووم لەلایەن گروپێکی گەشەپێدراوی کۆمپانیا فرە نەتەوەکان کرانەوە بۆ وەبەرهێنانی بیانی و بازرگانی. وەک ژەنەراڵ ویلیام ئۆدۆم، بەڕێوەبەری ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی لە سەردەمی سەرۆک ڕۆناڵد ڕیگان، تێبینی کرد: "بە دامەزراندنی چەترێکی ئەمنی کە ئەوروپا و ئاسیای گرتەوە، ئەمریکییەکان توانیویانە خەرجی مامەڵەی بازرگانی لە هەموو ئەم هەرێمانە کەم بکەنەوە، وە لە ئەنجامدا ئەمریکای باکور و ئەوروپای ڕۆژئاوا و باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەموویان دەوڵەمەند بوون". ئەو نرخە نزمانەی مامەڵەکان ئێستا دەتوانرێت درێژ بکرێنەوە، وە لەگەڵیشی بەڵێندان بە ئازادی ئابووری زیاتر.

دوای ساڵێک کەمتر، لەوکاتەوەی کە ئەڵمانییەکان چەکوش و شۆفڵەکانیان لە دیواری بەرلین بەکارهێنا لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠دا، تیم بێرنەرس لی، زانای کۆمپیوتەری بەریتانی لە ڕێکخراوی ئەوروپی بۆ توێژینەوەی ناوکی لەسەر سنووری فەرەنسا و سویسرا، سەرکەوت لە ناردنی یەکەم پەیوەندی لەنێوان پرۆتۆکۆلی گواستنەوەی تێکستی خێرا ( HTTP) و سێرڤەر لە ڕێگای ئەنترنێت، وە بەمەش تۆڕێکی جاڵجاڵۆکەیی جیهانی بنیادنرا. ئەو داهێنانە، لەلایەکی ترەوە شۆڕشی پەیوەندیە جیهانییەکانی هەڵگیرساند کە کاریگەری لەسەر هەموو بوارەکانی ژیانمان هەبوو.

گومانی تێدانیە کەکۆتایی جەنگی سارد و لەدایک بوونی ئینتەرنێت توانایان هێزە بچووکەکان بەرزکەنەوە، بەڵام بەهەر حاڵ ئەم دوو فاکتەرە گرنگە بەهیچ

شێوەیەک بە تەنیا نەبوونە. چونکە ئێمە زۆر جار بە زەحمەت بەرگەی ئەو ئارەزووە دەگرین کە ماوەیەک لە ماوەکانی گۆڕانکاریەکی گەورە بۆ یەک هۆکار ببەخشین. بۆ نموونە، ڕۆڵی پەیامە تێکستەکان و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەک فەیسبووک و تویتەر وەرگرە لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی جیهاندا. مشتومڕێکی زۆر توند بەرپابوو، بەڵام لە کۆتاییدا بێهودەبوو، لە نێوان ئەو کەسانەی کە پێیان وایە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بزووتنەوەی سیاسی نوێیان دروست کردووە و ئەوانەی وادەبینن کە کاریگەریەکەی زێدەڕەوی تێداکراوە. بەوەی توخمێکە لە توخمەکانی ململانێ لەسەر دەسەڵات، تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان یارمەتی ڕێکخستنی خۆپیشاندانیان داوە و ئاگادارکردنەوەی دنیای دەرەوە بە پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ. بەڵام ڕژێمە سەرکوتکەرە لێهاتووەکان، وەک ئێران و چینییەکان، ئەم ئامرازانە بۆ چاودێری و سەرکوتکردنیش بەکاردێنن. وە کاتێک حکومەت هەر گومانێکی دەبێت، دەتوانێت بە ئاسانی ئینتەرنێتی نەتەوەیی دابخات، یان سیستەمێکی فلتەر و کۆنترۆڵ دامەزرێنێت کە لێشاوی پەیوەندیە نەخوازراوەکان لە سەر ئینتەرنێت سنووردار بکات (هەروەک چین بە دیوارە ئاگرینە مەزنەکەی ئەنجامی داوە). چەندین کەیس و کەیسێکی پێچەوانە هەن کە مشتومڕی گەشبینەکان بە ئینتەرنێت و پسپۆڕەکان لە خوێندنی تەکنەلۆجیای داهاتوو ڕووندەکاتەوە، وەک کلای شیرکی، و هەروەها ئەو مشتومڕە پێچەوانانەی کە لەلایەن گومانکارانەوە دەوروژێندرێن، وەک ئیڤگنی مۆرۆزۆڤ و مالکۆڵم گلادوێل. لەبەر ئەوە ئەگەر بمانەوێت لەو هۆکارانە تێبگەین کە وایکرد بەربەستەکانی دەسەڵات ئاسانتر ببڕدرێت، دەبێت سەیری گۆڕانکارییە قووڵەکان بکەین - بۆ ئەو گۆڕانکارییانەی کە دەستیان کرد بە کەڵەکەبوون و خێراکردن تەنانەت پێش کۆتایی هاتنی جەنگی سارد یان سەرەتای داهێنانی ئینتەرنێت. ئەو تەحەدا گەورانەی کە لە سەردەمی ئێمەدا ڕووبەڕووی دەسەڵات دەبێتەوە لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

**گۆڕانکاریەکانی بنەماکانی ژیانەوە هاتووە - ئێمە چۆن دەژین؟ لە کوێ دەژین؟ وە بۆ ماوەی چەند؟ وە لە چ ئاستێکی ژیان؟ ئەوەی گۆڕاوە ئەو دیمەنیە کە هێزەکە تێیدا کاردەکات.**

دیمەنی پێهاتە دانیشتوانەکان، و ئاستی بژێوی و ئاستەکانی تەندروستی و پەروەردە و شێوازی کۆچ و خێزان و کۆمەڵگا و دواجار هەڵوێستەکانمان: خاڵە سەرچاوەکانە بۆ ئاوات و باوەڕ و ئارەزووەکانمان و ئەو ڕێگایانەیە کە بیر لە خۆمان و بە دڵنیاییەوە لە ئەوانی تر دەکەینەوە. بۆ ئەوەی ئەم گۆڕانکارییانە لەم ئاستە قووڵەدا باس بکەین، و تێبگەین کە هێز چی دەکات، پێویستە لەسەرمان لێکیکەینەوە بۆ سێ چین: شۆڕشی زۆربوون و شۆڕشی گەڕان و شۆڕشی عەقڵییەتەکان؛ چونکە ئەوەی یەکەم بەربەستەکانی هێز نقوم دەکات، و دووەمیان دەست بە دەورەدانی دەکات، و سێیەمیشیان دەست بە لاوازکردنی دەکات.

### شۆڕشی زۆربوون: زاڵبوون بەسەر ئامرازەکانی کۆنترۆڵدا

سەردەمی ئێمە سەردەمی زۆریە، بە سادەیی هەموو شتێک زۆرە. ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک و دەوڵەت و شارەکان و پارتە سیاسیەکان و سوپاکان هەن؛ هەروەها ژمارەیەکی زۆریش لە کاڵاکان و خزمەتگوزاریەکان و ئەو کۆمپانیایانەی کە دەیانفرۆشن هەن؛ و داوودەرمان و قوتابیەکان و کۆمپیوتەرەکان و دڵخۆشکەران و تاوانباران هەن. بەرهەمی ئابووری جیهانی لە ساڵی ١٩٥٠ەوە پێنج ئەوەندە زیادی کردووە. و داهاتی هەر تاکێکی ئەمڕۆ بۆ سێ ئەوەندە و نیو زیاتر بووە لەوەی کە هەبووە پێشتر. لە هەمووی گرنگتر، دانیشتوانی جیهان دوو بلیۆن زیاترە لە دوو دەیە پێش ئێستا. تا ساڵی ٢٠٥٠ دانیشتوانی جیهان چوار ئەوەندەی ساڵی ١٩٥٠ دەبن. تێگەیشتن لەم ژمارەی دانیشتوانە و هەروەها پێکهاتەی تەمەن و دابەشکردنی جوگرافی و تەمەندرێژی و ئاستی تەندروستی و

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئاواتەکانیان زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن لەوەی بەسەر هێزەکەدا هاتووە.

شۆڕشی زۆربوون تەنها چارەگەک لە دانیشتوانی گۆی زەوەی یان چینێک لە مرۆڤایەتی نەگرتۆتەوە. بەڵکو لە پێشەوەی هەموو ئەو ڕووداوە نێگەتیڤانەدا هاتووە کە هەموو ڕۆژێک مانشێتەکانی ڕۆژنامەکانی داگیرکردووە: سەقامگیربوونی ئابووری، تیرۆریزم، بومەلەرزە، سەرکوتکردن، شەڕی ناوخۆ، کارەساتی سروشتی و هەڕەشەی ژینگەیی. وە بە بێ کەمکردنەوە لە پێداگری ئەم قەیرانانە و ئەو زیانە مرۆیی و جیهانیانەی لێدەکەوێتەوە، دەتوانین جەخت بکەینەوە کە دەیەی یەکەم لە سەدەی بیست و یەک سەرکەوتووترین دەیە بوو لە مێژووی مرۆڤایەتی، هەروەک شیکەرەوە تشارلز کینی دەڵێت " باشترین دەیە لە مێژوومان". هەموو داتا بەردەستەکان پشتگیری ئەم بانگەشەیە دەکەن. چونکە بە پێی بانکی نێودەوڵەتی، لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٥ تا ٢٠٠٨، ڕێژەی دانیشتوان ئەوانەی لە هەژارییەکی زۆردا دەژین (بە داهاتی ڕۆژانەی کەمتر لە ١.٢٥ دۆلار) لە باشوری بیابانی ئەفریقاوە بۆ ئەمریکای لاتین، و لە ئاسیاوە بۆ ئەوروپای ڕۆژهەڵات، بۆ یەکەم جار کەمبۆوە لەو کاتەوە کە ئامارەکانی هەژاری جیهانی بەردەستن. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەو دەیە سەرەتای قووڵترین قەیرانی ئابووری بەخۆوە بینی لە دوای نەبوونیە مەزنەکەی ساڵی ١٩٢٩، ئەوا ئەم پێشکەوتنە زیاتر سەرسوڕهێنەرە. لە ڕاستیدا، لە ناوەڕاستی قەیرانەکەدا، ڕۆبێرت زیلیک سەرۆکی ئەوکاتی بانکی جیهانی نیگەرانییەکی زۆری دەربڕی سەبارەت بە بانگەشەکانی توانەوەی دارایی لەسەر هەژاری، ئەو گوتی شارەزایان پێیان وتووە کە ژمارەی هەژاران بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات. وە خۆشبەختانە پسپۆرەکان هەڵەبوون. چونکە لە ڕاستیدا پێشبینی دەکرێت جیهان ئامانجی گەشەسەندنی هەزارەی لەسەر هەژاری بە ماوەیەکی زۆر پێش وادەی دیاریکراو بەدەست بهێنێت ، کە لە ساڵی ٢٠٠٠ لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دانراوە، یەکێک لەو ئامانجانە

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەوەیە کە هەژارییەکی زۆر تا ساڵی ٢٠١٥ کەم بکرێتەوە،و ئەم ئامانجەش هاتە دی پێنج ساڵ لە پێش بەرواره دیاریکراوەکەی.

ڕوونکردنەوەکە ئەوەیە کە ئابووری وڵاتە هەژارەکان بەردەوام بووە لە فراوان بوون و دروستکردنی هەلی کار سەرەڕای قەیرانەکە. ئەم ڕەوتە سێ دەیە پێش ئێستا دەستی پێکرد، بۆنموونە، لە ساڵی ١٩٨١ ەوە، ٦٦٠ ملیۆن چینی لە بازنەی هەژاری دەرچوون. وە لە ئاسیا ڕێژەی ئەو کەسانەی کە لە هەژارییەکی زۆردا دەژین لە ٧٧٪ ی دانیشتوانی لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم بۆ ١٤٪ لە ساڵی ١٩٩٨ دابەزی. ئەم دەستکەوتە نەک تەنیا لە چین و هیندستان و بەرازیل و ئابووریە سەرکەوتووەکانی تری، بەڵکو لە هەژارترین وڵاتانی ئەفریقاش ڕوودەدات. ئابووریناسان ماکسیم بێنکۆفیسکی و شیفەر سالا مارتن لە نێوان ساڵانی ١٩٧٠ و ٢٠٠٦ ڕوونیان کردەوە کە هەژاری لە ئەفریقا زۆر خێراتر لەوەی کە بە گشتی دەناسرێت دابەزیوە. ئەم دوو ئابووریناسە لەسەر بنەمای شیکردنەوەیەکی ئاماری ورد گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە "دابەزینی هەژاری لە ئەفریقا" ڕەوتێکی گشتی بەرچاو بوو کە ناتوانرێت بە قەبارەی دەوڵەت یان تەنانەت لەلایەن گروپێکی تاکە وڵاتەوە کە هەندێک تایبەتمەندی جوگرافی یان مێژوویی بەسوودی هەیە لێکبدرێتەوە. چونکە هەموو جۆر دەوڵەتەکان، ئەوانەش کە بارودۆخی جوگرافی و مێژوویيان ناگونجاوە، کەمبوونەوەیەکی بەرچاویان بەخۆدیوە لە هەژاری. وە بە شەوەیەکی دیاریکراو، هەژاری لە هەردوو وڵاتە کەنەریەکان و ناکەناریەکان وەک یەک کەمبۆتەوە؛ وە لە وڵاتە دەوڵەمەندەکان بە کانزاکان، و ئەوانەش کە کانزایان نیە، و لەو دەوڵەتانەش کە کەرتی کشتوکاڵی گونجاویان هەیە و لەوەنەش کە نیانە؛ و لەو دەوڵەتانەش کە مێژوویەکی جیاوازیان هەیە لەگەڵ داگیرکەران، و هەروەها لەوانەش کە جیاوازی بەخۆیانەوە دەبینن لە تێکڕای ناردنی کۆیلەکان لە ماوەی سەردەمەکانی بازرگانی کۆیلە لە ئەفریقا. لە ساڵی ١٩٩٨، وە بۆ یەکەم

جار کە زانیاریەکان بەردەست بوون، ژمارەی ئەفریقیەکان ئەوانەی کە لەسەرەوەی هێڵی هەژاری دەژین گەورەتر بوو لەوانەی کە لە ژێرەوەی دەژین.

بە هەر حاڵ هێشتا ملیۆنەها خەڵک لە بارودۆخی زۆر خراپ دەژین. دەستکەوتنی بژێوێکی ژیان کە بکاتە ٣ یان ٥ دۆلار (لە جیاتی ٢٥.١ دۆلار)، کە بانکی نێودەوڵەتی بە هێڵی هەژاری دایناوە، کەسی هەژار لە بازنەی هەژاری دەرناکات، بەڵکو مانای ژیانێک دەدات لە تەنگانە و بێبەشبوون. بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە چۆنایەتی ژیان باشتر بووە تەنانەت بۆ هەژارترین دانیشتوانی جیهان، و ئەو یەک ملیار کەسەش لە نزمترین پایەی پەیژەی بژێو دادەنرێن. لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە تێکڕای مردنی منداڵان زیاتر لە ١٧% دابەزیوە، و تێکڕای ٦٠% ی مردنی منداڵان بە نەخۆشی تیفۆید کەمیکردووە لە نێوان ساڵانی ١٩٩٩ و ٢٠٠٥. وە لە وڵاتە گەشەسەندوەکاندا ژمارەی تووشبووانی "بەدخۆراک"ی لە ٣٤% لە ساڵی ١٩٧٠ بۆ ١٧٪ لە ساڵی ٢٠٠٨ دابەزیوە.

ئەو گەشە خێرایەی کە زۆرێک لە وڵاتە هەژارەکان بەخۆیانەوە دەبینن، و ئەنجامی کەمبوونەوەی تێکرای هەژاری، بوونەتە گەشەسەندی چینە مامناوەندەکانیش لە جیهاندا. بانکی نێودەوڵەتی دەڵێت:لە ساڵی ٢٠٠٦ەوە، ٢٨ لە " وڵاتە کەم داهاتەکان"ی پێشوو بەژداریان لەو ڕیزانە کردووە کە ناویانراوە بە " وڵاتە داهات مامناوەندەکان". ڕەنگە ئەم چینە ناوەندییە نوێیانە لە ئاستی هاوتاکانیان لە وڵاتانی پێشکەوتوودا گەشە نەکەن، بەڵام ئەندامەکانیان ئەمڕۆ چێژ لە ستانداردێکی بێوێنەی ژیان وەردەگرن. وە ئەمە خێراترین چینی گەشەسەندووی دانیشتوانە لە جیهاندا. هەروەک هۆمی خەراس یەکێک لە توێژەرە هەرە بەرزەکانی جیهان لە پەیمانگای بروکینگس پێی وتم: "چینی ناوەندی جیهانی لە ساڵی ١٩٨٠ بۆ ساڵی ٢٠١٢ لە ملیارێکەوە بۆ دوو ملیار زیادی کردووە. وە ئەم چینەی کۆمەڵگا ئێستاش بەردەوامە لە گەشەکردن بە شێوەیەکی

زۆر خێرا، و لەوانەیە بگاتە سێ ملیار کەس تا ساڵی ٢٠٢٠. وە بە گوێرەی خەملاندنی من، تاساڵی ٢٠١٧، چینی مامناوەندی ئاسیا گەورەتر دەبێت لە ژمارەی هاوتای ئەمریکا باکوور و ئەوروپایی بەیەکەوە. وە تا ساڵی ٢٠٢١، وە بە پێی ڕەوتە هەنووکەییەکان، دەکرێت زیاتر لە ٢ بلیۆن ئاسیایی لە چینی ناوەندا هەبێت. چونکە تەنیا لە چین، دەکرێت زیاتر لە ٦٧٠ ملیۆن بەکاربەر لە چینی مامناوەند بێت".

وە خاراس ئاماژە بەوە دەکات کە ئەمە تەنیا لە ئاسیا ڕوو نادات: "لە هەموو جیهاندا وڵاتانی هەژار کە گەشەیەکی خێرایان هەیە، بەردەوام ژمارەیەک لە دانیشتوانیان زیاد کردووە بۆ چینە مامناوەندەکانیان وە من هیچ شتێک نابینم بۆ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە ئەم ڕەوتە لە چەند ساڵی داهاتوودا بەردەوام نابێت سەرەڕای ئاستەنگە پچڕاوەکان لەسەر ڕێگاکە، کە ڕەنگە بۆ ماوەیەک گەشەی چینی ناوەند لە هەندێک دەوڵەتدا خاو بکاتەوە. بەڵام ڕەوتەکە لە ڕووی جیهانییەوە ڕوونە".

دیمەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی جیهانی لە سێ دەیەی ڕابردوودا بە شێوەیەکی ڕیشەیی گۆڕاوە. وە لیستی گۆڕانکاریەکان دووروودرێژەکان- لە ڕاستیەکەی واتە دەستکەوتەکان - بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە درێژە: ٨٤% ی دانیشتوانی جیهان ئێستا دەزانن چۆن بخوێننەوە و بنووسن بە بەراورد بە ٧٥% لە ساڵی ١٩٩٠. وە ئاستی خوێندنی زانکۆ زیادی کردووە و تەنانەت تێکڕای نمرەکان لەسەر تاقیکردنەوەکانی بلیمەتی لە سەرانسەری جیهاندا لە ئێستادا بەرزتر بووە. لە هەمان کاتدا، مردووانی جەنگ ئێستا زیاتر لە ٤٠% کەمترن لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە. و مامناوەندی تەمەن لەو وڵاتانەی کە زۆرترین زیانیان بە نەخۆشی ئایدز کەوتوون دووبارە دەستی بە بەرزبوونەوە کردووە. وە ئێستاش ئێمە پێداویستییە کشتوکاڵیەکانمان باشتر لە جاران دابین دەکەین، چونکە لە ساڵی ٢٠٠٠ ەوە،

بەرهەمی دانەوێڵە لە جیهانی گەشەسەندوودا بە تێکڕای دوو ئەوەندەی دانیشتوان زیادی کردووە. تەنانەت "توخمە دەگمەنەکانی زەوی" - ئەو حەڤدە توخمە دەگمەنەی کە لە پیشەسازی مۆبایل و پاڵاوتنی سووتەمەنی بەکاردێت، چیتر زۆر دەگمەن نین، چونکە بازاڕەکان ئێستا سەرچاوە نوێ و بەرهەمهێنەرە نوێی دەچێتە ناو. وە لەوانەیە یەکێک لەهۆکارەکانی ئەم هەموو پێشکەوتنە فراوانبوونی خێرای کۆمەڵگەی زانایانی پسپۆڕ بێت، ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و گەشەپێدانی (OECD) ڕاپرسیەکی ئەنجامدا، تێیدا ئەوەی نیشان دا ژمارەی ئەو زانایانەی کە کار دەکەن لەو وڵاتانەی کە ڕاپرسیەکەی تێدا کراوە لە ٣.٤ ملیۆن لە ساڵی ١٩٩٩ بۆ ٣.٦ ملیۆن لە ساڵی ٢٠٠٩ زیادی کردووە. ئەم ژمارەیەش زۆرێک لەو وڵاتانە ناگرێتەوە کە توێژێکی فراوان و گەشەسەندووی زاناکانی هەیە، دیارترینیان هیندستان.

گومان لەوەدا نییە کە ئەمڕۆ مرۆڤ چێژ لەژیانێکی درێژتر و تەندروستی باشتر وەردەگریت، بەپێی پێڕستی گەشەپێدانی مرۆیی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە نیشاندەری تەندروستی و پەروەردەو داهات تێکەڵ دەکات بۆ پێدانی پێوانەیەکی جیهانی بۆ خۆشگوزەرانی، لە ساڵی ١٩٧٠ەوە ئاستەکانی بژێوی لە سەرانسەری جیهان بەرزبۆتەوە. لە ڕاستیدا، بە پەنجەکانی یەک دەست دەتوانی ژمارەی ئەو وڵاتانە بژمێریت کە ستانداردەکانی ژیان لە ساڵی ٢٠١٠ کەمتر بوون لە ساڵی ١٩٧٠. وە لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٠ و ٢٠١٠دا، ئیندێکسی گەشەپێدانی مرۆیی لە هیچ وڵاتێک لە جیهاندا کەم نەبۆوە، جگە لە زیمبابۆی. لە هەژاری و مردنی منداڵەوە تا گەیشتن بە پەروەردە و بەدەستهێنانی فێربوون و زیادبوونی پلە گەرمیەکان، ژمارە سەرەکیەکان لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٢دا باشتر بوو لە ساڵی ٢٠٠٠. بە سادەیی، ملیارەها کەس کە تا ئێستا بە نزیکیی بەبێ شتێک ژیاون، ئێستا چێژ لە خواردن زیاتر و دەرفەتی زیاتر و ژیانی درێژتر لە جاران وەردەگریت.

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئامانجی من لێرە ئەوەیە نیە وەک دکتۆر پانگلۆس بم - لە شانۆگەریی ڤۆلتێردا - کە جەختی کردەوە "هەموو شتێک بەرەو باشتر دەڕوات لە هەموو جیهانەکان، تابکرێت باشتر ". لە ڕاستیدا، هەریەک لە دەستکەوتە ناوبراوەکان ئاماژە بە تەحەدای بەرچاو و جیاکارییەکان دەکەن کە زۆرجار دەگۆڕێن بۆ تراژیدیا. پێشکەوتن لە وڵاتە هەژارەکاندا بە پێچەوانەی ئەو بارودۆخەی ئەم دواییەی ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا وەستاوە، ئەو چینەی کە دەیان ساڵە چێژ لە گەشەکردن و خۆشگوزەرانی وەردەگرت دەستی کردووە بە لەدەستدان و چوونەوەیەکی هێزە ئابووریەکیە بەهۆی دارمانی داراییەوە. هەرچۆنێک بێت، وێنەی گشتی ژیانی درێژتر و تەندروستتر کە مرۆڤ تێیدا ئەژییێت، کە پێداویستییە سەرەتاییەکانی لە هەموو کاتێکی پێشتر بە شێوەیەکی زۆر باشتر تێدا بەدی دەکرێت، ئەمڕۆ شتەکی زۆر گرینگە بۆ تێگەیشتن لە گۆڕانەکان و پرۆسەکانی دابەشکردنی دەسەڵات، وە بۆ پێدانی لێکدانەوەی مۆدێرنتر بۆ ڕووداوە هەنووکەییەکان بە پێی ناوەڕۆکی. بەڵێ بەهاری عەرەبی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکانی ئەم دواییە سوودێکی زۆریان لە تەکنەلۆجیای مۆدێرن وەرگرتووە. بەڵام ئەم گۆڕانکاریانە زیاتر قەرزاری بەرزبوونەوەی خێرای تەمەنی چاوەڕوانکراو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقیا لە ساڵی ۱۹۸۰ەوە؛ هەروەها قەرزاری زیادبوونی ژمارەی ئەو گەنجانەی کە لە ملیۆنەها تاکی خوێندەواری تەندروست پێک دێت ئەوانەی کە هێشتا ژیانێکی درێژیان لەبەردەمدا ماوە، بەڵام هیچ پیشە یان هەلێکیان نیە؛ بەم جۆرەش قەرزاری بەرزبوونەوەی چینێکی مامناوەندی چالاکی سیاسیە. وە ڕێکەوت نیە کە بەهاری عەرەبی لە وڵاتی تونس دەستی پێکرد، ئەوە وڵاتەی باکوری ئەفریقیا کە باشترین ئاستی ئابوری هەبوو و زیاتر سەرکەتوو بوو لە بەرزکردنەوەی هەژارەکانی بۆ چینی مامناوەند. گومانی تێدانیە بزوێنەری زۆرێک لەگۆڕانکارییە سیاسییەکان لەم

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

دمیەیەدا بوونی چینێکی مامناوەندە کە بێ ئارامە و باشتر لەڕاستیەکان تێدەگات و دمیەوێت خێراتر لەحکومەت بەرەوپێش بچێت و لێخۆشنەبوونی بەرامبەر گەندەڵی گۆڕیویەتی بۆ ئۆپۆزسیۆنێکی کاریگەر. گەشەی دانیشتوان و داهات لە خۆیاندا بەس نین بۆ گۆڕینی ئەزموونی هێز: چونکە هێز لەوانەیە لە هەندێک دەستی کەم بە چڕی بمێنێتەوە. بەڵام شۆڕشی زۆربوون تەنیا دەربارەی چەندێتی نییە، بەڵکو مانای باشبوونی چۆنیەتیی ژیانی خەڵکیشە. چونکە کاتێک خەڵک خواردنیان، تەندروستیان، ڕۆشنبیریان، هۆشیاریان و پەیوەندیان لەگەڵ ئەوانی تر باشتر بوو، زۆرێک لەو هۆکارانەی کە دەسەڵاتیان بەچەند دەستێکەوە بەستۆتەوە بەئەندازەی پێویست بێ کاریگەر دەبن.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە: کاتێک خەڵک ژمارەیان زۆر بێت و ژیانێکی تەواو بژین، کۆنترۆڵکردنیان قورستر دەبێت. پیادەکردنی هێز لە هەر بوارێک لە بنچینەدا پێویستی هەیە بە توانای کۆنترۆڵکردنی وڵات و بازاڕ و دەنگدەران و دانیشتوانی لایەنگری حکومەت و تۆڕی ڕێگا بازرگانیەکان و ...هتد، و پارێزگاری کردن لەو کۆنترۆڵکردنە. کاتێک دانیشتوانی ئەو وڵاتە - ئینجا چ سەربازی شاراوە بن، یان دەنگدەرەکان، کڕیارەکان، پێشبڕکێکارەکان یان پابەندبووانی ئایینیەکان- ژمارەیان زۆرتربێت و بە تەواوی خاوەنی ئامرازەکانی خۆیانن و لە ئاستی بەرزی تواناد لە هەموو کاتێکی تر کار دەکەن، ئەوا پرۆسەی هەماهەنگی و کۆنترۆڵ کردنیان قورستر دەبێت. ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا زبیگنیو برزینسکی سەبارەت بە گۆڕانکارییە ڕادیکاڵەکانی ناو ڕێکخستنی جیهان لەو کاتەوەی کە چووە ناو ژیانی گشتیەوە گوتی: "کوشتنی ملیۆنێک مرۆڤ ئەمڕۆ بە شێوەیەکی بێئەندازە ئاسانترە لە کۆنترۆڵ کردنیان"، و سەبارەت بەوانەی لە دەسەڵاتدان، ئەوا شۆڕشی زۆربوون ئاستەنگی گوماناوی دروست دەکات: چۆن دەتوانرێ دەسەڵات بە کاریگەری

## کۆتایی سەردەمی هێز

بسەپێنرێت کاتێک بەکارهێنانی هێز خەرجی و مەترسی زیاترە؟ چۆن دەتاونرێت هێز فەرز بکرێت کاتێک ژیانی خەڵک لە هەموو بوارەکاندا تەواوە و هەست بە سەربەخۆیی زیاتر و کەمتر لاوازبوون دەکەن؟ چۆن کار لە خەڵک دەکرێت و لەبەرامبەر دڵسۆزیان خەڵات بکرێن لە جیهانێک کە بژاردەی زیاتریان پێ دەبەخشێت؟ ئەرکی حوکمڕانی کردنی ژمارەیەکی زەبەلاح لە خەڵک کە چێژ لە ئاستە باشەکانی بژێو دەکەن، یان ڕێکخستنیان یان پڕکردنیان یان کارتێکردنیان یان قەناعەت پێهێنانیان یان کۆنترۆڵکردن یان سەرکوتکردنیان، پێویستی بە شێوازەک هەیە جیاوازە لەو شێوازانەی کە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە لە کۆمەڵگا بچووکتر و کەمتر گەشەسەندوو.

شۆڕشی جووڵانەوە (گەڕان): کۆتایی سەدەی جەماوەری دیلکراو هیچ کاتێک وەکو ئەمڕۆ ژمارەی مرۆڤ نەبووە، زۆربەیان نەک تەنیا ژیانێکی تەواو و تەندروست بەسەر دەبەن، بەڵکو لە جاران زیاتریش دەگەڕێن؛ وە ئەمەش وادەکات کۆنترۆڵکردنیان زەحمەت بێت، وە لە هەمان کاتدا ئەمە دابەشکردنی هێز لەنێو میللەتەکان و نێوانیان دەگۆڕێت، ئینجا چ لە ڕێگای بەرزبوونەوەی ڕێتمی کۆچکردنە نەتەوەیی یان ئایینی یان پیشەیی بێت، یان لەبەر ئەوەی بیرۆکەکان و سەرمایەداری و باوەڕەکان دەتوانن فاکتەری ئاژاوەو توانا بن. وە مەزندەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژە بەوە دەدات کە ٢١٤ ملیۆن کۆچبەر لە جیهاندا هەن، بە زیادەی ٣٧٪ لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوو. هەر لەو ماوەیەدا ژمارەی کۆچبەران لە ئەوروپا بەڕێژەی ٤١٪ و لە ئەمریکای باکوور بەڕێژەی ٨٠٪ زیادی کردووە. ئێمە لە شۆڕشی جوڵەدا دەژین کە تێیدا خەڵک بە ڕێژەیەکی زۆر زیاتر لە هەموو کاتێکی تر لە مێژووی جیهاندا کە بینیومانە دەجوڵێنەوە.

بۆ نمونە، کاریگەری جوڵەی خێرای جیهانی لە جوڵەی کرێکاریی ئەمریکادا وەربگرە. لە ساڵی ٢٠٠٥دا، شەش سەندیکای کرێکاران لە یەکێتی کرێکارانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەمەریکا و کۆنفرانسی ڕێکخراوە پیشەسازییەکان دەرچوون بۆ پێکهێنانی یەکێتیەکی ڕکابەری بەناوی گۆڕان بۆ سەرکەوتن. یەکێتیە جیابووەکان هەریەک لە فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی بۆ کارمەندانی خزمەتگوزاری و فیدراسیۆنی پیشەسازی جل و بەرگی لەخۆگرتبوو، هەردوو یەکێتیەکە بریتی بوون لە ڕێژەیەکی زۆر لە کرێکارە کۆچبەرە کەم داهاتەکان کە بەرژەوەندی و ئەولەویەتی جیاوازیان هەبوو لەگەڵ یەکێتیە پیشەسازییە کۆنەکان و بنەماکانی، وەک یەکێتی شۆفەری بارهەڵگرەکان. کاریگەری ئەم دابەشبوونە بۆ سیاسەتی نەتەوەیی درێژبۆوە. وەک پەیامنێری نیویۆرک تایمز جەیسن دیپارل گوتی" یەکێتیەکانی گۆڕان لە پێناو بردنەوە ڕۆڵێکی گێڕا (هەندێک دەڵێن یەکلاکەرەوە بوو) لە قۆناغەکانی سەرەتای یەکەم هەڵمەتی سەرۆکایەتی بەڕێز ئۆبامادا". وە لە کاتی هەوڵدانی سەرۆک ئۆباما بۆ خولی دووەمی سەرۆکایەتی ساڵی ٢٠١٢، دەنگدەرانی لاتینی سەلماندیان کە فاکتەرێکی دیاریکەرن لە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنانە. بەم شێوەیە چاوەڕوان نەکراوە، بزووتنەوە نێودەوڵەتیەکە یارمەتیدەر بوو لە داڕشتنی دەرەنجامە سیاسییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەروەک لە هەموو شوێنێکی جیهاندا دەیکات.

وە بەپێی یاسای ریفراندۆمی سودانی ساڵی ٢٠٠٩ کە لە لایەن پەرلەمانی سودانەوە دەرچوو، سودانیە پارچەبووەکان - لەوانە ١٥٠ هەزار کەس لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، توانیان لە ڕیفراندۆمی ساڵی ٢٠١١دا دەنگ لەسەر جیابوونەوەی باشووری سودان بدەن. هەروەها هەندێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی پیرانی کۆلۆمبیا کە لە لایەن کۆلۆمبیەکان هەڵبژێردراون لە دەرەوەی وڵات دەژین. وە ئەو سیاسەتمەدارانەی کە کاندیدن بۆ پۆسی حاکم یان سەرۆک لەو وولاتانەی کە ژمارەیەکی زۆر لە کۆچبەری هەیە - بۆ نموونە بۆ حاکمی ویلایەتەکان لە مەکسیک یان بۆ سەرۆکایەتی لە سینیگال - زۆرجار بۆ

شیکاگۆ یان نیویۆرک یان لەندەن یان هەر شوێنێکی تر گەشت دەکەن کە هاوڵاتیەکانیان تێدا جێگیربوونە بۆ کۆکردنەوەی دەنگەکان و پارە.

بەهەمان شێواز کۆچبەران دەستیان کردووە بەگۆڕینی سروشتی بازرگانی و ئاین و کەلتوور لەو وڵاتانەی تێیدا نیشتەجێن. هەر لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ژمارەی لاتینیەکان لە ٢٢ ملیۆنەوە لە ساڵی ١٩٩٠ بۆ ٥١ ملیۆن لە ساڵی ٢٠١١ زیادی کردووە، و ئێستا لە شەش ئەمریکیدا یەک لاتینی هەیە، و لاتینیەکانیش زیاتر لە نیوەی ڕێژەی گەشەکردن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان پێک دێنن لەو دەیەی ڕابردوو. لە دیربورن لە ویلایەتی میتشیگان، کە مەقەڕی جیهانی کۆمپانیای فۆردی تێدایە، ٤٠% دانیشتوانی عەرەبە ئەمریکیەکانن، و دانیشتوانە موسڵمانەکەی گەورەترین مزگەوتیان لە ئەمریکای باکور تێدا بنادناوە. وە لەم جۆر ناوچانە بێ گومان گۆڕانکاری لە هاوپەیمانیەکان و دەنگەکان دەکرێت، و هەروەها لە ستراتیجیەکان بازرگانی و تەنانەت لە ڕکابەری لەسەر ڕاکێشانی ئەندامان بۆ کەنیسەکان. پارتە سیاسیەکان و سیاسەتمەدارەکان و کۆمپانیا بازرگانیەکان و دامەزراوەکانی تریش هەموویان بە شێوەیەکی زیاتر دووچاری ئەو ڕکابەرانە دەبنەوە کە ڕەگی قووڵتر و تێگەیشتنی زیاتریان هەیە بۆ ئەو دانیشتوانە نوێیانە. وە هەمان شت لە ئەوروپا ڕوودەدات؛ کاتێک حکومەتەکان سەلماندیان کە دەستەوەستانن لە ڕاگرتنی شاڵاوی کۆچبەرەکان لە ئەفریقا و ئاسیا و دەوڵەتە ئەوروپیە کەمتر دەوڵەمەندەکانی تر. وە لەم بارەیەوە، حالەتێکی سەرنج ڕاکێش هەیە: لە ساڵ ٢٠٠٧، لە بورتلاویس، ئەو شارە ئێرلەندیەی کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای دبلن، پیاوێک هەڵبژێردرا، کە لە دایکبووی نێجیریا بوو، وەک یەکەم قایمقام لەم وڵاتە.

وە تەنانەت ئەو هەوڵانەی بۆ سنوردانان لەم جۆرە جوڵانەوە نوێیە دەدرێت لەوانەیە دەرەنجامی بەهێزی چاوەڕوان نەکراوی لێبکەوێتەوە. جۆرج جی

کاستانیدا، وەزیری دەرەوەی مەکسیکی پێشوو، و دۆگلاس ئێس ماسی، زانای کۆمەڵایەتی لە زانکۆی برنستون، ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە وەک کاردانەوەیە بۆ ئەو مامەڵە خراپە و کەشە ناپێشوازیکارەی بە کۆچبەران دەکرێت لە هەندێک لە ویلایەتەکانی ئەمریکی " زۆرێک لەو مەکسیکیانەی کە ئیقامەی دائیمیان هەیە بڕیاری چاوەڕوان نەکراویان داوە؛ چونکە لە جیاتی بەجێهێشتنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەبەر ئەو هەستەی کە ئەوان پێشوازی لێکراو نین، بوون بە هاووڵاتی، ئەم کردارە بە ناوی " ڕەگەزنامەی بەرگری " بوو. وە لە دەیەی پێش ساڵی ١٩٩٦، ساڵانە ٢٩ هەزار مەکسیکی ڕەگەزنامەی وەردەگرت؛ وە لە ساڵی ١٩٩٦ەوە ئەم ڕێژەیە بۆ ١٢٥ هەزار بەرزبوویەوە؛ وە لە ئەنجامدا دوو ملیۆن هاووڵاتی نوێ کە دەتوانن خزمە نزیکەکانیان بهێنن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوونیان هەبوو. لە ئێستادا نزیکەی دوو لەسەر سێی دانیشتوانی یاسایی لە مەکسیکەوە دەچنە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە وەک خزمی هاووڵاتیانی ئەمریکی". ئەم هاووڵاتییە نوێیانەش دەنگدەریشن، بێگومان، ئەمە ڕاستیەکە دەستیکردووە بەگۆڕین و دووبارە شێوەپێدانی دیمەنی هەڵبژاردن.

هەروەها کۆچبەران ملیارەها دۆلار پارە دەنێرن بۆ وڵاتانی بنچینە و پەرە بە گەشەی ئابووری و گەشەسەندن دەدەن. لەسەر ئاستی هەموو جیهان ٣٣٩ ملیار دۆلار گواستراوەتەوە بۆ وولات بنچینەییەکانی کۆچبەران لە ساڵی ٢٠١٠، ( لە ساڵ ١٩٨٠ پارە گواستراوەکان گەیشتنە تەنیا ٣٧ ملیار دۆلار)". وە لە کاتی ئێستادا ڕەوانەکردنی پارە دەگاتە زیاتر لە پێنج ئەوەندەی تێکڕای یارمەتیە دەرەکیە جیهانیەکان و گەورەترن لە کۆی ساڵانەی وەبەرهێنانە بیانیەکان کە دەڕژێنە وڵاتە هەژارەکان. بە کورتی، ئەو کرێکارانەی لە دەرەوەی وڵاتانی خۆیان دەژین - کە زۆربەی کات زۆر هەژارن - پارەی زیاتر لە وەبەرهێنەری بیانی و زیاتر لە وڵاتانی دەوڵەمەند بۆ وڵاتەکانیان دەنێرن. لە ڕاستیدا، پارە حەواڵەکردنەکان بوونەتە

## کۆتایی سەردەمی هێز

گەورەترین سەرچاوەی دراوی قورس بۆ زۆرێک لە وولاتەکان و گەورەترین کەرتی ئابووری، بەو شێوەیە پێکهاتە تەقلیدییەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و هەروەها دیمەنی کەرتە بازرگانیەکانی گۆڕی.

وە لە نێوان لایەنەکانی شۆڕشی جولانەوە لەونایە شارنشینی بەهێزترین لایەنی بێت کە هێز لەخۆ دەگرێت؛ چونکە پرۆسەی شارنشینی، کە پێشتر خێراترین بووە لە مێژوودا، لە ڕاستیدا هێشتا بەرەو خێراتر دەڕوات بە تایبەتی لە ئاسیا. خەڵکانێکی زیاتر لە کێڵگەوە چوونە بۆ شارەکان زیاتر لە هەموو کاتێکی تر، ئێستاش هەر بەردەوامن. لە ساڵی ٢٠٠٧، وە بۆ یەکەم جار لە مێژوو، ژمارەی دانیشتوانی شارەکان زیاتر بوو لە ژمارەی دانیشتوانی ناوچە لادێییەکان. ڕیچارد دۆبس باسی ئەم گۆڕانکاریە گەورەیە دەکات و دەڵێت : " شارە زەبەلاحە گەورەکان لە چین و هیند ئەبێتە وولاتێک بۆ چینە مامناوەندە گەشەسەندووەکان، کە بازارە بەکاربەرەکانیان گەورەتر دەبێت لە بازارەکانی ئێستا کە هەیە لە ژاپۆن و ئیسپانیا ". ئەنجومەنی سیخوڕی نیشتیمانی ئەمریکی باوەڕی وایە کە " لە هەموو ساڵێک ٦٥ ملیۆن کەس زیاد دەکرێت بۆ دانیشتوانی ناوچە شارستانیەکان لە جیهان؛ بەمانای کە زیادکردنی حەوت شاری بە قەبارەی شاری شیکاگۆ یان پێنج شار بە قەبارەی شاری لەندەن لە هەموو ساڵێک". لێکەوتەکانی ئەم شۆڕشە لەسەر دابەشکردنی دەسەلات قووڵیەکەی کەمتر نیە لەسەر ئاستی ناوەخۆدا، چونکە لە ڕاستیدا ژمارەیەکی زیاتر لە خەڵک دەبینینی لە هەمان کاتدا لە دوو وولات یان زیاتر خەرجی و وەبەرهێنان دەکەن. وە هەروەها کۆچکردنی ناوەخۆ - بەتایبەتی گواستنەوەی دانیشتوان لە کێڵگەکان بۆ شارەکان - لەوانەیە تێکچوونێک لە هێز دروست بکات کە کەمتر نیە لەوەی کۆچکردنی نێودەوڵەتی دروستی دەکات.

وە بە پلەیەکی تەسکتر لە مەودای شارنشینی ( دانیشتوانی شارەکان)،

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

جۆرێکی نویێ هەیە لە جۆرەکانی جوڵانەوە دەستی کردووە بە دووبارە پێکهینانەوەی دیمەنی هێز؛ چونکە وولاتە هەژارەکان مەیلی لە دەستدانی هاووڵاتیە کارامەکان و زیاتر ڕۆشنیریان هەیە بۆ بەرژەوەندی وولاتە دەوڵەمەندەکان کە ڕایاندەکێشێت بە هیوای دەستکەوتنی ژیانێکی باشتر. "ئاوەڕۆی مێشک" کە ناسراوە لەم وولاتانە پەرستاران و ئەندازیاران و زاناکان و بازرگانەکان و پیشەگەرانی دیکە بێبەش دەکات، کە پارەیەکی زۆریان بۆ ڕاهێنانیان خەرج کردووە، و کۆچکردنیان بە ڕوونی سەرمایەی مرۆڤی لەو وولاتانە بچووک دەکاتەوە. بەلام لەم ساڵانەی دواییدا، ژمارەیەکی زۆر لەو پیشەگەرانە دەستیان کردووە بە گەڕانەوە بۆ وڵاتانی بنچینەییەکانیان، و ڕاهێنانە بازرگانییە ناساییەکان لە کەرتی پیشەسازی و زانکۆ و میدیا و سیاسەتدا هەڵدەگێڕنەوە. ئانالی ساکسینیان، ڕاگری کۆلێژی ڕاگەیاندن لە زانکۆی کالیفۆرنیا، بێرکلی، بۆی دەرکەوت کە پەنابەرانی تایوانی، هندی، ئیسرائیلی و چینی کە لە دۆڵی سیلیکۆنی کالیفۆرنیا کاریان دەکرد، زۆرجار دەبنە " بەرهێنەرە فریشتەکان" (کەسانێکی دەوڵەمەند کە سەرمایە بۆ کۆمپانیا دەستپێکەکان دابین دەکەن، زۆرجار لە بەرامبەر ئەو سەنەدانەی کە دەتوانرێت حەواڵە بکرێت یان هەندێک بەش لە پرۆژەکان یان " سەرمایەداری دەستپێشخەر" لە وولاتە بنچینەییەکانیان، کاتێک لە کۆمپانیاکان دەردەچن و لە کۆتاییدا دەگەڕێنەوە وولاتە ڕەسەنەکی خۆیان، یان زۆر گەشت دەکەن لە نێوان وولاتە ڕەسەنەکەیان و نوێیەکەیان ( ئەمەش کە ساکسیان پیێ دەڵێت سوڕانی مێشکەکان). بەم شێوەیە ئەو کلتور و میتۆد و ڕێبازانەی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا فێر بوون لەگەڵ خۆیان دەگوازنەوە. وە لە حالەتی بازرگانە دەست پێشخەرەکان، هیچ خۆلادانیێ نیە لە بەریەککەوتنی کلتوری ڕکابەریە داهێنەرە بازرگانیە دینامیکیەکانی سەنتەرەکانی دەستپێشخەری لەگەڵ شێوازەکانی سەرکوتکردنە تەقلیدیەکانی

بازرگانیکردن، کە زۆرجار لە وولاتە گەشەسەندووەکان هەیە، کاتێک ئەو کوتلە بازرگانیانەی کە لەلایەن خێزانەکانەوە کۆنترۆڵ کراوە دەست بە زاڵبوون دەکەن. ئەمەش نموونەیەکی تری ئەو ڕێگا سەرسورهێنەرانەیە کە لە ڕێگەیەوە شۆڕشی جوڵانەوە کاردەکات بۆ گۆڕینی پرۆسەی وەدەستهێنانی هێز و ئەزمونکردنی لە کۆمەڵگا تەقلیدیەکان، و بەڵام بە ڕیتمێکی خێرا دەگۆڕێت.

ئەم جوڵەیەی کە کۆچبەرە کاتیەکان و هەمیشەییەکان پیادەی دەکەن لە چوارچێوەی زیادبوونێکی فراوان لە جوڵەی کاڵاکان و خزمەتگوزاریەکان و پارەکان و زانیاریەکان و بیرۆکەکان ڕوودەدات؛ چونکە جوڵەی گەشتە کورت خایەنەکان چوار ئەوەندە زیادی کردووە؛ هەر لە ساڵی ١٩٨٠دا ژمارەی گەشتیارە نێودەوڵەتیەکان ٣.٥% تێکڕای ژمارەی دانیشتوانی جیهانی تێپەڕ نەدەکرد، بەراورد بە نزیکەی ١٤% لە ساڵی ٢٠١٠. وە مەزندەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە سالانە ٣٢٠ ملیۆن کەس گەشت دەکەن بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکان و کۆنفرانسەکان و کۆبوونەوە پیشەییە نێودەوڵەتیەکان، و ژمارەیان بە شێوەیەکی بەردەوام زیاد دەکات.

ئەو پاشەکشە ئابووریەی کە لە ساڵی ٢٠٠٨ دەستی پێکرد، هیچ هێواشبوونێکی ئەوتۆی لە بازرگانی کاڵاکان دروست نەکرد؛ لە ساڵی ١٩٩٠ کۆی هەناردە و هاوردەکان لە جیهان ٣٩% ی ئابووری جیهان پێک هێنا، و تا ساڵی ٢٠١٠ ڕێژەکە بەرزبۆوە بۆ ٥٦%. وە لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٠ و ٢٠٠٩ بەهای گشتی کاڵا ئاڵوگۆڕەکان لە سنورەکان بە نزیکەیی لە ٥.٦ تریلیۆن دۆلارەوە زیادی کرد بۆ ١٢.٥ تریلیۆن ( بە نرخی ئێستای دۆلار )، وە بە گوێرەی وولاتە یەکگرتووەکان؛ لەم ماوەیە تێکڕای هەناردەی کاڵاکان و خزمەتگوزاریەکان لە ٩.٧ تریلیۆن دۆلارەوە بازیدا بۆ ١٨ تریلیۆن دۆلار، بەگوێرەی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی. لە هەمان کاتدا، ئێستا جوڵەی پارە زۆر ئاسانترە وەک لە هەر

کاتێک لە پێشتر. وە قەبارەی وەبەرهێنانی بیانی، کە وەک ڕێژمیەک دادەنرێت لە نابووری جیهانی، لە ٥.٦% لەساڵی ١٩٨٠ بازیدا بۆ ٣٠% لە ساڵی ٢٠١٠، لەو کاتەی کە قەبارەی دراوی گوازراوەی ڕۆژانە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بۆ حەوت ئەوەندە زیادی کرد لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥ و ٢٠١٠. وە لە ساڵی ٢٠١٠، ڕۆژانە زیاتر لە بەهای ٤ تریلیۆن دۆلار ئاڵوگۆڕی کراوە لە سنورە نێودەوڵەتیەکان.

وە زیاتر لەمەش، توانای گواستنەوەی زانیاریەکان زۆر فراوان بووە؛ چەند کەس دەناسیت کە مۆبایلیان نیە؟ زۆر کەم. ئەمە وەڵامە ڕاستەکەیە تەنانەت لە هەژارترین و نادروسترین وولات. لە ساڵی ٢٠٠٩، ئاژانسی ڕۆیتەرز سەردێڕێکی سەرەکی دانابوو لە هەواڵنامەکەی بۆ نێردراوی لە سۆماڵ دەیگووت: " کۆمپانیاکانی مۆبایل لە سۆماڵیەکان گەشە دەکەن لەگەڵ بوونی ئاژاوەش". سۆماڵیا چەمکی "دەوڵەتی شکستخواردوو" بەرجەستە دەکات، وە ئەو کۆمەڵگایانەی کە هاوڵاتیان خزمەتگوزاری سەرەکیان نییە کە زۆربەمان بە شتە ئاساییەکان دایدەنێین. لەگەڵ ئەوەش، تەنانە لە سۆماڵیش، مۆبایلە مۆدێنەکان بە مەودایەکی فراوان بەردەستن. فراوانبوونی خزمەتگوزارییەکانی مۆبایل لە ڕووی خێرایی و نوێگەرییەوە جێگای سەرسوڕمانە، لە ساڵی ١٩٩٠دا ژمارەی بەشداربووانی خزمەتگوزاری مۆبایل لە جیهاندا ٢.٠ بۆ هەر ١٠٠ کەس بووە. وە تا ساڵی ٢٠١٠ بۆ زیاتر لە ٧٨ بەشداربوو بۆ هەر ١٠٠ کەسێک زیادیکرد. وە یەکێتی نێودەوڵەتی بۆ پەیوەندیەکان ئاماژەی بەوەدا کە لە ساڵی ٢٠١٢ ژمارەی بەشداربووان لە خزمەتگوزاریەکانی مۆبایل ٦ ملیار کەسی تێپەڕاند؛ کە دەکاتە ٨٧%ی دانیشتوانی جیهان.

پاشان ئەنتەرنێتیش هەیە، بە هەر حاڵ، وە فراوانبوونی بڵاوبوونەوەی ئەنتەرنێت و ڕێگایە نوێیە سەرسورهێنەرەکانی بۆ بەکارهێنانی ( کە بە خراپ بەکاردێت) پێویستی زۆر بە وورده‌کاری نیە. لە ساڵی ١٩٩٠، ژمارەی بەکارهێنەرانی

ئەنتەرنێت زۆر کەم بوو ١.٠% ی ژمارەی دانیشتوانی تێپەڕ نەدەکرد. ئەم ژمارەیە بۆ ٣٠%ی ئەم دانیشتوانە بەرزبۆوە لە ساڵی ٢٠١٠ ( زیاتر ٧٣%ی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان). لە ساڵی ٢٠١٢، تەمەنی فەیسبووک ٨ ساڵ بوو، ژمارەی بەکارهێنەرانی زیاتر لە ملیار ونیوێک کەسی تێپەڕاند و زۆربەی ئەو بەکارهێنەرانە لە ڕێگای مۆبایلەکانیان یان تەختە ئەلکترۆنیەکانیان ئەچوونە ناو فەیسبوک، وە ژمارەی بەکارهێنەرانی تویتەر ( کە لە ساڵی ٢٠٠٦ دەرچوو) گەیشتە ١٤٠ ملیۆن کەس، و ژمارەی بەکارهێنەرانی سکایپ ( لە ساڵی ٢٠٠٣ دامەزرا) بە نزیکەیی گەیشتە دوو ملیۆن کەس.

شۆڕشەکانی تویتەر و فەیسبووک لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەسیاسەتدا مشتومڕێکی بەرفراوانیان لەسەرە، ئێمەش لە ڕۆڵی ئەوان لەهەڵوەشاندنی دەسەڵاتدا دەکۆڵینەوە. بەڵام لەم دیبەیتە سەرەتاییەی شۆڕشی جوڵەدا دەبێت کاریگەری ئامرازێکی تر لەبەرچاو بگرین کە ئەو ڕێزە بەدەست ناهێنێت کە شایەنیەتی لە ڕۆڵی لە گۆڕینی جیهان، ئەویش کارتی تەلەفۆنی پێشوەختەیە. بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت پێویستیان بە کارەبا و کۆمپیتەر و دابینکەری خزمەتگوزاری ئینتەرنێت هەیە، ئەو شتانەی کە زۆربەمان دەیگرینە بەر، بەڵام بۆ زۆربەی دانیشتوانی جیهان گرانن.

بەکارهێنەرانی کارتەکانی تەلەفۆن پێویستیان بە هیچ نییە جگە لە چەند سەنتێک و تەلەفۆنێکی گشتی بۆ پەیوەندی کردن بە هەموو جیهانەوە بەبێ گوێدانە ئەوەی کە شوێنی جوگرافیان چەند دابڕاوە یان چەند دوورە. وە گەشەی بەکارهێنانی کارتەکانی پەیوەندی تەلەفۆن و بڵاوبوونەوە جیهانیەکەی زیاترە لە گەشەی ئەنتەرنێت. لە ساڵی ١٩٧٦، کارتە پێشوەختەکانی تەلەفۆنی پارەدراو لە ئیتالیا داهێنراو وەک کاردانەوەیەک بۆ کەمی دراوە کانزاییەکان، وە بۆ

کەمکردنەوەی دزی و تێکدانی تەلەفۆنە گشتیەکان. بەرهەمە نوێیەکە دەرچوو، و لە ساڵی ١٩٧٧ لە نەمسا و فەرەنسا و سوید و بەریتانیا بەکارهێنرا، و پاش ٥ ساڵی تر لە ژاپۆنیش دامەزرا ( ئەمەش هەر لە ئەنجامی کەمی دراوە کانزاییەکان بوو). بەڵام ئەوەی کە سەرنج ڕاکێش بوو بەڕاستی ڕوویدا کاتێک کارتەکانی پەیوەندی تەلەفۆنی پارەدراوی پێشوەختە بووە شتێکی باو لە نێوان هەژارەکانی جیهان. وە بە هۆی قازانجە دەستکەوتووەکان لە وڵاتە هەژارەکان، داهاتەکانی ئەم پیشەسازیە لە ٢٥ ملیۆن دۆلارەوە لە ساڵی ١٩٩٣ بازیدا بۆ زیاتر لە ٣ ملیار دۆلار لە ساڵی ٢٠٠٠. وە ئەمڕۆش کارتەکانی تەلەفۆنی پارەدانی پێشوەختە دەستی کردووە بە بوارێکی کردەوە بۆ مۆبایلە پارەدراوە پێشوەختەکان. مۆبایلە پارەدراو پێشوەختەکان، لە ڕاستیدا، توانیان ئەو تەلەفۆنانە لابدەن کە پێویستی بە بەشداربوونێکی درێژخایەن هەیە و بەکارهێنەرە دەبەستێتەوە بە یەکێک لە خزمەتگوزاریەکان لە ڕێگای گرێبەستێکی جیا و سەپێنراو. تاکە کەمتر دەوڵەمەندەکان ئەوانەی کە وڵاتەکانیان جێ دەهێڵن بۆ گەڕان بەدوای ژیانێکی باشتر، یان ئەوانەی کە لە ناوچە دوورەدەستەکان کاردەکەن، چیتر دووچاری گرفتی هەڵبژاردن نابنەوە لە نێوان مانەوە لە نزیک خێزانەکانیان و کۆمەڵگاکەیان، و باشتر کردنی باری داراییان. وە هەموو ئەم تەکنەلۆجیایانەی کە پرۆسەی جوڵانەوە بەهێز دەکەن لە دوو تایبەتمەندی جیاواز هاوبەشن کە ئەوانیش خێرایی گواستنەوەی کاڵاکان و پارە و خەڵک و زانیاریەکان، و کەمبوونەوەی خەرجی گواستنەوەیە. پلیتیەکانی هێڵی ئاسمانی کە هەزاران دۆلاری تێدەچوو، ئەمڕۆ دەتوانرێت بکڕدرێت بە بەشێکی بچووکی نرخەکانی پێش ٢٠ یان ٣٠ ساڵ، هەروەها تێچووی گواستنەوەی تەنێک لە کاڵاکان ئەمڕۆ بە دە ئەوەندە کەمترە لە تێچووی پێش ساڵانی پەنجاکان لە سەدەی بیستەم. گواستنەوەی پارە لە کالیفۆرنیا بۆ مەکسیک لە کۆتاییەکانی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم نزیکەی

١٥%ی پارە گواستراوەکەی تێدەچوو، بەڵام ئەمڕۆ بۆتە کەمتر لە ٦%. هەروەها تەنەلۆجیای مۆبایل کە دەکرێت لە ڕێگایەوە پارە لە مۆبایلێک بۆ یەکتری ڕەوان بکرێت وایکردووە بە نزیکەیی حەوالەکان بێ بەرامبەر بن.

ئەم هەموو شۆڕشی گۆڕانکاریانە لە جوڵانەوە و پەیوەندیەکان بە تەواوی مانی چی دەدات بە گوێرەی هێز؟ شۆڕشی جوڵانەوە کاریگەریەکی قووڵی هەیە کە ناتوانرێت بە ئاسانی لێی تێبگەین وەک کاریگەری شۆڕشی زۆربوون؛ چونکە پیادەکردنی هێز بە مانای پارێزگاریکردن لە سیستەم و کۆنترۆڵ نایەت تەنیا لە ناوچەیەکی ڕاستی یان ڕەمزی، بەڵکو مانای چاودێریکردنی سنورەکەشی دەدات. وە ئەوەش ڕاستە دەربارەی دەوڵەتە نەتەوەییەکان، بەڵام لەسەر هەر کۆمپانیایەکیش جێبەجێ دەکرێت کە زاڵە بەسەر بازاردا، یان هەر پارتێکی سیاسی کە پشت بە دەنگدەرە سنوردارکراوی جوگرافی دەبەستێت، یان هەر باوکێک ئەیەوێت منداڵەکانی لە نزیک خۆی بمێننەوە. هێز پێویستە بە جەماوەرێکی دیلکراو هەیە. لەحاڵەتێکدا کە هاوڵاتیان و دەنگدەران و وەبەرهێنەران و کرێکاران و کڕیارەکان هیچ دەرچوونێکیان نییە یان دەرچوونێکی کەمیان هەیە، جگە لە ڕازیبوون بە مەرجەکانی ئەو دامەزراوانەی کە ڕوویەڕوویان دەبێتەوە هیچ بژاردەیەکی تریان نیە. بەڵام کاتێک سنورەکان بە ئاسانی دەبڕدرێن و دانیشتوانە کۆنترۆڵکراوەکانیش توانایان زیاتر دەبێت لە جوڵانەوە، ڕێکخراوە جێگیرەکان زەحمەتیەکی زۆر ئەبینن لە پارێزگاریکردنی کۆنترۆڵیان. ڕەنگە کۆچکردن دیارترین نموونە بێت، بە شێوەیەک خەڵک بە سادەیی خۆیان لە ناوچەیەکی دابەشکردنی دەسەڵات بۆ ناوچەیەکی تر دەربهێنن و پاشان خۆیان لە شوێنێکدا دابنێن کە پێیان وایە هەڵبژاردنی باشتریان پێ دەدات. وە ئاسانی لە گەشتکردن و گواستنەوە، و خێرایی لە گەیاندنی زانیاری و پارە و بەهاکان بە تێچوویەکی کەمتر، دوو هۆکارن کە وادەکات ژیان ئاسانتر بێت بۆ ڕکابەرەکان، و قورستر بێت

بۆ خاوەن پێگەکانی هێز.

شۆڕشی عەقلیەتەکان: خۆبەدەستەوە نەدان بە هەر شتێک لەمەودوا

لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم ساموێل هنتنگتۆن، مامۆستا لە زانستە سیاسیەکان لە زانکۆی هارڤارد، گووتی " یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی ناسەقامگیری کۆمەڵایەتی و سیاسی لە دەوڵەتە گەشەسەندووەکان - ئەوانەی کە پێی خۆش بوو ناویان بنێت " کۆمەڵگا خێرا گۆڕاوەکان" - ئەوەیە کە پێشبینیەکانی خەڵک بە خێراییەکی زۆرتر لە توانای هەر حکومەتێک بۆ دابینکرنی زیادیان کردووە ". هەردوو شۆڕشی زۆربوون و جوڵانەوە چینێکی مامناوەندی نوێی فراوان و خێرا گەشەکردوویان دروست کرد کە ئەندامەکانی باش ئاگاداری ئەوەن کە ئەوانی تر زیاتر سەرفراز و ئازاد و خۆبەدیهاتوون، و هیوا و ئومێدیان هەیە کە بە پێیان بگەن. " شۆڕشی پێشبینیەکان " ئەمڕۆ بۆتە جیهانی، وە هەروەها باری بەریەککەوتنەکانیشی. ئەم شۆڕشە بە هەمان ڕادە کاریگەری لەسەر وڵاتە دەوڵەمەندەکان و هەژارەکان دەکات؛ زۆربەی زۆری دانیشتوانی جیهان ئەمڕۆ ئەژین لەناو ئەوەی کە دەتوانرێت ناوبنرێت بە " کۆمەڵگا خێرا گۆڕاوەکان" . بە دڵنیاییەوە جیاوازییەکە ئەوەیە کە چینی ناوەند لە نەتەوە هەژارەکان لە فراوانبووندایە، لە کاتێکدا لە وڵاتانی دەوڵەمەند کەم دەبێتەوە. وە هەردوو چینی گەشەکردوو و کەمکردوو نائارامی سیاسی دەوروژێنێت. چونکە چینە مامناوەندە پڕکراوەکان دەرژێنە سەر شەقامەکان و دەجەنگن لە پێناو پاراستنی ئاستەکانی بژێو، لە کاتێک چینە مامناوەندە فراوانەکان لە پێناو دەستکەوتنی کاڵا و خزمەتگوزاریەکان زیاتر و باشتر نارەزایی دەردەبڕن. بۆ نمونە، لە چیلی، قوتابیەکان لە ساڵی ٢٠٠٩ەوە بە شێوەیەکی ڕێک و پێک بەردەوام بوون لە خۆپیشاندان، و داوای خوێندنی زانکۆی باشتر و تێچووی کەمتر دەکەن. گرینگی نیە کە بەدەستهێنانی خوێندن پێش چەند دەیەیک دەستکەوتێک بوو

تەنها لەلایەن نوخبەیەکی بچووک دەستی بەسەردا گیرابوو، وە کە ئێستاش زانکۆکان پڕن لە کوڕ و کچانی چینە مامناوەند نوێیەکان. چونکە بۆ قوتابیان و باوانیان چیتر گەیشتن بە خوێندنی باڵا بەس نیە. ئەوان خوێندنێکی باشتر و هەرزانتریان دەوێت، وە دەیانەوێت ئێستاش بێت. وە هەمان شت ڕوو دەدات لە چین. لەو شوێنەی کە خۆپیشاندانەکان بڵاودەبنەوە لەسەر خراپی باڵەخانە نوێیەکانی نیشتەجێبوونی هەژارەکان و نەخۆشخانەکان و قوتابخانەکان. وە لێرەش سودی نابێت کە بڵێین باڵەخانەکان و نەخۆشخانەکان و قوتابخانەکان بوونیان نەبووە پێش چەنساڵێک بەر لە ئێستا، و توڕەیی ئەو کەسانەش نارەوێنێتەوە کە دەیانەوێت چۆنیەتی خزمەتگوزاریە تەندروستیەکان و پەروەردەییەکانیان باشتر بکرێت کە پێشکەشیان دەکرێت. وە ئەمەش ڕێگەیەکی بیرکردنەوەی نوێیە - گۆڕان لە عەقلییەتەکان - کاریگەری قووڵی لەسەر هێز هەیە.

وە گۆڕانێکی قووڵ لە پێشبینیەکان و ستاندەرەکان ڕوویدا، نەوەک تەنها لە کۆمەڵگا لیبرالیەکان، بەڵکو تەنانەت لە کۆمەڵگا هەرە بە ئەنجامەکانیش. زۆربەی خەڵک سەیری جیهان و دراوسێ و فەرمانبەر و پیاوی ئایینی و سیاسیەکان و حکومەتەکان دەکات بە چاوێکی جیاواز لەو چاوانەی کە باوانی سەیریان پێ دەکرد. تا ڕادەیەک، ئەوە هەمیشە وا بووە. هەر چۆنێک بێت، هەردوو شۆڕشی زۆربوون و جولانەوە بوونە هۆی فراوانبوونێکی گەورە لە کاریگەریەکانی مەعریفی و سۆزداری بۆ زیادبوونی هەڵی گەیشتن بە داهاتەکان و توانا بۆ جوڵانەوە و فێربوون و پەیوەندیکردن بە شێوەیەکی بەرفراوانتر و تێچووی کەمتر لە هەر کاتێکی پێشتر. وە ئەمەش بێگومان بۆشایی لە عەقلییەت - و شێوازی سەیرکردن بۆ جیهان - لە نێوان نەوەکان بەدەردەخات.

شۆڕشی عەقلییەتەکان چۆن کار دەکات؟

تەڵاق بە نموونە وەربگرە، کە لە زۆر لە کۆمەڵگا تەقلیدیەکاندا بە چاوێکی

قێزەوەن سەیر دەکرێت، بەڵام ئەمڕۆ لە هەموو شوێنێک زیاتر باو بووە. لە توێژینەوەیەک کە لە ساڵی ٢٠١٠ ئەنجام دراوە، دەرکەوت کە ڕێژەکانی تەڵاق تەنانەت لە وڵاتەکانی کەنداوی عەرەبیش بەرزبۆتەوە، کە گەیشتە ٢٠% لە عەرەبستانی سعودی و ٢٦% لە ئیمارات و ٣٧% لە کوێت. سەرەڕای ئەوەش، ئەم ڕێژەی تەڵاقە بەرزانە لەڕووی ئامارەوە پەیوەست بوون بە پەروەردەوە، بەو مانایەی کە زیادبوونی ژمارەی ژنانی ڕۆشنبیر فشار دەخاتە سەر هاوسەرگیرە پارێزگارەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی ناکۆکی خێزانی و بە توندی پاڵ بە هاوسەرەکانەوە دەنێت بۆ جیابوونەوەی بەپەلە. لەکوێت ڕێژەی تەڵاقدان بەرزبۆوە بۆ ٤٧% لەنێوان ئەو هاوسەرانەی پلەی زانکۆیان هەیە. زانای کۆمەڵناسی سعودی و نووسەری ڕاپۆرت، منى المنجد، لە بەراورد لە نێوان کۆمەڵگاکانی کەنداو پێش ٣٠ ساڵ دەڵێت " ئافرەتەکان لەسەر ڕازیبوون بە قوربانیدانە کۆمەڵایەتیەکان ڕاهاتبوون، وە ئێستاش ئەمە قبوڵ ناکەن".

جیهانی ئیسلامی بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند دادەنرێت بۆ نیشاندان لەسەر چۆنیەتی ئەو گۆڕانەی کە شۆڕشی عەقلییەتەکان دەستیان بە ڕوودانی کردووە لە نەریتە ڕیشەییەکان. لە هیند، گۆڕان لە هەڵوێستەکان دەستی کردووە بە بڵاوبوونەوە لە نەوەیەکی گەنج بۆ نەوەی باوانیان؛ لە وڵاتێکدا کە تەڵاق بە کارێکی ئابڕوبەر دائەنرێت - بە تایبەت ئافرەتان، هەوڵێکی زۆریان ئەدا بۆ هاوسەرگیرکردن دووبارە - ئێستا پیشەسازیەکی بەهێزی تێدایە بۆ ڕێکلامەکانی هاوسەرگیری کە تەرخانکراوە بۆ کەسە تەڵاقدراوە بەتەمەنەکان - هەندێکیان لە هەشتاکان و تەنانەت لە نۆوەدەکانی تەمەنیانن - ئەوانەی کە بەدوای خۆشەویستی دەگەڕێن لە کۆتایی ژیانیان بەبێ ئەوەی هەست بە خەجاڵەتی بکەن. گەنجە پێگەیشتووەکان دەستیان کردووە بە وازهێنان لەو هاوسەرگیریەی کە باوانیان بۆیان ڕێکدەخستن کاتێک لە تەمەنی هەرزەکاری یان تەمەنێکی زووتر بوون. وە لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

ساڵەکانی دووایی لە ژیانیان، لە کۆتاییدا ئەتوانن لە دەسەڵاتەکانی خێزان و کۆمەڵگا و دین دەرچن، عەقلییەتەکانیان گۆڕیەوە.

گۆڕانەکان لە عەقلییەتەکان و هەڵوێستەکان بە ئاراستەی هێز و دەسەڵات دەستی بە ڕوودان کردووە لە نێوان گەنجەکانیش، کە ئەمانیش چینێکی دانیشتوانن ژمارەیان ئێستا زۆر گەورەتربووە لە جاران، بە پێی ئەنجومەنی سیخوڕی نیشتمانی ئەمریکی ئەمڕۆ زیاتر لە ٨٠ وولات تەمەنی ناوەندی دانیشتوانیان دەگاتە ٢٥ ساڵ یان کەمتر. وەک گروپێک ئەم دەوڵەتانە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر کاروباری جیهان هەبووە، و لە ساڵانی حەفتاکانەوە ٨٠% ی هەموو ململانێ چەکدارییە مەدەنی و ڕەگەزییەکان لە وڵاتانە سەریهەڵداوە کە چڕی گەنجان لە دانیشتوانەکەی هەیە. " کەوانی دیمۆگرافی بۆ ناسەقامگیری " کە ئەم گەنجانە پێکی دەهێنن لە ئەمریکای ناوەڕاست و ناوچەی ئیندیزی ناوەڕاست درێژدەبێتەوە، و هەموو ئەفریقا و باشوری بیابان دادەپۆشێت، و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست درێژدەبێتەوە بۆ باشورو ناوەڕاستی ئاسیا.

ئێستا هەردوو شۆڕشی زۆربوون و جولانەوە بوونە هۆی بەهێزکردنی مەیلی گەنجەکان بۆ شکبردن لە دەسەڵات و بەرەنگاربوونەوەی هێز. ئەمەش تەنها بۆ ژمارەیەک خەڵکی ژێر تەمەنی سیەکان چڕنابێتەوە، ژمارەکە زۆر گەورەتر بووە لە جاران، بەڵکو ئەو خەڵکانە کارتی مۆبایلی پارەدراوی پێشەکی و ڕادیۆیەکان و تەلەفزیۆنەکان و مۆبایلەکان و کۆمپیوتەرەکان و ماڵپەرەکانی ئەنتەرنێتی زۆریان هەیە، وە هەروەها توانای گەشت کردن و پەیوەندی کردن بە هاوشێوەکانیان لە ناوەوە و لە دەوری جیهان. هەروەها ئەوان توانای جولانەوەیان زیاترە لە هەموو کاتێکی تر. ڕەنگە نەوەی بازدانی تەمەن ( ئەوە نەوەیەیە کە لە تەمەنێکی زوو پێدەگات) ئێستا تایبەتمەندی زۆرێک لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکان بێت، بەڵام گەنجان نیشانەن لە کۆمەڵگاکانی تر ، ئەو گەنجانەی کە نەریت ناناسنەوە،

بەدوای گۆڕاندا دەگەڕێن، و بە ڕکابەری دەناسرێنەوە، و زیاتر دەخوێننەوە و زاناترن، پەیوەندیان زۆرترە و توانای جولەیان زیاترە و لەوانەیە بەیانی کۆمەڵەکی دیموگرای گەورە پێک بێنن. هەروەک بینیمان لە باکوری ئەفریقا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، ڕەنگە ئەم گەنجانە کاریگەریان بەهێز بێت.

وە ئەوەی ئەم دیمەنە ئالۆزتر دەکات لە هەندێک کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان ئاراستەکانی دیموگرافی بەیەکداچووەکانە لە دەرەنجامی کۆچکردن. لە ساڵی ۲۰۱۰، ئاماری دانیشتوانی ئەمریکی ئاشکرایکرد کە دانیشتوانی ئەمریکا لە ژێر تەمەنی هەژدە ساڵ کەمبوونەوەیەکی بەرچاوەیان بەخۆوە بینیوە لە کۆچبەرە گەنجە لاتینیەکان و ئاسیاییەکان. ئەم گەنجە کۆچکەرانە فاکتەرێکی گرینگ دەنوێنن بۆ ڕوودانی پرۆسەی گوستنەوە کە پێشتر نەبووە؛ لە ساڵی ۲۰۱۲ ژمارەی لە دایکبووانی پێست سپیەکان کەمینە بوو لە نێوان هەموو لەدایکبوونە ئەمریکیەکان. شارەزای دیموگرافی لە پەیمانگای برۆکینگز، ولیام فری، دەڵێت: لەبەرئەوەی ڕێژەی کۆچبەران لە نێو دانیشتوانی وویلایە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کەمترین ئاستی بووە لە سەدەی بیستەم لە نێوان سالآنی ۱۹٤٥ و ۱۹٦٤، ئەوا:

ئەو بەیەکداچوونی نەوەی بازدانی تەمەن لەگەڵ ئەوانەی کە لە وولآتانی تر دەهاتن زۆر کەم بوو. وە ئەمڕۆش کۆچبەران ڕێژەی ١٣%ی دانشتوان پێک دەهێنن، هەروەها ئەوان زیاتر جۆراوجۆرن؛ و لەوانەیە هۆکارێک بوویێت بۆ گۆشەگیری کە هێشتا بەردەوامە؛ چونکە لە نێوان ئەو ئەمریکیانەی کە تەمەنیان ٥٠ سالە سپی پێستەکان ٧٦% پێک دێنن، لە کاتێکدا ڕەش پێستەکان گەورەترین کەمینە پێک دێنن ( ڕێژەیان دەگاتە ١٠% ). وە لە نێوان ئەوانەی کە تەمەنیان لە ۳۰ ساڵ کەمترە سپی پێستەکان ٥٥% پێک دێنن. وە لاتینیەکان و ئاسیاییەکان و کەمینەکانی تریش جگە لە ڕەش پێستەکان ٣١% لەم چینە تەمەنیە پێک دێنن. بەزۆری گەنجە تەمەن بچووکترەکان هەردوو نەوەی یەکەم و

دووەم لەو ئەمریکیانە پێک دێنن لە ڕەگیان ئەوروپی نیە، وە دەتوانن بە زمانی ئینگلیزی و زمانەکانی تریش بدوێن.

بە کورتی، بەتەمەنەکان نەک تەنیا لە زمانی ئینگلیزی ناگەن، بەڵکو ناشتوانن قسەی پێ بکەن. بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە هەوڵی بەدەستهێنانی هێز دەکەن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا یان ئەزموونکردنی یان پارێزگاری کردن لێی؛ ئەوا تێگەیشتن لە عەقلیەتی بەربژێرە نوێیەکان و پێشبینیەکانیان شتێکی پێویست دەبێت.

ژمارەیەک لە ڕاپرسییەکانی ڕای گشتی وێنەیەکی ڕوونتر سەبارەت بە ڕادە و خێرایی ئەم گۆڕانکارییانە لە هەڵوێست و عەقڵییەتیدا دابین دەکەن، لە ساڵی ١٩٩٠ەوە "ڕاپرسیی بەها جیهانییەکان" بەدوای گۆڕانکارییەکان لە هەڵوێستی خەڵکدا دەڕوات لە زیاتر لە ٨٠ وڵات کە ٨٠%ی دانیشتوان لەخۆیان دەگرن. بە تایبەتی ڕۆناڵد ئەنگێلهاردت، بەڕێوەبەری ڕاپرسیی بەهای جیهانی، و ژمارەیەک لە هاونووسەرەکانی، بەتایبەتی پیپا نۆریس و کیرستین وێلسێل، گۆڕانکارییەکی قووڵیان لە هەڵوێستەکان سەبارەت بە جیاوازی ڕەگەزی، ئایین، حکومەت و جیهانگیری دۆکیومێنت کرد. یەکێک لە دەرەنجامەکانیان لەسەر ئەم گۆڕانکارییانە لە عەقڵییەتی خەڵکدا ئەوە دەردەخات کە کۆدەنگییەکی جیهانی گەشەسەندوو هەیە لەسەر گرنگی سەربەخۆیی تاک و یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەز و هەروەها قبووڵنەکردنی جەماوەری بۆ دەسەڵاتی سەرکوتکار.

لە لایەکی ترەوە بەڵگەی ڕاپرسیی زۆر هەیە کە ئاماژە بە ڕەوتێک دەکات لە هەڵوێستەکان کە کەمتر قووڵ نییە بەڵکو زیاتر نیگەرانە، لە دیموکراسیە پێگەیشتووەکاندا (ئەوروپا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ژاپۆن)، دەبینین کە متمانەیەکی جەماوەری بە سەرکردە و دامەزراوەکانی حوکمی دیموکراسی، وەک پەرلەمان و پارتە سیاسیەکان و دەزگای دادوەری، تەنها کەم نیە، بەڵکو

گەڕانەوەیەکی چاوەڕوانکراویش دەردەخات.

لە کاردانەوەیەک بۆ ئەم ڕەوتە، سەرۆکی دامەزراوەی نێودەوڵەتی بۆ ئاشتی جێسیکا ماثیوس، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد:

لە ساڵی ١٩٥٨ەوە، گروپی لێکۆڵینەوەی هەڵبژاردنی نەتەوەیی ئەمریکا هەموو دوو ساڵ جارێک بە نزیکەیی هەمان پرسیاریان لە ئەمریکییەکان کردووە: "ئایا متمانەتان بەوە هەیە کە حکومەت لە واشنتن هەموو کات یان لە زۆربەی کات بەوە هەڵدەستێت کە ڕاستە؟ وە تەنانەت تا ناوەڕاستی ١٩٦٠ ی سەدەی بیستەم ، ٧٥%ی ئەمریکییەکان بە بەڵێ وەڵامیان دایەوە. پاشان جۆرێک لە دابەزین دەستی پێکرد و بەردەوام بوو لە گەشەکردن بە خێرایی بۆ ماوەی ٥٠ ساڵ، بە شێوەیەک کەس بە بەڵێ وەڵامی نەدایەوە تەنها ٢٥٪ نەبێت تا ساڵی ١٩٨٠. لەو ماوەیەدا بێگومان جەنگی ڤێتنام و دوو ڕووداوی کوشتن و ئابڕووچوونی وۆتەرگیت و ئابلوقەی نەوتی عەرەب ڕوویدا. لەبەر ئەوە هۆکاری زۆر هەیە بۆ ئەوەی خەڵک هەست بە گۆشەگیری و دوژمنایەتی بکەن. بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە کە متمانە نەگەڕاوەتەوە بۆ یەکەم دۆخی خۆی، و لە ماوەی سێ دەیەی ڕابردوودا ئاستی پشتگیری لە نێوان ٢٠٪ بۆ ٣٥٪ بووە. وە ڕێژەی متمانە لە ساڵی ١٩٧٢ بۆ کەمتر لە نیوەی دابەزی. ئەمەش بەو مانایە دێت کە هەر کەسێکی خوار تەمەنی ٤٠ ساڵ بێت هەموو ژیانی خۆی لە دەوڵەتێکدا ژیاوە کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی متمانەیان بەوە نییە کە حکومەتی نیشتمانی ئەو شتە دەکات کە ڕاستە. لە ماوەی چوار دەیەدا هیچ گۆڕانکارییەکی گەورە لە سەرکردایەتی و ئایدیۆلۆژیدا کە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە دەنگی پێدرا سەرکەوتوو نەبوو لە گۆڕینی ئەو دۆخەدا. مرۆڤ دەبێت بیر لەوە بکاتەوە کە ئەمە مانای چی دەگەیەنێت بۆ کارکردنی گونجاو دیموکراسی کە ٦٦-٧٥٪ ی دانیشتوانەکەی لەو باوەڕەدان کە حکومەتەکەیان زۆربەی کات کاری دروست

ناکات.

ئەم گۆڕانکاریە بنچینەییە لە هەڵوێستەکان لەلایەن گالوپەوە پەسەند دەکرێت کە لە ساڵی ۱۹۳٦ەوە چاودێری ئاراستەی ڕای گشتی دەکات. سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیە، بۆ نموونە، دامەزراوەکە بۆی دەرکەوت کە پشتگیری جەماوەری بۆ سەندیکاکانی بازرگانی و متمانەدان بە کۆنگرێس و لایەنە سیاسییەکان و کۆمپانیا گەورەکان و بانکەکان و ڕۆژنامەکان و هەواڵەکانی تەلەڤزیۆن و چەندین دامەزراوەی گرنگی تر بەردەوام بەرەو کەمبوونەوە دەچێت. (سوپا یەکێکە لەو دەزگا کەمانەی کە متمانە و پشتیوانی ئەمریکییەکان دەپارێزێت). تەنانەت دادگای باڵای ئەمریکاش، کە ئەمریکیەکان بەردەوام بەرزترین ئاستی ڕێز و پێزانینیان بۆ داناوە، ئاستی پشتگیری جەماوەریی خۆی بە توندی دابەزاند: لە نزیکەی ۷۰٪ لە ساڵی ۱۹۸٦ بۆ ٤۰٪ لە ساڵی ۲۰۱۲.

هەروەک کە داتاکانی ڕاپرسی جەختی لەسەر دەکاتەوە کە لەلایەن پرۆژەی " دامەزراوەی پیو جیهانی بۆ هەڵوێستەکان " کۆکراوەتەوە، جێگای سەرسوڕمان نییە کە ئەم دابەزینی متمانە بە حکومەت و دامەزراوەکانی تر دیاردەیەکی تایبەت بە ئەمریکا نییە. پیپا نۆریس، لە زانکۆی هارڤارد، و تۆڕێکی نێودەوڵەتی لە شارەزایان، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە نارەزایەتی لە سیستەمی سیاسی و دامەزراوە سەرەکیەکانی حکومەت دیاردەیەکی گەشەسەندووی جیهانی بوو. چونکە ئەو قەیرانە ئابووریەی ساڵی ۲۰۰۸ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو پاشان ئەوروپاشی گرتەوە ئەمیش بووە هۆی بەرپاکردنی هەستی توند دژی لایەنە کردارە جێبەجێکارەکان کە جەماوەرلۆمەی دەکات لە دروستبوونی قەیرانەکە: حکومەت و سیاسیەکان و بانکەکان و هاوشێوەکانی.

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

ئەم ڕاپرسیانە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیری تێدا نیە، بەڵکو هەریەکەیان لانی کەم هەندێک لەو ڕێگایانەی دەرخستووە کە هەڵوێست و بەهاکان دەستیان کردووە بە گۆڕینی ئاراستەیان لە میانەی گۆڕانە سیاسی و ماددیەکان کە لە ژیانی خەڵکی ڕوویان داوە، وە ڕەنگە پێشووتریش لە هەندێ کات.

شۆڕشی عەقڵییەت گۆڕانێکی قووڵ لەخۆدەگرێت لە سەروەری بەهاکان و ستانداردەکان و نەریتەکان. ئەوە ڕەنگدانەوەی گرنگی گەشەسەندوویە کە دەگەڕێتەوە بۆ شەفافیەت و مافی موڵکداری و نەزاهە، چ لە مامەڵەکردنی ژنان لە کۆمەڵگا یان کەمینە ڕەگەزییەکان یان کەمینەکانی تر، یان تەنانەت کەمینەی خاوەن پشکەکان لە کۆمپانیاکان. زۆرێک لەو قیاس و نەریتانە ڕەگی قووڵی فەلسەفیان هەیە، بەڵام بڵاوبونەوەیان ئەمڕۆ زۆر سەرسورهێنەرە، هەرچەندە هێشتا زۆر نایەکسان و ناتەواون. ئەم گۆڕانکارییە لە عەقڵییەتەکاندا گۆڕانکاریە دیمۆگرافیەکان و چاکسازیە سیاسیەکان دروستیان کرد؛ لە ڕێگەی فراوانبوونی دیموکراسی و خۆشگوزەرانی ، وە لە ڕێگای باشتربوونی بەرچاو لە بواری نەهێشتنی نەخوێندەواری و بە دەست گەیشتنی پەروەردە، و لە ڕێگەی تەقینەوەی شۆڕشی پەیوەندیەکان و ڕاگەیاندنەکان.

جیهانگیری و شارنشینی و گۆڕانکاری لەپێکهاتەی خێزان و بەرزبوونەوەی پیشەسازی و هەلی نوێ و بڵاوبوونەوەی زمانی ئینگلیزی وەک زمانێکی قسەکردنی جیهانی، هەموویان تێوەگلانی هەیە لە هەموو بوارەکان، بەڵام کاریگەرییان لەسەر ئاستی هەڵوێستەکان گرنگتر بوو. دیارترین کاریگەری ئەم گۆڕانکارییانە بێگومان دەرکەوتنی ئاواتە زیادکراوەکانە وەک هاندەرێک بۆ کردار و ڕەفتارەکانمان. ئارەزوو بۆ بەدیهێنانی ژیانێکی باشتر سیفەتێکی سروشتی مرۆڤە، بەڵام ئەوەی کە پاڵ بە خەڵکەوە دەنێت بۆ چوونە سەر کار ئەوەیە کە چاو

## کۆتایی سەردەمی هێز

لە مۆدێلە دیاریکراوەکانی فۆرمی باشتری ژیان دەکات نەک تەنیا بیرۆکەیەک بۆ باشترکردنی ژیان. ئابووریناسان ئەوەیان سەلماندووە کە ئەمە لەسەر دۆخی کۆچکردن جێبەجێ دەکرێت بۆ نمونە، چونکە خەڵک کۆچ دەکەن نەک بەهۆی بێبەشبوونی ڕەهاوە، بەڵکو بەهۆی بێبەشی ڕێژەییەوە، نەک لەبەرئەوەی هەژارن، بەڵکو لەبەر ئەوەی بۆیان دەردەکەوێت کە دەتوانن دەستکەوتێکی باشتر بەدەست بهێنن. هەر چەند پەیوەندی نێوان خەڵک گەورەتر بێت، ئەو ئاواتانە فراوانترە کە لە ئەنجامی ئەم جۆرە پەیوەندیانەوە دێت.

کاریگەرییەکانی شۆڕشی عەقلیەت لە دەسەڵاتدا هەمەجۆر و ئاڵۆزە. بەرزبونەوەی تێکەڵەی بەها جیهانییەکان، و زیادبوونی ڕەفتارە ڕووکەشەکان، گەورەترین تەحەدایە کە ڕووبەڕووی بناغەی ڕەوشتی هێز دەبێتەوە. ئەوە یارمەتی بڵاوکردنەوەی ئەو بیرۆکەیە دەدات کە شتەکان پێویست ناکات هەمیشە وەک خۆیان بمێننەوە، وە هەمیشە ڕێگایەکی باشتر هەیە، لە شوێنێک و بە شێوەیەک. گومان و بێمتمانەیی بۆ هەر دەسەڵاتێک دروست دەکات، و نەبوونی ئارەزوو لە خۆبەدەستەوە دان بە تەندروستی هەر دابەشبوونێک لە هێز.

یەکێک لە باشترین نموونەکانی هەر سێ شۆڕشەکە کە لە هەمان کاتدا کاری تێدا دەکەن بریتییە لە پیشەسازی بەڵێندەری هیندی، ڕۆشنبیرە گەنجە هیندییەکان لە چینی ناوەندی سەرفرازەوە بە گروپ بەرەو ناوچە شارستانییەکان ڕۆیشتن بۆ کارکردن لە ناوەندەکانی پەیوەندیکردن و کۆمپانیا بەڵێندەرە بازرگانیەکانی تر، کە لەساڵی ٢٠١١ داهاتەکانی گەیشتە ٥٩ ملیار دۆلار، وە ١٠ ملیۆن هندی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دامەزراند. شەهزاد ندیم لە توێژینەوەکەیدا " کۆپیە هاوشێوەکان " سەبارەت بە کاریگەری ناوەندەکانی پەیوەنندی هیندی لەسەر کرێکارەکانیان، لە توێژینەوەکەیدا دەڵێت: "ناسنامەی کرێکارانی تەکنەلۆجیای زانیاری و پەیوەندیەکان و ئاواتەکانیان لەسەر

بنەمایەکی جێگیر دیار دەکرێت بەپێی سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان، چونکە ئەم کرێکارانە، لە ڕێگای ڕەتکردنەوەیان بۆ ڕادیکالیەتی نەریتە کۆنەکان و شانازیکردن بە خۆیانەوە، دیمەنێکیان بۆ ڕۆژئاوا دروست کرد کە وای لێهات بەکاربێت وەک پێوەرێک بۆ پێشکەوتنی هیند بەرەو مۆدێرنی". هەرچەندە کار داهاتێکی تا ڕادەیەک باش دروست دەکات، بەڵام هیندییە گەنجەکان تێکەڵ بە ناکۆکی و ئاواتە سەرنجڕاکێشەکان دەکات، بەمانای ئاواتەکان بۆ سەرکەوتن لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری هیندی، لە هەمان کاتدا پەرە بە ناسنامەی کولتووریی خۆیان دەدەن بە گرتنەبەری زاراوە و ناوی وەهمی، و مامەڵەکردن لەگەڵ خراپەکاری وچەوسانەوەی کڕیارە زەنگینەکانی کیشوەرە جیاوازەکان.

بۆ ژنانی لاوی هیندی، بەتایبەتی ژنانی شارنشین، ئەم کارانە دەرفەتێک و سوودی ئابووریان بۆ ڕەخساندن کە بەبێ ئەوان دەستیان نەدەکەوت؛ ئەو شتەی کە بووە هۆی گۆڕانکاری بەردەوام لە هەڵسوکەوتدا دەستی کرد بە هەڵگەڕانەوەی سەراوسەری بنەما کولتوورییەکان. ئەمە جگە لەو وتارە هەستیارانەی ڕۆژنامەوانی کە باسی ناوەندەکانی پەیوەندیکردنیان دەکرد وەک "بەشێک لە هیندستان کە هیچ سنوورێک نییە بۆ ئازادی، ئەو شوێنەی خۆشەویستی خۆشییەکی کاڵ کەرەوەیە وسێکس بۆ خۆحەسانەوەیە." نزیکترین وێنە بۆ واقیع ئەو ڕاپرسیەی ئەم دواییەیە ڕوونی دەکاتەوە کە لەلایەن فیدراسیۆنی ژووری بازرگانی هیندی ئەنجام دراوە، کە بۆیان دەرکەوت ئافرەتە لاوە خێزاندارە هیندیەکان کە لە شارەکانی هندستان کار دەکەن بە شێوەیەکی زیاتر پەنا بۆ دواخستنی منداڵ هینان دەکەن وسەرنجیان دەخەنە سەر پێشخستنی ژیانی پیشەییان.

## ئەنجامە شۆڕشگێڕییەکان: لاوازکردنی بەربەستەکانی هێز

زۆرێک لە ڕووداوەکان پێشنیار دەکەن کە شتەکان ئەوەندە نەگۆڕاون، وە هێزە بچووکەکان حالەتێکی نائاسایی دەنوێنن، وهێزی گەورە دەتوانێت بمێنێتەوە وهەر لەسەر کۆنترۆڵ کردن دەمێنێتەوە. ئایا کردارە سەرکوتکەرە خێراکانی حکومەتی چین و ئێران و ڕوسیا، یان بەهێزبوونی بانکە گەورەکان و شێوازی فراوانبوونی حکومەت، و بەرنامەکانی ڕزگاری دارایی، و تەنانەت بەنیشتمانیکردنی کۆمپانیا گەورەکان لەچەندین وڵاتی دەوڵەمەند و پێشکەوتوودا؛ ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە هێز لە کۆتاییدا هەر دوای هەمان یاسا کۆنەکان دەکەوێت؟ هیچ یەکێک لە بانکی گۆڵدمان ساکس، و حزبی کۆمۆنیستی چینی و کڵێسای کاسۆلیک لەناو نەچوون، وە هێشتا ئەم دامەزراوانە بەردەوامن لە سەپاندنی ئیرادەی خۆیان بە شێوازێکی بێشومار.

سەرەڕای کەوتنی هەندێک دەزگای زەبەلاح، بەڵام ئەو دامەزراوانەی جێگەیان گرتەوە وا دیار بوو کە پەیڕەوی هەمان بنەماکانی ڕێکخستنیان دەکرد، وهەمان خواستی فراوانکردن وپتەوکردنی دۆخ سەریهەڵدا. ئایا گرنگە کە گەورەترین کۆمپانیای پۆڵای جیهان چیتر کۆمپانیای پۆڵای ئەمریکی یان زەبەلاحێکی ئەوروپی نییە، بەڵکو کۆمپانیایەکی هیندی لەدایک بووە کە جارێک پەراوێزخراوبوو، چەندین سەرمایە وکارمەند و کڕیاری لە هەندێک لەو پێشبڕکێکارە کۆنانە بەدەست هێناوە؟ ئایا دادپەروەرییە بڵێین دەرکەوتنی زەبەلاحە تازەکان کە لە ئۆپەراسیۆنەکانیاندا جیاواز نین لە زەبەلاحە کۆنەکانەوە بەتایبەتی لە بواری بازرگانیدا، بە سادەیی بەشێکن لە کاری میکانیزمە ئاساییەکانی سەرمایەداری؟

وە وەڵام بۆ ئەم دوو پرسیارە بەڵێ ونەخێرە. ئەو ڕەوتانەی کە ئێستا چاودێری

دەکەین دەکرێت بە سادەیی لێکبدرێتەوە - یان ڕەت بکرێتەوە - بەوەی کە ئەوە دەردەخات کە ئابووریناس جۆزێف شومپیتەر (وپێش ئەو، کارل مارکس) ناوی نابوو " وێرانکاری داهێنەرانە". شومپیتەر، وتیشی: "کردنەوەی بازاڕی نوێ. دەرەکی یان ناوخۆیی، وبەرەسەندنی ڕێکخراو لە کۆگاکانی پیشەیی وکارگەکانەوە بۆ کۆمپانیاکانی وەک کۆمپانیای پۆلای ئەمریکی، هەمان پرۆسەی گۆڕانی پیشەسازی نیشان دەدات، کە نەوەستاوە لە بەرەوپێشبردنی پێکهاتەی ئابوری لە ناوەوە، و لە وێرانکردنی پێکهاتەی ئابوری کۆن، وە لە نوێکردنەوەی پێکهاتەی ئابوری نوێ. ئەم پرۆسەی وێرانکارییە داهێنەرانە حەقیقەتی بنەڕەتی سەرمایەدارییە، وە پێکهاتەیەکی بنەڕەتییە تێیدا و دەبێت هەموو دامەزراوەیەکی سەرمایەداری لەگەڵیدا بژی ".

بێ گومان ئەو گۆڕانانەی هێز ئەمڕۆ لەدەوری خۆماندا دەیانبینین کە بەرزبوونەوەی کۆمپانیاکان و نەمانیان لەخۆدەگرێت و تێپەڕیشیان دەکات هاوشانن لەگەڵ پێشبینیەکانی شومپیتەردا، و هەروەها لەگەڵ تێڕوانینەکانی کلینتۆن کیرستنیش یەکدەگرێتەوە، پرۆفیسۆری بەڕێوەبردنی بازرگانی لە کۆلێژی کارگێڕی هارڤارد، کە دەستەواژەی داهێنانی شۆڕشگێڕانەی داڕشت ( ئەو داهێنانەی کە شۆڕش بەرپا دەکات لە بازارەکان و جێگای بازرگانیە کۆنەکان دەگرێتەوە )، بە مانای گۆڕان لە تەکنەلۆجیا یان خزمەتگوزاری یان بەرهەم کە بازارێکی نوێی لێ پەیدا دەبێت لە ڕێگای پشت بەستن بە شێوازێکی تەواو نوێ. دەرهاوێشتەکانی سەر هەر داهێنانێکی شۆڕشگێرانە لە کۆتایی دا درێژدەبێتەوە بۆ بازارەکانی تر کە پێوەی بەستراوە یان هاوشێوەیەتی و لاوازی دەکات. وە ئامێری ئایپاد نموونەیەکی باشە بۆ ئەمە. وە لە نموونە باشەکانی تر بەکارهێنانی مۆبایلە بۆ پێدانی نرخی کاڵا یان ناردنی پارە بۆ کەسێک لە کیشوەرێکی تر.

بەڵام، لە کاتێکدا شومپیتەر سەرنجی خستە سەر هێزەکانی گۆڕان لە ناو

سیستەمی سەرمایەداریدا بە گشتی، و کیرستنسن بە شێوەیەکی تەسکتر بازاڕە دیاریکراوەکانی شیکردەوە، ئەوا پاساوەکە لێرەدا ئەوەیە کە هێزە هاوشێوەکان لە ناو کۆمەڵێکی زۆر فراوانتر لە هەوڵ و کۆششەکانی مرۆڤدا کار دەکەن. هەروەک ئەم بەشەی ئەم کتێبە هەوڵی دا ئەوە ڕوون بکاتەوە، بەڵام شۆڕشەکانی زۆربوون، جووڵە و عەقڵییەتی نوێنەرایەتی گۆڕانێکی زۆر گەورەتر دەکەن لە قەبارە و مەودادا.

هەریەک لەم شۆڕشانە تەحەدایەکی دیاریکراو پێشکەش بە مۆدێلی هێزی تەقلیدی دەکەن، لەو مۆدێلەدا ئەبینین ڕێکخراوە مۆدێرن و مەرکەزی و پێکەوەبەستراوەکان کە سەرچاوەی زۆر و سەرمایەی تایبەت یان هێزی زاڵیان بەکارهێناوە، ڕوونترین ڕێگا بۆ دەستکەوتن و هێشتنەوەی دەسەڵات پێشکەش دەکەن بۆ چەند سەدەیەک دەرکەوت کە ئەم مۆدێلە باشترین گونجێنراوە، نەک تەنیا بۆ زۆرلێکردن و سەرکوتکردنی خەڵک بە زەبروزەنگ و توندوتیژی، بەڵکو بۆ ئەوەی هێز لە ڕەهەندە کارامە و لێهاتووەکانی خۆیدا بەکاربێنێت.

وەک بینیمان لە بەشی دووەمدا، هێز لە ڕێگای چوار کەناڵی ماسولکەیی جیاوازەوە کاردەکات، یان زۆرلێکردنێکی ناشکرا کە خەڵک ناچار دەکات ئەو کارانە بکەن کە هەرگیز نەیان دەکرد ئەگەر ناچار نەبان، و نەریت، واتە هێزی پابەندبوونی ڕەوشتی، و ڕێگای خستنەڕوو و پێشەکش کردن، واتە هێزی قایلکردن، و پاداشت: هێزی هاندان، دوو لە کەناڵەکان ماسولکییەکان و پاداشتەکان-- هاندانەکان دەگۆڕن، و ڕەنگە دووبارە دارشتن بۆ دۆخەکە بکەن تا پاڵ بە خەڵکەوە بنێن بە شێوەیەکی دیاریکراو کار بکەن، لە کاتێکدا دو کەناڵەکەی تر شێوازی پێشکەشکردن و نەریتەکان هەڵسەنگاندنی خەڵک بۆ بارودۆخەکە دەگۆڕن بەبێ گۆڕینی هاندانەکان. بۆ ئەوەی ماسولکەکان، نەریتەکان، ڕێگای پێشکەشکردن و خەڵاتەکان کاریگەر بن، دەبێت بەریەستی هێز هەبێت. کاریگەری شۆڕشەکانی

زۆربوون و جوولەیی و عەقلییەتی بە وردی خۆی دەنوێنێت لە کەمکردنەوەی ئەم بەربەستانە. خشتەی ژمارە (٤-١) کورتکراوەیەکک بۆ ئەمە پێشکەش دەکات.

هەر وەک خشتەی پێشوو پیشانی دەدات، هەر سێ شۆڕشەکە لە هەر چوار کەناڵەکەدا بەرەنگاری هێز دەکەن: ماسولکەکان، ژوورەکان، ڕێگای پێشکەشکردنەکان، و خەڵاتەکان. بێگومان زۆرەملێیی، نابەجێترین کرداری هێزە، چ لە ڕێگەی یاسا یان سوپا یان حکومەت یان دەستبەسەرداگرتن پیادە دەکرێت. بەڵام لەگەڵ گەشەسەندنی سێ شۆڕشەکە؛ ئەو دامەزراوانەی کە پشت بە ڕێگای زۆرەملێ دەبەستن دووچاری تێچوویەکی زیاتر دەبنەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە کۆنترۆڵکردنیان بکەن لە بوارە تایبەتەکان و پاسەوانی سنورەکانیشی بکات.

نەبوونی توانای ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، یان یەکێتی ئەورووپا، بۆ کەمکردنی کۆچ و بازرگانیە نایاساییەکان نمونەیەکی باشە بۆ ئەمە. دیوارەکان، پەرژینەکان، کۆنترۆڵی سنوورەکان، ناسنامەی بایۆمەتری، بنکەکانی دەستبەسەرکردن، هێرشی پۆلیس، لێکۆڵینەوەکانی پەناخوازان و دیپۆرتکردنەوەی بیانیەکان تەنیا بەشێکن لە میکانیزمی پاراستن و سەرکوتکردن کە سەلمێنراوە تا ئێستا تێچووەکانی زۆرە، ئەگەر شکستخواردووش نەبێت. سەیری شکستی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکە لە ڕاگرتنی هاتنە ناوەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە ئەمریکای لاتینیەکان، سەرەرای جەنگە دوورودرێژ و تێچووە زۆرەکەی لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکان.

وە زیاتر لەمەش؛ زیادبوون لە باشبوونی باری بژێو، و بڵاوبوونەوەی نەریتە جیهانیەکان، بوار و ئارەزوو و ئامرازەکان بە خەڵک دەدەن بۆ ئەوەی بەرامبەر دەسەڵاتە ستەمکارەکان بوەستنەوە و تەحەدایان بکەن. خەڵک وایلێهاتووە زیاتر دەست بە بەهاکانی ئازادی شارستانی و مافەکانی مرۆڤ و شەفافیەتی ئابووریەوە دەگرن، و ژمارەیەکی زیاتر لە بەرگریکاران و پسپۆرانن و پشتگیران و

سەکۆکان بەردەستن بۆ دامەزراندنی ئەم بەهایانە. وە من لێرە مەبەستم ئەوە نیە کە زۆرەملێ چیتر ئەنجام نادرێت، بەڵکو مەبەستم ئەومیە تێچووەکەی زیاتر بووە، و پارێزگاریکردن لێی زەحمەتر دەبێت لەگەڵ کات.

ئەو هێزەی کە پیادەکرا لە ڕێگای نەریتەکان یان ئەرکە ڕەوشتیەکان دووچاری بەرەنگاری دەبنەوە لەگەڵ پێشکەوتنی سێ شۆڕشەکان؛ چونکە خەڵک هەر لە کۆنەوە پشتی بە نەریتەکان و ئایینەکان بەستووە بۆ فەراهامکردنی سیستەمێکی ئەخلاقی و شیکردنەوەی ڕاستیەکانی جیهان. وە بەنسبەت ئەو خەڵکانەی کە ژیانێکی کورتی پڕ لە نەخۆشی و هەژاری دەژین، ئەوا گوومانی تێدا نیە کە بەها ڕیشاڵییەکانیان لە خێزانەکان یان کۆمەڵگا تەسک و بەستراوەکان یارمەتیان دەدات بۆ ڕاهاتن و ئاڵوگۆڕکردنی یارمەتی و پشتگیری. بەڵام لەگەڵ زیادبوونی ئاسودەیی جەستەیی و بژاردەی زیاتر، کەمتر پشت بە سیستەمی باوەڕی میراتیی خۆیان دەبەستن و زیاتر کراوەن بۆ تاقیکردنەوە لەگەڵ نوێکان.

لە کاتی گۆڕانی توندی ماددی و هەڵسوکەوتدا، داواکاری بۆ پابەندبوون بە داب و نەریتەکان یان ئەرکە ئەخلاقییەکان شانسی کەمتر دەبێت بۆ سەرکەوتن ئەگەر ئەو نەریتانە یان ئەرکە ئەخلاقیانە ڕەنگدانەوەی گۆڕانی barودۆخەکان نەبێت. بۆ نمونە، قەیرانی کڵێسای کاسۆلیک وەربگرە، کە بێ توانایی لە ڕاکێشانی ئەو کاهینانەی سوێندی ڕەبەنایەتی قبول بکەن یان - کێبەرکێیان لەگەڵ کڵێسا بچووکەکانی ئینگلیزی کە دەتوانن ووتارێک پێشکەش بکەن لەگەڵ کەلتووری کۆمەڵگە تایبەتەکاندا بگونجێت و دەست بدات لە پێویستیە ڕاستەقینەکانیان - ڕووداوێکی ئاگادارکەرەوەی سەرسامکەرە.

هێز لە ڕێگای باوەڕ پێکردنیشەوە کار دەکات، وەک ئەو ڕێگای خستنەڕووەی کە هەر کەمپینێکی ڕاگەیاندن نیشانی دەدات، یان هەر دەڵاڵێکی

خانووبەر، بۆ نموونە، وە لە ڕێگای هاندانیش؛ بە خەڵاتکردنی دەنگدەران یان فەرمانبەران یان شوێنکەوتووەکانی تر بەو سوودانەی کە گرەنتی بەشداربوون و هەڵوێستەکانیان دەکات. سێ شۆڕشەکە گۆڕانێکیان دەست پێکردووە لە ڕێگای خستنەڕوو و پاداشتکردن.

بێنە بەرچاوت بەربژێرێک یان پارتێکی سیاسی هەوڵی کۆکردنەوەی دەنگ دەدات بۆ هەڵبژاردنی داهاتوو لە ڕێگای نامەکان و ڕێکلامەکان و بەڵێندان بە پێشکەشکردنی کەڵاتەکان لە شێوەی خزمەتگوزاری و کار بۆ دەنگدەران. شۆڕشی زۆربوون دەستی کردووە بە دروستکردنی کۆبوونەوەکان لە دەنگدەری ڕۆشنبیرتر و هۆشیارتر و کەمتر مەیلی قبوولکردنی بڕیارەکانی حکومەتی هەیە بە شێوەیەکی نەرێنی، و زیاتر مەیلی وردبینی لە هەڵسوڕانی دەسەڵاتەکان و لێکۆڵینەوەیان، و چالاکانەتر لە گەڕان بەدوای گۆڕان و سەلماندنی مافەکانیان. شۆڕشی جوڵانەوە وادەکات کە پێکهاتە دیموگرافیەکان بۆ دەنگدەران زیاتر هەمەجۆر و پارچە و ناجێگیرتر بێت. لە هەندێک حاڵەتدا لەوانەیە یاریزانانی ئارەزوومەند هەبێت کە بتوانن لە دوورەوە کاریگەری لەسەر دەنگدەران بکەن، لە ڕاستیدا لە وڵاتێکی جیاوازەوە. وە هۆکاری شۆڕشی عەقلییەتەکان گومانی زیاترە لە سیستەمی سیاسی بە گشتی.

هەروەها کێشەیەکی هاوشێوەش هەیە کە کاردەکاتە سەر فەرمانبەران و ئاشکراکەران و هەر لایەنێک کە هەوڵی ڕاکێشانی پشتگیری یان ڕەواج دان بە فرۆشتن بدات لەو کۆمەڵگایانەی کە بەرژەوەندی و پەسەندەکانیان دەستی بە پارچەبوون کردووە و زیاتر هەمەجۆر بووە. لە جیاتی دروستکردنی پاکێجێکی سوودە سەرکەوتووەکان بۆ ڕاکێشانی دانیشتوانێکی گەورەتر، لەوانەیە دروستکردنی پاکێجێک کە بە ڕاستی سەرکەوتوو بێت لە بردنەوەی پشتگیری گروپێکی بچووکتر ئاسانتر بێت. هەرچەند تایبەتمەندیەکانی قەبارە و مەودا زیاتر بچنەوە

یەک، ئەوا بازارە بچووکە تایبەتمەندەکان و ئەو ووتارە سیاسیانەی کە تیشک دەخەنە سەر یەک کێشە، بۆ نموونە، سوودمەنتر دەبن. لە دەرەنجامی ئەمەش، کۆمپانیا گەورەکان زیاتر و زیاتر ناچاردەبن بۆ هەڵسوکەوت کردن وەک یاریزانێک لە بازارێکی بچووکی تایبەتمەند، وە ئەمەش لە ژێر فشاری هێزی بازار و کردارەکانی ڕکابەرە بچووکەکان، کە ئەمەش کارێکی ئاسان نیە بۆ ئەو دامەزراوانەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر ڕاهاتوون پشت بە هێزی یەکلاکەرەوە ببەستن کە سەرچاوەی گرتووە لە قەبارە گەورەکەی.

## ڕووخانی بەربەستەکان: هەڵێک لە بەرامبەر هێزە بچووکەکان

لە پەڕەکانی داهاتوو باسی ئەم چەمکانە دەکەین لە جیهانی واقیعی. وە یەکێک لەو هۆکارانەی کە وادەکات گفتوگۆ لەسەر هێز شتێکی قورس بێت، جگە لە تێکەوتە فەلسەفیە گشتیەکانی، ئەوەیە کە ئێمە ڕاهاتووین لەسەر بیرکردنەوە دەربارەی دینامیکیەکانی هێز بە ڕێگای زۆر جیاواز، بە پشت بەستن بەوەی کە سەرنجی دەخەینە سەر؛ ئایا ململانێیەکی سەربازیە یان ڕکابەری بازرگانی، یان دبلۆماسی نێودەوڵەتی، یان پەیوەندی نێوان ژن و مێرد، یان پەیوەندی نێوان باوک و کوڕ، یان هەر بوارێکی تر؟

لەگەڵ ئەوەش، ئەو گۆڕانکاریانەی کە سێ شۆڕشەکان دەریان دەخات کاریگەری لەسەر هەموو بوارەکاندا هەیە و زۆر دوورتر دەڕوات لە هەر ئاراستەیەکی هەنووکەیی دیاریکراو. وە ئەم گۆڕانکاریانەش، لە ڕاستیدا، ڕەگی کێشاوە لە شێوازەکانی کۆمەڵگا مرۆییەکان و ئاواتەکانی ئەمڕۆ بە شێوەیەکی قووڵتر لەوەی کە بوون پێش چەند ساڵێک یان دەیەیەک لە ئێستا، و ڕکابەریەک پێک دەهێنێت بۆ بیروباوەڕە سەقامگیرەکان دەربارەی ئەوەی کە پێویستە بۆ دەستکەوتنی هێز و بەکارهێنانی و پارێزگاری کردن لێی. ئەو پرسیارەی کە چۆن

ئەو ڕکابەریە دەرئەکەوێت و چۆن یاریزانە زاڵەکان لەسەر دیمەنەکە لە سەدەی بیستەمەوە وەڵام دەدەنەوە، تەوەری سەرەکی باقی ئەم کتێبە دەبێت.

هێزی گەورە بە هیچ شێوەیەک نەمردووە، چونکە یاریزانە گەورەکان و دامەزراوەکان بەرگری لە پۆستەکانیان دەکەن و لە زۆر حاڵەتدا هێشتا زاڵن. وە بەردەوام دیکتاتۆرەکان و دەوڵەمەندەکان و کۆمپانیا زەبەلاحەکان و ڕابەرانی ئایینە گەورەکان بە تایبەتمەندییەکی گرنگی دیمەنی جیهانی و فاکتەری دیاریکەر لە ژیانی ملیارەها مرۆڤدا دەمێننەوە. هەرچۆنێک بێت، ئەم یاریزانە پلەبەرزانە ئێستا زیاتر لە جاران بەستراونەتەوە دەربارەی بەوەی کە لە توانایان دابوو بیکەن، وە دڵنیابوون لە کۆنترۆڵکردنی هێزەکەیان بە بەردەوامی کەم دەبێتەوە. وە بەشەکانی داهاتوو نیشانی دەدەن کە چۆن هێزی بچووکتر ئەو بژاردانە کەم دەکەنەوە کە بەردەستن بۆ یاریزانە باڵاکان، و چۆن لە هەندێک حاڵەتدا ناچاریان دەکەن پاشەکشە بکەن یان تەنانەت دەسەڵات بە تەواوی لە دەست بدەن، وەک لە بەهاری عەرەبیدا.

شۆڕشەکانی زۆربوون و جووڵە و عەقڵییەتەکان هێرش دەکەنە سەر مۆدێلی ئەو ڕێکخراوەی کە ماکس وێبەر و شوێنکەوتوانی لە بواری زانستەکانی کۆمەڵناسی و ئابووری بە شێوەیەکی زۆر قایلکەرانە بەرگریان لێدەکرد، ئەم هێرشەش بە وردی لەسەر ئەو خاڵانەیە کە هێز خۆی لێی وەرگیراوە. کۆمپانیا گەورەکان کاریگەرتر بوون چونکە ئەوان بە نرخێکی کەمەوە کاریان دەکرد بەهۆی ئابووریەکانی قەبارە؛ بەلام تێچووی پارێزگاریکردن لە سیستەم و کۆنترۆڵکردن ئەمڕۆ بەرەو بەرزی دەچێت. کۆمپانیا گەورەکان کاریگەرتر بوون چونکە هەڵدەستان بە کۆگاکردنی سەرچاوە دەگمەنەکان و تایبەتکردنی مەرکەزیەت، بەڵام ئەمڕۆ سوود وەگرتن لە سەرچاوەکان ئاسانترە وەک شتومەک، زانیاری، بەهرەی مرۆڤ، کڕیارەکان و خزمەتگوزارییەکان لە ماوە دوورەکان یان نزیکەکان.

## کۆتایی سەردەمی هێز

وە دامودەزگا گەورەکان چێژیان لە هێز و مۆدێرنی و گەشەسەندن وەردەگرت، بەڵام ئەمڕۆ سەرکەوتنە دیارەکانی هێزە بچووکە نوێکان بەرەنگاری هێزە زەبەلاحەکان دەبنەوە. وە لەگەڵ چوونەوەیەکی ئەو سوودانەی کە مۆدێلێکی ڕێکخستنی ناوەندی فراوان و عەقڵانی و لێکترازاو چێژی لێ دەبینی، دەرفەتەکان بۆ هێزی بچووکتر بۆ سەلماندنی هەبوونیان بە بەکارهێنانی مۆدێلێکی نوێی سەرکەوتن زیاتر دەبێت.

بەڵام ڕادەی هەڵوەشانەوەی هێز چەندە؟ دەرهاوێشتەکانی چین؟ لە بەشە ماوەکەی ئەم کتێبەکەدا دەچینە ناو وردەکاری چۆنیەتی دەرخستنی ئەم پرۆسەیە لە سیاسەتی ناوخۆ و جەنگ و جیۆپۆلەتیک و بازرگانی و بوارەکانی تر. دیاریکردنی ئەو بەربەستانەی هێز کامانەن کە خەریکە دەڕووخێت؟ وە یاریکەرە تازەکان کێن کە دەرکەوتوون؟ و ئەو هێزانەی ئێستا چۆن بەرگرییان لە خۆیان کرد؟

لەگەڵ ڕووخانی بەربەستەکان، ڕێکخستنەوەی هێزەکە دوورە لە تەواوبوون، بەڵام بە ڕاستی دەستی کردووە بە هێنانەدی گۆڕانکاریە بنەڕەتیەکان.

## بەشی پێنجەم

## بۆچی چەمکەکانی سەرکەوتنی یەکلاکەرەوە و زۆرینەکان و ڕاسپاردە بەهێزەکان لە مەترسی لەناوچوونن ؟

## هەڵوەشانەوەی هێز لە سیاسەتی نەتەوەیی

هێز جەوهەری سیاسەتە، و سیاسەتیش جەوهەری هێزە. لە کۆنەوە سیاسەت ڕێگای کلاسیکی بووە بۆ وەدەستهێنانی هێز. هیچ گومانێک نیە کە هێز بۆ سیاسەتمەدارەکان وەک تیشکی خۆر وایە بۆ ڕووەکەکان. ئەوەی سیاسەتمەداران بە هێزی خۆیان دەیکەن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا، ئاواتی هەبوونی دەسەڵات تایبەتمەندی سەرەکی هاوبەشە لە نێوانیان. هەروەک ماکس فیبەر نزیکەی سەدەیەک پێش ئێستا وتی: "ئە کەسەی کە لە سیاسەتدا کاردەکات، هەوڵی بەدەستهێنانی هێز دەدات، یان وەک ئامرازێک خزمەتکردن ئامانجەکانی تر، یانیش "وەک هێزێک بۆ دەسەڵات"، بەمانای لە پێناو چێژ وەرگرتن لەو هەیبەتەی کە ئەو دەسەڵاتە دەیبەخشێت".

بەڵام ئەم " هەست کردن بە هەیبەتە " هیچ نیە جگە لە هەستێکی خێرا ڕۆیشتوو، وە لەم سەردەمە تەمەننی کورتتر بووە. کۆتا دەیەی سیاسەتی ئەمریکی بێنە بەرچاو، کە شیکەرەوەی سیاسی ڕۆن برانستاین ناوینابوو " سەردەمی هەڵگەڕاوەکان "، چونکە دەنگدەران کۆنترۆڵکردنی هەریەک لە کۆنگرێس و کۆشکی سپییان دا بە پارتی جمهوری لە ساڵەکانی ٢٠٠٢ و ٢٠٠٤دا، پاشان لێیان وەرگرتنەوە لە ساڵەکانی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٨ بۆ ئەوەی دووبارە کۆنترۆڵی ئەنجومەنی نوێنەران بکەن لە ساڵەکانی ٢٠١٠ و ٢٠١٢. پێشتر لە پێنج خولەکانی هەڵبژاردن لە ساڵی ١٩٩٦ بۆ ٢٠٠٤، گەورەترین زیادبوون کە هەر

## کۆتایی سەردەمی هێز

لایەنێک لە کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەراندا بەدەستی هێنا نۆ کورسی بوو، بەڵام لەساڵی ٢٠٠٦ کۆمارییەکان ٣٠ کورسیان لەدەستدا، و لە ساڵی ٢٠٠٨ دیموکراتەکان ٢١ کورسیان بەدەستهێنا، و لە ساڵی ٢٠١٠ دیموکراتەکان ٦٣ کورسیان لەدەست دا. ژمارەی دەنگدەرە ئەمریکیە تۆمارکراوەکان ئێستا زیاترە ژمارەی ئەوانەی کە یەک ڕیزن لەگەڵ جمهوریەکان و دیموکراتەکان. وە لە ساڵی ٢٠١٢ گرینگی دەنگدەرە لاتینیەکان ڕوون بۆوە.

ئەمەش دیاردەیەکی تایبەتی ئەمریکی نیە، بەڵکو لە سەرانسەری جیهان بنەمای هێزی سیاسی زۆر ناسکتر بووە، بەدەستهێنانی زۆرینەی دەنگدەران کە گرەنتی توانا لەسەر دەرکردنی بڕیارەکان بدات چیتر بەردەست نیە، چونکە هێزی بچووکی هەمەجۆر هەیە کە دەتوانێت ڕێگری بکات، یان دوابخات، یان کەمی بکاتەوە. وە هێز لە نێوان پەنجەکانی سیستەمە ستەمکارەکان و تاک پارتەکان دەستی بە دزەکردن کردووە، ئینجا چ چاکسازی پەیڕەو کردبێت یان پاشەکشەی لێکردبێت. وە هێز دەستی بە بڵاوبوونەوە کردووە لە پارتە سیاسیە گەورە جێگیرەکانەوە بۆ پارتی بچووکی خاوەن ئەجێندایەکی تەسک یان بنکەیەکی دیاریکراوەی هەڵبژاردن. تەنانەت لە ناو پارتەکانیش ئەبینین کە سەرۆکەکانی، ئەوانەی بڕیار دەدەن و بەربژێرەکان هەڵدەبژێرن و بەرنامە سیاسیەکان دادەڕێژن لە دوای دەرگا داخراوەکان، دەستیان بە پێدانی بوار کردووە بۆ یاخیبووان لەسەر هێڵی حزبایەتی و بیانیە سیاسیە نوێیەکان ئەوانەی نەژیاون بۆ داگیرکردنی پێگەیەکی بەرز لە ڕیزەکانی حیزب، و هەرگیز گرینگیان نەداوە بە دەربڕینی ڕێز و گەورەیی بۆ سەرۆکەکانیان. ئێمە بە تەواوی کەسی نامۆ دەبینین لەسەر پێکهاتەی حیزب - ئەمانە ئەو تاکانەن کە خاوەن کەسایەتیەکی کاریزمان، و هەندێکیان لە پشتەوە لایەنگرانی دەوڵەمەندەکانن لە دەرەوەی حیزب و چینی سیاسی، وە هەندێکی

تریشیان شەپۆلێکی پشتگیریان بەدەست هێناوە لە ڕێگای ئامرازەکانی پەیوەندی و گردبوونەوە نوێیەکان کە پێویستی بە بوونی پارتەکان نیە - کە دەستیان بە دۆزینەوەی ڕێگەیەکی نوێ کردووە بۆ بەدەست هێنانی هێزی سیاسی.

هەر چ ڕێگایەک کە سیاسەتمەدارەکان لە حکومەت دیگرنە بەر بۆ گەیشتن بەو ئامانجە؛ بەڵام ماوەکانی مانەوەیان کورتتر بووە، و هێزیان لە دارشتنی سیاسەتەکان دەستی بە هەڵوەشانەوە کردووە. سیاسەت هەمیشە هونەری سازان و چارەسەرە ناوەندەکان بووە، بەڵام ئێستا بە هەموو مانای ووشە نائومێد بووە، و هەندێ جار وا دەردەکەوێت کە بە هیچ شێوەیەک هونەری هیچ شتێک نیە. سستی و خنکان بەربڵاوتر بووە لە هەموو ئاستەکانی بڕیاردان لە سیستەمی سیاسی، لە هەموو بوارەکانی حکومەت، و زۆربەی ووڵاتان. هاوپەیمانیەکان تێکدەشکێن، و هەڵبژاردن زیاتر ئەنجام دەدرێت، وە "ڕاسپاردەکان" دوورن لە لابردن لە هەموو کاتێکی تر. لامەرکەزیەتی و گواستنەوەی دەسەڵاتەکان لە ناوەندەوە بۆ یەکە ناوخۆییەکان، دەستەی یاسادانان و جێبەجێکاری نوێیان دۆزیەوە. لە ئەنجامدا سیاسیەکان و بەرپرسە هەڵبژێردراوەکان یان دامەزراوەکان زیاتر بەدەردەکەون لەم دەستە و ئەنجومەنە ناوچەییە بەهێزانە، و دەست دەگرن لەسەر بەشێکی گەوەرە لە هێزی سیاسیە گەورەکان لە پایتەختە نەتەوەییەکان. تەنانەت دەسەڵاتی دادوەریش بەژدارە لەمە؛ چونکە دادوەرەکان چالاکتر و زیاتر مەیلیان بۆ پرساندنی سەرۆکە سیاسیەکان هەیە، یان ڕێگری کردن لە هەڵوێستەکانیان، یان ڕاکێشانیان بەرەو لێکۆڵینەوەی گەندەڵی کە دووریان دەخاتەوە لە ڕێگەدانی یاساکان و دروستکردنی سیاسەتەکان. هەرچۆنێک بێت، بردنەوە لە هەڵبژاردنەکان لەوانەیە یەکێک بێت لە سەرچاوە گەورەکانی جۆش و خرۆشی ژیان تا ئێستا، بەڵام لە دوایدا تەوژمەکەی کەم دەبێتەوە. تەنانەت بوون لەدەسەڵاتی حکومەتێکی ستەمکار ئیتر

بەقەد ڕابردوو پارێزراو و بەهێز نییە. هەروەک پرۆفیسۆر مینکسین بای یەکێک لەشارەزایانی سەرەکی جیهان لەسەر کاروباری چین پێی وتم: "ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ئێستا بە ئاشکرا باس لەکاتە کۆنە خۆشەکان دەکەن کاتێک سەرکردەکانی حیزبی شیوعی پێویست نەبوو نیگەران بن لە بلۆگەران و هاککەرەکان و ئەو تاوانبارانەی کە سنوری نەتەوەیی دەبڕن، یان سەرکردە دەستبرەکان یان ئەو چالاکوانانەی کە ١٨٠ هەزار ناڕەزایی نەتەوەیی ڕێک دەخەن هەموو ساڵێک. سەرکردە کۆنەکان هێزی زیاتریان هەبوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ یەکگرتووەکان و ڕکابەرەکان کاتێک دەرکەوتن. سەرکردەکانی ئەمڕۆ هێشتا زۆر بەهێزن، بەڵام بە چەند دەمیەک وەک پێشینیان بەهێز نین و دەسەڵاتیان بەردەوام لە کەمبوونەوەدایە".

ئەمانە تۆمەتی گەورەن، بەڵام هەمەچەشنی سیستەمی سیاسی لە جیهان تووشی ترس دەکات. چونکە سیستەمی مەرکەزی و فیدراڵی زۆر هەن کە دەکەونە نێوان ئەم دوو پۆلێنکردنەوە، و هەندێک دەوڵەت سەر بە ڕژێمە سیاسیەکانی سەرەوەی نەتەوەیین، وەک یەکێتی ئەوروپا. وە ئەو دیکتاتۆرانەی کە لەسەر بنەمای یەک حیزب، یان فرەحیزبی بە شێوەیەکی دەستکرد، یان بێ حیزب دامەزراون، یان سەربازین، یان ڕژێمێکی بۆماوەیین، یان چڕبۆتەوە لەسەر بنەمای زۆرینە یان کەمینەیەکی ڕەگەزی یان ئایینی... وە بەم شێوەیە. هەرچی دیموکراسیەتەکانە، ئەوا زیاتر هەمەجۆرە. سیستمی سەرۆکایەتی و پەرلەمانی بەسەر چەندین بەشی لاوەکیدا دابەشکراون کە هەڵبژاردن لەسەر خشتەی کاتی جیاواز ئەنجام دەدەن، و ڕێگە بە لایەنی سیاسی کەمتر یان زیاتر دەدەن، و یاسای ئاڵۆزیان هەیە کە حوکمی بەشداری و نوێنەرایەتی سیاسی و دارایی هەڵبژاردن و پشکنین و هاوسەنگی و هەموو ئەزموونەکان دەکات. داب و نەریتەکانی ژیانی

سیاسی لە سەرانسەری ناوچەکاندا جیاوازە، تەنانەت ئەو ڕێژەی کە بە سەرکردە سیاسییەکان دراوە و سەرنجڕاکێشی پیشەی سیاسیش پەیوەستە بە چەندین فاکتەری گۆڕاوەوە. کەواتە چۆن دەتوانین گشتگیری بکەین و بڵێین کە سیاسەت دەست دەکات بە پارچەپارچەبوون، وە کە دەسەڵاتی سیاسی لە هەموو شوێنێکدا ڕووبەڕووی بەربەستی زیاتر دەبێتەوە، و خێرایی لەناوچوونی زیاتر بووە؟

با سەرەتا وەڵامی خودی سیاسەتمەداران لەبەرچاو بگرین، هەموو سەرکردە سیاسیەکان یان سەرۆکەکانی دەوڵەت کە قسەم لەگەڵ کردوون ئاماژەیان بە کۆمەڵێک هێزی هەڵواسراوی گەشەسەندوو کرد کە توانایی خۆیان بۆ حوکمڕانێتی سنووردار دەکەن، نەک هەر فراکسیۆنەکانی ناو حزب و یان هاوپەیمانی دەستڕۆیشتووەکانیان، یان ئەندام پەرلەمانە ناهاوکارەکان، یان ئەو دادوەرانەی کە چالاکتر و ئازادتر بوونە، بەڵکو هەڵگری سەنەدەکانی هاروهاجەکان و ئەوانی ترن لە وەکیلەکانی بازار و سەرمایەدارە جیهانیەکان و ڕێکخەرە نێودەوڵەتیەکان و دامەزراوە فرەلایەنەکان، و ڕۆژنامەنووسە ڕاپرسەکان و چالاکوانانی ئامرازە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، و بازنەیەکی بەرفراوانیش لە گروپە چالاکوانەکان. هەروەک لینا هێلم فالین کە پێشتر وەک جێگری سەرۆک وەزیرانی سوید و وەزیری دەرەوە و وەزیری پەروەردە کاری دەکرد پێی گوتم: من هێشتا سەرسامم بەوەی کە چۆن و چەند بە خێرایی دەسەڵاتی سیاسی دەگۆڕێت. ئێستا سەیری دواوە دەکەم و سەرسامم بەو کارانەی کە توانیمان لە ساڵانی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ ئەنجامی بدەین، کە ئێستا بە نزیکەیی پێشبینی ناکرێت لە ژێر سێبەری چەند فاکتەرێکی نوێ کە توانای حکومەت و سیاسەتمەداران سنووردار دەکەن یان خاوی دەکاتەوە بۆ کار کردن".

هەروەها سیاسەتمەدارە دامەزراوەکانیش دەستیان کردووە بە بەرکەوتن لەگەڵ

جۆرێکی نویێ لە کەسایەتیەکان لە نێو ڕاڕەوەکانی ئەنجومەنی یاساداناندا، لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ٢٠١٠ی بەرازیلدا، بۆ نموونە، ئەو کاندیدەی کە زۆرترین دەنگی بردەوە لە سەرانسەری وڵات (و دووەم پەرلەمانتاری زۆرترین دەنگ بوو لە مێژووی بەڕازیل) کەسێکی هەزەلی بوو، جۆکەرێکی ڕاستی بوو خۆی ناونابوو بە تیریریکا، و جلەکانی وەک جۆکەرەکان ئەپۆشی لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەی. وە بەرنامە سیاسیەکەی زۆر دوور بوو لەوەی سیاسەت بێت؛ چونکە، لە ڕێگای شریتە ڤیدیۆیەکان کە بڵاوبوویەوە لە پێگەی یوتیوب کە ملیۆنەها بینەری ڕاکێشا، بە دەنگدەرانی ووت " نازانم پەرلەمانتار لە پەرلەمان چی دەکات، بەڵام ئەگەر منتان هەڵبژارد ئەوا پێتان دەڵێم ". ڕوونیشیکردەوە کە ئامانجەکەی ئەوەیە کە "یارمەتی ئەو کەسانە بدات کە لەم وڵاتەدا پێویستیان هەیە، بەڵام خێزانەکەی بە تایبەتی"؟

سیاسەت لە چاوی ماکس فیبەردا کارێکی "پیشەیە"، ئەو پیشەیە کە سیاسەتمەداران حەزیان لێیە، وە پێویستی بە پابەندبوون، و کۆمەڵێک لە بەرژەوەندی تاکەکەسی، و هەوڵێکی زۆر هەیە. بەڵام لەگەڵ لەدەستدانی متمانەی جەماوەری لەلایەن " چینی سیاسی" نموونەییەوە لە هەموو دەوڵەتەکان یەک لە دوای یەک، بێگانەکانی وە تیریریکا سەرکەوتنی زیاتر بەدەست دێنن. لە ئیتالیا هونەرمەندی کۆمیدی پیپ گریلۆ دەبینین، کە ڕەخنە لە سیاسەتمەدارانی هەموو ئینتیماکان دەگرێت، و بەناوبانگترین بلۆگەکانی ئەو وڵاتە دەنوسێت و هەر یاریگەیەکی ئەو وڵاتە پڕ بینەر دەبێت کاتێک تێیدا دەردەکەوێت. پیپ سێڤەر گێنینی لە ساڵی ٢٠١٢ لە ڕۆژنامەی تایمز نوسیویەتی: " پیپ گریلۆ وەک کۆمیدیەک، یان هەزەلیەک یان هونەرمەندێکی تەرفیهی ناوینێ، بەڵام بۆ ماوەیەک سەرنج ڕاکێشترین بەشی هەواڵی سیاسی ئیتالیایە". وە لە هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی ئەو ساڵەدا، بریلۆ ٢٠٪ ی دەنگەکانی بەدەست هێناو چەندین هەڵبژاردنی شارەوانیی

بردەوە. وە لە کەنەداش ڕۆب فۆرد- ئەو کەسەی کە پێشێلکارییەکانی ڕابردووی ببوە کەرەستەیەک بۆ ڕکابەرەکانی تا بە لافیتەکان هێرشی بکەنە سەر کە لەسەریان نووسراوبوو " پیاوێک لە ژنەکەی دەدات، سەرخۆشێکی نەژادپەرست خۆی بۆ سەرۆکی شارەوانی بەربژێر کردووە" - لە ساڵی ٢٠١٠ بە سەرۆکی شارەوانی تۆرنتۆ هەڵبژێردرا. وە لە ئیسپانیا بیلین ئیستیبان، کەسایەتیەکی زۆر بەناوبانگ لە تەلەفزیۆن، توانی لە پێش کامیراکان نهێنیە سۆزداریەکانی بدرکێنێت - توانی لایەنگرانی بەپەرۆش کۆبکاتەوە کە زۆربەی سیاسەتمەدارە تەقلیدیەکان هیوا ڕاکێشانیان دەکات.

لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، سەرهەڵدانی پارتی چای لە کۆبوونەوە نارێکخراوەکانی دوور لە هەر ڕێکخراوێکی سیاسی نەریتی پێگەی کاندیدەکانی بەهێز کردووە، وەک کریستین ئۆدۆنێل، کە گوایە ئەزموونی کاری جادووگەری هەبووە، و دژایەتیکردنی نەریتی نهێنی کردۆتە بەشێکی سەرەکی لە کارنامەکانی. تەنانەت کاتێک ئودونیل و هاورێکەی ئارون ئینجیل شکستیان هێنا؛ سیاسەتی جمهوریەکان لە نیڤادا کە پشتگیری پارتی چایەی دەکرد ( کە گووتی ڕێگا بۆ چاکسازی کۆنگرێس ئەوەیە کە ئەمریکیەکان پەنا بۆ " چارەسەرەکانی هەموارکردنی دەستوری دووەم" ببەن: بەمانای ڕاپەڕینی چەکداری ) بۆ بردنەوە لە هەڵبژاردنەکان، سەرکەوتنیان لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانی پارتی جمهوری ساڵی ٢٠١٠ بەڵگەیەک بوو بۆ کەمبوونەوەی توانای سەرۆکی پارتە تەقلیدیەکان لەسەر کۆنترۆڵکردنی پرۆسەی بەربژێرکردن. سەرکردە کۆمارییە تەقلیدیەکان نەک هەر هێزیان نەبوو بۆ لەخۆ گرتنەبەری ململانێیە دڕندەییەکانی نێوان ڕکابەرەکانی پارتەکە بۆ سەرۆکایەتی، بەڵکو نەشیانتوانی پارێزگاری لە زۆربەی ئەندامانی ئێستای کۆنگرێس بکەن

(دیارترینیان سیناتۆری دێرینی ئیندیانا ڕیچارد لوگار) و کاندیدەکان بۆ ئەندامێتی کۆنگرێس ( وەک جێگری حاکمی تکساس دیڤید دیوهیرست )، یەکێک لە بەرەنگاریە سەرکەوتووەکان ئەوە بوو کە کەسە لەخۆباییەکان لە ئەندامانی پارتی چای لە هەڵبژاردنی سەرەتایی ٢٠١٢ سەپاندیان بەسەر خۆیان.

وە پاڵەوانە سیاسیەکان تەنیا لە سنور بەزاندنی پارتەکان نەوەستان، بەڵکو ئەوەیان تێپەڕاند بۆ لادان لە سیاسەتی خودی ڕێکخراوەکە. ئەوان هێزو دەسەڵات کۆدەکەنەوە، نەک بۆ هەوڵی بەدەستهێنانی پۆستێکی سیاسی؛ بەڵکو لە پێناو خزمەتکردنی دۆزەکەیان و سەرنجیان بۆ ڕابکێشن. لەمانەش وەک ئەلێکسی نافالنی، پارێزەر و نووسەری ڕووسی کە بوو بە هێمایەک بۆ بەرەنگاری کردنەوەی سەرۆک پوتین؛ وە هەروەها توگل کرمان، دایکی سێ منداڵ، براوەی خەڵاتی نۆبل بۆ ئاشتی بۆ هەوڵەکانی لە پەرەپێدانی ئازادی و دیموکراسی لە یەمەن، و واشل غنیم، ئەو کەسەی بەدەکەوت وەک سەرۆکی سەرەکی بۆ شۆڕشی میسری ( وە پاشان بۆ کەسایەتیەکی بەناوبانگ لە بەهاری عەرەبی بە گشتی، وەک توگل کرمان) لە پێگەی خۆی وەک بەڕێوەبەری جێبەجێکاری ناست ناوەند لە ئۆفیسی ناوەخۆی کۆمپانیای گوگل.

بەم شێوەیە، ئەم چیرۆکانە بەقەدەر ئەوەی کە مایەی سەرنج ڕاکێشانە، لەگەڵ ئەوەش تەنها چیرۆکن، بەڵام ئەگەر بمانەوێت پێوەرێکی ڕاستی بەکاربێنین بۆ هەڵگەڕاوەکانی هێز لە جیهانی سیاسەت، بە تایبەت هەڵوەشانەوەی، ئەوا ئێمە پێویستیمان بە داتاکان و بەڵگە پتەوەکان هەیە. وە ئەم بەشە ئامانجی ئەوەیە کە بیسەلمێنێت ئەو ناوەندانەی هێز کە ڕووکارەکانی ڕوون بوون لە ڕابردوو ئێستا بوونیان نەماوە لە زۆربەی وولاتان ( ئەوانەی کە ژمارەیان زیاتر و زیاتر دەبێت). چونکە کۆمەڵێک یاریزان هەن کە جێگای ناوەندیان گرتەوە، و هەریەکێکیان خاوەنی هەندێک هێزن کە تواناییان پێ دەدات کاریگەریان لەسەر ئەنجامە

سیاسیەکان یان حکومەت هەبێت، بەڵام هیچ کەسێک نییە لە نێوانیان کە خاوەن هێزێکی پێویست بێت بۆ دیاریکردنی ئەم ئەنجامانە بە تەنیا. ڕەنگە ئەمە وەک سیستمێکی دیموکراسی دەنگی و چەک و هاوسەنگییە خواستراوەکان دەربکەوێت کە تارادەیەک حالەتە بەڵام لە زۆرێک لە دەوڵەتەکاندا پارچەبوونی سیستەمی سیاسی حاڵەتێکی دروستکردووە کە تێیدا خنکاندن و مەیلی کەمترین بوە لەوانەیە ئەمە هاوشێوەی سیستەمێکی دیموکراسی دروست و پابەندبوو و هاوسەنگیە خوازراوەکان بێت، ئەو حاڵەتەش ڕاستە تا ڕادەیەک، بەڵام لە زۆر دەوڵەتان ئەبینین پارچەبوونی سیستەمی سیاسی بارێکی وای درو ست کردووە کە خنکان و ڕۆچوون بەرەو بڕیاردان لە نزمترین ئاست و لە کۆتا ساتەکان بوونەتە هۆی داخورانێکی مەترسیدا لە کوالێتی سیاسەتی گشتی، و توانای حکومەتەکان لە بەدیهێنانی پێشبینی دەنگدەران، یان چارەسەرکردنی کێشە گرینگەکان.

## لە ئیمپراتۆریەتەکانەوە بۆ دەوڵەتەکان: شۆڕشی زۆربوون و زۆربوونی دەوڵەتەکان

ئایا ڕۆژێک یان ساتێکی دیاریکراو دەتوانێت مێژوو بگۆڕێت؟ جەواهار لال نەهرۆ، یەکەم سەرۆک وەزیرانی هیندستان ئەو ساتەی بە "ژوانێک لەگەڵ چارەنووس" وەسف کرد. بەڕاستی ئەو ساتەی لە ناوەڕاستی شەودا کە ڕێپێدراو بوو بۆ چوونەژوورەوە لە ١٥ی ئابی ١٩٤٧، زیاتربوو لە سەرەتای سەردەمێکی ئازادی سیاسی بۆ هیندستان و پاکستان. شەپۆلی کۆتایی هێنان بە داگیرکردن جوڵێنرا، کە سیستەمی جیهانی گۆڕی لە سیستەمێکی زاڵی ئیمپڕاتۆریەت بۆ سیستەمێک کە ئەمڕۆ ٢٠٠ دەوڵەتی سەربەخۆی خاوەن دەسەڵات پێک هێناوە. لە ئەنجامدا ئەو چوارچێوەیە نوێیەی دانا کە دەسەڵاتی سیاسی لە ئێستا بەدواوە پێوەی دەجوڵێتەوە، ئەو چوارچێوەش کە لە سەردەمی ئیمارات و ویلایەتەکانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

شارەکانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە نەناسراو بوو و بێشک پێشتر ناسراوە نەبوو لەسەر ئاستی جیهانی. ئەگەر ئەمڕۆ سیاسەتی جیهانی لەباری پارچەپارچەبوون بێت، ئەوە بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەوەیە کە زۆر دەوڵەت هەیە، هەریەکەیان خاوەن توانایەکن لە هێز. پارچەبوونی ئیمپراتۆریەکان و گۆڕینیان بۆ چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ، کە بوونیان ئەمڕۆ لە شتە ئاساییەکانە، نوێنەرایەتی ئاستی یەکەمی گۆڕانی سیاسی و رۆشنایەتی سیاسی دەکات.

وە پێش ئەو ساتە لە ساڵی ١٩٤٧، جیهان لە ٦٧ وولاتی خاوەن دەسەڵات پێکهاتبوو. دوو ساڵ لەمەوپێش، نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئەندامێتییەکی سەرەتایی ٥١ دەوڵەت دامەزرا (بڕوانە ژمارەی ١-٥). دوای سەربەخۆیی هیندستان پرۆسەی دارمانی دەگیرکردن لە ئاسیا بڵاوبووەوە، و گەیشتە بۆرما و ئیندۆنیسیا و مالیزیا، و دواتر بە هێزی تەواوەوە بەرەو ئەفریقا بڵاوبووەوە. لە ماوەی پێنج ساڵ لە سەربەخۆیی گانا لە ساڵی ١٩٥٧ دا، ٢٠ دەوڵەتی دیکەی ئەفریقی بە هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتییە داگیرکاریەکانی بەریتانیا و فەرەنسا ئازادی خۆیان بەدەست هێنا. نزیکەی هەموو ساڵێک تا سەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم، بەلایەنی کەمەوە وڵاتێکی نوێ لە ئەفریقا، یان کاریبی یان زەریای هێمن سەربەخۆییان بەدەست هێنا.

ئیمپراتۆریەتیە داگیرکارەکان وون بوون، بەڵام ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت مایەوە، هەردوو پێکهاتەی فەرمی یەکێتی سۆڤیەت و ئیمپراتۆریەتی ڕاستەقینەی بلۆکی رۆژهەڵات. وە ئەمەش لە ماوەیەکی نزیکدا دەگۆڕێت، بەهۆی " ژوانێکی تر لەگەڵ چارەنووس". ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩ ڕوخاندنی دیواری بەرلین و سەرەتای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت و چیکۆسلۆڤاکیا و یوگۆسلاڤیای بینی. تەنیا لە ماوەی چوار ساڵدا، لە نێوان ساڵانی ١٩٩٠ و ١٩٩٤دا، نەتەوە یەکگرتووەکان ٢٥ وڵاتی بۆ ئەندامێتی زیاد کرد. لەو کاتەوە، لێشاوی وڵاتە

نوێکان خاو بووەتەوە، بەڵام بەتەواوی نەوەستا، تیمۆری ڕۆژهەڵات لە ساڵی ٢٠٠٢ چووە پاڵ نەتەوە یەکگرتووەکان و مۆنتینیگرۆ لە ساڵی ٢٠٠٦. لە ٩ی تەمووزی ٢٠١١ باشووری سودان بوو بە نوێترین وڵاتی دەسەڵاتداری جیهان.

سەبارەت بە عەقڵییەتی سەدەی بیستەم ڕەنگە ئەم زنجیرە ڕووداوانە ئاشنا بن، لەگەڵ ئەوەشدا مەودای گۆڕان کە لە تەنیا دوو یان سێ نەوەدا شایەتیمان داوە بێوێنەیە. شۆڕشی زۆری کە لە بەشی پێشوودا ئاماژەمان پێ کرد بە ڕوونی لە زۆربوونی دەوڵەتە سەربەخۆکان بە پایتەخت و حکومەت و دراو و سوپا و پەرلەمان و دامەزراوەکانی ترەوە ڕەنگی داوەتەوە، ئەم فراوانبوونە لە خۆیدا مەودای جوگرافی نێوان خەڵکی ئاسایی و کورسی دەسەڵات کەمکردۆتەوە. چونکە هیندییەکان سەیری نیودەلهی دەکەن، نەک لەندەن، بۆ ئەوەی ئەو بڕیارانە بدەن کە کاریگەری لەسەر ژیانیان هەبێت. وە وارسۆش، نەک مۆسکۆ، بوو بە ناوەندی دەسەڵات لە پۆڵەندا.

ئەم گۆڕانە سادەیە بەڵام قووڵە، گەیشتن بە پایتەختەکان ئێستا لە ناو دەستدایە، و شۆڕشی گواستنەوە، بە ئامرازی ئاسانتر و هەرزانتر بۆ گەشت و گواستنەوەی زانیاری خێراتر، ئاسانکاری دەکات بۆ پەیوەندی نێوان حوکمڕان و حکوومەتەکانیان. بەڵام چەندین ڕۆڵی سیاسی زۆر هەیە کە دەبێت چاوی پێدابخشێنینەوە، و چەندین پۆستی هەڵبژێردراو و کاری خزمەتگوزاری مەدەنی و ئەوانی تریش. وە ئەزموونکردنی سیاسەت بووەتە ئەگەرێکی کەمتر دوور، و بازنەی سەرکردایەتی بووەتە یانەیەکی زۆر کەمتر تایبەت. لەگەڵ زیادبوونی چوار ئەوەندە لە دەوڵەتە باڵادەستەکان لە لاوەی نیو سەدەدا، زۆر بەربەست بۆ گەیشتن بە دەسەڵات ترس و قورسیان کەمتربووە. وە ئێمە نابێت لە ئاستی ئەو گۆڕانکاریەکانە کەم بکەینەوە کە بەهۆی قۆناغی یەکەمی گۆڕانکاری هێزەوە

دروست بووە بە سادەیی تەنها لەبەرئەوەی ئەوان زۆر ئاشنا دیارن. کەچی قۆناغی داهاتووی گۆڕانی زیاتری پەرتەوازەبوون و لاوازکردنی سیاسەتی ناو ئەم هەموو دەوڵەتە سەربەخۆیە بالادەستانە سوپرایزی تر لەخۆ دەگرێت.

## لە دیکتاتۆرەکانەوە بۆ دیموکراتەکان

لەوەی کە بەشۆڕشی میخەکی ناسرا، ئەو سەربازانەی لەشەقامەکانی لیشبۆنەی پایتەختی پرتوگالی بڵاو بوونەوە، گوڵیان لەسەر لولەی تفەنگەکانیان دانا بۆ دڵنیاکردنەوەی خەڵک کە خراپەیان نیە. هەروەها ئەو ئەفسەرانەی کە لە ٢٥ی نیسانی ١٩٧٤دا سەرۆک ئەنتۆنیۆ سالازاریان لە دەسەڵات لادا، سەلماندیان کە لە بەڵێنەکەیان ڕاستگۆن، چونکە دوای ئەوەی کۆتاییان بە یاسایەکی سەرکوتکاری هێنا کە نزیکەی نیو سەدەی خایاند، لە ساڵی داهاتوو هەڵبژاردنیان ئەنجامدا کە دیموکراسی هێنا بۆ پورتوگال، تا ئێستاش چێژی لێ دەبینن.

لەگەڵ ئەوەش کاریگەرییەکە زۆر زیاتر پەرەی سەند، دوای شۆڕشی مێخەک دیموکراسی لە دەوڵەتەکانی دەریای ناوەڕاستدا گەشەی کرد کە لە لایەن دیکتاتۆرەکانەوە پەکیان کەوتبوو، وبێبەشی کردبوون لە بەشێکی زۆری ئەو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و ئابووریانەی کە لە دوای جەنگەوە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا بەدەست هاتبوو. دوای سێ مانگ لە ڕاپەڕینەکەی لیشبۆنە، ئەو حکوومەتە سەربازییەی کە یۆنانی بەڕێوەدەبرد کەوتە خوارەوە. لە تشرینی دووەمی ١٩٧٥ فرانسیسکۆ فرانکۆ کۆچی دوایی کرد و ئیسپانیاش بوو بە دەوڵەتێکی دیموکراسی. لە نێوان ساڵانی ١٩٨١ و ١٩٨٦ ئەم سێ وڵاتە چوونە پاڵ یەکێتی ئەورووپا.

شەپۆلەکە فراوان بۆوە، کاتێک هەریەک لە ئەرجەنتین لە ساڵی ١٩٨٣،

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەرازیل لە ساڵی ١٩٨٥ و چیلی لە ساڵی ١٩٨٩ لە چنگی دیکتاتۆرە سەربازییە ماوەدرێژ و ترسناکەکان دەرچوون. کاتێک یەکێتی سۆڤیەت ڕووخا، کۆریای باشوور، فلیپین، تایوان و ئەفریقای باشوور لە ناوەڕاستی گۆڕانکارییە دیموکراسیەکانیان بوون. لە سەرتاسەری ئەفریقا، وڵاتە یەک پارتەکان ڕێگایان دا بە هەڵبژاردنی فرەلیستی لە ساڵی ١٩٩٠ و بەدواوە. شۆڕشی میخەک، کە لەلایەن توێژەر ساموئێل هانتینگتۆن ناونرابوو، شەپۆڵی سێیەمی بۆ گۆڕانی دیموکراسی دەست پێکرد. شەپۆلی یەکەم لە سەدەی نۆزدەهەمدا هات - لەگەڵ بەرزبوونەوەی مافی دەنگدان و سەرهەڵدانی سیستەمە دیموکراسیە مۆدێرنەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپای ڕۆژئاوا - بەڵام دووچاری چەند قەیرانێک بۆوە لەو ماوەی پێش جەنگی جیهانی دووەم لەگەڵ سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیای تۆتالیریزم. شەپۆلی دووەم لەدوای جەنگی جیهانی دووەم هات بە گێڕانەوەی دیموکراسی لە ئەوروپا، بەڵام کورتخایەن بوو، چونکە کۆمۆنیزم و ڕژێمە یەک حیزبیەکان بڵاوبوونەوە بۆ بلۆکی ڕۆژهەڵات و چەندین دەوڵەتی تازە سەربەخۆ. هەرچی شەپۆلی سێیەمە درێژتر و فراوانتر بوو. ژمارەی دیموکراسیەکان لە جیهاندا ئەمڕۆ پێشتر نموونەی وای نەبووە. جێی ئاماژەپێکردنە کە دەوڵەتە ئۆتۆکراتە ماوەکان کەمتر لە جاران ستەمکار و دەسەڵاتخواز بوون لە جاران، هاوتەریب ئەمەش بوونی سیستەمەکانی هەڵبژاردن کە بەهێزتر دەبوون، جەماوەرەکانیش توانایان زیاتر دەبوو لە ڕێگای فۆرمە نوێیەکانی بەرگریەوە کە ڕژێمە سەرکوتکەرەکان ناتوانن سەرکوتیان بکەن. قەیران و کێشە نێوخۆییەکان ڕاستەقینەن، بەڵام ڕەوتی جیهانی بەهێزە، چونکە دەسەڵات بەردەوامە لە دزەکردن لە دەستی ڕژێمە سەرکوتکارەکان، خێراتر لەناودەچێت و زۆرتر پەرتەوازە دەبێت. (بڕوانە شێوەی ٥-٢).

داتاکان ئەم گۆڕانە پشتڕاست دەکاتەوە، ساڵی ١٩٧٧ لووتکەی دەسەڵاتی

دەسەڵاتخواز دەنوێنێت، لەو کاتە کە ٩٠ دەوڵەتی دەسەڵاتخواز هەبوو. بەپێی پرۆژەی بۆڵت، تا ساڵی ٢٠٠٨ جیهان ٩٥ دەوڵەتی دیموکراسی هەبوو، تەنیا ٢٣ دەوڵەتی دەسەڵاتخواز و ٤٥ دەوڵەت لە نێوان دیموکراسی و دیکتاتۆریدا ریزکرابوون. سەرچاوەیەکی تری ڕێزدار، کە فریدەم هاوسە، هەڵسا بە هەڵسەنگاندنی ڕادەی دیموکراسی دەوڵەتەکان، لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئایا هەڵبژاردنی ئاسایی و کراوە و دادپەروەرانە و لە کاتی خۆی ئەنجام دەدرێت، و ئەگەر هەندێک ئازادی مەدەنی و سیاسی دیکە بوونی نەبێت. (بڕوانە شێوەی ٥-٣ لە ئاراستە هەرێمییەکان.) بەپێی فریدەم هاوس، لە ساڵی ٢٠١١دا، ١١٧ دەوڵەت هەڵبژاردنی دیموکراسی جێبەجێ دەکرد لە نێو ئەو ١٩٣ دەوڵەتەی کە ڕاپرسیەکە لەخۆی گرتبوو. ئەمە بەراورد بکە بە ساڵی ١٩٨٩ کە لە ١٦٧ وڵات تەنیا ٦٩ وڵات لەم ڕیزبەندیەدا هەبوون. بە واتایەکی تر، ڕێژەی دیمۆکراسی لە جیهاندا زیادی کرد بە ڕادەی زیاتر لە نیوەی لە ماوەی تەنادوو دەیە.

هۆکاری ئەم گۆڕانە جیهانییە چییە؟ ڕوونە کە فاکتەرە ناوخۆییەکان ڕۆڵیان گێڕا، بەڵام هەنتینگتۆن ئاماژەی بە هەندێک هێزی سەرەکیش کرد. چونکە دامودەزگا ئابوریە خراپەکان لەلایەن زۆرێک لە حکوومەتە دەسەڵاتخوازەکانەوە بووە هۆی داخورانی پێگە جەماوەریەکەی. چینی ناوەندی بەرزبووەوە داوای خزمەتگوزاری گشتی باشتر، و بەشداری زیاتر، و لە کۆتاییدا ئازادی دیموکراسیانەتر دەکات. حکوومەت و چالاکوانانی ڕۆژئاوا هەڵسان بە هاندانی ئۆپۆزۆسیۆن، و بەڵێنیان داوە بە پاداشت بۆ ئەوانەی لە باوەشی چاکسازیدان، وەک ئەندامیەتی ناتۆ، یەکێتی ئەوروپا، یان دەستکەوتنی دارایی لە دامەزراوە داراییە جیهانییەکان. کڵێسای تازە کارای کاسۆلیکی لە ژێر دەسەڵاتی پاپا یۆحنا پۆلسی دووەمدا لە پۆڵەندا، ئێل سالڤادۆر و فلیپین ئۆپۆزۆسیۆنی بەتوانا کرد. لە سەرووی هەموو شتێکەوە، سەرکەوتنەکە سەرکەوتنێکی دروست کرد کە

تەوژمەکەی زیاتری دەکرد بەهۆی بڵاوبوونەوە و خێرایی میدیای جەماوەری مۆدێرن. هەڵی گەیشتن بە میدیاکان لەلایەن جەماوەرەوە، کە ڕێژەی ڕۆشنبیران تێیدا زیاتر و زیاتر دەبێت، زیاتر هانی ئەدان بۆ لاسایی کردنەوە کاتێک هەواڵەکانی سەرکەوتنەکانی دیموکراسی لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر بڵاودەبوویەوە. چونکە لە کەلتوری سەردەمی دیجیتاڵدا هێزی پەیوەندیکردن تەقیەوە. خوێندەواری و پەروەردە کە شۆڕشی جیهانیی فرەیی بەرجەستە دەکات، پەیوەندی سیاسی سنورەکانی زۆر ئاسانتر کردووە، و یارمەتیدەر بووە بۆ پەرەپێدانی ئاواتی سیاسی، و لێرەدا ئەو شۆڕشە عەقڵییەتە دێت کە بەها بنەڕەتییەکان دەگرێتەوە لە ئازادی و ڕادەربڕین لە خود و ئارەزووکردن لە نوێنەری سیاسی جددی و کاریگەر.

بە دڵنیاییەوە جیاکاری هەبوو، نەک هەر لەو دەوڵەتانەی کە هێشتا شەپۆلی دیموکراسی پێیاندا درێژ نەبووەتەوە، بەڵکو لە وولاتەکانی تریش کە تووشی شکست و دۆخی نالەبار بوون. لاری دایمۆند، توێژەری پێشەنگی ئەو بوارە، لە چەند ساڵی ڕابردوودا وەستانی فراوانبوونی دیموکراسی لە وولاتانی وەک ڕووسیا، ڤەنزوێلا یان بەنگلادش بە "دامرکانی دیموکراسی" وەسف دەکات. بەڵام لەبەرامبەردا بەڵگەی زیاتر هەن لەسەر ئەوەی کە هەڵوێستە جەماوەریەکانیش گۆڕاون؛ چونکە لە ئەمریکای لاتینی، بۆ نموونە، سەرەرای بەردەوام بوونی هەژاری و نایەکسانی و ئابروچوونی گەندەڵیەکان، بەڵام ڕاپرسیەکانی ڕای گشتی ئەوە دەردەخەن کە متمانە بە حکومەتی مەدەنی زیاترە لە حکومەتی سەربازی.

تەنانەت سیستەمە ستەمکارەکانیش ئەمرۆ کەمتر ستەم دەکەن. بەپێی توێژینەوەیەک لەسەر سیستەمی هەڵبژاردنی دیموکراسی لە جیهان، ڕەنگە بڕوانای تاکە وولات بێت کە " سیاسەتی هەڵبژاردن تێیدا شکستی هێنابێت لە

جێگیرکردنی ڕیشاڵەکانی بەهەمان واتە ". وە لە ژێر بوونی سیستەمێکی کەمتری ستەمکاری لە جیهان، لەوانەیە مرۆڤ چاوەڕێی ئەوە بکات ئەو سیستەمانە فەرمانڕەوایی وولاتانێکیان کردبێت کە بە شێوەیەکی ڕوو لە زیاد ئازادی و ڕکابەری سیاسی سەرکوت کرابێت. بەڵام لە ڕاستیدا پێچەوانەکەی تەواوە. چۆن؟ هەڵبژاردن کۆڵەکەی سەرەکی دیموکراسییە، بەڵام تاکە نیشاندەری کراوەیی سیاسی و ئازادی ڕادەربڕین و ئازادییە مەدەنییەکان و کۆنترۆل و هاوسەنگییەکان نین کە دەسەڵاتی هەر دامەزراوەیەکی تاکەکەسی سنوردار دەکات (لەوانەش سەرۆکی دەوڵەت و ڕێوشوێنەکانی تر؛ هەموویان تیشکدانەوەی چنگی حکومەت و کۆنترۆڵیتی لەسەر کۆمەڵگا ). بە شێوەیەکی گشتی داتاکان دەریانخست کە نیشانەکانی دیموکراسی لەو وولاتانەی کە بە داخراوی سیاسی ماونەتەوە بەرزبووەتەوە، و هەروەها ژمارەی ڕژێمە دەسەڵاتخوازەکان کەم بۆتەوە. گەورەترین پێشکەوتن لە سەرەتای سالانی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم ڕوویدا، ئەمەش مانای ئەوە بوو کە هەمان ئەو هێزانەی کە لەو کاتەدا چەندین دەوڵەتیان هێنایە سەر دیموکراسی، کاریگەرییەکی گەورەی سەروەریان هەبوو لەو دەوڵەتە نادیموکراسیانەی کە مابوون.

ئەمە ڕەنگە کەمێک دڵتەزێن بێت بۆ چالاکوانێک یان بەرهەڵستکارێک لە زینداندا. لە قاهیرەوە بۆ مۆسکۆ و لە کاراکاسەوە بۆ تونس، و لەگەڵ هەموو هەنگاوێک بەرەو پێشەوە، مرۆڤ دەتوانێت چەند چیرۆکێک بدۆزێتەوە کە بانگەشەی وشیاری بکات، یان نمونەی پێچەوانە کە هەر پێشوازیەکی ئاهەنگێرانە بۆ بڵاوبوونەوەی دیموکراسی سەرکوت بکات. زۆر جار بەرپەرچدانەوەی حکوومەتە زلهێزەکان بەرامبەر ئامراز و شێوازە نوێیەکانی دێموکراسی بابەتێکە ئامادەیە لە هەواڵەکان، و نابێت هیچ کەسێک سەرسام بێت بەوەی کە زلهێزەکان بەرهەڵستی ئەو ڕەوتانە دەکەن کە دەسەڵاتیان لاواز دەکات.

## کۆتایی سەردەمی هێز

هەرچۆنێک بێت، ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت بە دڵنیاییەوە بڵێت لە ئێستادا، ئەوەیە کە دیموکراسییەکان بڵاودەبنەوە، وە پاشان ڕەوتەکانی ناو دیموکراسییەکان نیشاندەر و دەرخەری زیادبوونی ڕەوتەکانن لەو دەوڵەتانەی کە دیموکراسی هێشتا تەواو نەبووە. هەروەها ژمارەکان و ڕاستیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە هەڵوەشانەوەی هێز لە نێو دیموکراسیەکاندا تەوژمێکی بەهێزیان لە تەکنیکە ئاڵۆزەکانی شێوازی دەنگدان و دانوستانەکانی پەرلەمان و هاوپەیمانی حوکمڕانی و لامەرکەزیەتی و ئەنجومەنە هەرێمییەکان دۆزیوەتەوە.

### لە زۆرینەکان بۆ کەمینەکان

ئێمە ئێستا و دواتر هەڵبژاردنی زۆر زیاتر ئەنجام دەدەین، ئەمە ڕەوتێکی سەرەکییە لە ژیانی مەدەنیدا لە نیو سەدەی ڕابردوودا، بەلایەنی کەمەوە بۆ ئەوانەی کە لە دیموکراسییە چەسپاوەکانی ڕۆژئاوادا دەژین. لە کۆمەڵێک دەوڵەتدا کە لە ساڵی ۱۹٦۰ەوە بە بەردەوامی دیموکراسییان پیادە کردووە، کە بریتین لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کەنەدا، ژاپۆن، ئوسترالیا، نیوزلەندا و زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، لە زۆربەی حاڵەتەکانی نێوان ساڵانی ۱۹٦۰ و ۲۰۰۰ ژمارەی بانگکردنەکانی هاووڵاتی بۆ هەڵبژاردنەکان زیادی کردووە؛ بۆیە هاووڵاتیان لەو وڵاتانە هەلی زیاتر دووبارەیان هەیە بۆ هەڵبژاردن و ڕەتکردنەوەی ئەو کەسانەی کە نوێنەرایەتیان دەکەن، وە بۆ ئەوەی باشترینەکانیان دەربڕن لە سیاسەتی گشتی یان ئەولەویاتی نەتەوەیی لە ڕێگەی ڕیفراندۆمەوە. ڕێژەی دەنگدان بە مانای زیادبوونی ڕێژەی بەشداریکردنی دەنگدەران نییە، لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا ڕێژەی بەشداری نەکردن لەم ساڵانەی دواییدا زیادی کردووە. بەڵام ئەوانەی دەنگدانیان هەڵبژارد دەرفەتی زیاتریان هەبوو بۆ ئەوە، ئەمەش مانای ئەوە بوو کە سیاسەتمەدارەکان دەبێت چەند جارێک ڕەزامەندی گشتی

بەدەستبهێنن. ئەم پشکنینە بەردەوام و بارگرانی ململانێ دووبارەکانی هەڵبژاردن نەک هەر ئەو کاتە کورت ناکاتەوە کە بەرپرسە هەڵبژێردراوەکان بەکاری دەهێنن بۆ بڕیاردان یان هەڵبژاردنی دەستپێشخەرییەکان کە سەرمایەی سیاسی و کاتی خۆیانی تێدا وەبەردەهێنن بەڵکو بە شێوەیەکی بەرچاو سنور بۆ ئازادیان دادەنێت. |

بۆیە تاچەند دووبارەکردنەوەی هەڵبژاردنەکان زیادی کردووە؟ ئەم پرسیارە لە لێکۆڵینەوەیەک لەلایەن رەسێل دالتۆن و مارک گرەی، لە ماوەی پێنج ساڵ (١٩٦٠-١٩٦٤) دا هاتووە، ئەو وولاتانەی کە لێکۆڵینەوەکە لەخۆی گرتبوو ٦٢ هەڵبژاردنی نەتەوەییان ئەنجام داوە (بڕوانە شێوەی ژمارە ٥-٤). لەماوەی پێنج ساڵی ١٩٩٥ بۆ ١٩٩٩، ٨١ هەڵبژاردنی ئەنجام داوە، بۆچی ئەم زیادبوونە؟ هۆکارەکەشی لەوانەیە پەیوەندی بە گۆڕانکاریەکان بێت لە یاساکانی هەڵبژاردندا، یان زیادبوونی بەکارهێنانی ڕاپرسیەکان، یان هاتنەکایەوەی هەڵبژاردنەکان تایبەت بۆ ئەنجومەنە نوێیەکانی هەرێم کە لەلایەن هەندێک دەوڵەتانەوە نوێکراوەتەوە. ئەندامانی یەکێتی ئەوروپا هەڵبژاردنی ئاساییان بۆ پەرلەمانی ئەوروپا ئەنجامدا. هەردوو توێژەرەوەکە ئاماژە بەوە دەکەن کە داتاکان ئەو ڕۆژانە دەگرنەوە کە هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێت، نەک ڕێژەی دەنگدانە جیایەکان کە لە هەموو ڕۆژێکدا ئەنجام دەدرێت. لە ڕاستیدا، ڕەنگە ئەو ڕەوتە بەهێزتر بێت لەوەی کە ژمارەکانیان نیشانی دەدەن، چونکە چەند وولاتێک هەڵبژاردنی هەمەجۆریان لەخۆ گرتوە (وەک هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی، یاسادانان، و شارەوانییەکان لە یەک ڕۆژی دەنگداندا). ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم ئاراستەیەدا بەدەرە؛ بەهۆی نەریتی بەهێزی خۆی بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی نیشتمانی لەڕۆژانی دیاریکراوی مانگی تشرینی دووەمدا هەموو دوو ساڵ جارێک، بەڵام نەک لەبەر ئەوەی ئەمریکییەکان کەمتر دەنگ دەدەن. لەڕاستیدا هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا کە هەموو دوو ساڵێک ئەنجام دەدرێت کورتترین ماوەی هەڵبژاردنە لە نێو

دیموکراسیە جێگیرەکاندا هەیە، کە وادەکات ئەمریکیەکان هەندێک لە بەربژێرەکان زۆرترین باگکردنیان هەبێت لە هەڵبژاردنەکان لە جیهان. جیهان بە گشتی دەستی کردووە بەو ئاراستەیە بڕوات بەرەو زۆرتری هەڵبژاردنە دووبارەکان لەسەر هەموو ئاستە حکومیەکان. پرۆفیسۆر مات گۆڵدەر لە زانکۆی ویلایەتی پەنسلڤانیا چاودێری هەڵبژاردنەکانی یاسادانانی دیموکراسی و سەرۆکایەتی کرد لە ١٩٩ وولات لە نێوانساڵی ١٩٤٦ (یان لەو کاتەوەی کە دەوڵەتەکان سەربەخۆ بوون) و ساڵی ٢٠٠٠. لە ماوەیەدا بۆی دەرکەوت کە ئەم ١٩٩ وولاتە ٨٦٧ هەڵبژاردنی یاسادانان و ٢٩٤ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەنجام داوە. بە واتایەکی تر لەماوەی ئەم ٥٤ ساڵەدا (کە زیاتر لە ١٠ ساڵی تێدابوو دێموکراسی بەگەیشتبووە ئەو ئاستەی کە دواتر هەبووە) دوو هەڵبژاردنی گرنگ بە تێکڕایی هەموو مانگێک لە شوێنێکی جیهان بەڕێوەدەچوو.

هەروەک بێل سوینی سەرۆکی دامەزراوەی نێودەوڵەتی بۆ سیستەمەکانی هەڵبژاردن کە ڕێکخراوێکی قازانج نەویستە و گرنگترین دامەزراوەی جیهانە لە بواری دابینکردنی یارمەتی تەکنیکی بۆ بەرپرسانی هەڵبژاردن، پێی ووتم: "داواکاری بۆ خزمەتگوزاریەکانمان زۆر زیادی کردووە، چونکە بەنزیکەیی لە هەموو شوێنێک لە جیهان هەڵبژاردنە دووبارەکان ڕوو لە زۆربوونە، وە دەتوانین هەست بە پێویستی بۆ سیستەمەکان و تەکنەلۆجیاکان بکەین کە گرەنتی ئەوەدەدات هەڵبژاردنەکان لە کەشێکی زیاتر شەفافیەت و دوور لە تەزویرکردن بەڕێوە دەچێت".

زیاد بوون لە هەڵبژاردە دووبارەکان تەنیا حالەتێکە کە سەرۆکە سیاسیەکان بەدەست کۆتی سەپێنراوەی زیاتری سەر ئازادی کارکردنیان دەناڵێنن. حاڵەتی دووەم دابەزینی دراماتیکی لە زۆرینەی هەڵبژاردنەکانە. چونکە کەمینەکان فەرمانڕەوایی دەکەن لەم ڕۆژانە، لە ساڵی ٢٠١٢ تەنها چوار وولات هەبوون کە

حکومەتەکەیان بە زۆرینەی ڕەهایان هەبوو لە پەرلەمان، لە نێوان ٣٤ وڵاتانی ئەندام لە "یانەی وڵاتە زەنگینەکان" - ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و گەشەپێدان. لەهیندستان ٣٥ حزب لەهەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٩دا کورسی پەرلەمانیان هاوبەش کرد و هیچ لایەنێک لەساڵی ١٩٨٤ەوە زۆرینەی ڕەهای بەدەست نەهێناوە. لەڕاستی دا گەورەترین ڕەهاکان لە ڕووی جیهانییەوە کاڵ دەبێتەوە، چونکە لە هەڵبژاردنە دیموکراسیەکاندا پارتە کەمینەکان بە تێکڕایی زیاتر لە ٥٠٪ کورسی پەرلەمانیان بە درێژایی ماوەی دوای جەنگ بردۆتەوە و لە ساڵی ٢٠٠٨دا پارتە کەمینەکان بە تێکڕایی ٥٥٪ کورسیان کۆنترۆڵ کرد، بەڵام تەنانەت لەو وڵاتانەی کە بە وڵاتی دیموکراسی دانانرێن پارتە کەمینەکان بەهێتر بوونە. لەبەر ئەوەی لەم وڵاتانە، پارتە کەمینەکەکان کۆنترۆڵی لەسەر کەمتر لە ١٠%ی کورسیەکانی بەرلەمان هەبوو لە ماوەی سێ دەیەی ڕابردوو، بەلام ناوەندی ڕێژەکەی بەرزبۆوە بۆ نزیکەی ٣٠%.

بۆیە کاتێک سیاسەتمەداران ئەم ڕۆژانە داوای "ڕاسپاردە" دەکەن، زۆرجار هیوای باش بۆخۆیان دەخوازن، چونکە سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی هەڵبژاردن کە بتوانێت پاساوی بوونی ئەو چەمکە بدات بە سادەیی شتێکی زۆر دەگمەنە. گەورە سیاسیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە تەنانەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، کە پێدەچێت سیستمی دوو حیزب بە ڕوونی براوە و دۆڕاو بەرهەم بهێنێت، لەم دواییانەدا هیچ هەڵبژاردنێکی سەرۆکایەتی نەبووە جگە لە دانەیەک کە بتوانرێت بە سەرکەوتنی یەکلاکەرەوە پۆلێن بکرێت، ئەمیش سەرکەوتنی سەرۆک ڕۆناڵد ڕیگان بوو لە دووبارە هەڵبژاردنی بۆ سەرۆکایەتی لە ساڵی ١٩٨٤ کە تێیدا لە واڵتر موندێلی بردەوە. ڕیگان تەنها هەموو ویلایەتەکان، جگە لە دانەیەک نەبێت، و کەرتی کۆلۆمبیا و دەنگەکانی هەڵبژاردنی هەڵمالی،

بەڵکو بە ڕێژەیەکی زەبەلاح لە دەنگەکایش کە ئەگەیشتە ٥٩%، لەو کاتەوە هیچ بەربژێرێکی تری ئەمریکی نەگەیشتۆتە ئەم جیاوازیە لە دەنگەکان. ئەگەری ڕوودانی ئەم جۆرە سەرکەوتنانە زۆر کەمترە لەو سیستەمانەی کە ماوەی سەرۆکایەتی دابەش بووە لە نێوان سێ یان چوار یان پێنج پارتی سەرەکی لە پارتە بچووکەکان.

بەم ڕێچکەیەش، هونەری فەرمانڕەوایی ئەمڕۆ زیاتر پشت دەبەستێت بە کارامەیی کارپێکراوی زۆر ڤێزەوەنتر؛ پێکهێنان و پاراستنی هاوپەیمانی. ئەو دانوستانانەی کە پێویستە بۆ هاوپەیمانیەکان، کاریگەری زیاتر دەدات بە لایەنی بچووکتر بۆ داواکردنی هەندێک پێداویستی سیاسی یان پۆستی وەزاری. لە دیمەنێکی پەرشوبڵاوی هەڵبژاردندا باشتر وایە حزبێکی بچووک بیت، و لە ڕاستیدا لایەنە پەراوێزخراوەکان - کە دیدی توندڕەویان هەڵگرتووە، یان تیشک دەخەنە سەر یەک کێشە یان بایەخ دەدەن بە پێویستیەکانی بنکەیەکی هەرێمایەتی - دەتوانێت دەسەڵاتی زیاتر بەدەست بهێنێت بەبێ ئەوەی پێویست بکات هەڵوێستەکانیان کەمبکەنەوە بۆ ئەوەی ئەو دەنگدەرانە ڕاکێشن کە سەر بە حیزب نین. ڕابیتەی باکوری شۆڤینی ئازادیخواز لە ئیتالیا، و حیزبی وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل ئاڤیگدۆر لیبەرمانی توندڕەو، و پارتی گەلی فلامنکی جیاخوازی بەلجیکی، و زۆربەی پارتە کۆمۆنیستەکان لە پەرلەمانی نەتەوەیی یان ئەنجومەنە هەرێمییەکان لە هیند، هەموویان چێژیان لە دەسەڵاتێکی گەورەتر لە قەبارەکەی وەرگرت لە یەککگرتنەکانی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی تر کە بیروباوەڕەکانیان ڕەت دەکەنەوە بەڵام هیچ چارەیەکی تریان نیە جگە لە بەژداری کردنیان نەبێت لە دەسەڵات. بۆ نمونە لە کانونی یەکەمی ٢٠٠١دا، دوو لایەن لە ناو هاوپەیمانیەتیەک کە لەلایەن پارتی کۆنگریس بەڕێوەدەبرا لە هیند ئۆپۆزسیۆنێکی توندیان دەستپێکرد کە سەرۆک وەزیران مانمۆهان سینگی ناچاری کرد پلانەکان

هەڵبوەشێنێتەوە بۆ ڕێگەدان بە فرۆشگا بیانییە گەورەکان ( سوپەرمارکێت) خاوەنداری ٥١٪ ی پرۆژەکانیان بکەن، ئەمەش پەشیمانبوونەوەیەکی سەرسورهێنەر بوو.

دووبەرەکییەکان دەربارەی هاوپەیمانێتییەکان قەبارەی ئەو تەنازولانە دەردەخات کە دەبێت "براوە" لە هەڵبژاردندا پێشکەشی بکات. لە هەڵبژاردنەکانی بەریتانیا لە مانگی ئایاری ٢٠١٠، پەرلەمانێک دروست بوو هیچ لایەنێک تێیدا زۆرینە نەبوو، کە بووە هۆی هاوپەیمانی نێوانن پارتی پارێزگاران بە سەرۆکایەتی دێڤید کامیرۆن و پارتی دیموکراتە لیبراڵەکان بە سەرۆکایەتی نیکۆلاس کلیگ، ئەم دوو پارتە جیاوازی توندیان هەیە دەربارەی کۆچبەران و یەکگرتنیان لەگەڵ ئەورووپا و کێشەکانی تر؛ هەردوو پارت زۆر تەنازولیان کرد لە ئەنجامی ئەمە. بەڵام هەندێک کات لەوانەیە پێکهێنانی هاوپەیمانی ئامانجێک بێت بەدەست هێنانی قورس بێت. هۆڵەندا چەند مانگێکی بەسەر برد بە بێ حکومەت لە ساڵی ٢٠١٠. ئەم شتەش لە بەلجیکا خراپتر بوو. چونکە لە ساڵی ١٩٨٨ سیاسیەکانی بەلجیکا ژمارەیەکی پێوانەییان تۆمارکرد کاتێک ١٥٠ ڕۆژیان بەسەربرد بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانی. ئەم بارودۆخە وەک پێویست خراپ دیار بوو، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٧ و ٢٠٠٨، لە نێوان زیادبوونی گرژییەکانی نێوان هاوڵاتیانی فلێمینکی هۆڵەندی و قسەکەرانی فەرەنسی لە پارێزگاکانی واڵون، ئەو وڵاتە نۆ مانگ و نیوی بە بێ حکومەت بەسەربرد، لەکاتێکدا کە فراکسیۆنە توندڕەوەکان داوای جیابوونەوەی تەواوی هەرێمی فلیمنگیان دەکرد. حکومەتەکە لە مانگی نیسانی ٢٠١٠ دەستی لەکار کێشایەوە و دواتر ماوەیەکی بێ جموجۆڵی دووروودرێژی بەدواهات. لە مانگی شوباتی ٢٠١١، بەلجیکا لە کۆلۆمبیای بردەوە بە تۆمارکردنی ژمارەیەکی پێوانەیی لەو ماوەی کە وولات بەسەری برد بەبێ حکومەت؛ لە

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

کۆتایی لە ٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠١١، پاش بەسەرچوونی ٥٤١ ڕۆژ لە شکست و نەبوونی چالاکی، سەرۆک وەزیران سوێندی یاسایی خوارد. ئەوەی کە جێگای سەرسورمانە دەرباری کەمبوونەوەی هێزی سیاسیەکان ئەوەیە کە لەگەڵ ئەوەی کێشیەکی بێ بەها پڕۆسەی پێکهێنانی حکومەتی پەکخستبوو، بەڵام ئابووری و کۆمەڵگا بۆ پێشەوە جوڵەیان کرد و ئاستەکەیان هیچ لە ئاستەکانی دراوسێ ئەورووپیەکان کەمتر نەبوون؛ لە ڕاستیدا کەمبوونەوە لە پۆلینی متمانەی بەلجیکا، کە دامەزراوەی ستاندەرد ئاند بورز پێ هەڵسا، تەنیا فاکتەرێک بوو کە پەستانی خستە سەر پارتە ناکۆکەکان تا بگەن بە چارەسەر.

ئەو توێژینەوانەی کە لەم دواییەدا دەربارەی پێکهێنانی حکومەتەکان و ماوەی فەرمانڕەواییان و کۆتاییان ئەنجامدرا بەڵگەیەکی زیاتری پەیوەست بە هەڵوەشانەوەی هێزی پێشکەشکرد. وە ڕەنگە یەکێک لە سەرچاوە مەزنەکان لەلایەن هەردوو توێژەوەی ئەسکەندەنافی دابنکراوە کە زانیاری ووردیان لەسەر ١٧ حکومەتی وولاتە دیموکراسیە ئەورووپیەکان کۆکردەوە، بە شێوەیەک زانیاریەکان بۆ کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم درێژدەبێتەوە، یان لە هەندێک حالەتدا، بۆ کاتێک کە ئەو دەوڵەتانەی ڕاپرسیەکە گرتوویانیتەوە لە کۆتاییدا بوون بە دەوڵەتێکی دیموکراسی ( وەک یۆنان و ئیسپانیا و پرتوگال). هەروەها زانیاریەکان هەریەک لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و بەریتانیا و دەوڵەتە ئەورووپیە گرینگەکانی تریش دەگرێتەوە. لەگەڵ ئەوەیی کە ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە ناکرێت گشتگیر بکرێت بەسەر هیند یان بەرازیل یان باشوری ئەفریقیا، بۆ نموونە، بەڵام زۆر ڕاستی باوەڕپێکراو دەخاتەڕوو دەربارەی ڕادەی ململانێی سیاسی لە دیموکراسیەکان لەم ڕۆژگارە. ئەمەش چەند نموونەیەکە.

کاڵبوونەوەی تایبەتمەندیەکانی خاوەن پۆستەکان

بە گشتی، لەگەڵ ئەوەی پارتەکان و هاوپەیمانە دەسەڵاتدارەکان بەرژەوەندی

بەیەکەوە بەستراویان هەیە وەک پشتگیری لایەنگرەکانیان و دەرکەوتنی ڕوون، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە کە هەندێک لە دەنگەکان لەدەست بدەن ئەگەر هاوسۆزەکانیان پەرۆشیان لەدەست بدەن لە کاتێکدا ڕکابەرەکانیان تۆمارێکیان لایە بۆ رەخنەگرتن. لەم ساڵانەی دواییدا، ڕوودانی ئەم جۆرە دیاردانە زیادی کردووە؛ شیکردنەوەی ١٧ دیموکراسیە ئەوروپیە دامەزراوەکان دەریخستووە کە لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە هەموو ١٠ ساڵێک جارێک مامناوەندی لەدەستدانی دەنگەکان بەرزبوونەتەوە سەبارەت بە خاوەن پۆستەکان ئەوانەی کە دەجەنگن بۆ دووبارە هەڵبژاردنەوەیان، لە پەنجاکان خاوەن پۆستەکان ٠٨.١% دەنگەکانیان لە دەستدا بە ڕێژەیەکی مامناوەند، و تا ساڵانی هەشتاکان، لە دەستدانی دەنگەکان بووە ٤٤.٣%؛ و لە نۆوەدەکان جارێکی تر دووئەوەندە زیادی کرد بۆ ٢٨.٦%. لە ساڵانی پەنجاکان ٣٥ ئەنجومەنی وەزیرانی ئەو دەوڵەتانەی کە ڕاپرسیەکە گرتبووینەوە لە دووبارە هەڵبژاردنەوە سەرکەوتن، لە کاتێکدا ٣٧ ئەنجومەنی وەزیران شکستیان هێنا؛ وە لە نۆوەدەکان تەنیا ١١ ئەنجومەن بەسەرکەوتن و ٤٦ شکستیان هێنا. هەروەها لە شیکردنەوەیەک کە هەردوو زانای سیاسی هان مارث نارود و هنری فالینن ئەنجامیان دا، ئاماژەیان بەوەدا کە ئەم ئاراستەیە بەهێز بوو لە دیموکراسیە دامەزراوەکانی وەک بەریتانیا یان هۆڵەندا هەروەک کە بەهێز بوو لە دیموکراسیە تازەکانیش وەک لە یۆنان یان پورتوگال؛ بە مانایەکی تر ئەم ئاراستەیە کاریگەر نەبوو بە درێژی ئەزموون و نەریتە دیموکراسیەکان.

## ڕووخانی حکومەتەکان بە خێراییەکی زیاتر

بەڵگەیەکیش هەیە لەسەر ئەوەی کە لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە هاوپەیمانیەکان یان ئەنجومەنە وەزیرانە دەسەڵاتدارەکان مەیلی زیاتر و زیاتر کۆتایی پێهێنانیان هەیە پێش ئەوەی ماوەی دەسەڵاتدارییان تەواو بێت بەهۆی

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

ململانێی سیاسی ناوەخۆ، زانا سیاسیەکان دوو جۆر لە کۆتایی پێهێنانی ئەنجومەنە وەزیرانەکان دەست نیشان دەکەن؛ یەکەمیان کۆتایی پێهێنانی هونەری؛ بەمانای پەیوەندی بە هۆکارە دەستوریە تایبەتەکانی وڵاتی ناوبراو هەیە یان بەو حالەتانەی کە وادەی هەڵبژاردنەکان بڕیاری لەسەرر دەدات بەپێی یاسا، یان سەرۆک وەزیران کۆچی دوایی کردووە و پێویستە هەڵبژاردن بکرێتەوە بۆ دیاریکردنی جێگرەوەی. جۆرەکی تریش کۆتایی پێهێنانە لەسەر بنەمای دەسەڵاتی خەملێنراو؛ بە دەربڕینێکی تر، بە هۆی ئاڵۆزیە سیاسیەکان، هەروەک کە ڕوودەدات کاتێک ئەنجومەنی وەزیران دەست لەکار دەکێشێتەوە بەهۆی ناکۆکی سیاسی، یان بەهۆی شکست هێنانی دەنگی متمانە لە پەرلەمان. وە بە گوێرەی توێژینەوەیەک کە پشت بە هەمان زانیاریە تەیبەتەکان بە ١٧ دیموکراسیە پەرلەمانیە ئەوروپیەکان دەبەستێت لە ساڵی ١٩٤٥ەوە، حەلەتەکانی کۆتایی هێنان بە ئەنجومەنە وەزیرانەکان لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەم لەسەر بنەمای دەسەڵاتی خەملێنراو زیاتر بووە لە کۆتایی پێهێنانی لەسەر بنەمای هۆکارە هونەریەکان، ( ٩.٧٢% و ٧.٦٤% ) بەراورد بە سەردەمەکانی پێشتر. وە لە نۆوەدەکانیش ڕێژەکان یەکسان بوون؛ کاتێک حالەتەکانی کۆتایی پێهانانی هونەری یەکسانە بە ژمارەی حالەتەکانی کۆتایی پێهێنان لەسەر بنەمای دەسەڵاتی خەملێنراو.

جێگای سەرسورمان نیە کە ڕەوتی کۆتایی پێهێنانی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر بنەمای دەسەڵاتی خەملێنراو زیادی کردووە لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیست ویەک. وە لەوەتەی قەیرانی دارایی هەڵگیرساوە لە ساڵی ٢٠٠٨زۆر حکومەت ڕووخان، و ئەنجومەنی وەزیران کۆتاییان پێهات، و هاوپەیمانیەکان هەڵوەشانەوە، و وەزیرەکان لە کار دوورخرانەوە، و سەرۆک پارتەکان ناچار بە دەست لە کارکێشانەوە کران. وە لەگەڵ بەریەککەوتنی کێشە ئابوریەکان لە سەرانسەری

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەوروپا بێتوانایی بەهێزەکان لە دامرکاندنەوەی قەیرانەکان زۆر ئاشکرابوو.

تەنانەت لە دەرەوەی سیستەمە پەرلەمانیەکانیش بەڵگە زیاتر بوو لەسەر ئەو کۆتانەی کە ئێستا ڕاسپاردەکانی سەرکەوتنی هەڵبژاردن لاوازتر دەکات. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەبینین کە یەکێک لە سەرچاوەکانی بێ ووره‌کردن بۆ هەموو ئیدارە سەرۆکایەتیەکان درێژی ئەو کاتە بوو کە ئەنجومەنی پیران دەیخایەند بۆ بەربژێرەکان. هەروەک پۆل لایت تێبینی کرد، پسپۆر لە زانکۆی نیویۆرک، " لە نێوان ساڵانی ١٩٦٤ و ١٩٨٤ بە نزیکەیی کەس گوێی بە پرۆسەی پاڵاوتن و پەسەندکردن نەبووبوو کە زیاتر لە شەش مانگ بخایەنێت. چونکە لە هەمان ئەو ماوەیەدا تەنیا پێنج لە بەربژێرەکان چاوەڕوانی پەسەندکردن بوون بۆ زیاتر لە شەش مانگ لە نێوان پەیوەندی پێکردنیان پێش خۆبەربژێرکردن، و دەستکەوتنی پەسەندکردنەکە. وە بە پێوەرەکانی ئەمڕۆ ئەم ئاستە بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو زۆر خێرا بووە. چونکە لە نێوان ساڵانی ١٩٨٤ و ١٩٩٩، پۆل لایت بۆی دەرکەوت کە ٣٠%ی بەربژێرەکان پێویستیان بە زیاتر لە شەش مانگ بووە بۆ ئەوەی پەسەندکردن بەدەست بێنن. وە لە لایەکی تر هەندێ پەسەندکردنی خێرای تریش ڕوویاندا کە لە تەنها مانگێک بۆ دوومانگی خایاند لە ٥٠%ی حالەتەکان لە نێوان ساڵانی ١٩٦٤ و ١٩٨٤، بەڵام تەنیا لە ١٥%ی حالەتەکانی نێوان ئەم دوو ساڵە ئەمە ڕووینەدا. وە لە دەیەی دواتر، کاتێک ڕاکێشانی سیاسی توندتر بوو، ئەم ئاراستەیە خراپتر بوو.

### لە پارتەکانەوە بۆ فراکسیۆنەکان

وێنەی سەرکردە حیزبییەکان ئەوانەی سیگار دەکێشتن و بەرژەوەندیەکان دەگۆڕنەوە لەکاتی دانانی بەرنامەکان و سیاسەتەکان و کاندیدەکانیان، هێشتا بەشێکی زۆر داگیرکردووە لە ئەفسانە سیاسیەکان، بەڵام لە زیاتر و زیاتر لە واقیع

لابراون. بەڵگەی یەکەمیش لەسەر ئەمە گۆڕانی ئەگەرەکانی پارتی کۆماریە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. چونکە ماوەیەکی زۆر دوور نیە پارتی جمهوریەکان بنەماکانی پارێزگاریکردنیان بەرجەستە کرد لە بواری بازرگانی و ئەوانەی پەیوەندیان بە پابەندبوونەکان هەیە؛ ئەمانەش چەند تایبەتمەندیەکن کە پارتی جمهوری توانی پارێزگاریان لێبکات لە بەرەنگاری هاندانی ڕێکخراو، و هەندێجار سەرکەوتوو، کە هەندێک کۆمەڵە پێی هەڵدەستان کە بەرگریان لە کێشە نەریتیە کۆمەڵایەتیەکان دەکرد. لەگەڵ ئەوەش پارتی چایە سەلماندی کە تاڵنگاریەکی ڕێکخراو دەنوێنێت. وە ئەوەی جێگای سەرسورمانە ئەوەیە کە پارتی چای بە هیچ شێوەیەک حیزب نیە، بەڵکو تێکەڵەیەکی ڕەنگاوڕەنگە لە ڕێکخراوەکان و فراکسیۆنەکان و کۆمەڵەکان و کەسایەتیە هاوشێوەکان کە لە لایەن هەمان بیرۆکە ڕەنگاوڕەنگەکان پاڵیان پێوە دەنرێت کە پەیوەندیان بە چەمکی " پارتی چایە" و ناسنامەکەی هەیە. چونکە هەندێک لە کاندیدەکانی پارتی چای و گروپەکانیان پارەیان لە خاوەن بەرژەوەندیە بازرگانیە بەهێزەکان وەرگرت ئەوانەی ئەزموونێکی گەورەیان هەبوو لە کاریگەری کردن لە سیاسەتی ئەمریکا ( بۆ نموونە دیڤید و تشارلز کوک، ئەو دوو ملیۆنێرەی کە کۆمپانیای کوکی پیشەسازی بەڕێوەدەبەن کە دووەم گەورەترین کۆمپانیای تایبەتە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا). هەرچی پێکهاتەکانی تری پارتی چای تەنها بزوتنەوەی جەماوەری چالاک بوون کە بانگەشەی دیموکراسی ڕاستەوخۆ دەکەن لە نێو نەریتەکانی هاوبەشی سیاسەتی ئەمریکای دێرین.

ئەم پێکهاتە دیارانەش بە جۆرێک کۆبوونەتەوە کە هیچ پارتێکی تەقلیدی ناتوانێت لەخۆی بگرێت. پارتی چای لە ساڵی ٢٠٠٩ سەری هەڵدا، و تەنیا چەند مانگێک دوای دەرکەوتنی توانی دووبارە سیاسەتی پارتی کۆماری و سیاسەتی ئەمریکا دابڕێنێتەوە، چەند سەرکەوتنێکی لە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان بەدەست

بێنێت بۆ ئەو بێگانانەی کە لە ڕیز حیزبەکە بوون و بۆ ئەوانەش کە لە پەسەندەکانی دامەزراوەی حیزب نین. لە ڕاستیدا پارتی چای لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۲۰۰۸دا بوونی نەبوو، و چوار ساڵ دواتر هەموو کۆمارییەکان بۆ سەرۆکایەتی بە پەرۆشەوە بەدوای ئەوە بوون بچنە ژێر سێبەری عابایەکەی.

پارتی چای دیاردەیەکی تەواو ئەمریکییە، ئینجا چ ڕەنگدانەوەی سەرنجڕاکێشی ئەمریکیەکانە بۆ دێموکراسی ڕاستەوخۆ بەوەی ئامرازێکە بۆ ڕشتنی پارە بۆ ناو سیاسەت، یان لەبەرئەوەی دوایین کەشتیە بۆ پۆپۆلیستی حکومەتی بچووک. بەڵام دەرکەوتنە خێراکەی لە هیچ شتێکەوە دەرەنجامی ڕاستەوخۆی هەیە. چونکە لە ئەوروپا ئەبینین کە بزوتنەوەی پارتی چەتەکان، کە داوای ئازادی زانیاریەکان و ئازادی شارستانی زیاتری دەکرد، لە شوێنی سەرهەڵدانی لە سوید لە ساڵی ۲۰۰٦ فراوانتر بوو بۆ نەمسا و دانیمارک و فلندا و ئەلمانیا و ئێرلەندا و هۆڵەندا وپۆلەندا و ئیسپانیا. بەرنامە سیاسیەکەی - ئەوەی کە بە پڕوپاگەندەی ئەبسالا ناسراو بوو لە ساڵی ۲۰۰۹ - تیشک دەخاتە سەر ڕزگارکردنی مافەکانی چاپ و داهێنان، و زیادکردنی شەفافیەت و ئازادی ڕادەربڕین و جولاندنی دەنگی گەنجەکان. بزوتنەوەی پارتی چەتەکان نەک هەر لەهەڵبژاردنەکانی سویددا ۱.۷٪ ی دەنگەکانی بەدەست هێنا بۆ پەرلەمانی ئەوروپاو دوو کورسیش لەپەرلەمانی ئەوروپا کە بۆ سوید تەرخانکراوە، بەڵکو لەمانگی ئەیلولی ۲۰۱۱دا بە ۹٪ ی دەنگەکان لە بەرلین نوێنەرایەتی لە پەرلەمان بردەوە. وە لە نێوان ئەو پارتانەی کە ئەم بزوتنەوەیە شکستی پێ هێنان، پارتێکە کە هاوبەشی سەرەکیە لە هاوپەیمانی لەگەڵ ئەنجێلا مێرکل، کە ئەویش پارتی دیموکراسی سەربەخۆی دێرینە، ئەوەی کە نەیتوانی ڕێژەی ٥%ی پێویست بەدەست بێنێت بۆ نوێنەرایەتی لە پەرلەمان. وە لە ساڵی ۲۰۱۲، پارتی چەتەکان سەرکەوتنێکی تری بەدەست هێنا کاتێک یەکێک لە ئەندامەکانی لە لقی

سویسرا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکی شارەوانی لە شاری ئیکبیرگ بردەوە.

جۆرێکی تر لە یاخیبونی هەڵبژاردن هەیە کە سیگولین ڕۆیال لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی فەرەنسا لە ساڵی ٢٠٠٧ پێی هەڵسا. لە میانەی ئامادەکاریەکانی پارتی ئیشتراکی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نیکۆلا سارکۆزی، ڕۆیال بەرهەڵستی هەموو جەمسەرەکانی پارتە تەقلیدییەکانی کرد ئەوانی کە تۆڕێکی پشتگیری فراوانیان هەبوو لە نێو کادرەکانی حیزب و گەورە بەرپرسە هەڵبژێردراوەکان.

ئەی چۆن سیگۆلین ڕۆیال توانی ببێتە کاندید؟ ڕێگای جوڵانەوەیەک هاوشێوەی پارتی چای لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؛ بە مانای لە ڕێگای بەکارهێنانی هەڵبژاردە سەرەتاییەکان بۆ دیاریکردنی کاندید. شایەنی ئاماژە پێکردنە کە هەڵبژاردە سەرەتاییەکان ئامرازێکی نوێیە لە دیموکراسیەکان؛ چونکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان گشتگیر نەکرایەوە تەنها لە کۆتاییەکانی شەستەکانی سەدەی بیستەم نەبێت، کە ئەمەش نوێترینە بەراورد بە وڵاتەککانی تر. وە زیاتر و زیاتر بوو بە شتێکی باو؛ چونکە سەبارەت بە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٧ لە فەرەنسا، پارتی ئیشتراکی هەڵبژاردنی سەرەتایی کراوەی بۆ هەموو ئەندامانی ئەنجامدا، وە کامپینی سیگۆلین ڕۆیال دەستی بە هەڵمەتێکی فراوان کرد بۆ هاندانی ئەندامە نوێیەکان و باوەڕیان پێ بکات کە لە کاتی گونجاو بەشداری بکەن. وە لە ڕێگای ئەم نێوەندەوە، جگە لە ماڵپەرێکیی تۆڕی ئەنتەرنێت و پەیامە سیاسیەکان کە سیگۆلین ڕۆیاڵ پێی دیاربوو لە نێو حیزبەکەی، ڕێژەی ٦١% لە دەنگەکانی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانی بەدەست هێنا لەگەڵ ئەوەی لە هەڵبژاردنە گشتیەکان شکستی هێنا.

سۆسیالیستە فەرەنسییەکان بەو داهێنانە ڕازی نەبوون، بۆیە بڕیاریان دا کە لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

ساڵی ۲۰۱۱ هەنگاوێک بەرەو پێشەوەی ببەن کاتێک ئامادەکاریان کرد بۆ هەڵبژاردنی ۲۰۱۲ . ئەمجارە بڕیاریاندا کە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان کراوە بێت بۆ هەموو کاندیدەکان، نەوەک تەنها ئەندامانی حیزب. بۆ ئەوەی دەنگدەری بەشداری بکات، تەنیا لەسەریەتی بەیاننامەیەکی بنەڕەتی واژۆ بکات کە تێیدا بە بەهاکانی چەپی ڕازی بێت، ئەمەش ڕێکارێکە نزیکە لەوەی ببێتە سەپاندن و شایەنی جێبەجێکردن بێت. ئەم بەیاننامەیە لە لایەن یەک کاندید واژۆ کرا، بەلایەنی کەمەوە، خۆشی ئەندامی حیزب نیە. لە پاڵاوتنی پارتی سۆسیالیست فرانسوا ئۆلاند براوەبوو، کە لە ساڵانی حەفتاکانەوە لەگەڵ سیگۆلین ڕۆیاڵ ژیابوو و چوار منداڵی لێی هەبوو، و لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدا شکستی بە نیکۆلاس سارکۆزی هێنا. لەو کاتە، ئۆلاند و ڕۆیال لێک جیاببونەوە، و سەرۆکە نوێیەکە چوو بۆ کۆشکی ئیلیزیە لەگەڵ هاوڕێی ڕۆژنامەوانەکەی فالیری تریرفیلر.

پارتی چای لەلایەک و پارتی سۆسیالیستی فەرەنسا لەودیوی پانتاییە سیاسییەکان تەنیا دوو نموونەی ڕەوتێکی نێودەوڵەتین، لەهەموو دیموکراسییە پێشکەوتووەکاندا، پارتە سەرەکیەکان دەست کردووە بە هەستکردن بە دووریی جیاکەرەوە لە نێوان سەرکردە هەڵبژێردراوەکانی پشت دەرگا داخراوەکان و ئەو سەرکردانەی کە دەتوانن دەنگەکان کۆبکەنەوە. لەگەڵ سەرهەڵدانی پارتە کەمینەکان پێویستییەکی بەپەلە هەیە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخی نوێدا. لە زۆربەی وڵاتاندا ئەو پارتانەی دەیان ساڵە چاوەڕوانی پشکی دەسەڵات بوون یان لە یەکێ لە خولەکان براوە بەدەستیان هێناوە، دەرگایان بۆ ئەو ڕێگایە کردەوە کە سەرۆکەکانیان پێیدا هەڵبژێرن. وە بە بەکارهێنانی ڕێگایەک یان شێوازێکی تر، ئەم لایەنانە دەستیان کردووە بە فراوانکردنی "لیژنەی هەڵبژاردنی کاندیدەکان"، واتا کۆمەڵێک خەڵک کە قسەیان دەڕوات لە هەڵبژاردنی سەرۆک حیزب.

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

بڵاوبوونەوەی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان نیشانەیەکی گرینگە لەسەر ئەم گۆڕانە. ئۆفر نیگ، سەرۆکی کۆمەڵێک توێژینەوەی پارتە سیاسیەکان لە پەیمانگای ئیسرائیلی بۆ دیموکراسی، هەڵسا بە چاودێریکردنی ٥٠ پارتی سەرەکی لە ١٨ وڵاتی دیموکراسی، وە لە ساڵی ٢٠٠٩ ئاماژەی بەوەدا کە ٢٤ پارت ڕۆڵێکی گەورەی داوە بە ئەندامە ئاساییەکانی بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکەکەیان. هەرچی پارتە ماوەکانی تر دابەشبوون لە نێوان هەڵبژاردنی بەسایەی ئەندامانی پەرلەمان و هەڵبژاردنی بە سایەی لیژنە تایبەتمەند.

وە هەڵبژاردنی سەرەتایی دەستی کردووە بە تەشەنەکردن لە هەموو شوێنێک. لە ئەمریکای لاتیندا نزیکەی لە ٤٠٪ ی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی، لەو کاتەوەی کە لە ساڵانی هەشتاکاندا لە دەسەڵاتی سەربازیدا تێپەڕیوە، بە لایەنی کەمەوە یەک کاندیدی سەرەکی تێدایە کە لە ڕێگەی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکانەوە دەستنیشان کراوە. لێکۆڵینەوەیەک لەسەر لایەنە سیاسییەکانی ئەمریکای لاتینی بۆی دەرکەوت کە زیاتر لەنیوەی ئەو پارتانە جۆرێک لەهەڵبژاردنی سەرەتایی یان هاوشێوەیان بەکارهێناوە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی حیزب تا ساڵی ٢٠٠٠. توێژینەوەیەکی تریش دەریخست کە نزمترین ئاستی متمانە بە پارتە سیاسییەکان لە ئەمریکای لاتین لە وڵاتانی وەک بۆلیڤیا و نیکوادۆر بووە، کە کاندیدەکان لە ڕێگەی هەڵبژادنە سەرەتاییەکان دیاری نەکراون. بە شێوەیەکی گشتی گەورەکانی سیاسەت ئەوەیان دۆزییەوە کە هەرچەندە لە سەرەتادا هەڵبژاردە سەرەتاییە کراوەکان بوونیان نەبوو تەنیا لە ژمارەیەکی سنووردار لە وڵاتان نەبێت، بەڵام ڕەوتێکی نێودەوڵەتی ڕوون هەیە بۆ گرتنەبەریان. کالیفۆرنیا، کە لە زووەوە پێشەنگە لە ڕەوتە نەتەوەییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، دوورتر چووە لە پەسەندکردنی لایەنی باشترینەکانی کاندیدەکان لەسەر باشترینەکانی پارتەکان، لە ڕیفراندۆمی جەماوەری ساڵی ٢٠١١ ڕازیبوو لەسەر پێویستی بەدەرکەوتنی هەموو

کاندیەکانی هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان لەسەر یەک لیستی دەنگدان، بە شێوەیەک دوو براوەی یەکەم دەردەچن بۆ هەڵبژاردنی گشتی بە بێ ڕەچاوکردنی حیزب.

سەرکردەکانی پارتە ئەمریکایەکان کێشەی ئەوتۆیان نەبوو لە پاراستنی دەسەڵاتەکەیان و سەپاندنی تەمێکردن، تا ئەو کاتەی لیژنە گەورەکانی کاری سیاسی هاتن، ئەمەش میکانیزمێکی نوێە کە لەلایەن دادگای باڵاوە لە ساڵی ٢٠١٠ لە ڕێگەی ڕێکخراوی "هاونیشتیمانیانی یەکگرتوو" پێشکەش کرا و سەقفی سەپێنراوەی سەر بەخشینەکان بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی لابرد، و توانای بە کۆمپانیا تایبەتەکان بەخشی. ئەم لیژنە سەرەکیانە ڕێگەیان پێ نادرێت هەماهەنگی لەگەڵ ئەو کاندیدانە بکەن کە پشتگیریان دەکەن، بەڵام لە کەمپینی ساڵی ٢٠١٢ی سەرۆکایەتی دەرکەوت کە هەموو کاندیدێکی سەرۆکایەتی ( و تەنانەت هەموو ڕکابەرێک لە کۆماریەکان بۆ دەستەبەرکردنی پەسەندکردنی حیزب) لیژەنەیەک یان زیاتر هەبوو، بڕێکی زۆر لە پارەی خەرج دەکرد لەو دەستپێشخەریانەی کە پروپاگەندەیان بۆ دەکرد یان هێرشی دەکردە سەر ڕکابەرەکانی. لیژنە گەورەکانی کاری سیاسی جۆرێکی نوێن لەدەسەڵاتی سیاسی ڕاستەقینە لەسەر بنەمای ئازادی دەستگەیشتن بەپارەیەکی زۆر، و نموونەیەکی ترە لەسەر شێوەکانی لەتبوونی هێز و دەسەڵات. بەرگریکارەکان لێی تەنیا وەک زیادەیەکی تەندروستی دەبینن بۆ جبەخانەی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ کێبڕکێی زیاتر بهێننە ناو سیاسەتەوە. پرۆفیسۆری یاسا گویل گۆرا، کە یارمەتی گرووپەکانی دژ بە ئاشکراکردنی بەخشین دەدات، دەڵێت زۆربەی ئەو یاسایانەی کە ڕێگە بە گەیشتن بە لیژنە گەورەکانی کاری سیاسی دەدەن، بە سادەیی بەشێکن لە "فێڵکردن بۆ پاراستنی خاوەن پۆستەکان". وە گۆرا پێی وایە: "ئەم یاسایانە کەسانی ناسەربەستی دەرەکی سنوردار دەکەن، چ لیبراڵ بن، چ چەپەکان، پارێزگارەکان یان ڕاستڕەوەکان". لە ڕاستیدا، بازرگان لیۆ لینبکی سێیەم

## کۆتایی سەردەمی هێز

لە ساڵی ٢٠١٢ لیژنەیەکی گەورەی چالاکی سیاسی دەستپێکرد کە تاکە ئامانجیان لابردنی ئەو خاوەن دەسەڵاتە دەستڕۆیشتووانە بوو کە باوەڕیان وابوو چیتر وەڵامی دەنگدەران نادەنەوە. هەروەک پەیامنێری واشنتۆن پۆست پاول کاین ڕایگەیاند، لە کاتێکدا زۆربەی لیژنەکانی کاری سیاسی ئامانجیان بەرزکردنەوەی هەلی پەسەندی کاندیدەکە یان وازهێنانی ڕکابەرێکی ئایدیۆلۆژییە، بەڵام لیژنە گەورەکانی کاری سیاسی ئامانجێکی تەواو جیاوازیان هەیە: ئەویش دەرکردنی خاوەن پۆستەکان، لە هەردوو پارتەکە. بۆ نا؟ لیژنەی کاری سیاسی گەورە کە لە لایەن لینبکەوە دەستی پێکرد یارمەتی دا دوو کۆماری دێرین و دوو دیموکرات ببەزێنن، کە گورزێکی کوشندەیان دا بە ئەزموونێکی نزیکەی ٦٥ ساڵ لە ئەنجومەنی نوێنەران. هەرچەندە سەرمایەکانی لینبێک سنوردار بوون، وە پارەی لیژنە گەورەکەی خەریک بوو تەواوبێت، وتەبێژەکەی شانازی کرد، "ئێمە سەلماندمان کە بیرۆکەکەمان سەرکەوتووە".

لیژنە سەرەکییەکانی کاری سیاسی ڕەنگە دیاردەیەکی ڕوون و ئاشکرای ئەمریکی بن، بەڵام پارە لە هەموو جیهاندا بۆتە دیاریکەرێکی بەهێزی دەرئەنجامە سیاسییەکان وەک ئایدیۆلۆجیا لە ڕابردوو، بەڵام پارە بەتەنیا بەس نییە بۆ ئەوەی ئەم ڕۆژانە دەست پێ بکات بۆ پڕکردنەوەی ئەو کونە هەمەجۆرانەی کە لە ڕێگایانەوە ڕێگەی دزەدەکات دوور لە خاوەنەکانیان؛ هەروەک ڕوون بوو لە حاڵەتەکانی سیلڤیو برلسکونی لە ئیتالیا و ثاکسین شناواترا لە تایلاند و زین العابدین لە تونس و کەسانی تریش.

### لە پایتەختەکانەوە بۆ ناوچەکان

ئێستا وڵات و دیموکراسیەکان و گوشاری زیاتر هەن بۆ هاوبەشی کردنی دەسەڵات تەنانەت لەو وڵاتانەش کە سیستەمی ستەمکار فەرمانڕەوایە، لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

کاتێکدا دیموکراسیەکان هەڵبژاردەی زیاتر دەستەبەر دەکەن لە ناوەوە و دەرەوەی پارتەکان، و دووبارە هەڵبژاردن و ڕاپرسی و ووردبینی و یەکلاکردنەوە، و ڕکابەری زیاتر. هەموو ئەم ئاراستانە ئاماژە بە هەمان ئاراستە دەکەن کە ئەویش دووبارە دابەشکردنی هێز و پەرتەوازەبوونی لە دەستی یاریزانە جێگیرەکانەوە بۆ ڕکابەری زیاتر.   ئاراستەیەکی جیهانی بۆ ئەم ئاراستانە زیاد دەکرێت کە ئەویش گۆڕانی هێزە لە پایتەختەکان و دەزگا جێبەجێکارەکانەوە بۆ حکومەتی ویلایەتەکان و ناوەخۆییەکان.

بەریتانیا وەربگرە، بۆ نمونە، سیستمە سیاسیەکەی ناسراوە بە جێگیری و پارتی پارێزگاران و پارتی کرێکاران نۆرە دەگرن لە سەر دەسەڵات، لە نێوانیشیان پارتی دیموکراسیە ئازادەکانە بە قەبارە بچووکەکەیەوە. کاتێک هیچ کام لەو دوو پارتە سەرەکییە زۆرینە نابەنەوە، وەک ئەوەی لە ساڵی ٢٠١٠ ڕوویدا، ئەوا هاوپەیمانی لەگەڵ دیموکراتەکان لاسەنگی هە لایەکیان بەرزدەکاتەوەو لە لوتکە دایدەنێت. لەگەڵ قورسی دانوستان دەربارەی پێکهێنانی هاوپەیمانێتییەکە، بەڵام زۆر کەمتر ئاڵۆزە لە گەیشتن بە زۆرینە لە پەرلەمان کە پێویستی بە هاوپەیمانێتی پێنج یان شەش حزب هەیە.

لەبەریتانیا ئەم سێ حزبە کۆنترۆڵی زۆرینەی ئەنجومەنی کۆمۆنەکان دەکەن، و یاساکانی هەڵبژاردن وادەکات بۆ لایەنەکەی تر قورس بێت کە ئەم دۆخە ببڕێت. کەواتە چۆن دەتوانین بوونی ئەم فرەلایەنە ڕوون بکەینەوە کە لەم ساڵانەی دواییدا گوێمان لێ بووە؟ پارتی سەربەخۆیی بەریتانیا و پارتی نەتەوەیی بەریتانیا و پارتی نەتەوەیی سکۆتلاند و سین فێین و پارتی یەکێتی ئۆلستر و پارتی وێلز هەموویان دەریانخست کە دیمەنی سیاسی بەریتانیا لە وێنە تەقلیدیەکەی هەمەجۆرترە. ئەم پارتانە، کە هەندێکیان ناوچەیی و هەندێکیان توندڕەون، لە دوو دەیەی ڕابردوودا بە سەرنج و متمانەی میدیایی پەیوەستەوە پۆستی هەڵبژاردنیان بەدەست هێناوە. چۆن؟

ئەمە ڕوودیدا بەهۆی دەستە هەڵبژێردراوە نوێیەکان، لە ساڵی ١٩٩٨دا ڕیفۆرمی سیاسی فراوان، کە بە گواستنەوەی دەسەڵاتەکان ناسراوە، بووە هۆی گواستنەوەی هەندێک دەسەڵاتی یاسادانان لە پەرلەمانی شانشینی یەکگرتووەوە بۆ پەرلەمانەکانی سکۆتلاند و وێڵز و ئیرلەندای باکوور. سەرەڕای ئەوەش، ئەندامێتی یەکێتی ئەورووپا بووە هۆی بەشداری کردن لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەورووپا، کە نوێنەرایەتیی ڕێژەیی دەرگای بۆ پارتە بچووکەکان کردەوە بۆ بەدەستهێنانی هەندێک کورسی، پارتی سەربەخویی شانشینی یەکگرتوو، کە گومانی هەبوو لە سودەکانی ئەندامێتی یەکێتی ئەورووپا، بەسەرکەوت لە ڕێگای بەشداریکردنی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ئەورووپی. وە پارتی نەتەوەیی چەپی توندڕەو، کە ڕقی لە بیانیەکانە، دوو کورسی پەرلەمانی ئەورووپی بەدەست هێنا لە ساڵی ٢٠٠٩، ئەمە سەرکەوتنێکی بچووکە لە ڕووی ژمارەوە، بەڵام کرانەوەیەکی گەورەیە لە ڕووی بڕواپێدان بۆ پارتێک کە لە گۆڕەپانی سیاسی دوورخرابێتەوە.

بەریتانیا تەنیا نییە، لە ئیسپانیا دوو پارتی سەرەکی پارتی گەل و پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی ئیسپانیا لە سەرەتای دیموکراسییەوە لە ساڵی ١٩٧٨ەوە لە دەسەڵاتدا جێگر بوونە. بەڵام ئیسپانیاش وەک بەریتانیا لایەنی گرنگی هەرێمی هەیە، و حکومەتی پارێزگاکانیش (کەتەلۆنیا و باسک و هتد) زۆر سەرکەوتوو بوون لە بەدەستهێنانی سەربەخۆیی زیاتر لەسەر حسابی دەسەڵاتی حکومەتی نیشتمانی لە مەدرید، و هەمان شت بەسەر ئیتالیادا جێبەجێ دەکرێت.

پەرلەمانی یەکێتی ئەورووپا ڕێگای بەشداریکردنی بۆ پارتە بچووکەکان لە هەموو وڵاتانی ئەندام (٢٧ دەوڵەت) کردەوە. گرنگ نییە پەرلەمان دەسەڵاتی ڕاستەقینەی هەیە یان نا، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەو ڕێگایەیە کە بێ ئەم لایەنانە

دابین دەکات بۆ بەدەستهێنانی شەرعییەت و دەسەڵات لە نێو وڵاتەکانیاندا. هاوکات گواستنەوەی دەسەڵاتەکان بۆتە ڕەوتێکی نێودەوڵەتی، و لەساڵی ١٩٧٠ەوە ئیتالیا ئەنجومەنە هەرێمییە هەڵبژێردراوەکانی دامەزراند. فەڕەنساش لە ساڵی ١٩٨٢دا پەیڕەوی کرد. بەلجیکا لە ساڵی ١٩٩٣دا بوو بە سیستەمێکی فیدراڵی لەگەڵ ئەنجومەنە هەرێمییەکان. هەروەها فیلاندا، ئیرلەندا، نیوزلەندا و نەرویج جۆرێک لە پێکاتە نوێیەکانی هەڵبژێردراویان لە نێوان ساڵانی حەفتاکان و نۆوەدەکان ناساند. لە هەندێک لە وڵاتەکان ژمارەی ئەو شارەوانیانەی کە بەرپرسانی هەڵبژێردراویان هەیە زیادی کردووە، بۆلیڤیا لە ساڵی ١٩٩٤ ژمارەی شارەوانیەکانی خۆی دوو هێندە کرد و دەسەڵاتەکانیشی فراوانتر کرد.

جارێکی تر، دیموکراسیە دامەزراوەکان لە ئەمریکای لاتیندا بە شێوەیەکی زیاترو زیاتر بەشداری دەکەن لە خێرایی گۆڕانی نامەرکەزی کە زیاتردەبن. چونکە ژمارەی ئەو وڵاتانەی ئەمریکای لاتین کە بەڕێوەبەرانی حکومەتی خۆجێیی ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن، لەجیاتی ئەوەی لەلایەن دەسەڵاتدارانی ناوەندەوە دەستنیشان بکرێت، لە ٣ وڵات لە ساڵی ١٩٨٠ەوە زیادی کرد بۆ ١٧ وڵات لە ساڵی ١٩٩٥. بانکی گەشەپێدانی نێودەوڵەتی ئەمریکی توێژینەوەیەکی ئەنجام دا دەریخست کە حکومەتە لاوەکییەکانی هەرێم کۆنترۆڵی خۆیان لەسەر خەرجکردنی گشتی لە ٪٨ بۆ ١٥٪ بەرزکردۆتەوە لە ماوەی ١٥ ساڵ کە لە ساڵی ١٩٩٠ دەست پێ کردووە. وە لە وڵاتە زیاتر نامەرکەزیەکان ئەم ڕێژەیە زۆر زیاتر بوو: نزیکەی ٪٤٠ خەرجی گشتی لە ئەرجەنتین و بەرازیل و کۆلۆمبیا. هەروەها پرۆگرامی گۆڕانی لامەرکەزی سەرەکیش لە وڵاتانی وەک فلیپین، ئیندۆنیزیا و ئیستۆنیا جێبەجێ دەکرێت.

لە هەمان کاتدا، سیستەمە فیدڕالیە جۆراوجۆرەکان هەڵسان بە دابەشکردنی

وویلایەتەکان بۆ دوو بەش، کە دەستەی جێبەجێکاری ناوخۆیی و یاسادانانی نوێیان لێ دروست بوو. لە ساڵی ٢٠٠٠ هندستان ویلایەتەکانی چاپەتیسگار و تاراخان و جەرخاندی زیاد کرد، و پێشنیاری زیادکردنی دەوڵەتێکی تر بە ناو تەلەنگان کرد. نێجیریا ژمارەی ویلایەتەکانی لە ساڵی ١٩٧٦ لە ١٩بۆ ٣٦ وویلایەتەکەی ئەمڕۆ دوو هێندە کرد. تەنانەت کەنەداش هەرێمەکانی باکووری ڕۆژئاوای دابەشکرد و هەرێمی نونافوتی لێ دروست بوو.

بوونی پلاتفۆرمی نوێ مانای هەلی نوێ دەگەیەنێت، لەسەرانسەری ئەورووپادا کۆمەڵێک لایەنی چەپ و ڕاست و ژینگەیی و ناوچەیی و پارتە خاوەن یەک کێشەکان، و لە هەندێک حاڵەتدا پارتە نامۆکان وەک پارتی نێودەوڵەتی چەتەکان، ئەم گۆڕەپانە نوێیانەیان بەکارهێناوە بۆ بەدەستهێنانی ڕێز و ڕاکێشانی دەنگی دەنگدەرانی یاریزانە گەورە تەقلیدیەکان. چیتر دەنگ پێدانی بەفیرۆدانی دەنگەکان نییە، و قەبارەی بچووکی یان هەڵوێستە نامۆکانی چیتر ڕێگر نین لەبەردەم گونجاوییان بۆ بارودۆخەکە. ئەم پارتە "پەراوێزخراوانە" دەتوانن بڕیارەکانی پارتە گەورەکان و هاوپەیمانەکانیان تێک بدەن و دەتوانن دوایانبخەن و لە بابەتی خۆیان لا بدەن و تەنانەت ڤیتۆیان بکەن. پارتە بچووکەکانی "چەتەکان" هەمیشە بوونیان هەبووە، بەڵام ژمارەیان زیاد بووە بۆ کاتی ئێستا، و توانایان بۆ سنووردارکردنی هەڵبژاردنی یاریزانە گەورەکان لە زۆربەی دیموکراسیەکانی جیهاندا هەستی پێکراوە.

پێدانی دەسەڵاتی زیاتر بەدەسەڵاتدارانی ناوخۆو هەرێمیەکان پێشبینیەکانی سەرۆک شارەوانیەکان و سەرۆک هەرێمەکان و پێگا گشتیەکانیانی گۆڕیوە؛ و هەندێکجار پیشەی سیاسی نیشتمانیان بەهێزتر دەکات، و هەندێک جاریش جێگرەوە هەیە کە پایتەخت بە تەواوی تێدەپەڕێنێت. چونکە سیاسەتی دەرەوەی ڕاستەقینە کە لەلایەن هەندێک شار و ناوچەوە ئێستا جێبەجێ دەکرێت ئەو ئاهەنگە

تەقلیدییەکانە زۆر تێدەپەڕێنێت کە بۆ شاندەکان دەکرێت بۆ ڕەواجدان بە بازرگانی نێوان شارەکان. وە هەندێک لە توێژەران لەو باوەڕەدان کە ئێستا زۆرێک لە هەرێمەکان و شارەکان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێناوە لە هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیان لەگەڵ حکوومەتە ناوەندییەکان بە ڕادەیەک کە ڤێرژنێکی مۆدێرنی سیستەمی شارستانیی سەدەکانی ناوەڕاست دێنێتە ئاراوە.

### لە فەرمانڕەواکان بۆ پارێزەران

شێوازەکە ئاشنایە، هەروەها یاریزانەکانیش، زیاتر لە ٧٠ ساڵە نوخبەیەکی مەدەنی و سەربازی، یان لە ڕێگەی حوکمی سەربازیەوە، زاڵ بووە بەسەر تایلان و دواتر لە دوای ساڵی ١٩٧٠، لە چوارچێوەیەکی هەڵبژاردنێکی ناسکدا بە شێوەی خولی لەلایەن کودەتا و حکومەتی سەربازی ئینتیقالی ڕووخێندرا. سەرەڕای ناسەقامگیری، تایلەند گەشەی ئابووری خێرای بەدەست هێنا لە ساڵانی هەشتاکان و نۆوەدەکان. ئەو بانک و پیشەسازیانەی کە لە لایەن سوپاوە خاوەندارێتی دەکران و هەروەها بازرگانە مەدەنییەکانیش لە ڕێگەی کودەتا و دەستوورەوە گەشەیان کرد. ملیاردێر و پۆلیسی پێشوو تاکسن سچناواترا لە ساڵی ٢٠٠١ لە سەکۆیەکی سیاسی پۆپۆلیستی بوو بە سەرۆک وەزیران و لە ساڵی ٢٠٠٥ دووبارە هەڵبژێردرایەوە. وە بە جێرایی تۆمەتی سەرپێچی و گەندەڵی دەستی پێکرد، و وڵات چووە ناو قەیرانێکی سیاسی دوو ساڵە کە لەو ماوەیە هەڵبژاردنی شکستخواردوو و کودەتادا ڕوویدا، و دووبارە هەڵبژاردن لە ساڵی ٢٠٠٧ کە لە کۆتایدا خوشکی تاکسن سەرکەوتنی بەدەست هێنا بۆ سەرۆک وەزیران.

لە نێو ئەم نائارامیانەدا یاریزانێکی سیاسی نوێ خۆی سەپاند: دەزگای دادوەری. وە لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦، حوکمەکانی دادگا گەورەکانی تایلەند

دەستیان کرد بە دیاریکردنی ئەو ئاڕاستەیەی کە سیاسەتی نەتەوەیی تێیدا بەڕێوەدەچوو. دادگاکان پارتی پاکسین و زۆر لایەنی تریان هەڵوەشاندەوە و ڕێگرییان لە چەندین سەرکردەی سیاسی کرد لە ئەزموونکردنی سیاسەت، و جارێک بڕیاریان ناشایستەبوونی سەرۆک وەزیرانیاندا لەبەر ئەوەی بەرامبەر پارە لە بەرنامەیەکی تەلەڤیزیۆنی چێشتلێناندا دەرکەوت. لە کانوونی یەکەمی ۲۰۰۸دا دادگای دەستووری بەهۆی ساختەکاریی هەڵبژاردنەوە حیزبی دەسەڵاتداری هەڵوەشاندەوە، و سێ مانگ لە ناارامی جەماوەریی کۆتایی پێهێنا و ڕێگاشی بۆ حکومەتێکی هاوپەیمانی نوێ کردەوە.

دادگاکانی تایلەندی ئاشکرا نەبوون، بەڵام بەرگیان هەبوو، یەکەم دەستێوەردان لە ساڵی ۲۰۰٦ لە دادگایەک هات کە لە بنەڕەتدا لەلایەن سوپای تایلەندەوە دانرابوو. وە بە کاتێکی کەم پێش ئەوە، پاشای تایلەند، کەسایەتییەکی خاوەن دەسەڵاتی ئەخلاقی گەورە، ووتارێکی پێشکەشکرد و داوای لە دادگاکان کرد کە ژیرانە هەڵسوکەوت بکەن. هەرچۆنێک بێت سەرهەڵدانی دادگا لەژیانی سیاسیدا نەریتی جێگیری لەمێژینەی گۆڕیوە و دەرفەتێکی نوێی داوەتە خۆپیشاندەران و چالاکوانان بۆ سەلماندنی مشتومڕی ڕەوای خۆیان. لەهندستانیش دادگای باڵا دەستتێوەردانی کرد لەو بۆشاییەی کە لە ئەنجامی هاوپەیمانێتیەکی ناکاریگەر و ناپراکتیکی دروست بوو بەسەرۆکایەتی سەرۆکی وەزیران مەنمۆهان سینگی، ئەمەش بە لێکۆڵینەوە لەچالاکییە نایاساییەکانی کانزایی و هەڵوەشاندنەوەی مەوعیدەکان و تەنانەت دانانی تەمەنی خانەنشینی بۆ فەرماندەکانی سوپا. وەک لە یەکێک لە شرۆڤەکارانی هیندی دەگوترێتەوە ، "هندستان بووە بە کۆماری مۆز کە دادگای باڵا پەلکە مۆزی تێدا لێدەکرێتەوە ".

دەزگای دادوەری کاریگەر شتێکە، بەڵام ئەو دادگایانەی کە کێشەی سیاسی چارەسەر دەکەن یان دەست لە کار تێوەردان دەکەن بۆ دەرکردنی

## کۆتایی سەردەمی هێز

حکومەتەکان شتێکی زۆر جیاواز ترن. تەنانەت لەو دەوڵەتانەش کە سیستەمی دادوەری بەرێزیان هەیە، هەندێک پێشینەکان کەم بوونیان هەیە. یەکێک لەو پێشینانە دادگایی کردنی ساڵی ٢٠٠٠ بوو لە دادگای فلۆریدا و دادگای باڵای ئەمریکا، کە بووە هۆی ئەوەی جۆرج دەبلیو بۆش سەرۆکایەتی ئەمریکای بردەوە لەسەر بنەمای حوکمێکی دادگا. حاڵەتی دووەم بریتییە لە لێکۆڵینەوەکانی "دەست پاکەکان" کە لەلایەن تیمێکی دادوەرانی ئیتاڵی بە سەرۆکایەتی ئەنتۆنی دی پیترۆ، لە ساڵی ١٩٩٢ دەستی پێ کرد. ئەو لێکۆڵینەوەیە گەندەڵییەکی بەربڵاوی دەرخست، و لە ماوەی چەند مانگێکدا لێکۆڵینەوەکە تێوەگلانی سەرکردەکانی حیزب و وەزیرەکانی پێشوو و بەرپرسانی هەرێم و چەندین خاوەنی کۆمپانیای پیشەسازییەکانی سەلماند.

لە کۆتاییدا لێکۆڵینەوەکە سەلماندی کە چەندین کەسایەتی سەر بە پارتە دەسەڵاتدارە تەقلیدییەکانی گۆڕەپانی سیاسی ئیتالیا تێوەگلاون، لەوانە پارتی دیموکراسی مەسیحی و حزبی سۆسیالیست، ئەم پارتانە تووشی پووکانەوە بوون، و لە هەڵبژاردنی دواتردا پێگە و ناوبانگ و جەماوەریان لە دەستدا. وە لە ساڵ ١٩٩٤، پارتی دیموکراسی مەسیحی بە تەواوی شیبۆوە، و دابەش بوو بۆ چەند پارتێکی نوێ. شایەنی باسە کە لە جەنگی جیهان دووەمەوە زۆربەی سەرۆکەکان و وەزیرەکانی ئیتالیا سەر بە پارتی دیموکراسی مەسیحیەکان بووە. وە لە هەمان ساڵدا، دوای ١٠٢ ساڵ لە دامەزراندنی، پارتی سۆسالیستیش خۆی هەڵوەشاندەوە. ئەو لێکۆڵینەوەیە ئیتالیای لە گەندەڵی ڕزگار نەکرد، بەڵام دیمەنی سیاسی ئیتالیای بە تەواوی گۆڕی، کاتێک سیستەمی کۆنی حیزبی تەقاندەوە، گۆڕەپانەکەی تەرخان کرد بۆ کۆمەڵێکی نوێ لە ڕاستەکان( حیزبی فۆرزای ئیتالیا بە سەرۆکایەتی سیلڤیۆ بێرلوسکۆنی ) چەپیەکان (پارتی دیموکراسیەکان) و پارتە هەرێمیەکانی تر و هی تریش. دادوەرەکان جارێکی تر بوون بە پاڵەوانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

گرنگ لە ماوەی زاڵبوونی درێژی سیلڤیۆ بێرلوسکۆنی بۆ سیاسەتی ئیتاڵی؛ کاتێک تێوەگلاوبوو لە ئابڕووچوونە یەک لەدوای یەکەکان کە وای لێکرد ببێتە ئامانجێک بۆ لێکۆڵینەوە دووبارەکانی دادوەری تا کۆتایی کەوتنی تەواوی لە دەسەڵات لە ساڵی ٢٠١١.

ئەم لێکۆڵینەوانە دادوەرە ناودارەکانی کردە یاریزانی نوێ لە ژیانی سیاسیدا، دادوەری ئەنتۆنیۆ دی پیترۆ، کە سەرۆکی تیمی لێکۆڵینەوە بوو، لە کۆتاییدا لە پۆستەکەی دەستی لەکار کێشایەوە و وەک سەرۆکی پارتێکی بچووک چووە ناو دنیای سیاسیەوە. وە دادوەری ئیسپانی بالتاسار گارزۆن کە چەندین لێکۆڵینەوەی بەرزی لە ناوەوە و دەرەوەی ئیسپانیا بەڕێوەبردووە، سیاسەتمەداران و بانکەوانە ئیسپانیەکان و ڕێکخراوی ئیتای لە هەرێمی باسک، و هەروەها بەرپرسانی ئەمەریکا و ڕێکخراوی قاعیدە و فەرمانڕەوای پێشووی ئەرجەنتینی کردە ئامانج. یەکێک لە بەناوبانگترین کەیسەکان داواکاری ئەو بوو بۆ ڕادەستکردنەوەی ئۆگستینۆ پینۆشێت، دیکتاتۆری پێشووی چیلی، کە بووە هۆی دەستبەسەرکردن پینۆشێت بۆ ماوەیەکی دووردرێژ لە بەریتانیا لە ساڵانی ١٩٩٨ و ١٩٩٩. (گارزۆن خۆی دواتر تاوانبار کرا و لەکار ڕاگیرا بەهۆی تێپەڕاندنی دەسەڵاتەکانی بۆ دەسپێکردنی لێکۆڵینەوەی بوێرانە بۆ ئەو کارە دڕندانەی کە ڕژێمی فرانسیسکۆ فرانکۆ ئەنجامی دا). پێکهێنانی دادگای تاوانی نێودەوڵەتی لە لاهای و دامەزراندنی دادگاکانی تاوانی جەنگی نێودەوڵەتی، کەسایەتی گشتی نێودەوڵەتی دادوەرانی دروستکردووە وەک ڕیچارد گۆڵدستۆنی ئەفریقای باشوور و لویس ئاربۆری کەنەدا. چونکە ئاستی ناوبانگ و هێزی ئەم دادوەرانە لەسەر دیمەنی نێودەوڵەتی بەرزترە لە ئاستی هەندێک لە پێشینەکانیان لە ماوەی دادگاکانی تاوانەکانی جەنگ، کە لە لایەن هاوپەیمانانەوە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم کرا.

## کۆتایی سەردەمی هێز

وە لەسەر ئاستی سیاسەتی ناوخۆدا زیادبوونی دەسەڵاتی دادوەران بەشێوەیەکی بەرچاو لەدەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام، بەشێوەیەکی گشتی، کۆتی نوێی سەپەنادووە بەسەر ئەزمونکردنی هێز لەلایەن سەرۆکی حکومەتەکان و لایەنە سیاسییەکانەوە. گومانی تێدانیە کە زیادبوونی فرەیی بڕیارەکانی دادوەری لەسیاسەتدا گەرەنتی چاودێرییەکی ژیرانە نییە، بەهۆی بوونی چەندین سیستەمی دادوەریی کە جێی پرسیارەبن. بۆ نموونە، لە پاکستان زۆر خەڵک گومان دەبەن کە سوپای پاکستانی دادگاری باڵای بەکارهێناوە بۆ چاودێری و ڕێگرتنی حکومەتی مەدەنی. مەرجیش نیە ئەم پێشکەوتنە دیموکراسی بێت، بەڵام بەشێکی ڕاستیە لە لاوازکردنی هێزی دەسەڵاتی سیاسی.

### لە سەرۆکەوە بۆ گشت جەماوەر

سەرکردەکانمان کێن؟ سەردەمانێک هەبوو کە سەرکردەکان پەیوەندیان بە دەزگاکانی حکومەت و پارتەکان هەبوو پەیوەندیەک کە جیاناکرێتەوە؛ و تەنانەت شۆڕشگێڕانیش چاوەیان بڕیبووە پۆستە بەرزەکان. بەڵام لەم دواییانەدا زۆرێک لە پاڵەوانەکانمان لە ڕێگەی جیهانی دیجیتاڵەوە ناوبانگیان پەیدا کردووە، بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامەکان و کاریگەری ئەنجامەکان بە ڕێگایەک کە پێشتر پێویستی بە ژێرخان هەبوو لە لایەن پارتەکان، ڕێکخراوە ناحکومییەکان یان ڕۆژنامەگەری تەقلیدیەکان. نوسەر و چالاکوانی چینی لیو شیۆبۆ بەیاننامەیەکی لەسەر ئەنتەرنێت بڵاوکردەوە، کە داوا لە چین دەکات بەهاکانی دیموکراسی جیهانی و مافەکانی مرۆڤ تێکەڵ بکات لە بەرنامە نوێگەری و چاکسازیەکانی، پاشان بە بە خێرایی دەستگیرکرا و بەتۆمەتی چالاکیە تێکدەرەکان زیندانی کرا، بەڵام ساڵی دواتر لە زینداندا خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی پێ بەخشرا.

لە میسریش کاتێک وائل غەنیم بۆی دەرکەوت کە لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن لاوازن و پشتیان پێ نابەسترێت، بزووتنەوەیەکی فەیسبووکی ڕێکخست بۆ ئەوەی لێپرسینەوەی حکومەت بکات و بەرپرسیاری بکات. لە کۆلۆمبیا ئەندازیارێک بەناوی ئۆسکار مۆرالس دەستی کرد بە پێکهێنانی گروپێکی فەیسبووک بەناوی "ملیۆنێک دەنگ دژی هێزە شۆڕشگێڕەکانی کۆلۆمبیا" بۆ نارەزایی دەربڕین لەسەر هێرشە گەورەکانی گروپێکی یاخیبووان بۆ سەر خەڵکی مەدەنی؛ و ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی خۆنیشاندان و پەستانی گەورە کە ئازدکردنی بارمتەکانی لێکەوتەوە. هەروەها چالاکوانانی تویتەر لە مۆلدۆڤا یارمەتیدەر بوون لە دەرکردنی سپارکی گۆڕانی سیاسی لەو وولاتە. وە لە کینیا لە ساڵی ٢٠٠٦ پارێزگار ئاوری ئۆکولۆ و بلۆگەرێک بەناوی " ئێم " هەڵسان بە دروستکردنی ماڵپەرێکی چاودێری ئەلکترۆنی بۆ چاودێری کردنی دیمەنی سیاسی لە کینیای گەندەڵ. هاوڵاتی ئێرانی- ئەمریکی، کێلی گوڵنووش یەک-گاد، سایتەکەی دەستپێکرد بەناوی

TehranBureau.com بۆ کۆکردنەوەی هەواڵەکان لە ئێرانیەکان و ڕاستەخۆ بڵاوکردنەوەی لە کاتی ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی دوای هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ساڵی ٢٠٠٩، ئەو کاتەی کە ڕێ لە ڕۆژنامەنووسانی بیانی گیرابوون لە هاتنە ناوەوەی ئێران. بلۆگەر و چالاکوانی کۆمەڵگەی مەدەنی سامی بێن غەربیە، بە بەکارهێنانی بلۆگی خۆی بۆ بڵاوکردنەوەی چیرۆکی گەندەڵی بە ئازار کە لە تێلیگرامەکانی دیپلۆماسییەکانی ئەمەریکا هاتبوون کە ویکیلیکس بڵاوی کردبۆوە، یارمەتیدەربوو لە هاندان بۆ خۆپیشاندان دژی ڕژێم لە تونس.

ئەم لایانە کاریگەرە نوێیانە مەودای ووتاری سیاسیان فراوان کرد و دەوڵەمەندی کرد لە هەموو جیهان. ئەمانە لە دەرەوەی کەناڵەکان و کۆنترۆڵی

دەزگا سیاسیە تەقلیدیە پەیوەندیارەکان بە حکومەت و پارتەکان کاردەکات. ئەوان لە هەموو شوێنێکن، وە دەتوانن زۆر خۆ بەدوور بگرن کاتێک ڕووبەڕووی سەرکوتکردن دەبنەوە. بەڵام تەکنەلۆجیا تەنیا ئامرازێکە، گەورەترین وێنە بریتییە لەوەی کە بڵاوبوونەوە یەک لەدوای یەکەکانی هێز تاکەکانی لە پێگەیەکی بێوێنەدا داناوە کە نەک تەنیا توانای ئەوەیان پێ دەدات گوێ بە دامەزراوە سیاسیە تەقلیدیەکان نەدەن کە لە ماوەی دەیان ساڵدا پەرەیان پێ سەندراوە، بەڵکو توانای ئەوەشیان پێ دەدات کە کاریگەریان هەبێت لەسەر سیاسیەکان یان باوەڕیان پێ بکەن یان بە شێوەیەکی ڕاستەخۆتر و کاریگەرتر دایان بمرکێنن کە هەر دیمەنێکی سیاسی تەقلیدی بتوانێت چاوەڕێی بکات.

## سندوقەکانی دەرماڵە و چالاکوانانی هاککردنی سایبەر بۆ ئامرازە سیاسیەکان

ئەگەر جۆن پاولسۆن و جولیان ئەسانج پێکەوە لە ژوورێکدا بەجێ بهێڵن، لەوانەیە بە زووترین کات شەڕ بکەن. بەڕێز پاولسۆن کۆمپانیای "پاوڵسۆن و هاوکارەکانی" بەڕێوە دەبات، کە یەکێکە لە گەورەترین سندوقەکانی دەرماڵە لە جیهان. بەڵام ئەسانج دامەزرێنەری ماڵپەری ویکیلیکسە، کە تایبەتە بە بڵاوکردنەوەی زانیارە نهێنیەکانی تایبەت بە حکومەتەکان و کۆمپانیاکان؛ لەگەڵ ئەمەش هەردووکیان لە شتێکی زۆر گرینگ هاوبەشن: هەردووکیان لایەنێکی کاریگەری نوێیان دۆزیتەوە کە دەستی بە ڕوودانی گۆڕانێک کردووە لە سیاسەتی نەتەوەیی لە ڕێگای سنوردارکردنی هێزی حکومەتەکان.

سندوقەکانی دەرماڵە یەکێکە لە دامەزراوە داراییە جۆراوجۆرەکان کە بڕیارەکانی دەسەڵاتی حکومەتەکان سنووردار دەکات، وە توانای هەیە ملیارە دۆلار بگاوزنەوە بە خێرایی تیشکی خۆر بۆ دەرەوەی هەر وڵاتێک کە متمانەیان بە

سیاسەتە ئابوورییەکانی نەبێت. تۆماس فریدمان نوسەر لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ئەو سنوردارکردنانە بە " چاکەتی بەردی زێڕین" وەسف دەکات کە لەلایەن ئەم یاریزانانەوە سەپێندراوە (چاکەتێک کە کۆت دەخاتە سەر ئەو کەسانەی لەبەری دەکەن بۆ ئەوەی ئازاری خۆی و ئەوانی تر نەدات):

بۆ ئەوەی هەر دەوڵەتێک چاکەتی بەردی ئاڵتونی بۆ گونجاوبێت، دەبێت ئەم یاسایە زێڕینانەی خوارەوە بگرێتە بەر، یان وا ببینێت کە بە ئاراستەیان دەڕوات: کردنی کەرتی تایبەت بە بزوێنەری سەرەکی بۆ گەشەی ئابووری خۆی، و هێشتنەوەی تێکڕای نرخی هەڵئاوسان و جێگیرکردنی نرخەکان لە ئاستێکی نزم، و کەمکردنەوەی قەبارەی بیوروکراسی دەوڵەت؛ پارێزگاری کردن لە بودجە تا دەتوانرێت نزیکتربێت لە هاوسەنگی، ئەگەر زیادە لە بودجە نەبوو؛ و لادانی گومرگە سەپێنراوەکان لەسەر کاڵا هاوردەکان، یان کەمکردنیان؛ لابردنی کۆتە سەپێنراوەکان لەسەر وەبەرهێنانە بیانیەکان؛ و لەناوبردنی سیستەمی کوتلەکاری و دەستبەسەرداگرتنە ناوەخۆییەکان، زیادکردنی هەناردەکان؛ و بە تایبەتکردنی پیشەسازی و ئاسانکاریەکانی دەوڵەت، و ئازادکردنی بازاڕەکانی سەرمایەداری، وابکرێت دراوی نەتەوەیی قابیلی گۆڕان بێت؛ کردنەوەی پیشەسازیەکان و بازاری بورسەکان و بۆندە مولّکداریە بیانیەکان و وەبەرهێنانە بیانیە ڕاستەوخۆکان، و ئازادکردنی ئابووری تا کێبرکێی ناوخۆیی زیاتر بکرێت؛ لەناوبردنی گەندەڵی و پشتگیری و بەرتیلەکانی حکومەت تا ئەوپەڕی توانا؛ و کردنەوەی سیستەمی بانکی و پەیوەندیە تایبەتەکان و کێبڕکێ، و ڕێگەپێدا بە هاوولاتیان بۆ هەڵبژاردن لە نێوان کۆمەڵێک بژاردەی خانەنشینی و سندوقەکانی خانەنشینبوون و وەبەرهێنانە هاوبەشەکان کە لە لایەن لایەنە بیانیەکان بەڕێوەدەبرێن. کاتێک هەموو ئەم پارچەیانە پێکەوە دێنەدی، چاکەتێکی بەردی زێڕینت دەست دەکەوێت، و کاتێک وولاتەکەت بەردێکی زێڕینی لەبەر دەکات، دوو شت عادەتەن ڕوودەدەن:

ئابووریت گەشە دەکات و سیاسەتت بچووک دەبێتەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە چاکەتی بەردی زێڕین، لەسەر ئاستی ئابوری، هەمیشە زیادکردن لە گەشە و بەرزکردنەوەی ناوەندی داهات زیاتر دەکات، لە ڕێگای زیاترکردنی بازرگانی و وەبەرهێنانی بیانی و تایبەتکردن و بەکارهێنانی کاریگەرتری داهاتەکان لە ژێر فشاری کێبڕکێیە نێودەوڵەتیەکان. بەڵام لەسەر ئاستی سیاسی چاکەتی بەردی زێڕین بە ڕێژمیەک دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی بژاردە سیاسی و سیاسەتە ئابوریەکان تا ئاستێکی تەسک بەرامبەر ئەوانەی کە لە دەسەڵاتدان. حکومەتەکانیش ئینجا چ لەلایەن دیموکراسیەکان یان کۆماریەکان، یان پارێزگاران یان دیگۆلەکان یان سۆسالیستەکان، یان دیموکراتە مەسیحیەکان یان دیموکراسیە هاوبەشەکان کە زۆر لە یاسا سەرکیەکان لادەدەن، بەڕێوەبرێن ئەبینی وەبەرهێنەرەکانی پاڵ بەیەکەوە دەنێن بۆ دەرەوەی وڵات، و نرخی قازانجەکان بەرزدەبنەوە، وهەڵسەنگاندنەکانی بازارە داراییەکانی نزم دەبنەوە.

ئەو وێرانکردنی قەیرانی دارایی کە ئەورووپای گرتەوە نموونەیەکی سامناکە لەسەر توانای بازارەکانی بۆند و سەرمایەدارە جیهانییەکان بۆ سەپاندنی مەرج بەسەر حکومەتەکاندا، وە تەنانەت بۆ یارمەتیدان بۆ هێنانەخوارەوەیان لەکاتی دژایەتیکردنی چاکسازی ئابووری کە لەلایەن بازاڕەکانی دراو داوادەکرێت، هەروەک کە لە یۆنان ڕوویدا.

بەڵام، هەروەک پێشوو باسمان کرد، چینێکی نوێ لە چالاکوانە سیاسیەکان هەن کە نەبەستراونەتەوە بە پارتە سیاسیەکان و دامەزراوە سیاسیە تەقلیدیەکانی تر، ئەمانیش بوونەتە سەرچاوەی شەکەتی بۆ حکومەتەکان.  ئەم چالاکوانانە ئەمڕۆ بە "هاکتیڤیستەکان" ناسراون - زاراوەیەک کە لە ساڵی ١٩٩٦دا لەلایەن کەسێکەوە بە ناوی ئۆمێگا داهێنرا، ئەندامی گروپێک لە هاککەرەکان ئەنتەرنێتە کە خۆیان بە گرووپی مانگای مردوو ناودەبەن. هاککردنی سایبەر بۆ مەبەستی

سیاسی، کە بە "بەکارهێنانی ئامرازی ئەلکترۆنی یاسایی یان نایاسایی یان هەردووک بۆ بەدەستهێنانی مەبەستە سیاسییەکان" پێناسە دەکرێت، حکوومەتەکان ناچار دەکات کە بەشداری یاریەکی ڕاوکردنی تەکنەلۆجیای بەرز بکەن (وەک یاری مشک و پشیلە)، یاریەک کە هەوڵی هاککردن و تێپەڕاندنی تۆڕە کۆمپیتەرییەکان دەدات. هەروەها مەودایەکی فراوانی بەکارهێنانی تەکنەلۆجیاکانی زانیاری و پەیوەندیەکانە، کە پسپۆر لە زانکۆی ستانفۆر، لاری دیمۆند، بە تەکنەلۆجیاکانی ئازادکردن وەسفی دەکات. هەروەک دایمۆند لە کتێبەکەی خۆیدا بە هەمان ناونیشان ئاماژەی پێ دەکات:

چەندین ساڵ لەمەوپێش کاتێک کارم لەسەر خەباتی جیهانی بۆ دێموکراسی تەواو دەکرد، زۆربوونی بەکارهێنانی ئینتەرنێت و بلۆگ و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و مۆبایلەکان تووشی سەرسوڕمانی کردم. بۆ ئاشکراکردن و وەڵامدانەوەی پێشێلکارییەکانی ڕژێمە دەسەڵاتخوازەکان، و دابینکردنی کەناڵە جێگرەوەکان کە دەتوانرێت زانیاری و پەیوەندییەکانی تێدا هەڵقولێت لە دەرەوەی ئەو کۆت و کۆنترۆڵانەی کە ڕژێمی دیکتاتۆری سەپاندوویەتی، هەروەها بۆ تیشک خستنەسەر و چاودێریکردنی هەڵبژاردنەکان؛ و کۆکردنەوەی جەماوەری بۆ ناڕازیی دەربڕین. تا ساڵی ۲۰۰۷ - کە ئێستا وادەردەکەوێت کە دوو نەوە تێپەڕیوە پێش ئێستا لە ڕووی خێراییەوە کە ئەم تەکنەلۆجیانە گەشەیان لەگەڵ کردووە - تەکنەلۆجیاکانی زانیاری و پەیوەندیەکان بەڕاستی هەندێک سەرکەوتنی سەرسوڕهێنەری بەدەست هێناوە؛ چونکە ئەم تەکنەلۆجیا نوێیانە وای لە کۆمەڵگای مەدەنی فلیپین کرد کە شەقامەکان پڕ بکەنەوە بۆ لابردنی سەرۆکێکی گەندەڵ (جوزف سترادا) لە دەسەڵات، وە ئاسانکاریی کرد بۆ حەشدی بەکۆمەڵی خێرای شۆڕشی نارنجی لە ئۆکرانیا و شۆڕشی برنجی لوبنان دژی ستەمکاری؛ هەروەها تەزویرکردنی هەڵبژاردنی ۲۰۰۷ لە نێجیریای پشت ڕاست

کردەوە؛ و چینی ناچارکردن لەسەر ڕاگرتنی کارگەی کیمیایی لە ناوچەی شیامین، بە بڵاوکردنەوەی سەدان هەزار پەیامی تێکستی کاریگەر لەسەر سۆز دژی کارگەکە. من ئەو تەکنەلۆجیای زانیاری و پەیوەندیانەی کە ئەم هاوڵاتیانە بەکاریان هێناوە بە "تەکنەلۆجیای ئازادکردن" ناودەبەم، چونکە توانای ڕوونیان هەیە بۆ ئەوەی هاوڵاتیان بتوانن ڕووبەڕووی ڕژێمەکانی دەسەڵاتخواز ببنەوە و لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکەن و تەنانەت کۆمەڵگاکان ئازاد بکەن لە حوکمی تاکی درێژخایەن.

### میکانیزمی ناوەندی سیاسی

ئەگەر تۆ سیاسەتمەدارێکی پرۆفیشناڵ بیت بە عەقڵیەتێکی سیاسی کلاسیکەوە، دەبینیت کە کاریگەری تێکەڵی شەش دەیە لە پارچەبوونی ژیانی سیاسی نەتەوەیی کاریگەریەکی وێرانکەر بووە. "هەستی زاڵبوون" کە لەلایەن ماکس فیبەرەوە وەک ئارەزوویەکی قووڵی هەموو سیاسەتمەدارێک پێناسەکراوە، خەریکە دەهەژێت چونکە دەسەڵاتی تەواوی پشت پۆستە سیاسیەکان دەستی بە پاشەکشە کردووە.

وە ژمارەی زۆری دەوڵەت و حکومەت و دامودەزگاکان و ڕێکخراوە سیاسییەکان ڕەنگدانەوەی بۆچوون و بژاردە و کردەوەکانمانە، وە زیاتر ئێمەیان داڕشتووە؛ چونکە کۆچ و چڕکردنەوەی شارستانی تۆڕێکی نوێی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتووری و پیشەیی دروست کردووە لەو ناوچە شارستانیانەی کە هێزێکی گەشەسەندووی نوێیان هەیە. ستاندارد و نۆرمەکان جیهانیەکان پێشکەوتنێکی نوێیان بەدەست هێناوە، و ئاوات و چاوەڕوانییە تاکەکان بە توندی جولاون لەگەڵ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، و فایبەر ئۆپتیک، و سەتەلایت و مۆبایلە زیرەکەکان. وا دەردەکەوت کە ناوەندێکی سیاسی ئەو توخمانەی گرتبێت کە

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

شێوەی ئەو سیاسەتەیان هەبوو وەک ئەوەی ئێمە دەمانزانی و بەسەر فەزایەکی نوێدا بڵاویان کردبێتەوە، بە مەودایەکی فراوان. ئەمە هەندێک لە کاریگەرییە سەرەکیەکانیەتی:

### کشانەوەی ڕۆڵی نێوەندگیری لەحزبەکان

بۆ چەندین سەدەیە سیاسەت لەسەر ئەو بنەمایە کاری کردووە کە ڕێنوێنی بەرژەوەندی جەماوەری بکات (بە دەنگی هەڵبژاردن دەردەخرێت، یان لەلایەن سەرۆکەکانەوە سەپێنراوە)، و دەیانکاتە ئەنجامێکی پێکەوەیی، چونکە حکومەتە پەرلەمانییەکان گرنگیان داوە بە ئاراستەکردنی ئیدارەی جەماوەرەی لە ئاستی گەڕەکەکانەوە تا ئاستی شارەکان، لە ڕێگای هەرێمەکان و پارێزگاکان، وە لە کۆتایی بۆ دەوڵەتێکی خاوەن سەرکردایەتی. پارتە سیاسییەکانیش، یان گرووپە ڕێکخراوەکان لەناو یەک حیزبدا، لەگەڵ سەندیکاکانی بازرگانی و کۆمەڵگا مەدەنییەکان، هەموویان بەڵێنیانداوە کە نوێنەرایەتی هاوڵاتیانی ئاسایی بکەن و لەڕێگەی ئەو کەناڵانەوە ڕاوبۆچوونەکانیان بگەیەننە دەسەڵاتە باڵاکان.

حیزبەکان چیتر ئەم ڕۆڵە تەوەریە ناگێڕن، چونکە کەناڵەکان کورتتر و ڕاستەوخۆترن لەوەی جاران. هەروەک لینا هێلم فالین, جێگری سەرۆک وەزیران و وەزیری دەرەوەی پێشووی سوید, بە تێکەڵەیەک لە شەرمەزاری و خۆبەدەستەوەدان پێی ڕاگەیاندم: "خەڵک بە کێشە تاکەکەسیەکان ڕاپێچ دەکرێت کە زیاتر کاریگەری لێدەکات لە کۆی ئەو ئایدیۆلۆژیا ئەبستراکتانەی کە لەلایەن لایەنەکانەوە جێبەجێ دەکرێت". چونکە کەناڵە نوێیەکان و سەکۆکان پشتگیری جەماوەری بۆ سەرکردە سیاسییەکان ئاراستە دەکەن، یان بەرژەوەندی و لێپرسینەوە دابین دەکەن بەبێ ئەوەی پێویست بکات لایەنێکی سیاسی وەک نێوەندگیر یان بەستەرێک هەڵسوکەوت بکات. وە لە دیمەنێکی پەرتەوازەیی لە دەنگ و

پەرلەمانەکان، پارتە سیاسیەکان زاڵەکان زۆر لە سەرنج ڕاکێشانەکانیان لە دەست داوە، چونکە تێچوونەکانی چوونە ناو پارتێکی بچووک، یان تەنانەت پێکهێنانی، زۆر کەمترە لە جاران. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە پشتیوانی هەرکام لەم پارتە نوێیانە تێچووی هەڵی جێگرەوە کەمتر هەڵدەگرێت، بە واتایەکی تر ئێمە ئێستا کەمتر لە دەست دەدەین بە دەنگدانمان یان پشتگیریکردنمان بۆ لایەنێکی بچووک لە جیاتی حزبێکی گەورە، یان بە بەشداری کردنمان لە پرۆسەی سیاسیدا بە شێوازی تر. پارتە سیاسیە دامەزراوە گەورەکان ئێستاش هەر ئامرازی سەرەکیین بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵاتی حکومەت لە هەر سیستمێکی دیموکراسیدا، بەڵام شێوە نوێیەکانی ڕێکخراو و بەشدارکرنە سیاسیەکان دەستیان کردووە بە لاوازکردنی پێگەی ئەم پارتانە و زیاتر و زیاتر تێپەڕاندنیان.

## سنوردارکردنی جوڵانەوەی حکومەت

لە هەموو ئاستەکاندا لاوازبوونی هێز بووە هۆی سنوردارکردنی سەربەخۆیی هەڵسوکەوتکردن. تەنانەت لە سیستەمە سەرۆکایەتیەکانیشدا؛ چونکە زیادبوونی حالەتەکانی لێکترازانە سیاسیەکان و پارتیزانی فراکیسۆن لەوانەیە تێپەڕاندنی یاسادانان بۆ پەرلەمان زەحمەت بکات. بەڵام سنورە سەپێنراوەکانی سەر حکومەت لە دەرەوەی سیستەمی سیاسی ئاساییەوە دێت؛ چونکە لیستی ئەو یاریزانانەی کە دەتوانن هەڵە بدۆزنەوە یان پشتگیری بکشێننەوە یان چیرۆکێکی وێرانکەر بڵاوبکەنەوە کە کاری حکومەت پەکدەخات، درێژدەبێتەوە لە خاوەن بۆندەکان و چالاکوانانی نێو دەوڵەتییەکانەوە بۆ بلۆگەرەکان و ناسراوەکان. هەروەک ڕیکاردۆ لاگۆس، سەرۆکی پێشووی چیلی پێی ووتم: "هەرچەندە هێزی ڕێکخراوە ناحکومییە بەهێزەکان لە دوای ئامانجە یەکلایەنەکانیان زیاتر بێت، هێزی حکومەت و تاواناکەی لە حوکمڕانی کەمتر دەبێت. لە ڕاستیدا، زۆرێک لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

ڕێکخراوە ناحکومییەکان گروپی بەرژەوەندی تاکە کێشەن، و لە زۆربەی حکومەتەکان بەتواناترن لە ڕووی زیرەکیی سیاسی و زانیاری دەربارەی میدیا و چوستی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. زۆربوونی ئەم ڕێکخراوانە جوڵەی دەزگاکانی حکومەت سنوردار دەکات و بە شێوەیەکی بەرچاو بڕاردەکانی کەم دەکات. من خۆم تووشی ئەوە بووم، کاتێک سەرۆک بووم و لە گەشتەکانم سەیرم دەکرد کاتێک قسەم لەگەڵ سەرۆک دەوڵەتان و وەزیرەکانی دیکە دەکرد. بە گشتی، ڕێکخراوە ناحکومییەکان بەگشتی بۆ کۆمەڵگا سودمەندن، بەڵام تێڕوانینی تەسکیان و ئەو فشارانەی کە لە ژێریاندایە بۆ ئەوەی ئەنجامێک بۆ ئەندامان و سەرمایەدارانیان بەرهەم بهێنن و لەوانەیە وایان لێبکات زۆر ڕەق و بەستوو بن". لە ڕابردوودا، حکومەتەکان ئەیانتوانی بەدوای دووبارە داڕشتنەوەی دیمەنی سیاسیدا بن- چ بۆ جێبەجێکردن یان سەرکوتکردنی داواکاریەکی جەماوەری - لە ڕێگای گۆڕینی یاساکانی هەڵبژاردن، یان تێپەڕاندنی هەموارکردنەوەی دەستووری، یان سەپاندنی یاسای فریاکەوتن. تا ئێستاش دەتوانن هەوڵ بدەن ئەم ڕێوشوێنانە بگرنەبەر، بەڵام دەبێت ڕووبەڕووی لێکۆڵینەوەی زیاتر و چاودێری زیاتر ببنەوە لەلایەن ئەوانەی لە دەرەوەی ڕیڕەوی سیاسەتی تەقلیدین.

### ناساندنی پێشبڕکێیەکی لەڕادەبەدەر

لەگەڵ پەرتەوازەبوونی هێزی دەسەڵاتی سیاسی، هێڵە جیاکارەکانی نێوان پۆلەکانی یاریزانانی سیاسیدا تاریک بوون: پارتە سیاسییەکان (گەورە و بچووک، ئاسایی و توندڕەو)، لۆبیستەکان، ڕۆژنامەوانەکان و دەنگدەران؛ چونکە ئێستا لەوانەیە بەرپرسە هەڵبژێردراوەکان و ئۆفیسە حکومیەکان خۆیان بابەتە میدیاییەکانی تایبەت بەخۆیان بەرهەم بهێنن، یان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە

دەنگدەرانەوە بکەن لە ڕێگای ئەنتەرنێت. ئێستا گرووپە بەرژەوەندیە تاک کێشەکان کاندیدەکانی خۆیان پێشکەش دەکەن نەک لە دوورەوە بەشداری لە پرۆسەی سیاسیدا بکەن. وە لەگەڵ کەمبوونەوەی بەربەستەکان بۆ بەشداریکردن بۆ کەمترین ئاستی لەوەی کە پێشتر هەبوو بواری بەربەرەکانێ فراوانتر بووە، و هەر سیاسەتمەدارێکی بەرزخوار دەبێت بیر لە هاوپەیمانی بکاتەوە، و چاوەڕێی هێرشەکان بکات لە ژینگەیەکی گۆڕاو لە حیزب و چالاکوانان و سەرمایەداران و دروستکەرانی بیرورِا و ڕۆژنامەنووسانی هاونیشتمانی و چاودێرەکان و گروپەکانی فشار لە هەموو جۆرێک.

بەهێزکردنی تاکەکان

ڕەنگە دراماتیکیترین و بەرەنگاریترین کاریگەری میکانیزمی نێوەندگری سیاسی فراوانبوونی ڕۆڵی تاکی ناسیاسی و نا پیشەگەر بێت، و ئەم فراوانبوونە لەڕۆڵی تاکەکاندا تێکچوونی بەربەستی ڕێکخراوەیی و فەرهەنگی لێدەکەوێتەوە کە پیشەگەرانی سیاسی لە ئەوانی دەرەوە جیاکردۆتەوە. ئەم بەربەستانە بە کەمبوونەوەی گرنگی پارتە سیاسییە سەرەکیەکان و زۆربوونی ڕێگای ڕاستەوخۆی تێوەگلان لە گوتاری سیاسیدا کاریگەریان لەدەست داوە. ئەم پێشکەوتنە هیوای دیموکراسی ڕاستەوخۆی وەک کۆبوونەوەکانی گۆڕەپانی گشتی ئەسینیا یان کۆبوونەوەکانی پارێزگای سویسری بەرز دەکاتەوە کە بۆ سەردەمی دیجیتاڵ دەگەڕێتەوە. بەهەمان شێوە ئەم پێشکەوتنە دەبێتە هۆی تێکچوونێکی بەرچاو، نموونەی زۆر هەیە لە توانای هەر تاکێکی خراپ یان گرووپێکی دەرەکیی بەدکار بۆ تێکدان یان ئاستەنگکردنی پرۆسەی سیاسی. بۆیە فرناندۆ هێنریک کاردۆسۆ سەرۆکی بەرازیلی و جۆشکا فیشەری جێگری سەرۆک وەزیرانی ئەڵمانیا و لینا هێلم فالین جێگری سەرۆک وەزیران و وەزیری دەرەوەی سوید و ڕیکاردۆ لاگۆس سەرۆکی چیلی؛ هەموویان گلەیی و گازندەیان

لە پێگەی دەسەڵات و تایبەتمەندیە بێ پاساوەکان نەبوو. چونکە هێزی پلە بەرزەکانی حکومەتیان بەڕاستی دەستی بە تەنگەژەیی کرد، نەوەک بۆ بەرژەوەندی ڕکابەرێکی سیاسی دیاریکراودا کە بتوانن ڕووبەڕووی ببنەوە یان لێی نزیک ببنەوە، یان ڕێکخراوێکی دیاریکراو دیسانەوە بتوانن ڕووبەڕووی ببنەوە یان دایبخەن. هەروەها هۆکارەکە سەرچاوەی نەگرتووە لە کەسایەتی و پلاتفۆرمی سیاسی ئەوان کە بتوانن بە گۆڕینی پێگەی سیاسی یان بەکرێگرتنی ڕاوێژکارە نوێکان ئەمە چاک بکەنەوە ؛ ئەم هێزەیە لە پۆستەکانیان دزە دەکات، لە پۆستەکانی دەسەڵات و ئیدارە بەرزەکان کە هەمیشە ئەوپەڕی پاداشتی هەر ژیانێکی سیاسی بووە. بۆ جارێکی تر، هێز تەنیا دەستی بە گۆڕان نەکردووە، بەڵکو هەڵوەشاوەتەوە و بوو بە هەڵم لە هەندێک حەلەتدا.

میکانیزمی ناوەندی سیاسی ئاڵنگاری دەسەپێنێت بەسەر ڕژێمە دەسەڵاتخوازەکان، و دوژمنەکانیان زیاتر هەڵخەڵەتێن دەکات و پێشبڕکێکاری نوێیان بۆ بەرهەم دەهێنێت. بەڵام کاریگەریەکان ئاڵنگاری بەسەر دیموکراسیەکانیش دەسەپێنێت. چونکە سەربارەت بە زۆرێک لە پشتگیریکەران دیموکراسی ئامانج و مەبەستە، و هەڵوەشانەوەی هێزی حکومەتی ستەمکار یارمەتیدەر بووە بۆ هاندانی ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتان بۆ بە ئاراستەی ئەم ئامانجە؛ کەچی کاریگەریەکانی هەڵوەشانەوە لەم سنورە ناوەستێ؛ چونکە هۆکارە ئابوریەکان و تەنەلۆجیەکان و ڕۆشنبیریە قووڵەکان کە لە پشت ئەمەوە وەستاون دەبێتە هۆی بەهێزکردنی کۆمەڵێکی فراوان لە بیرۆکە و هەستەکان، کە هەموویان لە ناوەڕۆکیان دیموکراسی نین؛ چونکە جوداخوازی هەرێمی، و ڕقلێبوونەوە لە بیانیەکان، و هەڵمەتەکانی دژ بە کۆچکردن، و بنەما ئایینیەکان؛ هەموویان سوود لە هەڵوەشانەوەی هێز وەردەگرن. کاریگەری میکانیزمی نێوەندی سیاسی کە لە هەموو شوێنێک باو بووە خۆی لە ئاڵۆزکردنی دیمەنی سیاسی و سڕینەوەی شێواز

و نەریتە کۆنەکانە دەبینێتەوە، و بێگومان ئەم کاریگەرییە بەردەوام دەبێت.

## بەشی شەشەم

## وەزارەتەکانی بەرگری لە دژی چەتەکان: هەڵوەشانەوەی هێز

### سوپا گەورەکان

ڕێکخراوی قاعیدە نزیکەی ٥٠٠ هەزار دۆلاری خەرج کرد بۆ جێبەجێکردنی هێرشەکانی ١١ی سێبتەمبەر، لە کاتێکدا خەرجیە راستەوخۆکانی وێرانکردنەکە کە لەو رۆژە ڕوویدا لەگەڵ خەرجیەکانی وەڵامدانەوەی ئەمریکا بۆ ئەم هێرشانە گەیشتە ٣.٣ تریلیۆن دۆلار. بە واتایەکی تر، بەرامبەر هەر دۆلارێکی ئەمریکی کە ڕێکخراوی قاعیدە لە پلانەکانی بۆ ئەم هێرشانە و جێبەجێ کردنیان خەرجی کردبوو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا حەوت ملیۆنی سەرف کرد. خەرجیەکانی ١١ی سێپتەمبەر دەکاتە یەک لەسەر پێنجی قەرزە نەتەوەییەکانی ئەمریکا. لە ماوەی جەنگی لوبنان لە ساڵی ٢٠٠٦دا، حزبوالله موشەکێکی کروزی بە ووردی ئاراستەی کەشتیەکی سەربازی ئیسرائیلی کرد کە سیستەماکانی بەرگری موشەکی لەخۆگرتبوو، پێکای و خەریک بوو نقومی بکات. خەرجی کەشتیە ئیسرائیلیەکە ٢٦٠ ملیۆن دۆلار بوو؛ و نرخی موشەکەکە تەنها ٦٠ هەزار دۆلار بوو. وە لە ساڵی ٢٠١١ چەتە سۆماڵیەکان لە نێوان ٦،٦ بۆ ٦،٩ ملیار دۆلار زیانیان بە جیهان گەیاند؛ چونکە ٢٣٧ هێرشیان کرد - لە ساڵی ٢٠١٠ ژمارەی هێرشەکان ٢١٢ بوو - سەرەرای بەردەوامی نێشکگرتن لەلایەن کەشتییە فرە نەتەوەکانەوە کە هەندێک لە کەشتیە هەرە پێشکەوتووەکان لە رووی تەکنەلۆجیا لەخۆدەگرێت.

تیرۆرستان و یاخووبووەکان و چەتەکان و گەریلاکان و شەرڤانان لە پێناوی

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئازادی و تاوانبارەکان دیاردەیەکی نویێ نین. بەڵام هەرگیز لە گۆڕەپانی بواری ململانێی مرۆڤدا ڕووی نەداوە کە گروپێکی زۆر بچووک بەدەرکەوێت و توانای ئەوەی هەبێت زیانێکی زۆر گەورە بە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک بگەیەنێت بە نرخێکی زۆر کەم. بۆیە لە بواری ململانێیە چەکداریەکانیش هێزە بچووکەکان، لەگەڵ ئەوەی زۆر دەگمەنە ببەنەوە، وایان کردووە ژیان قورستر بێت بۆ هێزە گەورەکان و دامەزراوە زەبەلاحەکان و زۆر تێچووەکانی بەرگری لە جیهان.

گەشەسەندی توانای گرووپە شەڕکەرە بچووکەکان کە چوستن لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان، بە یەکێک لەو هۆکارانە دادەنرێت کە ئەزموونی هێزیان گۆری لە ڕێگای توندوتیژیەوە، لە کاتێکدا زیانێکی گەورەشیان گەیاندووە بە سوپا دێرینەکانی دوژمن. هۆکاری دووەم کەمبوونەوەی توانای دەوڵەتان، کە سوپای تەقلیدیان هەیە، و ئارەزوویان لە سوودوەرگرتنی تەواو لەو هێزە وێرانکەرە گەورەی کە لە ژێردەستیاندا هەیە. ڕوونە کە ئەمڕۆ هێزە بچووکەکان ناتوانن هاوشانی هێزی سەربازیە گەورەکان بڕۆن لە جیهان، بەلام زیاتر و زیاتر دەتوانن یاریزانە گەورە و پێشکەوتوو لە تەکنەلۆجیاکان بێ بەش بکەن لە هەر جەنگێکی ناتەبادا، ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەو گۆڕانە بنەڕەتیەیە لە چۆنیەتی کارکردنی هێز.

جۆن ئارکۆلا یەکێکە لە بیرمەندە دیارەکانی شەڕی مۆدێرن، پێی وایە جیهان چۆتە ناو "سەردەمی شەڕی هەمیشەیی نا ئاسایی"ەوە و دەڵێت: "سەرکردە گەورەکانی شەڕی تەقلیدی هیچیان نییە سەبارەت بەم جەنگە مۆدێرنانە، وە هیچ بنەمایەکی جەنگی تەقلیدی ناتوانێت یارمەتیەکی زۆر فەراهەم بکات لەم بارەیەوە، بەتایبەتی بیرۆکەی قەبارە، کە بەرەوام بوو لە مانەوە تاوەکو ئێستا لە شێوەی بیروباوەڕی کۆلن پاول کە خۆی لە هێزێکی سەربازی یەکلاکەرەوە دەنوێنێت" و چەمکی تریش وەک " شۆک و تیرۆر ". "ئەم بیروبۆچوونانە لە ڕۆژانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

جەنگی ڤێتنامەوە پەکیدەکەوێت و تێکدەشکێت، و ئەمڕۆ ئاشکرایە کە هەوڵەکان بۆ نوێکردنەوەیان بۆ ئەوەی دژی تۆڕە یاخیبووەکان و تۆڕە تیرۆریستییەکان بەکار بهێنرێت ئەوە دەسەلمێنن کە پرۆسەیەکی ئاڵۆز و پڕ کێشەن".

وە کاتێک شتەکە پەیوەندی بە نیشاندانی هێزو بەکارهێنانی هەیە؛ ئەوا سوپا سەربازیەکان تاکە ڕێگای سەرەکی دەنوێنن. وە لە کاتێکدا سیاسەت هەوڵی باوەڕپێکردن دەدات؛ بەڵام جەنگ یان هەڕەشەکردن بە جەنگ ئاماژەیە بۆ ناچارکردن. هێزی سەربازی، کە بە قەبارە و کەرەستە و کەلوپەلە تەکنیکییەکانی سوپا دەپێورێت، خۆبەدەرخستنێکی درەوشاوە بۆ بیرۆکە ئاڵۆزەکانی دەسەڵات دەدۆزێتەوە، چونکە هێزی چەکداری ئەو ڕاستییە ڕاشکاوانەیە کە ماوەتەوە ئەگەر پاڵاوتەی دیپلۆماسی و کاریگەری کلتور و دەسەڵات " هێزی نەرم "ی لێ دەربکەین. کاتێک مرۆڤ لە گوماندا دەبێت؛ ئەوا هاوسەنگی هێز بە شێوەیەکی تەقلیدی بۆ ئاراستەی جبەخانەی سەربازی تەواوکراو دەڕوات، بەپێی باوەڕە جێگیرەکان. وەک ڕۆژنامەنووس دیمۆن ڕانیۆن (لە چوارچێوەیەکی تردا) گوتی: "پێشبڕکێکە هەمیشە لە بەرژەوەندی خێرادا نییە، و نە شەڕەکەش لە بەرژەوەندی بەهێزەکاندایە، بەڵام ئەمە ئەو ڕێگایەیە کە پارە زیرەکەکان گرەوی لەسەر دەکات". یان وەک جۆزێف ستالین سەرسام بوو کاتێک داوای یارمەتی کاسۆلیکەکانی لێکرا لە ڕووسیا بۆ ئەوەی سۆزی پاپا بباتەوە، گوتی: " پاپا؟ چەند یەکەی سەربازی هەیە؟" کاتێک پاپا پیوس ١٢ پرسیاری ستالینی بیست، بە شێوەیەکی توند وەڵامی دایەوە و ووتی: " بە جۆزێفی کوڕیم بڵێن کە لە بەهەشتدا لەگەڵ تیمە سەربازییەکانم کۆدەبێتەوە".

سەرەڕای تێپەڕبوونی نزیکەی حەوت دەیە لە جەنگی جیهانی دووەم و دوو دەیە لە پێشبڕکێی خۆپڕچەککردن کە دەستی کێشابوو بەسەر جەنگی سارددا، پلاندارێژەرانی سوپا هێشتا بەردەوامن لە گرەوکردن لەسەر بیرباوەڕی هێزی

ئاگرینی باڵادەست، وە بەردەوام وادائەنێن کە سوپایەکی گەورە و پێشکەوتوو لە ڕووی تەکنەلۆجیا گرنگە بۆ سەقامگیری ئاسایش و هێز.

بەڵگە دیارەکەش لەسەرە ئەمە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە؛ لە ساڵی ٢٠١٢ بودجەی بەرگری ٧٠٠ ملیار دۆلاری تێپەڕاند، ئەم بڕە پارەیەش نزیکەی نیوەی خەرجی سەربازی جیهانیە. وە خەرجییە پەیوەندیدارەکان بۆ ئاژانسەکانی تری ئەمریکا خەرجی تەواویان بەرزکردەوە بۆ ١ تریلیۆن دۆلار. بەڵام گەورەترین ڕکابەرە سەربازیەکانی ئەمریکا - کە چین و ڕووسیایە - خەرجیەکانیان ٨% و ٥% ی خەرجی سەربازی جیهانیان تێپەڕ نەکرد، لەگەڵ ئەوەی کە خەرجیەکانیان زۆر بە خێرایی زیاد دەکات ( بە تایبەت چین). وەک ڕێژەیەک لە تێکڕای بەرهەمی ناوەخۆ، تەنیا ٢٥ وڵات هەیە کە زۆربەیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن کە خەرجیەکی زیاتریان بۆ سوپاکانیان تەرخان کردووە. تەنانەت لەگەڵ کەمکردنەوەی خەرجی بەرگری کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پلانی بۆ جێبەجێکردنی دانا لە دەیەی داهاتوو، بەلام خەرجیەکان زۆر گەورە دەبن. تا ساڵی ٢٠١٧، کاتێک پلانەکانی کەمکردنەوەکان بە تەواوی جێبەجێ دەکرێت، بودجەی بەرگری ئەمریکی هەر بە شەش ئەوەندەی خەرجیەکانی چین دەمێنێتەوە، وە گەورەتر لە خەرجیەکانی هەر ١٠ وڵاتی داهاتوو لە ڕیزبەندی بەیەکەوە. وە لە ژێر سایەی ئەم بودجە تۆزەک کەمە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ١١ کەشتی هەڵگری فڕۆکە بڵاودەکاتەوە و پارێزگاری دەکات لە سێیانە ناوکیەکەی ( هاوێژەری موشەکە ماوە دوورەکان، و موشەکە بلیستیە کیشوەریەکان، و ژێر دەریا موشەک هەڵگرەکان).

هەر کاتێک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چوویێتە جەنگێکی تەقلیدیەوە لە ماوەی دوو دەیەی رابردوو، هێزەکانی بە ئاسانی سەردەکەوتن.

## کۆتایی سەردەمی هێز

هەرچەندە ئەم جەنگە تەقلیدیانە کەم بوون؛ تەنها جەنگی کەنداوی یەکەم لە ساڵی ۱۹۹۱، وە دەتوانین بڵێین جەنگی کەنداوی دووەمیش، لەگەڵ ئەوەی کە سوپای عێراقی بە نزیکەیی شەری نەکرد. وە لە ساڵی ۲۰۰۸، وەزیری بەرگری ئەمریکا، رۆبرت گیتس، باسی ئەوەی کرد کە لە نێوان هەموو پرۆسە زۆرەکانی بڵاوکردنەوەی سوپای ئەمریکی لە ماوەی زیاتر لە چوار دەیە، جەنگی کەنداوی یەکەم تەنها جەنگ تەقلیدی بوو بە جۆرێک لە جۆرەکان. هەرچی جەنگەکانی ترە، لە گرینادا و لوبنانەوە بۆ سۆماڵ و کۆسۆفۆ و عێراق و ئەفغانستان، زیاتر بەرەنگاری یاخیبوون یان تیرۆریست یان دەست تێوەردانی سیاسی یان مرۆیی لەخۆ گرتبوو لەوەی کە شەرێکی درێژخایەن بێت لە نێوان سوپا پابەندەکانی ژێر رێساکانی پێشرەوی کردن و کۆنترۆڵکردن. وە ئەم رەوتەش بەسەر هەموو جیهان جێبەجێ دەکرێت. لە ماوەی پەنجاکانی سەدەی بیستەم، لە رێژەیەکی مامناوەند لە هەموو ساڵێک شەش جەنگی نێودەوڵەتی هەڵدەگیرسا، بەراورد بە کەمتر لە جەنگێک بە رێژەیەکی مامناوەند لە هەموو ساڵێک لە ماوەی دەیەی یەکەم لەم سەدەیە. وە لە ماوەی شەست ساڵی رابردوو هیچ جەنگێک لە نێوان هێزە گەورەکان رووی نەداوە.

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە چیتر جەنگەکان چیتر هەڵناگیرسێن، چونکە لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەی ململانێیە چەکداریەکان لە سەرانسەری جیهان کەمتر بووە بە رێژەی ٤٠% لە نێوان ساڵانی ۱۹۹۲ و ۲۰۰۳ ( ئەمە تەنیا جەنگەکانی نێوان وڵاتان ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو جەنگانەش کە دەوڵەتەکان دژی گروپەکان بەرپای دەکەن کە ناچنە ژێر باڵیان)، بەڵام لەو کاتەوە زیاتر بووە. دوای دابەزینی لە ساڵی ۲۰۰۳وە، ناکۆکی چەکداری نێوان لایەنە نادەوڵەتەکان - کە لە لایەن رەشنووسی راپۆرتی ناسایشی مرۆڤەوە پێناسە کراوە بە "بەکارهێنانی هێزی چەکداری لە نێوان دوو گروپی رێکخراودا، کە هیچیان حکومەتی دەوڵەت نین- لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

ساڵی ۲۰۰۸دا بە شێوەیەکی توند زیادی کردووە.

ئەمڕۆ جەنگ فۆرمی جۆراوجۆری گرتووەتە بەر کە دامەزراوە سەربازییە تەقلیدییەکان تێدەکۆشن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا. ئەم نموونە خێرایانە لە ڕووداوەکانی دەیەی ڕابردوو وەربگرە:

- جۆس گورای، ئەفغانستان، تشرینی یەکەمی ۲۰۱۱: سەربازێکی دەریایی ئەمریکا لە کاتی ئێشکگرتن بۆمبێکی چێنراو دەدۆزێتەوە لە نزیک گردێک بە ناوی گردی ناشیرین نێژراوە.

لەو کاتەی کاری لەسەر پوچەڵکردنەوەی دەکرد بۆمبێکی تری بینی، لەو کاتە جوڵەی کردو پێی خستە سەر بۆمبی سێیەم و لاقی ڕاستی وورد کرد، بۆ ئەوەی ببێتە یەکێک لەو ۲٤۰ سەربازەی کە یەکێک لە ئەندامەکانیان لە دەست داوە لە ساڵی ۲۰۱۱. ئەو بە بەخت بوو، چونکە ۲۵۰ سەرباز لە هێزەکانی هاوپەیمانی گیانیان لەدەستدا بەهۆی بۆمبە چێنراوەکان لە هەمان ساڵدا.

- مۆمبای، هیند، ۲٦-۲۹ی تشرینی دووەمی ساڵی ۲۰۰۸؛ ۱۰ چەکداری پاکستانی بە ڕێگەی دەریا دەگەن، دوای فڕاندنی کەشتیەکی ماسیگری هیندی، بۆ ئەوەی هێرشە تیرۆریستیەکان لە سەرانسەری شار ئەنجام بدەن کە کوشتنی ۱٦۸ کەس و بریندار بوونی ۳۰۰ی تری لێکەوتەوە پێش ئەوەی بکوژرێن یان دەستگیر بکرێن.

- مۆنتێری، مەکسیکۆ، ۲۵ی ئابی ۲۰۱۱: چەکدارانی لۆس زێتاس، توندوتیژترین چەتەی دەرمانە سڕکەرەکان لە مەکسیک، هێرش دەکەنە سەر کاسینۆ و تەقە لە کڕیارەکانی دەکەن و پاشان دەیسووتێنن. زیاترلە ۵۰ کەس کوژران لەم کوشتارگەیە.

- باکوری ڕۆژهەڵاتی دوورگەی سوقترە، یەمەن، ۷ی شوباتی ۲۰۱۲: چەتەکانی سۆماڵیا هێرش دەکەنە سەر تانکەرێکی یۆنانی کە ئاڵای لیبیریای

هەڵکردبوو، دەستی بەسەردا دەگرن، و دەیبەن بۆ کەناری سۆماڵی، ئەمە یەکێک لە ٣٧ هێرشەکان بوو، و کەشتیی ژمارە یازدە بوو کە بە بارمتە گیراوە.

بە تەواوی تاقەکەی، لە سەرەتای ساڵەوە.

- واشنتن، دی سی، ئایاری ٢٠١٠: ژووری بازرگانی ئەمریکا ئەوە ئاشکرا دەکات کە هاککەرانی چینی توانیویانە لە ماوەی ساڵی ڕابردوودا دەستیان بگات بە تۆڕە کۆمپیتەرییەکەی، و دزینی زانیاری ئەندامانی ژوورەکە و تۆماری ئیمەیلی هەندێک لە ئەندامان، هەروەها کۆنترۆڵکردنی ئامێرەکانی ڕێکخستنی پلەی گەرمی لە بیناکە. ئەمە تەنیا یەکێک لە سەدان هێرشی سایبەرە بۆ سەر حکومەتی ئەمەریکا و سوپا و کۆمپانیاکانی ئەمریکا، و لەلایەن هاککەرەکانی چین و شوێنەکانی ترەوە ئەنجام دراوە کە زۆربەیان پەیوەندیان بە حکومەتەوە هەیە.

وەک ئەو نمونانە دەری دەخەن کە ئاڵنگاری هێزە سەربازییە ئاساییەکان، وەک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تەنیا کۆمەڵێک دوژمن نییە، بەڵکو گۆڕانێکە لە خودی سروشتی جەنگدا. وە ئەم گۆڕانە زۆربەی سەرچاوەی گرتووە لە لایەنی تاریکی شۆڕشەکانی زۆربوون و جوڵانەوە و عەقلییەتەکان. بۆمبە چێنراوەکان، کە بۆتە چەکێکی پەسەند لە ئەفغانستان و عێراق و سوریا و زۆربەی ناوچە ناکۆکەکانی تر، تەنیا پشت بە بلۆتۆنیۆم و تێکەڵە کانزاییە ئاڵۆزەکان نیە، بەڵکو بە پێکهاتەکانی ماڵ یان کشتوکاڵی و کاڵا بەکاربەرکانیش دەبەستێت کە ڕێکدەخرێن و کۆدەکرێنەوەو دەگۆڕدرێن بۆ بۆمبەکان لەلایەن کەسانێک دیزاین کراوە کە سودیان لە بڵاوبوونەوەی پەروەردە وەرگرتووە؛ هەموو ئەمەش لە بەرهەمەکانی شۆڕشی زۆربوونە. وەک چەتەکان ئەوانەی بەلەمی فایبەرگلاس و تفەنگی کلاشینکۆفی هەرزان و نارنجۆکیان بەکار هێنا بۆ فڕاندنی کەشتییە فرە ملیۆن دۆلارییە گەورەکان، ئەو تیرۆریستانەی کە هێرشیان کردە سەر مومبای

سوودیان لە فراوانی چەک و تەکنۆلۆژیای پەیوەندیەکان وەرگرت: بەرهەمی شۆڕشی زۆربوون و جوڵانەوە، کە بریتی بوون لە ئامێرەکانی جی پی ئێس کە یارمەتیان دەدان لە ڕێگەی ئاوەکانی هند، هەروەها تەلەفۆنی سەتەلایت و مۆبایلەکان و تەلەفۆنی بلاک بێری، کە لە ماوەی هێرشەکانیان پشتیان پێ دەبەست بۆ پەیوەندی کردن بە یەکتر و چاودێریکردنی پۆلیس و ناردنی نامەکان کە وەسفی کارە قێزەوەنەکانیانی دەکرد بۆ جیهانی دەرەوە. وە بە هۆی ئاسانی لە گەشت و پەیوەندیکردن لەوانەیە تەنانەت یەک تیرۆریست گورزێکی کاریگەر بەرز ئاراستەی ئامانجێکی دوور بکات کە پێشتر هێرش کردنەسەری پێویستی بە موشەک یان بۆمبهاوێژەکان بوو؛ " پێڵاوی بۆمبرێژ" ی ڕیچارد ڕید و " بۆمبرێژی بۆمبی جلی ناوەوە " ی عومەر عەبدولموتەلەب بێنە بەر چاو، کە هەریەکەیان خەریک بوو سەرکەوتوو بن فڕۆکەیەک بکەنە خوارەوە. بە بەرزبوونەوەی ئاستی ئاواتەکان و خولیاکان کە زۆرجار بە توندی نزم دەبێتەوە، یان بە ئاسانی دەشێوێنرێت، یارمەتی شۆڕشی عەقلییەتی داوە کۆمەڵێک دەمارگیری ناڕازی و تاوانبار و شۆڕشگێری شاراوە دابمەزرێنێت. وە لەوانەیە بە هەمان بڕ لە گرینگی ئەو وانەیەی لە هێرشێکی تاک کەسی یان کۆمەڵێکی بچووکی لە شەڕکەرە پابەندەکان دەتوانێت کە زیانێکی گەورە بە دەوڵەتێکی گەورە بگەیەنێت گەیشتبێتە مێشکی ملیۆنەها کەس، وە لە بیرەوەریان لای نابەن.

ئەم توانا نوێیانە پێویستی بە پلەبەندی و هەماهەنگی نییە کە لەلایەن هێزە گەورەکانی جیهانەوە شانازی پێوە دەکرێت.` لەگەڵ ڕووخانی بەربەستەکان بەرامبەر تێکەڵبوون بە ململانێیەکان، ئەوا ئەو سودانەی کە لە پێشوو هێزی سوپا گەورەکانی پێک هێنا، و گەرەنتی توانای پێدا لە بەرەنگاربوونەوەی هێرشەکان، هەندێکیان گرینگیان لە دەستدا؛

چونکە دوای پێداچوونەوەی سەرەتایی لە پرۆسەی " شۆک و تیرۆر "

## کۆتایی سەردەمی هێز

دەرکەوت کە جەنگی ئەفغانستان و عێراق ئەو جۆرە جەنگانە نەبوو کە بە تۆپبارانی فراوان و هێرشی تانکەکان و شەڕی فڕۆکە جەنگی بەرپاکرابێت، ئەمە جگە لە بەرپاکردنی بە لۆژیکی دۆکترینی ناووکی و زیادبوونە لەبەرچاوگیراوەکەی. هاوکات هێزەکانی ناتۆش دەبوایە فێربن چۆن لەکەشێکی میدیایی جیاوازدا شەڕ بکەن، ژینگەیەک کە ڕکابەرەکانیان لەڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەوە بەئاسانتر پەیامی خۆیان بڵاویکەنەوە کە تێیدا ڕۆژنامەنووسان و بلۆگران و چالاکوانان سەرجەم قوربانیەکانی هێزەکانی هاوپەیمانان و زیانە لاوەکیە قێزەوەنەکان تۆماردەکەن بۆ ئەوەی پیشانی ئەو جەماوەری بدەن کە چاودێری ڕووداوەکان دەکەن.

گۆڕانی سروشتی جەنگ بووە هۆی بیرکردنەوەیەکی قووڵی وەزارەتەکانی بەرگری و کۆلێژە سەربازییەکان، و هەوڵدان بۆ هەموارکردنەوەی پێکهاتەی ڕێکخراوەیی و مەزهەبی سەربازی. لە هەر یەک لە ڕاپۆرتی پێداچوونەوەی بەرگری چوارگۆشەیی ساڵی ٢٠١٠ کە دۆکیومێنتی سەرەکی ڕێنمونی بۆ ڕێباز و خەرجی سەربازی سوپای ئەمریکا دەنوێنێت، کە هەر چوار ساڵ جارێک دەردەچێت، و ئاراستەی ستراتیجی بەرگری کە لە کانوونی دووەمی ٢٠١٢ دەرچووە، جەخت کراوە لەسەر گرینگی گەورەبوونی شەڕی بچووک و ناتەبا لەگەڵ گروپێک لە دژبەران، بە دانانی بەڵگەنامەی دووەم "دژە تیرۆر و شەڕی نا ڕێک" لە سەرەوەی لیستی ئەرکە سەرەکیەکانی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکا.

پلاندارێژە سەربازییەکانی ئەمریکا نیگەرانن لەوەی کە چەکە پێشکەوتوو و زۆر ووردەکان، کە دەتوانن فڕۆکەکان بخەنە خوارەوە، یان کەشتیەکان نقوم بکەن، یان ئۆتۆمبیلێکی جولاو بکەنە ئامانج لەسەر ڕێگای گشتی، بە شێوەیەکی زۆر بەردەست بووە نەک تەنها بۆ پێشبڕکێکارەکانی، وەک چین یان ناحەزانی وەک کۆریای باکوور، بەڵکو بۆ لایەنە کاریگەرەکانی جگە لە دەوڵەتەکانیش.

تۆماس مانکین - جێگری یاریدەدەری سکرتێری پێشووی بەرگری بۆ پلاندانانی سیاسەت و پرۆفیسۆر لە کۆلێژی جەنگی دەریایی - هۆشداری دا کە "ناحەزان دەستیان کردووە لە بەدەستهێنانی چەکی ئاراستەکراوی ورد، هەروەها توانایەکی پشتگیری پێویستی گرنگ بۆ هەڵگیرساندنی جەنگێک کە ئەم چەکە ئاراستە ووردانە بە کەمترین خەرجی تێیدا بەکار دێت". تەکنەلۆجیای فڕۆکەی بێفڕۆکەوان بە فراوانی گرینگی پێدراوە و بڵاو کراوەتەوە، ئەو شتەی

کە هەڵەکان بەرامبەر هەر کەسێکی ئامادەکراو زیاد دەکات بۆ خەرجکردنی هەندێک هەزار لە دۆلار بۆ ئەوەی ئاژاوە و زیانەکان دروست بکات بە خەرجیەکی زۆریشی تێناچێت.

سەرکەوتنی گەورەی هێزە سەربازیە بچووکەکان

ڤۆڵتێر لە سەدەی هەژدەهەمدا نووسیویەتی:" ئەمیر دەیویست شەڕێک بەرپابکات، و بەهۆی ئەو باوەڕەی کە خودا لەگەڵ کەتیبە سەربازییە گەورەکان وەستاوە، ژمارەی سەربازەکانی دوو هێندە کرد". بەڵام بەدرێژایی مێژوو نموونەی وا هەبووە کە هێزەچەکدارە بچووکەکان توانیویانە هێزە سەربازیە زەبەلاحەکان ماندوو بکەن و پەکیان بخەن، و هەندێک بەزاندوویانن.

باشتری نموونەش لە مێژووی کۆندس شەڕی ترموبیلایە کە لە ساڵی ٤٨٠ پێش زاین ڕوویدا؛ هێزە یۆنانیەکان سوودیان لە زەویە بەرز و پێچاوپێچ و ناتەواوەکان وەرگرت، و توانیان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هەڵکشانی سوپای فەرسەکان بوەستێنن، لەگەڵ ئەوەی کە هێزیان زۆر زیاتر بوو، و زیانێکی زۆریشیان پێگەیاندن پێش ئەوەی لە کۆتاییدا لە وەستانێکی پاڵەوانانەی کۆتایی ببەزێنرێن. یۆنانیەکان شەڕی ترمۆبیلایان دۆڕاند، بەڵام هێزی فارسیەکانیان لاواز کرد و لە کۆتایی دا بەرەنگاری داگیرکردنەکە بوونەوە. مێژوو، لە دەیڤدەوە لە سەردەمی کۆنەوە بۆ ڤیت

## کۆتایی سەردەمی هێز

کۆنگ لە جەنگی ڤێتنام، پڕە لە نمونەکانی سوپای بچووکتر و کەمتر ئامادەکراو کە خۆڕاگر بووە لە بەرپەرچدانەوەی سوپا گەورە و دوژمنکارەکان، ئەگەر شکستی سەربازی پێ نەهێنابێت.

وە لە پێشەنگی قسەکەران لەسەر ئەم جۆر جەنگە تشی گیڤارا و ماو تسی تونگە، کە تاکتیکەکانی یارمەتیدەر بوون لە جەنگی گەریلاکان لە شەڕی ناوخۆی چین بۆ ئەوەی چین بخەنە ژێر دەسەلاتی کۆمۆنیستەکان. ماو شەڕی گەریلاکان و جەنگی تەقلیدی لێک جیاکردەوە، کاتێک کە بینی پێداویستیەکانیان پێچەوانەی یەکترە لە ڕووی قەبارە و هەماهەنگیەوە. ماو نوسیویەتی: "لە شەڕی گەریلادا یەکە بچووکەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ کار دەکەن و ڕۆڵی سەرەکی دەبینن و نابێت دەستوەردانێکی زۆر لە ڕادەبەدەر لە چالاکییەکانیاندا بکرێت". لە بەرامبەردا، لە شەڕی ئاساییدا، "فەرماندەی ناوەند پێک دەهێنرێت و پێویستە هەموو یەکەکان و هەموو چەکە پشتیوانەکان لە هەموو ناوچەکان لە بەرزترین ئاستدا لەگەڵ یەکتر ڕێکبخرێت". لە شەڕی گەریلادا، ئەم جۆرە فەرمان و کۆنترۆڵە نەک هەر نەخوازراو نەبوو، بەڵکو ئەستەمە جێبەجێ بکرێت.

لەو زمانە سەربازییەی ئێستا شەڕی گەریلا بە شەڕی نا ئاسایی و ناتەندروست ناودەبرێت، ئەوان نا ڕێکن، چونکە لەلایەن دوژمنێکەوە بەرپا دەکرێت کە هێزێکی سەربازی ئاسایی نییە، هەرچەندە چەکدارە، و هەروەها ناتەبایە، چونکە ڕکابەرەکان لە ڕووی هێزی سەربازی یەکسان نین لە ڕووی چەک و ژمارە. ئەمڕۆش جەنگە ناڕێک و نایەکسانەکان بنەمای پەیڕەوکردنن. لە ئەفغانستان، بۆ نموونە، ٤٣٠ هەزار سەربازی ئەفغانی و هێزەکانی هاوپەیمانی نەیانتوانی هێزی تالیبان بندەست بکەن لە کاتێکدا ژمارەیان تەنیا ١٠% ژمارەی ئەوان بوو. لە عێراق لە لوتکەی زیادبوونی ئەو سەربازانە لە ساڵی ٢٠٠٧دا،

## کۆتایی سەردەمی هێز

زیاتر لە ١٨٠ هەزار سەربازی هاوپەیمانان و نزیکەی ١٠٠ هەزار هێزی ئاسایشی عێراق لە دژی تەنیا ٢٠ هەزار چەکدار شەڕیان دەکرد.

ڕوسیا ئەزموونێکی هاوشێوەی هەبوو لە چیچاندا، لە ساڵانی ١٩٩٩ و ٢٠٠٠دا، لە شەڕی بەناو دووەمی چیچان، نزیکەی ٢٢٠٠٠ یاخیبوو کە بۆ سەربەخۆیی دەجەنگان توانیان پێشڕەوی زیاتر لە ٨٠٠٠٠ سەربازی رووسی چەکدار بوەستێنن. لە کۆتاییدا سوپای ڕووسیا سەرکەوت و دەستی بەسەر ئەو ناوچەیەدا گرتەوە، بەڵام نەوەک پێش هەڵمەتێکی دڕندانە کە دەیان هەزار هاووڵاتی کوژران و زیاتر لە ٥٠٠٠ سەربازی ڕووسی کوژران.

لە سەرتاسەری ئەفریقیا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، دەتوانیت دەیان بزوتنەوەی یاخیبوونی نوێ بدۆزیتەوە کە بۆ ماوەیەکی زۆر چالاک بوونە، لە سوپای خودا لە ئوگاندا تا بەرەی ئازادی ئیسلامی مۆرۆ لە فلیپین. ململانێ سەربازییەکان پەیوەندی بە بەرگریکردنی ناوچەیەکی دیاریکراوەوە نییە، بەڵکو ئامانجە ئایدۆلۆژی و تاوانکاری و ئایینی و ئابووریەکان ئەیانجوڵێننەوە کە ڕەنگە سنووری جوگرافیان نەبێت، وە بە ڕوونی لە حالەتی زیادبووندایە. ناکۆکییە سەربازییەکانی ساڵانی پەنجاکان تەنیا ژمارەیەکی کەمی ململانێ لە نێوان دەوڵەتەکان و گروپە چەکدارییەکانی دەوڵەتانی تر بوو. لە بەرامبەردا، ناکۆکی لەگەڵ گروپە چەکدارەکان زۆرینەی کەیسەکان پێک دێنێت لە ساڵانی نۆوەدەکان، لە ساڵی ٢٠١١دا، ولیام لەین، جێگری وەزیری بەرگری ئەمریکا ڕوونی کردەوە کە جەنگەکە لە "پێکدادانی چڕ بەڵام کورتخایەن" گۆڕاوە بۆ "پێکدادانی درێژ خایەنتر" .

هێزە سەربازیە بچووکەکان بە شێوەیەکی زیاتر جێگیر سەرکەوتنیان سەلماندووە، بەلایەنی کەمەوە لە ڕووی گەیشتن بە ئامانجی سیاسی خۆیان، لەکاتێکدا لە ڕووی سەربازییەوە خۆڕاگر دەمێننەوە. توێژەر لە زانکۆی هارڤارد

## کۆتایی سەردەمی هێز

نیڤان ئاریگۆن - توفت ، هەڵسا بە شیکرنەوەی ١٩٧ جەنگ لە جەنگە نایەکسانەکان کە لە ساڵانی ١٨٠٠ تا ١٩٩٨ کە لە هەموو جیهاندا ڕوویان داوە. ئەو جەنگە ناتەبا بوو، بەو مانایەی کە لە سەرەتاوە بە پێی پێوەرە تەقلیدیان لە نێوان نەیارەکاندا بۆشایی هەبوو، واتە بە پێی قەبارەی سوپاکان و قەبارەی دانیشتوان. ئاریگۆن تۆفت ئەوەی بۆ دەرکەوت کە لایەنی "لاواز" لە ڕاستیدا براوەی جەنگەکە بووە لە نزیکەی ٣٠٪ ی ئەم حاڵەتانە. ئەو ڕاستییە لە خۆیدا زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، بەڵام سەرسوڕهێنەرتر ئەو ڕەوتە بوو کە سەری هەڵدا بە تێپەڕبوونی کات. چونکە لە ماوەی دوو سەدەی ڕابردوودا زۆربوونێکی جێگیر لە سەرکەوتنەکانی ڕکابەری بە گریمان "لاواز"دا هەیە. لاوازەکان تەنیا لە ١١.٨% جەنگەکانیان براوە بوونە

لە نێوان ساڵانی ١٨٠٠ و ١٨٤٩، بەراورد بە ڕێژەی ٥٥% لە جەنگەکانیان لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠ و ١٩٩٨. ئەمەش بەو مانایە دێت کە یەکێک لە بناغە بنەڕەتییەکانی جەنگ سەراوسەر هەڵگەڕاوە، چونکە لە ڕابردوودا هێزی ئاگرینی باڵا لە سەرەتا و لە کۆتا سەردەکەوت، و ئێستا چیتر ئەمە ڕاست نییە.

بەشێکی لەبەر ئەوەیە کە ئەو ڕاستیەی پەنابردنی لایەنە بەهێزەکە بۆ بەربەریزم لە جیهانی ئەمڕۆدا - وەک بۆمبارانکردنی هەڕەمەکی دانیشتوانی مەدەنی لە جەنگی جیهانی دووەمدا، یان بەکارهێنانی ئەشکەنجە لەلایەن فەرەنسیەکان لە جەزائیر، یان تیرۆرە ئامانجدارەکانی ڤیت کۆنگ لە ژێر بەرنامەی فۆنیکس لە ڤێتنام - چیتر جێگای قبولکردن نیە لە لایەنی سیاسیدا. وە هەروەک ئاریگۆن - تۆفت ئەیبینێت؛ هەندێک لە شێوازەکانی بەربەریزم - وەک بەرنامە مشتومڕلەسەری فینیکس -

دەکرێت لە ڕووی سەربازیەوە کاریگەر بێت ب شێوەیەکی ڕێژەیی دژی هێرشە ناڕاستەوخۆکان کە دەکەوێتە مەودای ئیستراتیجی جەنگی گەریلاکان. بەڵام

## کۆتایی سەردەمی هێز

لەگەڵ نەبوونی هەر هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە بۆ سەر هەر دەوڵەتێکی بەهێز، بە تایبەتی کاتێک ئەم دەوڵەتە دیموکراسییە دەکرێت سیاسەتی سەربازی بخرێتە ژێر باری ووردبینیەکی جەماوەری توند، ناکرێت سیاسەتێکی لەم جۆرە قابیلی جێبەجێکردن بێت لە ڕووی سیاسیەوە. وەک ژەنراڵی خانەنشینکراو، وێسلی کلارکی، کە یەکێکە لە شەڕکەرە کۆنەکان لە ڤێتنام و فەرماندەی پێشووی ناتۆ پێی وتم: "ئەمڕۆ، فەرماندەیەکی یەکەیەکی سەربازی دەتوانێت ڕاستەوخۆ کۆنترۆڵی هەلیکۆپتەرەکانی هێرشکردن بکات لە دووری ٣٠ بۆ ٤٠ میل پێش دەستپێکردنی جەنگ، و چێژ لەوە وەرگرێت کە ناونراوە " زاڵبوون بە سەر هەموو بوارەکان " [ کۆنترۆڵکردنی ئاسمان و ووشکانی و دەریا و بۆشایی ئاسمان و بۆشایی سیبرانی]. بەڵام هەندێک شتێک هەیە ئێمە لە ڤێتنام ئەنجاممان دەدا ئەمڕۆ ناتوانین بیکەین. تەکنەلۆجیای زیاترمان لەبەر دەستە بەلام بژاردە یاساییەکانمان تەنگتر بووە. سەرکەوتنە تاکتیکیە بەربەریەکان کە ڕووسیای ستەمکار بەکاری هێنا لە شیشان یان ئەو سەرکوتکردنە دڕندانەی کە لە لایەن سریلانکاوە ئەنجام درا دژی پڵنگەکانی تامێل بە نموونەی خوێناوی دادەنرێت بەوەی کە هێزی ئاگرینی باڵا پێویستیەتی بۆ ئەوەی بەسەر ڕکابەرە کەلەڕەقەکەی سەرکەوێت ئەگەر لاواز بوو لەلایەنی سەربازیەوە. |

گرینگی فاکتەرە سیاسیەکان لە دیاریکردنی ئەنجامی ململانێیە سەربازیە ناتەبایەکان یارمەتی شیکردنەوەی بەردەوامی لایەنە کاریگەرە بچووکەکان دەدات - تیرۆرستان. ئێمە هەنگاوێکی درێژمان بڕی لەوەتەی دەستپێکردنی ڕەگەکانی تیرۆر لە دەوڵەت لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی شۆڕشگێڕی فەرەنسی لە ماوەی " سەردەمی تیرۆر " کە لە ئەیلولی ١٧٩٣ تا تەمووزی ١٧٩٤ بەردەوام بوو. هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ٥٠ گروپی وەک ڕێکخراوی تیرۆریستی بیانی دیاریکردووە، بەڵام ژمارەی گروپە چالاکەکان بەئاسانی دوو

نموندە ئەو ژمارەیەن، کە هەندێکیان دەیان ئەندامیان هەیە کە هەندێکیشیان هەزاران کەسن. سەرەڕای ئەوەش توانای هەر تاکێک یان گرووپێکی بچووک بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی مێژوو لە ڕێگەی هەر کردەوەیەکی توندوتیژیەوە دیار بوو، تەنانەت پێش ئەوەی کەڤریلۆ پرینسیپی، ناسیۆنالیستی بۆسنی-سێربی، جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرسێنێ بە تیرۆرکردنی ئارچدۆک فێردیناند لە سارایڤۆ.

ئەوەی تیرۆریزمی مۆدێرن جیادەکاتەوە وەک بەرجەستەکرو لەهێرشەکانی ٩\١١ و ئۆپەراسیۆنەکانی تری قاعیدە لە لەندەن و مەدرید و بالی، و هێرشەکانی چیچان بۆ سەر مۆسکۆ و هێرشی کۆمەڵی سەربازی باش بۆ سەر مۆمبای ، پەرەسەندنی تیرۆریزمە لە بابەتی ئاسایشی ناوەخۆوە ( بە واتای هەر دەوڵەتێک بە ڕێگای تایبەتی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات) بۆ کێشەی سەربازی جیهانی. ئەو هێرشە تیرۆرستیانەی کە ئوسامە بن لادن و ڕێکخراوەکەی جێبەجێیان کرد هانی حکومەتی ٥٠ وڵاتی دا بۆ خەرجکردنی تریلیۆنێک دۆلار بۆ پاراستنی دانیشتوانەکەی لە ئەگەری هەر هێرشێکی تر. ڕاپۆرتێکی گرنگی ساڵی ١٩٩٤ی ستراتیژی بەرگری فەرەنسا ، ٢٠ ئاماژەی بۆ تیرۆر لەخۆگرتبوو، لەنووسینی هەموارکراوەکەیدا لەگەڵ داتاکانی ئەم دواییەی ساڵی ٢٠٠٨دا، تیرۆریزم ١٠٧ جار باسکراوە، زۆر زیاتر لە خودی جەنگەکە " تا ئەو ڕادەیەی کە ئەم جۆرە لە ململانەیانە وابەدەردەکەوێت زاڵدەبێت بەسەر هەڕەشەی جەنگ"، هەروەک هەردوو نووسەر مارک هیکەر و تۆماس ڕێد نووسیویانە.

کۆتایی قۆرخکاریی ڕەها: بەکارهێنانی توندوتیژی

هەرچەندە گرینگی و کاریگەری لایەنە کاریگەرە بچووکە نادوەڵەتەکان زیاتر بێت لە جەنگە مۆدێرنەکان یەکێک لەو بنەما سەرەکیانەی لاوازکردووە کە سیاسەتی ئاراستەکردوەو هێزی دابەشکردووە لە ماوەی سەدەکانی ڕابردوو. ماکس

## کۆتایی سەردەمی هێز

فیبەر گووتی " دەوڵەت جەستەیەکە کە بانگەشەی قۆرخکردنی بەکارهێنانی یاسای توندوتیژی دەکات". بە واتایەکی تر توانای چڕکردنەوەی هێزی سەربازی بەشێک بوو لە پێناسە و پاساوی دەوڵەتی مۆدێرن. پرۆسەکانی حەشدی سوپا و پۆلیس لە پسپۆری دەوڵەت بووە، وە هەروەها ڕێگریکردن لە لایەنەکانی تر بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی لەسەر زەویەکانی یەکێکە بووە لە بەرپرسیاریەتەکانی، ئەمەش یەکێکە لە توخمەکانی ئەو گرێبەستە کۆمەڵایەتیەی کە شەرعییەتی خۆیانی دامەزراند. ئەو قۆرخکارییە نوێیەی توندوتیژی مانای کۆتایی سەردەمی سەربازی بەکرێگیراو و چەتەی دزی بوو کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەسەر دانیشتوانیان دائەدا، و کۆتایی پلەبەندی پایەی دەرەبەگەکان و خزمەتکارەکان بوو کە هەر یەکیان سوپای تایبەتی خۆی هەبوو کە پارێزگاری لە خاکەکەی خۆی دەکرد؛ کۆنترۆڵی سەربازی پەیوەندیەکی توندی هەبوو بە سەروەری.

ئەم قۆرخکاریە ئەمڕۆ لەسەر زۆر ئاست درزی تێکەوتووە؛ چونکە حکومەتەکان لە مەکسیک و فەنزویلاوە تا باکستان و فلیپین کۆنترۆڵیان لەدەست داوە لەو بۆشاییە فراوانە نەتەوەییانەی کە لەلایەن گروپە چەکدارەکانەوە بەکاردەهێنرێت وەک بنکەیەک بۆ چالاکیە سەربازیەکان کە زۆرجار پشتگیری ناواتەکان یان پرۆژە سنوربڕەکان دەکات. تەنانەت بنەمای شەڕی گەریلاش گۆڕاوە، لە ڕابردوودا هەمیشە جموجۆڵەکانی گەریلا بەدوای ڕووخاندنی داگیرکەر و بەدەستهێنانی سەروەریدا بووە. بە بیروڕای تیوریستەکانی جەنگی گەریلاکان پشتگیری جەماوەری توخمێکی گرنگی شەرعییەتی گەریلا بووە لەو ناوچەیەی کە تێیدا کاردەکات. چی گیڤارا، نووسیویەتی:" شەڕڤانێک لە شەڕی گەریلاکان پێویستی بە هاوکاری تەواوی خەڵکی هەرێمەکە هەیە کە ئەمە مەرجێکی پێویستە". لە ئێستادا، بە شێوەیەکی زۆرتر، شەڕی گەریلا سنوری جوگرافی نیە:

نیتر لەسەر پشتیوانی جەماوەری ژیان ناکات، لەبەر هۆکارێکی سادە ئەویش ئەوەیە کە چیتر پەیوەست نیە بە زەویە سروشتیەکان. شەڕکردن لەگەڵ تالیبان لە ئەفغانستان لەوانەیە پێویستی بە بەدەستهێنانی دڵ و مێشکی جەماوەری ئەفغانی بێت، بەڵام شەڕکردن لەگەڵ ڕێکخراوی قاعیدە و لاساییکەرەوەکانی ئەوانەی ڕێنماییەکانیان لێ وەرگرتوون کاتێک هێرشیان کردە سەر نیویۆرک یان لەندەن یان مەدرید، لەوانەیە پێویستی بە کارامەیی بریکارەکانی هەواڵگری بێت زیاتر لەوەی کە پێویستی بە کارامەییەکانی پسپۆڕانی گەشەکردنی ئابوری بێت. لە هەمان کاتدا، لە بەرامبەر زیادبوونی فشارەکانی بودجەدا، دەوڵەتەکان بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕێن بۆ ئاسانکردنی ئەو بارە گەورەیەی کە لە لایەن سوپا هەمیشەییەکانەوە هەیە، و هەڵساوە بە دەرچوون لە بەشێکی زۆرتر لەوەی کە لە ناخی بەرپرسیارێتییە سیادییەکەیاندا هەبووە.

لێک نزیکبوونەوەی نێوان دەوڵەتی مۆدێرن و سوپای مۆدێرن تەنیا مەسەلەی ئایدیۆلۆژیا یان فەلسەفەی سیاسی نەبووە. هەروەها شتێکی زۆر پراکتیکیش بوو، چونکە ڕەنگدانەوەی تێچوون و تەکنیکەکانی جەنگ بوو. ئامرازەکانی توندوتیژی لە ماوەی سەدەکاندا لە دوای سەرهەڵدانی چەکە ئاگرینەکان لە ڕێگەی تۆپخانەی قورس و تانک و فڕۆکەی شەڕکەر و کۆمپیتەری ناوەندی گەورەوە زیادی کردووە، و هەموویان بوونەتە هۆی زیادبوونی تێچوون و پێداویستییە لۆجستییەکانی پێویستەکان بۆ بەدەستهێنانی کاریگەری سەربازی.

تیۆریزانانی سەربازی لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی مۆدێرنەوە باس لە چوار نەوەی جەنگ دەکەن، و هەر نەوەیەک نوێنەرایەتی قۆناغێک دەکات لە مێژووی جیهاندا، بەڵام هەروەها ڕەنگدانەوەی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیای مۆدێرن و داهێنانی تاکتیکیشە. تا دەرکەوتنی دەمانچەکەش، بۆ نموونە، سوپاکان هێزی ئاگرەکەیان چڕ دەکردەوە بە کۆکردنەوەی کەتیبە گەورەکانی سەربازەکان و ڕێکخستنیان لە

ڕیزەکان بۆ ئاراستەکردنیان بۆ شەڕکردن لە پێناو ناوچە بچوکەکانی خاک. وە شەڕەکان گۆڕەپانەکانیان پڕ لە جەستەی پەرت و بڵاو لەدوای خۆیان بەجێ ئەهێشت. ئەم شێوازە قێزەوەنە لە جەنگە ناپلیۆنیەکان تا جەنگە ناوەخۆییە ئەمریکیەکان بەردەوام بوو؛ بۆ ئەوەی بگاتە لوتکە لە خەندەقەکانی جەنگی جیهانی یەکەم. وە ئەم جۆرە لە شەڕکردنە لە بەرژەوەندی سوپا زەبەلاح و باشتر ڕێکخراوەکان بوو، چونکە گرینگیەکی تایبەت دەدات بە قەبارەی سوپا ( و پاشان هێزی مرۆیی بەردەست) و هەروەها هەماهەنگیش. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا تۆپهاوێژی قورس و تانک و فڕۆکە و مۆدێلێکی جەنگی جێگەیان گرتەوە کە تێیدا ئەو چەکانە ڕێگایان چۆل ئەکرد و سەربازە پیادەکان بەدوایاندا دەڕۆیشتن بۆ کۆنترۆلکردنی زەوی. ئەم مۆدێلە زیاتر کاریگەر بوو، بەلام تێچووشی زیاتر بوو. بەلام تێچووی ئەم چەکە نوێیانە زیاتر پێویست بوو بۆ پێشکەوتنی سوپاکان؛ چونکە کاتێک ماکس فیبەر هەلسا بە لێکۆلینەوەی دیمەنەکە لە سەرەتای سەدەی بیستەم وتی کە هیچ هۆکارێکی بنەرەتی نیە کە ڕێگری لە کۆمپانیا سەرمایەدارە تایبەتەکان بکات لە هەلگیرسانی جەنگ؛ و بەلام دەبێت پێکهاتەیەکی بەهێزی ڕێکخستن هەبێت. وەک فیبەر ووتی: داواکارییەکانی قەبارە و لێهاتوویی و تەکنەلۆجیا وای لە سوپا کردووە ببێت بە نمونەیەک بۆ پلەبەندی ناوەندی مۆدێرن، چونکە سوپای لامەرکەزیەتی کۆتاییەکەی هەر شکستە.

ئەو کۆدەنگیە لە جەنگی جیهانی دووەمدا لە ژێر لێدانە ئاسمانیەکانی بلیتزی ئەلمانی و شکستەکانی بەرگری ستاتیکا، وەک هێلی ماجینۆی فەڕەنسی دەستی بە لێکترازان کرد. بەکارهێنانی هێرشە لەناکاوەکان و هێزە ئاسمانییەکان پێویستی بە کرداری خێراتر و سووکتر بوو لەو شێوەیەی کە ئەفسەرانی سەر زەوی بەبێ بەفیڕۆدانی کات پیادەیان دەکرد لە چاوەڕوانی ڕێنماییەکانی فەرماندەیی

گەورە. وە مەرکەزییەتی ڕادەبەدەر لەوانەیە ڕێگرێک پێک بهێنێت، دواتر لە سەدەی بیستەمدا ناکۆکی نوێ دەرکەوت کە نەوەی شێیەمی جەنگەکانی بەرهەم هێنا، و چالاکبوون و نەرمیی بە شێوەیەکی زۆر بەنرخ و گرنگ بوو. ئامێرە ئالۆزەکان، وەک مووشەکی زەوی-ئاسمان، گواستنەوەیان ئاسانتر بوو و ڕێگەی بە سەرکردەکانی ناوخۆ دەدا کە بڕیاری گرنگ بدەن. هەرچۆنێک بێت، ئەو جەمسەرگیریەی جەنگی سارد و ئەو پێشبرکێیەی چەک کە دروستی کردبوو و ئەو هەڕەشەیەی کە لە هەڵگیرسانی جەنگێکی ئاسایی نێوان دەوڵەتەکان خۆی نواندبوو مانای ئەوە بوو کە سوپا گەورەکانی جیهان بەردەوام بوون لە گرنگی قەبارە زیاتر لە ئەولەویاتەکانی تر، هەروەک تیۆریستێکی سەربازی "ئەرکۆلا" گوتی: " پشتبەستن بە هەندێک یەکەی گەورە لە جیاتی ژمارەیەکی زۆرتر لە یەکەی بچووکتر". ئارکۆلا گوتی پێکهاتەی ڕێکخراوەیی سوپای ئەمەریکا لە سەردەمی جەنگی ڤێتنامەوە تا ئەمڕۆ کەمێک گۆڕاوە. وە گووتیشی کە سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکان کێشەیەکی درێژخایەنی هەیە لە گۆڕینی قەبارەدا، واتە نەبوونی توانا لەسەر ئەنجامدانی ئەرکی بچووکتر بە ژمارەیەکی کەمتر. دەتوانرێت بۆ ئەم عەقڵییەتە سەربازییە هەرەمییە تەقلیدییە ئەوە زیادبکرێت، کە وادەزانێت ژمارەیەکی زۆر هەمیشە باشترینن، وە ئەو باوەڕەی کە کە مرۆڤ هیچی بەدەست ناهێنێت بە ژمارەیەکی کەم تەنها خراپترین نەبێت".

زۆرێک لەشەڕڤانانی ئەمڕۆ هاوڕانین لەگەڵ ئەم بیروبۆچوونە، چونکە ئەو چەکدارە تاڵیبانەی کە ئامێرێکی تەقەمەنی دادەنێن، و ئەو یاخیبووەی لە هێزە چەکدارەکانی شۆڕشگێڕی کۆلۆمبیایە (فارک)، و سەرکردە لە بزوتنەوەی حەماس و بلۆگەری جیهادیی کە لەبەردەم کۆمپیوتەرێکدا دانیشتووە؛ هەموویان ئەنجامی "باشتر بە کەمتر" بەدەست دەهێنن. ئەمانە سەربازی ڕێکخراوە تەقلیدیەکان یان ئەو ئەفسەرانە نین کە لە ئەکادیمیای سەربازی دەرچووبن، بەڵام

گرینگیان کەمتر نیە لە کاروبارە سەربازیەکانی ئەمڕۆ. تەنها " خراپەکارەن" - تیرۆرستان و یاخیبووان و چەتەکان و تاوانباران لە ڕووی ژمارە و چووستی زیاد دەکەن؛ چونکە لە لایەنی سوپا نەتەوەییەکان لە دیموکراسیە ڕۆژئاواییەکاندا، کۆمەڵێکی گەشەسەندوو لە کۆمپانیا سەربازیە تایبەتەکان هەن کە هەڵدەستن بە کارە سەربازیەکان و ئەمنیەکان کە پێشتر قۆرخکرابوو لەلایەن سوپاکان و پۆلیس.

ئەمە بە تەواوی تازە نییە، لە سەدەکانی ناوەڕاست و ڕۆشنگەریدا زۆر جار کردەوەی شەڕ و ئاسایش لەلایەن بەکرێگیراوەکانەوە ئەنجام دەدرا. بەڵام بازاری خزمەتگوزاری سەربازی تایبەتی ئەمڕۆ، کە داهاتی ساڵانەی مەزندە دەکرێت بە نزیکەی ١٠٠ ملیار دۆلار، لە ڕاستیدا نەوەیەک پێش ئێستا بوونی نەبوو. ئەمەش پەرەی سەندووە و فراوان بووە لە دەرەوەی دابینکردنی پێداویستی و خزمەتگوزاریە لۆجستیەکان، ئەوانەش کرداری گرنگن بۆ هەر هەڵمەتێکی سەربازی، بەڵام دوورن لە پشت هێڵی پێشەوەن. وە کۆمپانیا سەربازییە تایبەتەکان هەندێک لە هەستیارترین ئەرکەکانیان لە ئەستۆ گرتووە، لەوانە لێپرسینەوەی زیندانییەکان. لە ساڵی ٢٠١١ بەلایەنی کەمەوە ٤٣٠ کارمەندی کۆمپانیا ئەمنییە تایبەتەکانی ئەمەریکا لە ئەفغانستان کوژراون و بریندار بوون. ئەگەر کۆمپانیای خزمەتگوزاری بەرگری "ئێڵ-٣ کۆمیونیکەشن" وڵاتێک بوایە، ئەوا تووشی سێیەم گەورەترین زیان دەبۆوە لە دوای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیاوە، لە عێراق و ئەفغانستان. پیتەر سینگەر، شارەزا، دەڵێت: "لە ماوەی دوو سەدەی ڕابردوودا هیچ پشتبەستنێک بە سەربازە تایبەتەکان نەبووە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکان کە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر سەرکەوتنی تاکتیکی و ستراتیژی پێکدادانی سەربازی هەبێت". ئەم کۆمپانیایانە کە زۆرجار لە نوسینگە نەناسراوەکان لە دەرەوەی لەندەن یان لە قەراغی ڤێرجینیا بە کۆمپانیا بچووکەکان دەست پێ دەکەن، وەک بلاکواتەر (ئێستا ناونراون بە ئەکادیمی)، ئێم پی ئاڕ

نای، ئاکز قتیف ئاوتکەم، باستر بیلز، تیتان و ئەیگیس، ڕۆڵی سەرەکیان بینیوە لە چالاکیە سەربازیە جۆراوجۆرەکاندا. هەندێک لە کارکردن وەستان، هەندێکیان لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانەوە کڕدراون، و هەندێکیش سەربەخۆ ماونەتەوە. وە لە نێوان دەرفەتەکانی تر کە لەم دواییە دەرکەوتن، کۆمپانیا سەربازییە تایبەتەکان پاراستنی کەشتییە بازرگانییەکان لە چەتەکانی سۆماڵی وەک بازاڕێک بەکارهێناوە بۆ خزمەتگوزاریەکانیان. بەکرێگیراوەکان، لەگەڵ هەموو ئەو مانایە کۆنانەی کە ئەم ووشەیە هەڵیدەگرێت، بوون بە پیشەسازیەکی گەشەدار و هەمەجۆر.

بیرمەندە سەربازییەکانی ئەمریکا چەمکی (٤W)یان داهێناوە بۆ وەسفکردنی هەر ململانێیەک کە بە ناڕوونی لە هێڵی نێوان شەڕ و سیاسەت، یان سەرباز و مەدەنیدا دەناسرێت. ئەمە ململانێیەکە کە ئەکتەرێکی توندڕەوی نادەوڵەتی شەڕی دەوڵەتێک دەکات، کە تێیدا شەڕکردن نەک تەنیا بە واتای تەسکی کرداری دوژمندارانەی چەکداری بەڵکو بەو مانایەی کە لە میدیا و ڕای گشتیشدا کارلێک دەکات، بۆ ئەوەی هەر لایەنێک بە دوای ئەوە بێت کە بناغە و شەرعییەتی ئەوی تر کەمبکاتەوە وەک هەوڵێک بۆ بەزاندنی لە گۆڕەپانی شەڕ. وە عادەتەن تیرۆریزم، جەنگی سایبەر و پڕوپاگەندەکان لە نەوەی چوارەمی شەڕدا بەکار دەهێنرێن. بیرۆکەی نەوەی چوارەمی شەڕەکان لە ساڵی ١٩٨٩ەوە کە شەڕی سارد بەرەو کۆتایی هات، بەفەرمی کرا. لەم بارەیەوە، بە شێوەیەکی بەرچاو ڕادەی سەرکەوتنی گەشەسەندووی نەوەی چوارەمی ڕکابەرەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەردەکەوێت، کە زۆر کەمتر دەوڵەمەند و پڕچەکن.

### تسونامیەک لە چەک

بۆ دەیان ساڵ، ئامرازەکانی جەنگ زیاتر پەرەی سەندووە و گرانتر بووە، وە لە

ئەنجامدا گەیشتن پێیان قورس بووە. بەڵام لەو کاتەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و وڵاتانی تر هێشتا توانای ئەوەیان هەیە کە موعجیزە دروست بکەن، بەلام گونجاوتری فڕۆکەی سەربازیی لە ئێستادا بۆ شەڕ، فڕۆکەی شەڕکەری ئەفاث نییە، بەڵکو شتێکی زۆر هەرزانتر و زۆر نەرمترە: ئەویش فڕۆکەیەکی بێفڕۆکەوانە.

ئێستا مەودایەکی زۆر لە فڕۆکەی بێفڕۆکەوان (دڕۆن) هەیە کە لە لایەن ژمارەیەکی زۆرتری وڵاتان بۆ ڕاکێشانی دوژمن، یان ئەرکە سیخوڕیەکان، یان وەشاندنی لێدانە موشەکیەکان بەکاردێت. وە تێچووەکەشی لە نێوان چەند هەزار دۆلارێکە بۆ فڕۆکەیەکی دڕۆنی سادەی مەودا کورتی ناشەڕکەر و نزیکەی ١٥ ملیۆن دۆلار بۆ فڕۆکەیەکی دڕۆن لە مۆدێلی " ڕیپر" ی شەڕکەر. بیرۆکەی فڕۆکەی دڕۆن نوێ نیە. بەڵام پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا لە دەیەکانی دوایی زۆر بە هێزتری کردووە، هەروەک بەکارهێنانیشی لە ئەرکەکانی شەڕکردن زۆر سەرنج ڕاکێشتر بووە بەهۆی تێچووە کەمەکەی و توانای فڕینەکەی بەبێ بوونی فڕۆکەوان. بەکارهێنانی لە کارە ناسەربازیەکان دەستی بە زیادبوون کردووە، بۆ نموونە، بریکارەکانی عەقارات بۆ وێنەگرتنی خانووەکان لەسەرەوە بەکاریان دەهێنن، و هەروەها زانایانی ژینگە بۆ چاودێری دارستانە باراناویەکان، خاوەن ئاژەڵەکان بۆ شوێنکەوتنی مەڕوماڵاتیان بەکاریان دەهێنن. ئێستا زیاتر لە ٣٠ وڵات هەیە کە فڕۆکەی بێفڕۆکەوان بەکاردێنن و لە ئێستادا دەیان کۆمپانیای تایبەت خزمەتگوزاری بەکارخستنیان پێشکەش بەو وڵاتانە دەکەن کە ژێرخانی پشتیوانیان نییە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە. ئەو شتەی کە جێی نیگەرانی زیاترە، بوونی زۆر کەسی ئاسایی و بەکارهێنەری تایبەتە؛ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠١٢دا گروپێک هەبوو بە ناوی " ئەو فڕۆکە بێ فڕۆکەوانانەی کە بە توانای خود دروستکراون"، ٢٠هەزار ئەندامی لەخۆگرتبوو. وە لە ساڵی ٢٠٠٤دا،

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

حزبولّا فرۆکەیەکی بێفرۆکەوانی لە بوارەکانی ئاسمانی ئیسرائیل خستە ئاسمان، و سوپای ئیسرائیل خستیە خوارەوە، بەڵام کاریگەرە نەفسیەکەی بەردەوام بوو لەسەر تێپەڕاندنی بواری ئاسمانی ئیسرائیلی و ئەو پەیامەی کە تواناکانی حیزبولّای گەیاند. چی ڕوودەدات کاتێک کەسێکی توندڕەو یان خەمبار یان ناتەواو دەبێتە خاوەن توانای وێرانکردن لە ئاسمان؟ هەروەک فرانسیس فوکویاما، پرۆفیسۆر لە زانکۆی ستانفۆرد کە بەردەوام بوو لە دروستکردنی فرۆکەیەکی بێفرۆکەوانی تایبەت بەخۆی بۆ وێنەگرتنێکی باشتری سروشت، دەڵێت " کاتێک تەکنەلۆجیا لە ڕووی بازرگانیەوە بە فراوانی هەرزانتر و بەردەستر دەبێت، لەوانەیە چاودێرکردنی فرۆکە دڕۆنەکان ئەستەم تر بێت؛ وە بە نەزانینی سەرچاوەکەی توخمی بەرپەرچدانەوەی ئەڕوخێت". بیرکردنەوە لە جیهانێک کە خەڵک بکرێنە ئامانج بەهۆی هۆکارێکی ڕۆتینیی و نادیار لە دوژمنێکی نەزانراو دڵخۆشکەر نییە".

فرۆکەی بێفرۆکەوانی زۆر پێشکەوتوو بەراورد بەو چەکانەی کە زیاتر وێرانکەرن لەو ململانێیە سەربازیانەی کە لەم ساڵانەی دواییی ڕوویاندا؛ بە واتای بۆمبە چێنراوەکان؛ ئەوا بۆمبە چێنراوەکان بە هەمەجۆری و پێکهاتەی جۆراوجۆر لە کەرەستە و سیستەمی تەقینەوە دێنە پێشەوە؛ وە بەپێی پێوەرێکی دیاریکراو دروست ناکرێت، و زۆرجار لە پێکهاتە بەردەستەکان بە ئاسانی بەیەکەوە دەخرێن، وەک ئامرازە کشتوکاڵیەکان یان مادده کیمیاییەکانی کارگەیەک یان دەرمانخانەیەک یان نەخۆشخانەیەک. وە بە گوێرەی ڕێژبەندیکردن لەوانەیە بۆمبە چێنراوەکان بکەونە لایەکی تری پێشکەوتن و پێداویستیە هونەریەکان بەراورد بە ئامرازەکانی تری جبەخانەی سوپا گەورەکان، بەڵام بە تەواوی گونجاو بۆ جەنگە نامەرکەزیەکانی سەردەمی ئێستا؛ چونکە پێویستی بە زنجیرەیەک لە پێداویستی و پرۆسەکانی بڵاوکردنەوە نیە کە کاتێکی زۆر بخایەنێت. ڕێنماییەکانی دروستکردنی ئەم ئامێرانە ئاسان و سادە و بەردەستن لە ئەنتەرنێت. هەروەها

## کۆتایی سەردەمی هێز

بڵاوبوونەوەی کەرەستە سەربازیەکان لە ناوچەکانی وەک عێراق، و یەکێتی سۆڤیەتی جاران، و لیبیا، تێچوونی دروستکردن و ئاڵۆزیەکانی کەمتر کردۆتەوە. قەبارەیان بچووکە و بە ئاسانی دەشاردرێنەوە، و پێویستی بە خۆئاشکراکردنی شەڕکەرەکە نیە، و کاریگەریەکی ئازاربەخشی هەیە بۆ دوژمن یان پێکان بە هێزو مەترسیدارەکەی. لە راستیدا، دژبەیەکی تەواوی نێوان کوالیتی ناوخۆیی ئەم چەکانە و باڵادەستی تەکنەلۆجیا دوژمن کە لاواز دەکات و وورەی دەڕوخێنێت دەتوانێت ڕۆمانێکی هاوشێوەی " داود دژی جالوت " دابمەزرێنێت، کە لەوانەیە ببێتە هۆی بەدەستهێنانی سەرکەوتن بۆ یاخیبووەکان لە بواری پەیوەندیە گشتیەکان.

ئەو پارەیەی کە جالوت خەرجی دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، لە کاتێک پێکانەکان زیاد دەبن، شتی زیاتر دەخاتە سەر کاریگەریەکانی، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر لە ١٢٠ ملیار دۆلاری خەرجکردووە لە ساڵی ٢٠٠٣وە بۆ لەناوبردنی بۆمبە چێنراوەکان. چارەسەرکردنی ئەم ئاڵنگاریەی داوە بە پێکهاتەیەکی جۆراوجۆر لە کۆمەڵەکان و بریکارەکان لە ناوەوەی دامەزراوەی سەربازی ئەمریکی، ئەو شتەی کە بووە هۆی ئەم جۆرە کێشە بیرۆکراسیە تەقلیدیانە؛ وەکو ماندووبوون بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی دژبەیەک، و ڕکابەری توند، هەماهەنگی خراپ، و بە شێوەیەکی سروشتی بەهەدەردان لە داهاتەکان. تەنانەت کورتکراوەی ناوی دەزگای سەرەکی بەشدار" سروشتی ڕێکخراوی هاوبەشی شەڕی دژە تەقەمەنی" (JIEDDO)، سروشتی نارەوشتی خۆی ئاشکرا دەکات. داهێنانەکانی وەک ئۆتۆمبێلی زرێپۆشی تایبەت و رۆبۆتەکانی پاککردنەوەی مین و جلوبەرگی پاراستنی تایبەت ژمارەیەکی بێشوماری لە ژیانی سەرباز و هاوڵاتیانی ڕزگارکردووە، بەڵام هەوڵدان بۆ وەستاندنی بڵاوبوونەوەی بۆمبەکان هێشتا ئەستەمە. بۆ نمونە لە ساڵی ٢٠١١،

ژمارەی ئەو بۆمبانەی کە بە تەنیا لە ئەفغانستان لابراون یان تەقێنراون لە ١٥٢٢٥ بۆ ١٦٥٥٤ زیادی کردووە، ئەمەش ٩% وەک ڕێژەی زیادبوون. وە ژمارەی هاوڵاتیانی ئەفغانی کە بە بۆمبە چێنراوەکان کوژراون یان بریندار بوونە بەرزبۆوە بە ڕێژەی ١٠% لە ساڵی ٢٠١٠؛ و تەنیا بۆمبە چێنراوەکان هۆکارێک بوون لە ٦٠%ی تێکڕای پێکانەکان لە ڕیزی مەدەنیەکان.

ئەو چەکەی کە لە بۆمبە چێنراوەکان کاریگەرتر و گونجاوترە بۆ خەنگە شارەوەکان، ئەو چەکەیە کە لە لایەن هەڵمەتەکانی جەنگی گەریلاکان و تیرۆرستەکانی ئەمڕۆ بەکار دێت؛ ئەو تاکانەی کە پەرۆشن و ئامادەن دەست لە ژیانیان هەڵگرن بۆ ئەوەی ئەرکێک جێبەجێ بکەن. ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کوشندەترین هێرشە تیرۆریستییەکانی جیهان لە نێوان ساڵانی ١٩٩٠ و ٢٠٠٦ ژمارەیان ٣٠ هێرش بووە، کە ٢٢یان لە لایەن خۆکوژەکانەوە بووە. شەهید بوون پاڵنەرێکی گەورەیە، و هەمیشە لە کاتی شەڕدا شەڕڤانانی خۆکوژ دەردەکەون. بەڵام لە ساڵانی هەشتاکانەوە هێرشی خۆکوژی بەشێوەیەکی بەرچاو بەرزبووەتەوە و هیچ پێشینەیەک لە سەردەمی مۆدێرندا نییە بۆ تێکڕای دووبارەبوونەوە و بەکارهێنانی ستراتیژیەیان. تێکەڵکردنی پاڵنەرەکانی پێش مۆدێرن لەگەڵ تواناکانی دوای مۆدێرن، سەلماندوویەتی کە وێرانکەرە. دووبارە سێ شۆڕشەکان دەبنە هۆی گەورەکردن و فراوانبوونی کاریگەری خۆکوژیەکان؛ چونکە ئەمڕۆ ئەوان سوود لە ئاسانی گەشتکردن وەردەگرن کە پێشتر نموونەی نەبووە، لە کاتێکدا کلتوری شەهیدبوون پشتگیری لە ئەنجامدەرەکەی دەکات و خۆکوژی نوێ دەهێنێت، و کاریگەری ترس زیاتر دەکات نەک تەنیا لە دڵی ئەو خەڵکانەی کە کراونەتە ئامانج، بەڵکو زۆر دووتر لەوانیش، ئەمەش بەهۆی گەورەکردنی بابەتەکە لەلایەن میدیاکان. لەمەش زیاتر، کلتوری شەهیدبوون بە کاریگەری نەبوونی سۆز تێیدا دەناسرێت چونکە بە نزیکەیی زۆر ئەستەمە مرۆڤ بەتەواوی بتوانێت خۆی

## کۆتایی سەردەمی هێز

بپارێزێت لە کەسێکی خۆکوژ کە تەنها ئامانجی ئەوەیە نزیک بێتەوە لە ئامانجەکەی و هیچ ئارەزوویەکی نیە لە ژیان.

بێگومان، جەنگە پچڕپچڕە شاراوەکان ئامرازی مۆدێرنیش بەکاردەهێنن. وایلێهاتووە ئەنتەرنێت گرینگیەکەی کەمتر نەبێت لە بۆمبە چێنراوەکان یان هێرشە خۆکوژیەکان لە دیمەنی جەنگە نامەرکەزیە نوێیەکان. لەبەرەی جەنگی سایبەردا، هێرشی چەتەکانی ئەنتەرنێت هەیە بۆ سەر هەردوو ژێرخانی مەدەنی و سەربازی، هەروەها هێرشەکانی بڕینی خزمەتگوزاریەکانی ئەنتەرنێت و ئەوانی تر لە پرۆسەکانی پەکخستنی ماڵپەڕە ئەلکترۆنیەکان، و سیستەمەکانی ئیشپێکردنی کۆمپیوتەرەکان کە حکومەت یان دانیشتوان پشتی پێ دەبەستن. بەڵام ئەوەی کە دەتوانرێت بە ئاسانتر بەدەست بگەیەنرێت کۆمەڵێک لە دەنگە توندڕەوە چالاکەکانە لەسەر ئەنتەرنێت کە پەیامی دوژمنداری و بابەتە ڕێکلامیەکان و هەڕەشەکان بڵاودەکاتەوە، و سەرنجی سەربازی نوێ بۆ قەزیەکەیان ڕادەکێشن. لە کاتێکدا هەندێک لە دەنگە توندە گشتیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لە جەنگیان دژی تیرۆر دامرکانەوە بەهۆی نەبوونی ئەزموونی سەربازی؛ چونکە ئەو خۆکوژەی کە هێرشێکی سەرکەوتووی لە بنەکی دەزگای سیخوڕی ئەمریکی لە ئەفغانستان ئەنجام دا لە کانوونی یەکەمەی ساڵی ٢٠٠٩، لێهاتوویەکی جیهادی پێشوو بوو لە هەڵگرتنی چەک. ئینتەرنێت تەنیا ئامرازێک نییە بۆ بەهێزکردنی ئەم کێشانە، بەڵکو دەتوانێت وەک ئامرازێک بۆ بڵاوکردنەوەی توندڕەوی بەکار بهێنرێت.

وە تەنیا هاوبەش لە نێوان ئەم ئامراز و تەکنەلۆجیایانە ئاسان گەیشتنە پێیان؛ هەروەک سەرۆکی سیخوری سەربازی ئیسرائیلی، جەنەڕاڵ عاموس یادلین، لە ووتارەکەی لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٩ ئاماژەی پێدا؛ "دوژمنەکانی ئیسرائیل زۆر لە دواوەینە لە ڕووی توانا سەربازیەکان، بەڵام دەستیان کردووە بە گەیشتن پێی لە

ڕێگای موشەکە وردەکان لە ئاراستەکردن، و کۆمپیوتەر بەکارهێنان، و چەکەکانی دژ بە فڕۆکەکان، و ئامێرەکانی دیاریکردنی شوێنەکان، و فڕۆکە بێ فڕۆکەوانەکان". وە گوتیشی " ئەو کۆمپیوتەرانەی کە ئێستا لە بواری بازرگانیەوە بەردەستن توانایان بە دوژمنانی ئیسرائیل داوە کە پەیوەندیەکانیان تەشفیر بکەن و تۆڕە ئەلکترۆنییەکانی ئیسرائیل تێبەڕێنن. هێزی سایبەر ئەو جۆرە توانایە دەدات بە یاریزانە گەنجەکان کە لەلایەن هێزە گەورەکان قۆرخکرابوو. ئەوە بەکارهێنانی هێزێکە، وەک فڕۆکەی بێفڕۆکەوان، کە دەتوانێت بەبێ گوێدانە دووری جوگرافی یان ماوەی کات و بەبێ ئەوەی ژیانی جەنگاوەرەکان بخاتە مەترسییەوە ئامانجەکەی بپێکێت".

ئەوەی کە جەنەراڵ ئامۆس یدلین گوتی ئەو گرێیە کورت دەکاتەوە کە سوپاکان ئێستا ڕوبەڕوی دەبنەوە، و ئەو حکومەتانەی کە سوپا بڵاو دەکەنەوە و ئەو هاوڵاتیانەی کە دەبێ بیانپارێزن، ئەویش ئەو فاکتەرانەیە کە هێزیان پەرتەوازە کرد لە سیاسەت یان بازرگانی یان ئەو ئایینەی کە درێژبۆوە بۆ بواری سەربازی، کە پێشتر ئاسایی نەبوو لێی نزیک بیتەوە. چونکە هەڵوەشانەوەی هێز مەرجەکانی جەنگ و تواناکانی گۆڕی؛ ئەویش لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئامرازەکان و کەمبوونەوەی تێچووکان توانای یاریزانە بچووکە نادەوڵەتیە ناتەقلیدیەکانی زیادکرد. دەزگاکانی ڕاگەیاندن و پەیوەندیەکان وانەکانی پرۆسە سەرکەوتووەکان بڵاودەکەنەوە، و یارمەتیدەرن لە گەورەکردنی کاریگەریەکەی.

بە سەرکەوتنی ئەم هێزە سەربازیە بچووکە تازانە، چالاکوانەکانی تر، یان ئەوانەی هێشتا نەهاتوون، ئەوە ئەدۆزنەوە کە چۆن لاساییان بکەنەوە. ئەم سیناریۆیەش مانای گرەنتی ململانێیە بچووکەکان نادات کە کۆتاییان نایەت، بەڵکو دەرهاوێشتە قووڵەکان لەخۆ دەگرێت بۆ هەموو کەسێک کە گرینگی بە ئاشتی دەدات وەک پێشینەیەکی ئەخلاقی یان پراکتیکی، هەروەها ئەو بانگەشە

گەورانەش لەخۆ دەگرێت سەبارەت بەو ڕێگایەی کە هێزی لێ بەدەست دێت، و چۆنیەتی پارێزگاریکردنی، و لەدەستدانی لەم سەردەمەی ئێستاماندا.

## هەڵوەشانەوەی هێز و یاسا تازەکانی جەنگ

"هەرگیز جارێکی تر" دروشمی جیهانیی ڕزگاربووانی جەنگە. لەگەڵ ئەمەش، ڕۆژێک تێنەپەڕیوە بەبێ بوونی ڕووداوێک ئەوە بێنێتەوە یاد کە توندوتیژی و تیرۆر و زۆرلێکردن هێشتا هۆکارە کاریگەر و بەهێزەکانە کە شێوەی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگاکان دیاری دەکات. هەروەها دەستکەوتەکانی ئاشتی کە لە جەنگە ساردەکان بەدەست هێنرا بە خێرایی بەرەو نەمان چوون لە جەنگی کەنداو، و هێرشی یەکەمی مەرکەزی بازرگانی جیهانی، و ململانێی بەلقان، و کۆمەڵکوژیەکەی ڕواندا، و جەنگە ناوەخۆییەکانی ڕۆژئاوای ئەفریقیا، و زۆری تریش جگە لەمانە. نوسەر ڕۆبێرت کاپلان هۆشداری دا لە "ئاژاوەی داهاتوو" لەگەڵ پارچەبوونی ئەو وولاتانەی کە جەنگی سارد کۆڵەکەیەکی پشتگیری بوو بۆ یەک پارچەییان، و بەهێزبوونی گرژییە ڕەگەزی و ئایینییەکان. شۆکی یازدەی سێپتێمبەر و سەرهەڵدانی قاعیدە و کۆپییەکانی، و بەردەوامبوونی " جەنگی جیهانی دژی تیرۆر" لەژێر ناوێک یان ناوێکی تردا لەو کاتەوە، هەموویان هەستی جیهانێکی گەمارۆدراو بەشێوازە نوێیەکانی توندوتیژی ئاستی نزم بەڵام کاریگەری بەرز زیاد کردووە. سەرەڕای جیاوازیەکانی بۆچوونی شیکەرەوەکان، بەڵام شیکەرەوەکانی وەک کاپلان و ئامی چوا، نووسەری "جیهان دەسووتێت"، باس لەوە دەکەن کە خێرایی تەوژمی جیهانگیری و لاوازکردنی دەوڵەتەکان ئەگەری ناکۆکی توندوتیژی زیاتر دروست کردووە، وە هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دیمکراسیەکان لەسەر شێوازی ڕۆژئاوا لەو شوێنانەی کە ئێستا تێیان دا نیە لەوانەیە دەرەنجامی پێچەوانە و پڕ لە توندوتیژی لێبکەوێتەوە. لە هەمان کاتدا لە

زۆر بەرەی جیاوازدا کە سنوری جوگرافیان نیە تیرۆریزم و شەڕی سایبەر و بازرگانیکردن بە مادده هۆشبەرەکان ڕوو دەدەن، و دەتوانن هەر ڕۆژێک زیان بە هەر شوێنێکی جیهان بگەیەنێت.

ناوزەندی بکە بە ململانێی کەمتر توند، یان جەنگی بچووک، یان جەنگێکی نارێک، ین هەروەک توێژەرەوان مارک هیکر و تۆماس ڕێد ووتیان " جەنگی ٢.٠ " - ململانێی توند ئەمڕۆ، لە ژێر هەر ناوێک بێت، جیاوازیەکی ڕیشەیی هەیە لەگەڵ ئەو مۆدێلانەی کە شێوەی هەردوو سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمیان دیار کردبوو کە بەردەوام بوو لەو فیلمە دۆکیۆمێنتاریانەی کە لە کەناڵی مێژوویی ( هستۆری چەناڵ) بڵاوکرایەوە... ولە شێوازەکانی خەرجکردنی سەربازی لە زۆربەی وولاتەکاندا." ئەوەی کە کەمتر ڕوونە چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەم دیمەنە نوێیەیە، چونکە پاساوەکانی پشتگیریکردن بۆ پرۆسەکانی کەمکردنەوە و چاکسازیە ڕیشاڵییەکان لە سوپا گەورەکانی جیهان داڕماوە بەرامبەر هێزی بەرژەوەندیە تایبەتەکان، و ئەو هەستەی کە لاوازی و نیگەرانی گەورەی لێ ڕەنگدەداتەوە دەربارەی لاوازبوونی هێزی بەربەرچدانەوەی تەقلیدی. هەڕەشەی تەقلیدیەکانی نێوان وولاتان وون نەبوونە، چ ململانێ چارەسەرنەکراوەکان لەسەر سنور هەر لە قەوقازەوە تا ئەمریکای باشور، یان گەشەسەندنی سەربازی لە وولاتانی وەک ئێران و کۆریای باکور، یان گوومانی توندی نێوان وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و چین. لە هەمان کاتدا، ئەبینین ئەو ڕەتەچەتانەی ئاماژەیان پێکرا بۆ چارەسەرکردنی بڵاوبوونەوەی توندوتیژی لایەنە کاریگەرە نادەوڵەتیەکان پشت دەبەستێت بە بیروڕا ئاشکراکان دەربارەی هۆکارە ڕیشاڵیەکانی، کە شیکەرەوەکان ئەیگێڕنەوە بۆ نەبوونی یەکسانی ئابووری، و ناهاوسەنگی کلتوری، و بڵاوبوونەوەی ئیمپریالی کە کۆمپانیاکان پیادەی دەکەن، و ئیسلامی ئصولی، و هاندانی وولاتە سپۆنسەرەکان بۆ

توندوتیژی، و کۆمەڵێک هۆکاری تر.

سەیرکردنی جەنگ ئەمڕۆ لەڕوانگەی هەڵوەشاندنی دەسەڵاتەوە جێگای مشتومڕێکی وا ناگرێتەوە، بەڵام دەتوانێت هەندێک ڕوونکردنەوەی پێویست بدات سەبارەت بە شێوازەکانی ململانێ کە بەردەوام دەبێت، و شێوەی واقیعە نوێیەکان چ لەدیموکراسی ڕۆژئاواوە سەرچاوەیان گرتبێت یان هێزێکی مەزنی ئاواتخواز یان دەوڵەتێکی گەشەسەندوو یان گروپێکی توندڕەو یان یاخیبوو کە دەبێت لەسەر هەر ئیستراتیجیەکی سەربازی لەبەرچاوی بگرێت ئەگەر بیەوێت سەرکەوتوو بێت .

سەرهەڵدانی کێبڕکێی سەربازی لەڕادەبەدەر

ئەو چەکانەی کە بە ئاسانی بەدەست دەبن، و تاریکبوونی هێڵە جیاکەرەوەکانی نێوان تەکنەلۆجیای سەربازی و مەدەنی، و زیادبوونی ژمارەی ئەو ململانێیانەی کە پەیوەندیان بە پارە و کاڵا و بیروڕاکان هەیە زیاتر لە پەیوەندیان بە زەوی، هەموویان ڕێگا خۆش دەکەن بۆ ڕکبارەیەکی لە ڕادە بەدەر لە بوارەکانی جەنگ و ئاسایش. وەک پارتە سیاسیە سەرەکیەکان، یان دامەزراوە پیشەسازی و بانکیەکان، دامەزراوە سەربازیە گەورەکانیش ڕووبەرووی ڕکابەرە نوێیەکان دەبنەوە کە چیتر بەربەستە تەقلیدیەکانی چوونەژوورەوە ڕێگریان لێ ناکات؛ چونکە وەزارەتی بەرگری سەرەکی وەک بنتاگۆن جیتر ئەو ئامراز و سەرچاوە پێویستانە قۆرخ ناکات بۆ بردنەوەی هەر جەنگێک. وە کارامەییە بەسوودەکانی هەر جەنگێک ئێستا دەتوانرێت بەدەست بهێنرێت نەوەک تەنیا لە ڕاهێنانی سەرەکی و ئەکادیمیاکانی سەربازی و زانکۆکانی بەرگری، بەڵکو لە هەر سەربازگەیەکی یاخیبووەکان لە باکوری ڕۆژئاوای پاکستان، یان قوتابخانەی ئیسلامی لە لیستەر لە بەریتانیا، یان قوتابخانەی کۆمپیوتەر لە گوانجۆ لە چینیش.

لەم دیمەنە پەرتەوازەیە دامەزراوە سەربازیە تەقلیدیەکان هەر بە گرینگ و کاریگەر دەمێننەوە؛ چونکە ئەوان خاوەنی تایبەتمەندی داهاتی گشتین و توانایان

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

هەیە لە ئەولەویەت دان بە خۆیان لە بودجەکانی حکومەت، هەروەها سەروەری نەتەوەیی سەنگێکی مەعنەویان پێ دەدات کە سەرنجی سەربازی نوێ ڕابکێشن و پاساوی وەبەرهێنان و خەرجکردن و شەرعیەتی سیاسی دەدات بۆ چوونە نێو هاوپەیمانیەتەکان. نەریتێکی خۆی هەیە کە پێگەکەی بەرزدەکاتەوە بەڵام تایبەتمەندی تاکرەوی و شێوە قۆرخکاریەکەی لەدەست داوە. دوو جۆری گرنگی قۆرخکاری هەیە یەکیان فەلسەفی و ئەویتریان پراکتیکی - کە لێکترازاون و خاڵە لاوازییەکانی دامەزراوەی سەربازی تەقلیدیان ئاشکرا کردووە. یەکەم قۆرخکاری بریتییە لە قۆرخکردنی فەلسەفی دەوڵەت لەسەر بەکارهێنانی ڕەوای هێز. قۆرخکاری دووەم قۆرخکارییەکی پراکتیکییە کە لەلایەن سوپاوە چێژی لێوەردەگرت بەهۆی کێبرکێی جیۆپۆلەتیکی نێوان دەوڵەتە سیادیەکان و پێویستی بۆ تەکنەلۆجیای پێشکەوتووتر بۆ بردنەوەی ئەم ڕکابەریە. سەرکەوتنی ئەکتەرە نادەوڵەتییەکان و بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆژیای مەترسیدار و خێرا بۆ مەیدانەکان لەودیوی دنیای پسپۆڕانەوە لەسەر کۆڵەکەکانی ئەو سوودە دانراوە.

ئەمڕۆش هێزە نەتەوەییەکان هەوڵ دەدەن بە خێرایی و دەرەنجامی جیاواز لەگەڵ "پانتاییەکی تەواو" ی شەڕدا بگونجێن کە چەکەکان بوون بە ژمارە بەڕادەی ئەوەی کە ماددین، و شێوازەکان بوون بە دەروونی بەڕادەی ئەوەی کە بەزۆریە، و جەنگاوەران بوون بە مەدەنی و پەرشوبڵاو بەڕادەی ئەوە کە ئەوان جلی فەرمی و ڕێک و ڕێکخراو دەپۆشن. ناکۆکیە لەڕادەبەدەرەکانی پێشبڕکێ مەرج نییە بە مانای شەڕەکانی زیاتر یان خراپتر لە جاران بێت، چ بە لەدەستدانی ژیان یان لەدەستدانی سوودە ئابوورییەکان بپێورێت. بێ گومان، ئاماژە بە کۆتایی سوپا نەتەوەییەکانیش ناکات، بەڵام ئەوە دادەنێت کە چاوەڕوان دەکرێت لە سوپای نەتەوەیی بەدەستی بێنێت لە ڕوانگەیەکی نوێ.

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

دەسەڵاتی سەربازی چیتر یەکسان نییە بە ئاسایشی نەتەوەییەوە

گواستنەوە لە شەڕی ئاسایی نێوان دەوڵەتانەوە بۆ ململانێ نامەرکەزییە بچوکەکان بە زۆری کۆتایی بە قازانجی تایبەتکردنی سوپا گەورەکان هێنا، بۆیە هەر ستراتیژیەکی نەتەوەیی کە پشت دەبەستێت بە هێزی سەربازی یان ئاگرینی باڵا ستراتیژیەکە جێگای متمانە نیە. سوپا گەورەکانیش ئەم ڕاستیەیان دووپات کردۆتەوە، و بەردەوام بووە لە ڕاهاتن لەگەڵی. هەروەک پێشتر باسکرا، وەک پێشتر باسکرا، ڕێنماییەکی سەربازی ئەمریکا کە لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٨ دەرچووە ڕایگەیاند کە شەڕی نا ڕێکوپێک دەبێت بە " هەمان ڕادەی گرنگی جەنگی تەقلیدی ئەژماربکرێت لە ڕووی ستراتیجیەوە "، ئەمەش بەیاننامەیەکی سەرەکی بوو لەسەر مەزهەبێکی سەربازی کە کاریگەری خۆی هەیە لەسەر تێکڕای پلانی سەربازی، لە کارمەندانەوە بۆ جبەخانە و ڕاهێنان. تیشک خستنە سەر جەنگی ناسەرنجدان لەسەر جەنگی نا ڕێکوپێک بۆ ئەمریکا مانای گرنگی زیاتردانە بە ئۆپراسیۆنە تایبەتەکان، و کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری و دژەتیرۆر و ئەوەی سوپا ناوی ناوە " ئۆپراسیۆنەکانی کەم بینین" ، و هەروەها زیاتر گرینگیدان بەو ئۆپەراسیۆنانەی کە بەهاوبەشی لەگەڵ هاوپەیمانان و هێزەکانی ناوخۆ ئەنجام دەدرێت. بەپێی ئەو پلانانەی لە ساڵی ٢٠١٢ ڕاپاگەیەنراوە، ژمارەی ئەندامانی فەرماندەی ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکانی ئەمریکا زیاد دەبێت، کە هێزی بڵاوکراوەی هەیە لە نزیکەی ٧٥ وڵات بە ڕێژەی ٦%، لە ٦٦ هەزار ئەندام لە ساڵی ٢٠١٢ بۆ ٧٠ هەزار لە ساڵی ٢٠١٧. لەگەڵ ئەم زیادبوونە ئەوە دەردەکەوێت کە ئەمڕۆ دەزگای دژە یاخیبوونی، بۆ نمونە، لەوانەیە جیاواز بێت لە جۆری ئۆپەراسیۆنەکان کە لە کتێبەکانی ڕێنمایی ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکاندا باس کراون. وەک توێژینەوەیەکی ئەم دواییەی زانکۆی بەرگری نەتەوەیی پێشنیاری کردووە، بزوتنەوە یاخوبووەکانی ئەمڕۆ کەمتر مەیلیان هەیە بۆ دواکەوتنی ئایدۆلۆجیا و

ڕابەریی جێگیر (شێوازی ڤیتکۆنگ)، وە زیاتر ئەگەری ئەوەی هەیە کە "هاوپەیمانی تووڕەکان" بن کە دەتوانرێت بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دروست بێت (بە شێوازی ڕاپەڕینی فەڵەستینییەکان).

سوپاکانی تر دەستیان کردووە بە کرداری هەموارکردنەوەی تایبەتی خۆیان، قەبارەی سوپای چین لە دوو دەیەی ڕابردوودا چۆتەوەیەک، هێزی زیادەی مرۆڤی بە تەکنەلۆجیای مۆدێرنتر گۆڕیوەتەوە. ئاستی بەشداریکردنی لە ئەرکە ئاشتی پارێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە و کە ئەم بەشداریکردنە پێشساڵی ۲۰۰۰ بێ نرخ بووە، و کەشتییە دەریاییەکانی چینی دەستیان کردووە بە چاودێریکردنی بەندەری زیاتر. سەرەڕای ئەوەش ڕفاندن و کوشتنی کرێکارانی چینی لەو ناوچانەی وەک سودان داوای بیرکردنەوەیەکی نوێیان کردووە کە چۆن چین دەتوانێت توانای خۆی بەهێز بکات بۆ پاراستنی ژمارەی گەشەسەندووی هاوڵاتیان و بەرژەوەندییەکانی لە دەرەوە. شیکەرەوە سەربازییەکان خەریکی هەڵکەندنن لە ئەزموونەکانی هێزە پێشەنگەکانی، وەک هێزەکانی ئەمریکا، چینی، هیندی، بەریتانی، فەڕەنسی و ئیسرائیلی بۆ گەڕان بەدوای "باشترین پراکتیزە" لە پێناوی ئامادەکاری کردن بۆ باشترین ئەرکی سەربازی لە جیهانی ئەمڕۆدا: کە ئەمانیش: دژە تیرۆر، دژە یاخیبوون، دەستێوەردانی مرۆیی و ئاشتی پارێزی.

ئەگەری دروستبوونی جەنگ لە بواری ئەلکترۆنی نیگەرانیەکی تایبەتی لێکەوتۆتەوە، لیستی هێرشەکان لە دەیەی ڕابردوو ڕادەی فراوانبوونی مەودای هەڕەشەکان دەردەخەن کە وڵاتەکان دووچاری دەبنەوە، بۆ نموونە ئەو هێرشانەی کە سیستەمەکان دەکاتە ئامانج بۆ پەکخستنیان یان دانانی بەرنامە زیانبەخشەکان تێیدا، یان هێرشەکانی سەر تۆڕە زانیارییەکان بە ئامانجی کۆکردنەوەی داتای هەستیار یان بڕینی پەیوەندیەکان، و هێرشەکانی سەر ژێرخانی سەرەکەی وەک

تۆڕی کارەبا. جەنگە سایبیریەکان پرۆسەکانی " جەنگی پەیامەکان" لەخۆدەگرێت؛ وەک بڵاوکردنەوەی دەنگۆیەکان و دووبارە ئاراستەکردنەوەی پێگە ئەلکترۆنیەکان بۆ مەبەستە جۆراوخۆرەکان. زۆر جۆری هێرشە ئەلکترۆنیەکان دەست نیشان کراوە کە سیستەمەکانی کۆمپیوتەرەیان کردۆتە ئامانج لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئێران و جۆرجیا و ئیستۆنیا و قیرگیستان و ئازەربایجان و وڵاتانی تر. هەروەها پێگاکانی کەرتە تایبەتەکانی وەک، تویتەر و گوگل، ئەمانیش دووچاری هێرش بوونەتەوە، بۆ نموونە، لە ماوەی تەنگەژەکانی هاوینی ٢٠٠٩ کە لە ئێران ڕوویاندا. هەرچۆنێک بێت، جەنگی سایبەر هێشتا نەگەیشتۆتە ئاستێک کە بەراورد بکرێت، بۆ نمونە، هێرشەکانی ٩\١١، ڕووداوێک کە زۆر گەورە بوو لە پێوەر، زیان و بڵاوبوونەوە، بە پلەیەک بووە هۆی کۆکردنەوەی داهاتەکان و پشتگیری جەماوەریی. بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە حکومەتەکان هێواش بوون بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ فەزای سایبەر وەک مەیدانێکی جەنگ، وە ئاشکرایە کە هاککەرەکان و هێرشبەرە سایبەرەکان هێشتا مەودایەکی فراوانی جوڵەیان هەیە لە ڕووی هەڵ وەرگرتن بۆ تێکدانی کاری هەستیاری حکومەت. بێشک کات فاکتەرێکی سەرەکیە لەم ڕووەوە: "مانەوە لە پێشەوەی هاککەرەکان گرنگە لەبەر ڕۆشنایی گۆڕانی خێرای سەرلێشێواو لە جیهانی ئینتەرنێتدا" عاموس یادلین، سەرۆکی هەواڵگری سەربازی ئیسرائیل گوتی: "وەڵامدانەوەی گۆڕان زیاتر چەند مانگێک دەخایەنێت، بە بەراورد لەگەڵ ئەوساڵانەی کە بەردەست بوون بۆ فرۆکەوانەکان".

بیرمەندی سەربازی ئەرکۆلا ئاماژە بەوە دەکات کە دواکەوتنی ئەنجامدانی هەموارکردنەوەی پێویست بۆ ڕزگاربوون لە دیمەنی جەنگی نوێی پەرشوبڵاو مەرج نییە هەڵەی عەقڵی سەربازی بێت. ئارکۆلا لە ساڵی ٢٠١٠ نوسیویەتی : "هۆشیاریی بەم کێشانە هێواش بووە، بەڵام لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا بە

شێوەیەکی جێگیر زیادی کردووە". بەڵام سەرکردە گەورەکان دەیانەوێت خۆیان بدەن بەدەستەوە بۆ ئەو چارەنووسە کە سەرچاوە دەگرێت لە باوەڕیان بەوەی کە سەرکردەکانی کۆنگرێس و پیشەسازی هەر هەوڵێک پوچەڵ دەکەنەوە بۆ گۆڕینی ڕیشەیی".

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە پاساوە پشتگیرەکان بۆ بەهێزکردنی سەربازی تەقلیدی بە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو و هێزی ئاگرینی باڵا وون بووە. بیرمەند جۆزێف نایی نووسەری چەمکی " هێزی نەرم" گوتی هێزی سەربازی " بەردەوام دەبێت لەدیاریکردنی شێوازی پێشبینیەکان و شێوەی حسابە سیاسیەکان". تەنانەت کاتێک و سوپای تەقلیدی بڵاونابێتەوە لە جەنگ ئەوا ڕۆڵی بەرپەرچدانەوەی هەر بە گرینگی دەمێنێتەوە. جۆزێف نای نووسیویەتی " هێزی سەربازی، لەگەڵ یاساکانی بەڕێوەبردن و دامەزراوەکان، یارمەتی دابینکردنی کەمترین ئاستی فەرمان دەدەن ". بەڵام ئەگەر دەسەڵاتی سەربازی ئەبستراکت چیتر بەس نەبێت بۆ گەرەنتیکردنی هەژموون، ئەوا پرسیارەکە پەیوەندی دەبێت بە چۆنیەتی دابەشکردنی سەرچاوەکان لە نێوان کۆڵەکەکانی دەسەڵاتی ئاسایی و جێگرەوە نوێیەکان کە تا ڕادەیەک بە ئەزموونن. کەس وا بیر ناکاتەوە کە تیرۆریستان بتوانن کۆتایی بە بوونی زلهێزەکان بهێنن، بەڵام بە دڵنیاییەوە دەتوانن کاریگەریان لەسەر هەڵسوکەوتەکانیان هەبێت و بێ بەشیان بکەن لەو بژاردانەی کە بە شتە ئاساییەکان ئەژمێردران.

### پارە کاریگەرترە لە فەرمانەکان

بەڕاستی چەتەی زێتاس چیە؟ ئەو تەنها یەکێکە لە زۆر لایەنی چەکداری بەشدار لە شەڕی درێژخایەنی دەرمانە بێهۆشکەرەکانی مەکسیک. ئەم جەنگە ڕێگەپێدراو نییە، لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦ تا سەرەتای ساڵی ٢٠١٢، نزیکەی

٥٠ هەزار کەس بەهۆی توندوتیژییەکانی پەیوەندیدار بە ماددە هۆشبەرەکانەوە گیانیان لەدەستداوە. حکومەتی مەکسیک بەهۆی ئەم جەنگەوە دەسەڵاتی خۆی بەسەر ڕادەیەکی گەورەی خاک و چالاکی ئابووریدا لە دەست داوە. لەم دیمەنەدا، چەتەی زێتاس بە تایبەت بەهێز دەردەکەوێت. چونکە کۆنترۆڵی ناوچە سەرەکییەکان دەکات لە باکوری ڕۆژهەڵاتی مەکسیک و چاودێری زۆربەی بارە دەرمانەکان دەکات بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕێگەی پەڕینەوەی لاریدۆی چالاکەوە. ئەندامانی ئەم میلیشیایە بە ٤٠٠٠ پیاو دەخەمڵێنرێت کە ناوبانگن بە بەدناوی و بەکارهێنانی تیرۆر لەو ناوچانەی کە تێیدا کار دەکەن، وە بە گەیشتنیان بۆ ناوچەکانی تری مەکسیک و سنووری ئەمەریکا. لە نێو زۆربەی ئەو ڕکابەرانەی کە مەکسیک ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لەم شەڕەدا، لەوانەیە چەتەی زێتاس بێت ترسناکترین و دڕندەترین چەتە. بەڵام ئەوەی لەوانی تری جیادەکاتەوە پێشینەی ئەندامەکانیەتی؛ ئەوان لە یەکە نوخبەکانی سوپای نیشتمانی مەکسیک و پۆلیسەوە ڕاکێشراون بۆ ئەوەی ببن بە سوپایەکی تایبەت بۆ کارتێلێکی کەنداو (Gulf Cartel). گەندەڵی و لە یاسا دەرچوون دوو شتی باون لە مەکسیک، بەڵام زیتاس پێشیخستووە بۆ ئاستێکی نوێ. ئێستاش زیتاس گۆڕانێکی تر بەخۆیەوە دەبینێت؛ لەگەڵ ئارامبوونەوەی ململانێی دەسەڵات لە نێوان چەتە ڕکابەرەکان زیتاس بووە بە ڕێکخراوێک بۆ بازرگانی ماددە هۆشبەرەکانی لەسەرپێ وەستاو، پاش ئەوەی کە میلیشیایەک بوو ئەندامەکانی کارە قێزەوەنەکانیان جێبەجێ دەکرد، وە ئێستا دەجەنگێت لە پێناو کۆنترۆڵکردنی بازارە سەرەکییەکان و ڕێگاکانی دابەشکردن، وە دەنگۆی ئەوە هەیە کە چالاکییەکانی فراوان کردووە بۆ ناوەوەی ئەوروپا لە ڕێگای دانانی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ڕێکخراوی ندرانغیتای تاوانکار کە لە ناوچەی کالابریا سەنتەریان گرتووە لە ئیتالیا.

## کۆتایی سەردەمی هێز

گۆڕانی زێتاسەکان لە سەربازانی حکومەتەوە بۆ سەربازە تایبەتەکان و دواتر بۆ قاچاخچییەکانی مادده هۆشبەرەکان توانای ئاڵوگۆڕکردنی ڕۆڵەکان لە شەڕەکانی ئەمڕۆدا دەردەخات. وە ئەم توانایە ڕەنگدانەوەکەی دەردەکەوێت لە کارەکانی ڕفاندن بەوەی کە سیفاتێکی بازرگانیە لە نێوان یاخیبووە عێراقیەکان، ئەوانەی زۆرجار خۆیان لە جەنگاوەرە کۆنەکانی سوپای سەدام حوسێنن، وە لە پەیوەندی تالیبان بە بازرگانی مادده هۆشبەرەکان؛ و لە هەڵکشانی چەتە دەریاییەکان. ئەم نمونانە ئەوە دەردەخات کە چۆن هەڵە ئابووریەکان لە پاداشتی مووچەدانەوە بۆ داهاتە گەورەکانی کە لە لایەن کۆمپانیا تاوانبارەکانەوە بە بێ ماندووبوون بەرهەم دەهێنرێن جوڵە بەو لایەنانە دەکات کە لە جەنگدا بەشدارن. پارە هەمیشە هاندەرێک بووە بۆ هەڵگرتنی چەک (و هەندێک جار بۆ دانانی چەک)؛ بەڵام لە ژینگەیەکی جەنگی نامەرکەزیدا، کە ئامرازی کاریگەرتر بە ئاسانی بەردەست دەبێت، ئەوا هاندەرە ئابوورییەکان هێزی تایبەتیان دەست دەکەوێت، و سوودەکانی گوێڕایەڵی سیستەمی فەرمان و کۆنترۆل بەو پێیە لاواز دەبن. لە تاوانەوە بۆ یاخیبوون و بۆ کۆمپانیا سەربازییە تایبەتەکان، هەڵی بازار زۆر دەبێت بۆ خاوەن ڕاهێنانە گونجاوەکان لە بواری چەک و خزمەتگوزاریە لۆجستیکەکان، کە خودی خۆی ڕێژەیەکی زیادەی لە تەکنەلۆجیا مەدەنیە تەقلیدیەکان لەخۆ دەگرێت.

بە واتایەکی تر فەرمانەکان لە شەڕەکانی ئەمڕۆدا کەمتر سەنگین و کاریگەرن لە هاندەرە ماددییەکان، لە سوپا تەقلیدیەکاندا مووچەدان بە پلەی دووەم دێت لە ڕووی گرینگیەوە، کەچی هاندەری سەرەکی بۆ بەشداریکردن وەفا، یان هاوولاتیبوون، یان هەستکردن بە ئەنجامدانی ئەرک یان ئامانج، و ئەم دیاردەیە کە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە بەدەرکەوت لە ژمارەی ئەو کەسانەی پەیوەندیان بە سوپای ئەمریکا کرد لە دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر. هەستی

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەجێگەیاندنی ئەرک درێژدەبێەوە بۆ هەندێک لە بزوتنەوەی یاخیبووەکان و بێگومان بۆ ڕێکخراوە توندڕەوەکانیش - کە بە داواکردن بۆ بەرگری لە زەوی دژی داگیرکەران سەربازی نوێ ڕادەکێشێت؛ یان داواکردن بۆ بەرگری لە ئایین دژی بێ باوەڕان. بەڵام پەرتەوازەبوونی ڕۆڵی سەربازی، و بەرزبونەوەی شێوازی ناسەربازی بۆ بەشداریکردن لەجەنگدا، مانای ئەوەیە کە نیشاندەرەکانی بازاڕو نرخ و پارەدانی دارایی و تێچوونی هەلی جێگرەوە ئێستا سروشتی توندوتیژی دیاری دەکات تا ئاستێک کە لەدونیای ڕۆژئاوای هاوچەرخ شتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە لە سەدەیەکەوە بەلایەنی کەم.

### هەڵوەشانەوەی هێزی سەربازی کاریگەری لەسەر هەمووان هەیە

ئەو چەقە هێزە ناوەندەی کە جەنگەکانی پەرتەوازەکرد، و توانای سەربازییەکانی هەڵوەشاندەوە، و ئەم تواناییانەیان گواستەوە بۆ جیهانێکی سەربازی-شارستانی تێکەڵاو، کاریگەریەکەی تەنها لەسەر سوپا نەتەوەیە زەبەلاحەکان نەبوو، چونکە تەنانەت یاریزانە تازەکانیش لە جەنگەکان مەترسی کەوتنیان لەسەرە وەک نێچیرێک بۆ هەمان پرۆسەی پەرتەوازەبوون کە لە بنەڕەتدا ڕێگەی بەرزبوونەوەیانی ئاسانکرد.

بۆ نموونە، لەسەر مرۆڤ نیە تەنهابۆ نموونە مرۆڤ دەبێت تەنیا سەیری بزووتنەوە جیهادییەکان بکات و زیاتر نا. هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر و هێرشەکانی پاشتر لە مەدرید و لەندەن، هەموویان دەرەنجامی چەند مانگێکی درێژ، بەڵکو چەند ساڵێک، بوون لە پلاندانان و هەوڵی تۆڕێکی خاوەن سەرکردایەتی بوو کە لە لایەن ئوسامە بن لادن و ئەیمەن زەواهیری نوێنەرایەتی دەکرا. هەموو هێرشەکانی بەم دوواییەی ڕێکخراوی قاعیدە بچووک بوون، تەنها بە پوچەڵکردنەوەیان نزیکتردەبوو لە کارێکی پێکەنیناوی بە لەبەرچاوگرتنی ئەو کەسایەتیانەی کە ئارەزوو دەکەن ببن بە خۆکوژ وەک بۆمبڕێژەکانی " پێڵاو" و

" جلی ژێرەوە". بۆچی شتەکان جیاوازن؟ یەکێک لە هۆکارەکان لەوانەیە باشتربوونی توانای دەزگاکانی دژە تیرۆر بێت بۆ پوچەڵکردنەوەی پیلانی گەورە پێش ئەوەی بگەنە ئامانجەکەیان. هۆکارەکەی تر هەرچۆنێک بێت پەیوەندی بە هەڵوەشانەوەی هێز و توانای ڕێخراوی قاعیدە، و کاریگەرییەکانی لەسەر چالاکییە جیهادییەکان و خودی قاعیدە هەیە. بیرمەند تۆماس ڕید هەڵسا بە لێکۆڵینەوەی " درزەکانی ناو بزووتنەوەی جیهادی"، ئەو ناوچە جۆراوجۆرانەی دۆزیەوە کە جیهادییەکان داگیریان کردبوو. ئەو بزوتنەوە یاخیبووە ناوەخۆییانەی کە دەجەنگان لە پێناوی زەوی عادەتەن ئارەزوویان نەبوو لە فراوانبوون لە گۆڕەپانی جیهانی. هەندێک لە یاخیبووانی جیهادی ڕوویان کردە تاوانی ڕێکخراو و قاچاخی کردن بە هۆکاری پارە و جێبەجێکردنی پەیامەکەی، و ئەوان لەم شتە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ چەتەکانی زیتاس نییە. زۆرێک لە جیهادییەکان هێشتا لە وڵاتانی دیاسپۆرا لە ئەوروپا و ئەمریکای باکوور و ناوچەکانی تر دێن کە خزمەتگوزاری ئینتەرنێتیان تێدا فەراهامە. هەندێکیان ڕێگایان دۆزیوەتەوە بۆ ناو ئۆپەراسیۆنی تەواوی سەربازی، بۆ نموونە عومەر شەفیق هومامی، کە لە ئەلاباما گەورە ببوو، لە خوێندکارێکی خۆشەویستی ئامادەیی لە ناوەراستی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گۆڕا بۆ فەرماندەیەکی جەنگی سەرەکی گەریلا لە سۆمال.

تۆماس ڕید و هاوکارەکەی مارک هێکەر دەڵێن: ڕوونی بەرژەوەندیەکان و تواناکان، و هەستکردن بە جێبەجێکردنی ئەرک، هەردووکیان جوڵە جیهادییەکان لە ناخەوە بێ توانا دەکات کە لە دەرەوە مەترسیدار و هەڕەشەدار بەدەر دەکەوێت. ئەم بێ توانایییە ناوەکییە لەنێوان ئەندامانی تاڵیباندا هەیە، کە لەلایەن چاودێرانی سەربازیەوە دابەشکراوونەتە سەر ئەو چەکدارانەی کە بە هاندەری ئایدۆلۆژی دڵخۆش دەبن و ئەو ئەندامانەی کە زیاتر لە کەسانی تر بە بەرژەوەندی تەسک و

دەستکەوتی داراییەوە کاردەکەن. لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ٤٥ گروپی تیرۆریستی ئەنجام درا کە کۆتاییان بە چالاکییەکانیان هێنابوو، و دەرکەوت ئەو گرووپانەی کە پێشتر شکستیان پێهێنرابوو تەنیا کەمینەیەک بوون، چونکە ٢٦ گروپ لە کۆی گشتی ئەم گروپانە لە ئەنجامی کاریگەری ناکۆکی ناوخۆییدا لە ناوچوون. ڕید و هێکەر باس لەوە دەکەن کە مۆدێلی ڕێگەپێدان بە گروپەکانی تر بۆ بەشداری کردن لە کردەوە تیرۆریستییەکانی سەر بە ئەلقاعیدە چەواشەکارانەیە، چونکە پێشنیاری ئەوە دەکات کە پلەیەکی زیادەڕۆیی لە سەرکردایەتی و هەماهەنگی هەیە بۆ هەڵسەنگاندنی واقیع. بیرمەندان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە ویکیترۆریزم، بە مانای گواستنەوەیەکی شل و پەراوێزی ئایدیۆلۆژیا و میتۆد و دڵسۆزی، شێوازی گواستنەوەی بیری جیهادیی باشتر وەسف دەکات، وە وایلێدەکان زیاتر بەربڵاوبێت و کەمتر کاریگەر بێت.

فڕۆکە بێفڕۆکەوانەکان، بۆمبە چێنراوەکان، بۆشایی سایبەری تەواو پڕچەکراو، چەکی ئاراستەکراو بە وردی، خۆکوژەکان، چەتەکان، تۆڕە تاوانبارە باش پڕچەکەکان و ترانسناسیۆنالەکان و گروپێکی زۆر لە یاریزانەکانی دیکەی چەکدار؛ هەموویان جیاوازی ڕاستەقینەیان لە دیمەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیدا دروست کرد. شێوەی داهاتووی ئەم دیمەنە نوێیە بە بەردەوامی دەگۆڕێ، و بۆیە ئەستەمە بە وردی پێناسەی بکەین. بەڵام گریمانەیەک هەیە کە دەکرێت بەبێ شەرمەزاری بخرێتەڕوو ئەویش ئەوەیە: هێزی دامەزراوە سەربازییە گەورەکان کەمتر دەبێت وەک ئەوەی لە ڕابردوو هەبوو.

# بەشی حەوتەم

## جیهان بۆ کێ دەبێت؟ مافەکانی ڤیتۆ، بەرگری و دزەکردن - یان بۆچی بارودۆخە جیۆپۆلەتیکیەکان بەرەوخوار دەچێت؟

لە ٢٨ی ئازاری ٢٠١٢دا ڕووداوێکی گرنگ ڕوویدا کە کەسی تێبینی نەکرد، ئەو ڕۆژە بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی دارایی ئوستراليا، قەبارەی تەواوی ئابووریەکانی وولاتە کەم گەشەسەندوەکان لە کۆی قەبارەی ئابووریەکانی وولاتە دەوڵەمەندەکان تێپەڕی. ئەو ڕۆژە کۆتایی هات بەوەی کە پیتەر هارتچەر، نووسەری ستوونی ڕۆژنامە، وەسفی کرد بە "خەلەلێکە سەدەیەک و نیو بەردەوام بوو چونکە چین تا ساڵی ١٨٤٠ گەورەترین ئابووری جیهان بوو" . وە بیتەر هارتشر لە کین کۆرتسەوە، یەکێک لە چاودێرانی بەناوبانگەکانی ئابووریەکانی ئاسیا، دەگێڕێتەوە کە " چینینەکان سەیری ئەم ڕووداوە دەکەن، و دەڵێن: ئێمە بە دووسەدەی خراپدا تێپەڕین، و لە ماوەی تەنها نەوەیەک هێزی جیهانی گۆڕا". تێپەڕبوونی کات ئەمە نەک هەر دەبێتە گۆڕانێکی ئابووری و دارایی بەڵکو گۆڕانێکی سیاسی و کەلتووری و ئایدۆلۆژیش دەبێت".

ئایا گۆڕانەکە هەر ئاوا دەبێت؟ سەرنجەکانی خوێنەران لەسەر ستوونی هارتچەر تێکەڵەیەکی ئاشکرای مشتومڕی دەستەبەر کرد کە خەمی بیرمەندان و سیاسەتسازانان لە هەموو شوێنێکە، ئایا لە چەند ساڵی داهاتوودا ئەو وولاتانە کێن کە لە لوتکەی سەرکردایەتی جیهاندا دەبێت؟ خوێنەر دێرێک لە کانبێرا نوسیوویەتی: "پێموانییە کە بۆ دەیان ساڵی داهاتوو شتێک دەبێت کە مایەی نیگەرانی ئێمە بێت، چونکە لە ڕووی تیۆریەوە چین و هیند دوو هێزی جیهانین،

بەڵام زۆربەی هاوڵاتیانیان ئاوەڕۆ و کارەبایان نیە ". خوێنەرێکی تر کە خۆی بە پەرڤیلەر ناودەبات نوسیویەتی: " با ئەو لەبەرچاو گیراوانەی ترمان بیر نەچێت کە پەیوەستن بە ئابووریە تازەکان: ناکۆکیە سنووریەکان، مافی ئاو و سەرچاوەکان، داهێنانەکان و موڵکە فکرییەکانی تر، و جیاوازیە ڕەگەزی، ئایینی و ئایدیۆلۆژیی، هەمەچەشنی کلتوری، ململانێیە مێژوویەکان و جەنگەکان و ...هتد، إلخ. بارودۆخەکە بۆ وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان ئاسان نابێت." دیڤید ڤێرمۆنت ئاماژەی دا بە پێویستی ڕەچاوکردنی " دابەشکردنی سامان لە نێوان دانیشتوانی ئەم وڵاتانە. بۆشایی نێوان (سامانی) هاونیشتمانیانی چینی مامناوەند و سەرمایەی هاوپیشەکانی حیزبی خاوەن ئیمتیازەکان، بە بۆچوونی من، ناتوانرێت پرد بکرێتەوە (وەک ئەوەی لە هیندستاندا هەیە)." خوێنەرێکی تر لە سیدنی کە خۆی بە کالدۆنیا ناودەبات زیاتر نیگەران بوو و نوسیبووی: باشە، ئەگەر ئابووری چین بڕوخێت ئەوا خۆت دەبینیتەوە کە لە سەرهێڵی بێکاری وەستاوی، و هەست بە بەخت دەکەیت ئەگەر بتوانیت کارێک بدۆزیتەوە وەک تەوالێت پاککەرەوە. ئەگەر چین بپژمێت، ئۆستڕالیا تووشی هەڵامەت دەبێت، و ئەگەر چین تووشی هەڵامەت بێت، ئوستڕالیا تووشی هەڵئاوسانی ڕێڕەوەکانی هەناسە دەبێت". ئەم بۆچوونانە هەڵگری گریمانە بنچینەییەکانن سەبارەت بەو هۆکارانەی کە دەوڵەت بەهێز دەکات بۆ ئەوەی ببێت بە دەوڵەتێکی زاڵ، دەوڵەتێک کە توانای سەپاندنی ئیرادەی خۆی بەسەر ئەوانی تردا هەبێت. وەک لەم بەشەی کتێبەکە دەرئەکەوێت، گۆڕان تەنیا لەسەر ئەو فاکتەرانە نەوەستاوە کە دەوڵەتی زاڵ دیاری دەکەن، بەڵکو خاوەندارێتی و بەکارهێنانی هێز لە سیستەمی نێو دەوڵەتیشدا وەرچەرخانێکی قووڵی بەخۆیەوە دەبینییێت.

بۆ چەندین سەدە ئەرکی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕکابەر لە نێوان دەوڵەتان و پێشبڕکێکردن لە پێناو خاک و سەرچاوەکان و کاریگەرییەکان لە پسپۆری

جەنەراڵ و باڵیۆزەکان بوو. وە لە ماوەی سەدەکانی نۆزدە و بیستەم نوێنەرانی زلهێزەکان هێزی سەربازی و ئابووری وڵاتەکانیان بەکارهێنا بۆ بردنەوەی جەنگ، و ڕێگەخۆشکردن بۆ هاوپەیمانیەتەکان، و پاراستنی ڕێگا بازرگانیەکان و ناوچەکانی، و دانانی یاساکان بۆ دەوڵەتەکانی تری جیهان. پاش جەنگی جیهانی دووەم کیانی زۆر سەرسورهێنەرتر سەریان هەڵدا، ئەویش هێزە گەورەکانە، و لە لووتکەی ئەم کۆمەڵەیە جێگیر بوو. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا، دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت لە کتێبەکانی مێژوودا ماڵئاوایی کرد، تەنیا یەک یاریزانی سەرەکی مایەوە: تاکە زلهێز، دەوڵەتی زاڵ، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. وە زۆرێک پێیان وایە کە ئەمە یەکەم جارە لە مێژوو کە ململانێی هێز لە نێوان وولاتەکان تەنها یەک براوەی ئاشکرا بێت، و لەوانەیە کۆتا براوە بێت.

سەیری بەڵگەکانی ویکیلیکس بکە کە زیاتر لە ٢٥٠ هەزار تێلیگرافی دیپلۆماسی ئەمریکای بڵاوکردۆتەوە. ئەم تێلیگرافانە، وەک جولیان ئەسانجی دامەزرێنەری ویکیلێکس وتی: "ڕادەی سیخوڕیکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ هاوپەیمانەکانی و نەتەوە یەکگرتووەکان ئاشکرا کرا،هەروەها لەگەڵ چاوپۆشیکردنی ئەمریکا لە گەندەڵی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لەو وولاتانەی کە دوای کەوتوون، و بەستنی گرێبەستی نهێنی لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە بە بێ لایەن ناسراوە؛ و هەژموونکردنی فشار لە بەرژەوەندی کۆمپانیا ئەمریکیەکان؛ و ئەو ئامادەکاریانەی کە دبلۆماسیە ئەمریکیەکان پەیڕەوی دەکەن بۆ خزمەتکردنی ئەو کەسانەی کە بە ئاسانی پیان دەگەن".

کاردانەوەی شیکەرەوە بەئەزموونەکانی، وەک جێسیکا ماثیوس، سەرۆکی ئەوقافی کارنگی لە واشنتۆن، کەوا ئەم شتە سەرسامکەرانە نەبوو، چونکە جێسیکا ماثیو بە گاڵتەجارییەوە ئاماژەی بەوەدا کە "ئەمە بە وردی ئەو شتەیە کە

هەمیشە زاڵ ئەنجامی داوە. بەڕاستی ئەمە ئەو ڕێگایەیە کە دەوڵەتە زاڵەکان هەڵسوکەوتی پێ دەکەن".

ئەوەی زۆرێک کە ئەو تێلیگرافانە دەریانخستووە ئەوەیە کە دەوڵەتێکی زاڵ تێدەکۆشێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، و لە لایەن بیرۆکراسیەکانی وولاتانی تر بە سیاسەتمەدارەکانی و ڕێکخراوە ناحکومییەکانی و هاولاتیانی ئاساییەکەی پەک دەخرێت. ئەگەر کەسێک سەیری هەر مانگێکی دیاری کراوی ئەم تێلیگرافانە بکات ئەوا دەبینێت:

وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەست بە نیگەرانی دەکات لەو کاتەی کە پەرلەمانی ئەوروپی ئامادەکاری دەکات بۆ دەنگدان دژی جێبەجێکردنی ڕێوشوێنی جیا لەسەر چاودێریکردنی دارایی تیرۆرستان و دابینکردنی تۆماری ناوی سەرنشینەکانی فڕۆکە.

ئەنجومەنی دۆمای ڕووسیا کۆمپانیاکانی کارتی کریدیتی ئەمریکا قەڵس دەکات بە نەدانی پارە ئەگەر بەشداری نەکەن لە سیستەمی نەتەوەیی تایبەت بە پارەدانی کارتەکانی کریدیت کە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەیەکی بەرچاو لە داهاتەکانی.

هەڵگیرسانی شەڕی درێژخیەن بۆ زۆرلێکردن لە حکومەتی تورکمانستان لەسەر گەڕاندنەوەی مافی نیشتنەوەی فڕۆکە سەربازیەکانی ئەمریکا.

- پەکخستنی ڕەتکردنەوەی حکومەتی کازاخستان بۆ بەخشینی لێخۆشبوونی باجی خۆماڵی بۆ کەلوپەلەکان و ئەو کەسانەی کە سپێردراون بۆ پاراستنی سووتەمەنی ناوەکی خەرجکراو، کە هەوڵێکی ستراتیژی زۆر گرنگە.

تەنانەت ئەو وولاتانەش کە بە شێوەیەکی تیۆری سەر بە وویلایەتە

## کۆتایی سەردەمی هێز

یەکگرتووەکانی ئەمریکان هەرئەوەتە گوێڕایەڵی دەکەن؛ چونکە ئیسرائیل بەرەنگاری داواکاریەکانی ئەمریکا دەکات لە دروستکردنی دانیشتگەکان لە ناوچە کێشە لەسەرەکان. ئەفغانستان، حکومەتێک کە پشت بەیارمەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دەبەستێت بۆ داپۆشینی بەشێکی زۆری بودجەکەی، پەیوەندی دۆستانەی خۆی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەپچڕێنێت بەهۆی جەنگی سەر خاکەکەی. واشنتن نیگەرانە لەوەی کە ئیسرائیل ڕەنگە بە یەکلایەنە بۆمبارانی دەزگا ئەتۆمییەکانی ئێران بکات، سەرەڕای هۆشدارییەکانی هێزەکانی ئەمریکا. وەک زبیگنیو برزینسکی، ڕاوێژکاری پێشووی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا پێی وتم، جیهان چووە ناو "سەردەمی دوای هەژمۆن"، کە "هیچ دەوڵەتێک دەسەڵاتی ئەوەی نییە کە ئیرادەی خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێت بە شێوەیەکی ڕاستەقینە یان هەمیشەییەوە".

ئەوەی بەسەر هەژموونی ئەمریکادا هات بوو بە بابەتی مشتومڕە بێ کۆتاییەکان، بیروباوەڕە جێگیرەکان زۆر بە توندی بەلاداچوون لە وەڵامی زنجیرەیەک ڕووداوی چاوەڕوان نەکراودا، لە سەرەتادا، کۆتایی ناکاوی جەنگی سارد، ئەو سەرکەوتنە ئایدیۆلۆجییەی کە بەو کۆتاییە نیشان دەدرێت، لەگەڵ گەشەی ئابووری ئەمریکا و پێشکەوتنی پەیوەندییەکان و تەکنۆلۆژیا لە سالانی نۆوەکاندا، هەموو ئەمانە وا دەردەکەوت کە دەرهاوێژی جیهانێکی تاک جەمسەری نوێ بکەن، جیهانێک کە تاکە زلهێزی گەورە دەتوانێت ئارەزووەکانی زالبوون پوچەڵبکاتەوە کە بە خەیاڵی هەموو ڕکابەرەکانی تردا دێت. بەڵام هێرشەکانی ٩\١١، و تاکڕەوی ئیدارەی بوش، و گەڕانەوەی بەرزبوونەوەی کەم و کوڕی دارایی، و گەشەی بەردەوامی چین، هەموویان کاریان لە دیمەنەکە کرد و گۆڕیان. لە ئەنجامدا دیدی دابەزینی هێزی ئەمەریکا بەهێز بووە و تەوژمێکی

پەیدا کردووە. ئەو نووسینانەی کە بە خەڵک دەڵێن ئیمپراتۆریەکان بە درێژایی مێژوو بەرەو کۆتایی ڕۆیشتوون دەرکەوتن، وەک نووسینی کۆلین مۆرفی "ئایا ئێمە ڕۆماین؟" لە ساڵی ٢٠٠٧ بڵاو کرایەوە.

٢٠٠٧.

هەڵبژاردنی باراک ئۆباما ئەم دیمەنەی بەدوور خستەوە ( دیمەنی چوونە دواوەی هێزی ئەمریکی ). لەناکاو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا باڵانسی ئەخلاقی خۆی لە جیهاندا بەدەست هێنایەوە، لەگەڵ "هێزی نەرم" ەکەی وەک سەرنج ڕاکێشانی ئەمریکایی کە وا دەردەکەوت بە خێرایی کەم دەبێتەوە تەنیا چەند ساڵێک لەمەوپێش. بەڵام سودە ماوەکانی سەرنج ڕاکێشانە جیهانییەکەی ئۆباما بەهۆی بەردەوامی قەیرانی دارایی ئەمریکا و ناهاوسەنگی دارایی قووڵ و هەمیشەیی و تێوگلانەکانی وویلایەتە یەکگرتووەکان لە عێراق و ئەفغانستان لاواز بوو. ئۆباما لە ووتاری باری یەکێتی لە ساڵی ٢٠١٢ گوتی: "هەرکەسێک پێت بڵێت کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە حاڵەتی کشانەوەدایە نازانێت باسی چی دەکات". گفتووگۆ لەسەر بارودۆخی جیهانی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەردەوامە، کە بە هەمان ڕادەی مانشێتی ڕۆژنامەکان یان ئامارە ئابوورییەکان بەڕێوەدەبرێن وەک لە تیۆرییەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتیە دێرینەکاندا هەیە، یان بەراوردە مێژووییەکان لەگەڵ ڕیزبەندی جیهانی لە سەدەکانی ڕابردوودا.

بەڵام هەر وەک چۆن هێزی ئەمریکا وا دیارە کە بێهێزە، بەڵام هێزی هەندێک لە ڕکابەرەکانیش وا دیارە. بە درێژایی زەریای ئەتڵەسی، یەکێتی ئەوروپا دەدۆزینەوە، ئەو پرۆژە بەرزخوازەی، کە زۆرێک پێیان وایبوو هێزێکی دژە ئەمریکی دەبێت، لە قەیرانێکی ئابووری وێرانکەردا نقووم بووە، کە لە لایەن بەڕێوەبردنێکی ناپراکتیکی بەستراوە، و ڕێڕەوەکەی هێور بۆتەوە بە هۆی دانیشتوانێکی بەتەمەنەوە، و هەروەها لێشاوێکی گەورەی کۆچبەران کە کیشوەری

ئەوروپا نازانێت چۆن جێگایان بکاتەوە. هەرچی ڕووسیایە، ڕکابەری دێرین و میراتگری داهاتەکان و توانا سەربازیەکانی یەکێتی سۆڤیەت، کۆمەڵگایەکی تری بەتەمەن، و دەوڵەتێکی خاوەن نەوتی ستەمکار هەوڵدەدات لە پێناوی دامرکاندنەوەی تورەیی جەماوەریە کە نزیکە لە تەقینەوە. سەرمایداری دوای ڕژێمی کۆمۆنیست، و دەستێوەردانی دڕندانەی دەوڵەت، و تاوانباریی ئاشکرای دوو دەیەی ڕابردوو، ئەم دەوڵەتە زەبەلاحەی گۆڕی بۆ دڕندەیەکی پەک کەوتە و پڕکێشە کە هێشتا خاوەنی جبەخانەی ناوەکییە، بەڵام تەنیا تارماییەکی ئەو هێزە گەورەیە کە بۆی ماوەتەوە.

وەک پێشتر باسکرا، ئەوانەی بەدوای بەڵگەدا دەگەڕێن بۆ دەرکەوتنی هێزێکی گەورەی نوێ وەڵامێکی ئاسانیان هەیە: لە ڕۆژهەڵاتدا زیندوویی و چالاکی هەیە. لە ڕاستیدا، بەپێی ڕوانگەی زمانی جیهانی، کە چاودێری سەرچاوەی یەکەمی میدیایی جیهاندا دەکات، هەواڵی "سەرهەڵدانی چین" بەردەوام بوو لە گرتنی گەورەترین ژمارەی خوێنەرانی سەدەی بیستویەکەمدا. چونکە ئابووری چین لە کاتی پاشەکشەی جیهانیدا بە توندی بەرەوپێش چوو، و توانا سەربازییەکانی بەردەوام لە فراوان بووندایە، هەروەها سەنگی دیپلۆماسیەکەی. لە ناوەڕاستی نۆوەدەکانەوە، ئابووری ئاسیایی دوو ئەوەندەی ئابووری ئەمەریکا یان ئەوروپا گەشەی کردووە. لە چاودێریکردنیان بۆ دوارۆژ، شارەزایان ناکۆک نین تەنها دەربارەی ڕادەی خێرایی ئابووری ڕۆژئاواییەکان نەبێت لە جێهێشتنی ئەوانەی دواوەیان. چونکە هەندێک پێشبینی هەیە ئاماژە بەوە دەدات کە ئابووری ئاسیا گەورەتر دەبێت لە ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا بەیەکەوە لە ساڵی ٢٠٢٠. هەروەها یەکێک لە پێشبینیەکان ئاماژە بەوە دەکات کە تەنیا چین بە ڕێژەیەکی زۆر سەردەکەوێت بەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٥٠؛ وە بە لەبەرچاوگرتنی هێزی کڕین ئابووری چین بە نزیکەیی دەبێتە

دووهێندەی ئابووری ئەمریکا لە ناوەڕاستی سەدەی ئێستاماندا، و دواتر هیند دێت بە جیاوازیەکی کەمتر، و پاشان یەکێتی ئەوروپی دێ لە پلەی سێیەم. ئەم پێشبینیانە مایەی نیگەرانی و مەترسین بۆ واشنترۆن؛ هەرچی لە پەکین هەست بە سەرکەوتن دەکرێت. هەروەک پێشتر بینیمان کە ئوسترالیەکانیش وەکو ئەوانی تر تێوەگلاون لەم مشتومڕە، و وەکو ئەوانیش دابەشبوونە.

پاش چین ڕکابەرە ڕاستەقینەکانی تر دێن. چونکە ئەو گەشەسەندنە خێرایەی کە هیند بەخۆیەوە دەبینێت و بەشداریکردنی لە یانەی چەکە ناووکیەکان و ئەوەی هەیەتی لە تەکنەلۆجیا و پێشکەوتنەکانی لە چالاکیەکانی دەرەوەی سەرچاوەکان، هەمووی ئاواتەکانی دووپاتکردەوە بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی گەورەی جیهانی. بەڕازیل بەسیاسەتی دەرەوەی کارای خۆی ئێستا شەشەم گەورەترین ئابووری جیهانە لەدوای لابردنی بەریتانیا، هەروەها پێگەی جیهانیشی بەرزبۆتەوە، بۆیە بازنەی گروپی هێزە دەرکەوتوەکانی ناسراو بە (بریکس)ی تەواو کرد ( بەڕازیل و ڕوسیا و هیندستان و چین و ئەفریقای باشوور). هەرکام لەم وڵاتانە بانگەشەی مافیان دەکەن لە کاریگەری هەرێمی، و هەروەها ئەزموونکردنی ڕۆڵە چڕ و نێوەندگیریەکەیان، و هەندێکجاریش زاڵ بێت بەسەر وڵاتانی بچووکتر و لاوازتردا. سەرەڕای ئەوەش هەریەک لەم دەوڵەتانە بەرەنگاری ئەو تایبەتمەندیانە بوونەتەوە کە دەوڵەتی زاڵ هەیەتی و پێشێلیشیان کردووە، ئینجا چ لە مامەڵە دووقۆڵییەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یان لە نەتەوە یەکگرتووەکان، و لە چەندین کۆڕی هەمەلایەنی دیکە.

بۆیە ئایا ڕەفتاری ئەم دەوڵەتانە مەترسی لەسەر سەقامگیریی ڕیزبەندی جیهانی دروست دەکات بۆ ئەوەی پێویست بکات ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرەنگاری ببێتەوە و بەرپەرچی بداتەوە؟ وە ئایا ئەو وولاتانە بە دوای بەدەستهێنانی گەورەترین قازانجی سەردەمی "ئاشتی ئەمریکین" و هیچ ئارەزوویەکیان نییە بۆ

هێنانەخوارەوەی؟ ئایا بەرزبوونەوەیان ئاماژە بۆ یەکپارچەیی سیستەمی تاک جەمسەریی دەکات کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەستی بەسەردا گرتووە، یان بۆ زوو بەرزبونەوەی ڕکابەرێکی گەورەی نەیاری وەک چین، یان بۆ گۆڕین بۆ سیستەمێکی نوێی فرە جەمسەری کە تێیدا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەنها هاوبەشێک دەبێت لە نێوان کۆمەڵێکی زیاتربوو لە هاوبەشەکان و ڕکابەرەکان و دوژمنەکان؟ وە چی دەبێت ئەگەر هەموو وولاتانی بریکس، یان هەندێکیان، تەنها لە کاتی ئێستادا پێگەیەکی هەبێت و لە ماوەیەکی نزیک بکەوێتە ناو ئەوکێشانەی کە بەهۆی هەژاری یان ناهاوسەنگی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی و ژینگەیی سەرهەڵدەدات؟ ئابووریەکانی وولاتانی بریکس و ئابووریە سەرکەتووەکانی تر پاش گەشەسەندنە خێراکەی دەستی بە هێوربوونەوە کردووە، ئەم ڕاستیەش دەکرێت ئەو نارەحەتیە سیاسیە بەگڕبخات کە بەردەوام هەبووە لەو کۆمەڵگایانەی کە گۆڕانکاری خێرا بە خۆیانەوە دەبینن. هەموو ئەم بۆچوونانە لایەنگری خۆیان هەیە کە ڕەچەتەی چارەسەرکەر دادەنێن دەربارەی ئەوەی کە دەوڵەت چی بکات بۆ بەرزکردنەوەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان و یارمەتیدان بۆ پاراستنی ئاشتی جیهانی، تا ئەوەندەی کە دەکرێت.

لە پەڕەکانی داهاتوو باس لەو هۆکارە دەکەین کە وادەکات بابەتی زاڵبوون گرینگ بێت لای بیرمەندە سیاسیە دەرەکی و سەربازیەکان، وە بۆچی گۆڕانکاریەکانی هێز لە نێوان وولاتە سەرەکیەکانی جیهان ئەو بانگەشانە لەخۆ دەگرێت کە بەسەر هەمواندا درێژ دەبێتەوە و کاریگەریان لێدەکات تا ئاستێک ئەو تیشکخستنەسەرە ڕووکەشە تێپەڕدەکات بەسەر هەرکەسێک کە خاوەنی گەورەترین تێکڕای بەرهەمی ناوەخۆیە یان گەورەترین سوپا، یان دەستکەوتنی زۆرترین ژمارەی مەدالیە زێڕەکان لە یاریە ئۆلۆمپیەکان. بەڵام ئەم بەشەی کتێبە دەربارەی چیرۆکێک یان ڕاستیەک دەسوڕێتەوە؛ ئەوەیش ڕاستیەکە کە زۆرجار وونبووە لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

گرینگی پێدانی ئەو کەسانەی باسی کێشەکانی سامانی نەتەوەیی و چاودێری ڕێڕەوەکەی دەکەن: هیچ وولاتێکی پارێزراو نیە لە پاشماوەکانی شۆڕشەکانی زۆربوون و جوولانەوە و عەقلییەتەکان، و هەڵوەشانەوەی هێز هاوتەریب لەگەڵ ئەم شۆڕشانە؛ لەگەڵ ئەوەی کە ئایا ئەم وولاتە لە لووتکە بووە یان هەوڵی گەیشتنی داوە، یان لەو وولاتانە بووە کە وا دیارە لە قوولایی گیربووە. ئەو گەشە سەرسورهێنەرەی بەرهەمهێنان و دانیشتوان، و گواستنەوەی کاڵاکان و بیرۆکەکان و مرۆڤ کە پێشتر نەبووە، و ئەوانەی هاوشانی ئەمانە دێن لە زیادبوونی ئاواتە جەماوەریەکان؛ هەموویان دەستیان کردووە بە لادانی ئەو بەربەستانەی کە دەبوونە هۆکار بۆ دەست نەگەیشتن بە هێز و دەرخستنی، ئەم ڕاستیەش لەسەر هەموو وولاتەکان جێبەجێ دەکرێت بەبێ ڕەچاوکردنی قەبارە، یان ئاستی داهات یان سیستەمەی سیاسی، یان هێزی سوپاکەی.

لەگەڵ ڕووخانی ئەو بەربەستانە، جیاوازی نێوان دەوڵەتە نوخبەکان لابرا کە توانای یاریکردنی گەمەی سیاسەتی دەسەڵاتیان هەیە، هەروەها توانای کۆنترۆڵ یان پشتگوێخستنی داگیرکەرانی پێشوو و دەوڵەتە ژێردەستەکان و قەوارە پەراوێزخراوەکانیان هەیە کە پێشتر هێزی گەورە بوونە. لە کاتێکدا سیستەمی زیرەکی پێشکەوتووی گرانبەها لە ڕابردوودا زانیاری کەمیان بەخشیوە بە هەندێک وولات، چونکە داتاکان و زانیارییە ئامادەکراوەکان کە بەردەستن ئەمڕۆ بازرگانین و سەرچاوەکانی ئینتەرنێت یارمەتی ویلایەتە بچووکەکان دەدەن بۆ پێشبڕکێ. وە لە کاتێکیشدا لە ڕابردوو ملیارەها دۆلار بۆ یارمەتیەکان بووە هۆی فەراهامکردنی نیەت باشی و ڕێکخستنی سیستەمە فەرمانڕەوا دڵسۆزەکان لە چوارچێوەی کاریگەری دەسەڵاتە گەورەکان، ئەوا سەرچاوەکانی یارمەتیە بیانیەکان ئەمڕۆ زیادی کردووە، لە وولاتە بچووکە بە تواناکانەوە تا ئەو دامەزراوانەی کە

داهاتێکی دارایی زۆریان هەیە زیاترە لە تێکڕای بەرهەمی ناوەخۆ لە وولاتەکانی تر. لە کاتێکدا کە هۆلیوود و ڕێکخراوی کۆمۆنیستی ئینتەرناسیۆنال (Cémentern) پێشتر کاریگەری کەلتووری بەهێزیان ئەزموون کردووە، بەڵام کۆمەڵگاکانی کۆنفۆسی و فیلمە بۆلیوودەکان و زنجیرە درامای کۆلۆمبییەکان ئەمڕۆ دڵ و مێشکی خەڵکیان بردۆتەوە.

توانای گەشەسەندنی وڵاتە بچووکەکان بۆ بەرپەرچدانەوەی فێڵەکان و پلانەکانی وڵاتە گەورەکان بەشێکە لە گۆڕانێکی گشتگیر کە توانایەکی زۆری بە ئەکتەرەکان داوە لە کاروباری نێودەوڵەتیدا. چونکە ڕێکخراوەکانی وەک ئەلقاعیدە و دامەزراوەی بیل گەیتس و کەناڵی جەزیرە، ئەجێندای تایبەتی خۆیان هەیە کە تا ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆن لە هەر وڵاتێکی دیاریکراو. وە بوونی تیرۆریستان و یاخیبووان و ڕێکخراوە ناحکومییەکان و کۆمەڵەی کۆچبەران و خێرخوازان و کۆمپانیا تایبەتەکان و وەبەرهێنەران و سەرمایەداران و کۆمپانیا میدیاییەکان و کەنیسە جیهانییە نوێیەکان بەکارهێنانی سوپا و باڵیۆزەکانیان بەلارێدا نەبردووە، بەڵام سنورێک دادەنێت لەوەی کە سوپاکان و باڵوێزەکان دەتوانن ئەنجامی بدەن، و کاریگەری هەیە لەسەر ئەجێندە نێودەوڵەتیەکان لە ڕێگای کەناڵەکان و ئامرازە تازەکان. سەیری فیلمی "کۆنی ٢٠١٢" بکە، کە لە لایەن چالاکوانێکی مەسیحی و فیلمسازەوە بە ناوی جەیسن ڕەسێل بەرهەمهاتووە، تێیدا داوای دەستگیرکردنی تاوانباری تۆمەتباری جەنگ جۆزێف کۆۆنی دەکات، و لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا کە لە یوتوب پەخش دەکرێت (نەک لە ڕێگەی کۆمپانیایەکی پسپۆڕ لە بڵاوکردنەوە لەم بوارە)، سەرنجی دەیەها ملیۆن بینەری ڕاکێشا، هەروەها بەخشینەکان، و پشتگیری ناودارەکانیشی بەدەست هێنا، و داواکاریەکان زۆرتر بوون بۆ جوڵانەوە بۆ دەستگیرکردنی کۆنی، ئەمە جگە لەو دەنگە تورەانەی کە هەندێک لە ئۆگەندیەکان دەریان کرد ئەوانەی دڵگران بوون

لەو ڕێگایەی کە وێنەی فیلمەکەی پێ گیرابوو. بەهەر حاڵ، فرۆشتنی چەک و بەرنامەکانی یارمەتی نەتەوەیی و هەڕەشەی داگیرکاری یان سزا بازرگانییەکان بەردەوامن لەڕۆڵی سەرەکی لەدیاریکردنی شێوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. هەموو دەوڵەتە بچووکەکانیش سەرکەوتوو نەبوون لە بەکارهێنانی شێوازی نوێ بۆ تیشک خستنە سەر هێزەکەیان.

کاتێک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و چین و ڕوسیا و زلهێزەکانی تر خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ململانێی سەربازی و بازرگانییەکان، دەبێت ڕەچاوی ئەم جۆرە چالاکیە نوێیە بکەن و کاریگەریەکەشی لەسەر سیاسەتی ناوخۆی و ئابووری و کەلتووری خۆی. وەک لە بەشی پێشوودا هاتووە، هەڵوەشانەوەی هێز بە شێوەیەکی بەرچاو بارودۆخی ململانێی نێودەوڵەتی گۆڕیوە. وە کاریگەری لەسەر چۆنیەتی پەیوەندی کردنی دەوڵەتەکان بەیەکەوە لە کاری دیبلۆماسی ڕۆژانە - ئەو تۆڕی پەیوەندییانەی کە شێوەی ژیانمان دیاری دەکەن و پارێزگاری لە ڕێکخستنی جیهانی ئێستاماندا دەکات - کەمتر قووڵ نییە. بۆ مەزەندەکردنی کاریگەریەکە، دەبێت ڕەچاوی ئەو هۆکارانە بکەین کە وایکردووە هەژموون و ناهاوسەنگی پێگەی هێزی گەورە لە سەرەتاوە زۆر گرنگ بێت. |

گرەوەکانی زاڵبوون

هەر کاتێک سیاسەتی جیهان بە ئاستەنگی گەورەدا تێپەڕ دەبێت، ئارماییەکانی جەنگ و ئاژاوە ئاشکرا دەبن و لە ڕاستیدا کاتێک پلە و پایەی زلهێزەکان دەگۆڕێن، ئەوا هەیبەت بە تەنیا لە مەترسیدا نابێت، بەڵکو سەقامگیری و تەنانەت مانەوەی خودی سیستەمی نێودەوڵەتیش.

وە کاتێک دەوڵەتەکان بەدوای بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆیاندا دەکەون، ئەوا ناچارە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی وڵاتانی تر بەریەک بکەوێت. لەوانەیە پێکدادانەکە پەیوەندی هەبێت بە زەوی، سەرچاوە سروشتییەکان، دەستگەیشتن بە

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

ئاو یان هەوای پاک، یان ڕێگا ئاویەکان، ئەو یاسایانەی کە فەرمانڕەوایی جوڵەی خەڵک دەکات، حەواندنەوەی گروپە نەیارەکان، یان چەندین بابەتی تری مشتومڕکەر. ئەم بێکداچوونە لە بەرژەوەندیەکان زۆرجار دەبێتە هۆی شەڕی سنوورەکان، و جەنگە بە نوێنەرایەتیەکان،

و ناکۆکیە هەرێمییەکان، حالەتەکانی هەڵگەڕانەوەکان، و ئۆپەراسیۆنە سیخوڕیە ناشرینەکان، و دەستێوەردانە مرۆییەکان، و پێشێلکارییەکانی دەوڵەتە سەرسوڕهێنەرەکان، و پرۆسەی جۆراوجۆری دەست بەسەرداگرتنی هێز. مێژوو دەرسێکی توند دەدات سەبارەت بەوەی کە چی ڕوودەدات کاتێک هێزە هەرێمییەکان ناتوانن ڕێگری لەو جۆرە ناکۆکیانە بکەن یان لەخۆیان بگرێت؛ بۆ ماوەی چەندین سەدە، لە جەنگی سی ساڵە تا جەنگەکانی ناپلیۆنەوە بۆ هەردوو جەنگە جیهانیەکانی یەکەم و دووەم، مەودای جەنگ و درێژکراوەکانی بە شێوەیەکی خوێناوی پێشکەوتووە کە ئاماژە بە خێر نادات.

لە ساڵی ١٩٤٥ەوە چەندین ناکۆکی هەرێمی وێرانکەر ڕوویدا کە بووە هۆی ڕووخانێکی زۆر بەبێ ئەوەی فراوان بێت بۆ جەنگێکی جیهانیی سەرتاسەری. بۆچی ئەم ئاشتیە بێوێنە و درێژکراوەی جیهان ڕووی داوە؟ هەژموون بەشێکی سەرەکی وەڵامەکەیە، بۆ ماوەی شەش دەیە، دەوڵەتەکان لە پێگای خۆیان نەپرسیوە لە ئاستی ڕیزبەندی نەتەوەکان یان ئەو سنوورانەی کە نابێت تێیپەڕێنن. وە لە سیستمی دوو جەمسەری جەنگی سارددا، هەموو جیهان بەتەواوی لەبازنەی دەسەڵاتی ئەمریکی یان سۆڤیەتدا بوون و دەوڵەتەکانی تر نەیانوێرا بەرەنگاری ئەم چوارچێوە گشتییە ببنەوە. وە هەر لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی سارد، تەنها یەک دەوڵەت - ویلایەتە یەکگرتووەکان - لە سەرووی هەموو وولاتانی تر بەدەرکەوت لە ڕووی هێزی سەربازی و ئابووری و هەروەها کاریگەری کولتوورییشەوە.

## کۆتایی سەردەمی هێز

تیۆری جێگیری هەژموونی کە لە ساڵانی ١٩٧٠دا لەلایەن چارلس ئەندلبێرگەر، پرۆفیسۆر لە پەیمانگای تەکنەلۆجیای ماساچوستس، دارێژراوە، بە روونی بنەمای زۆربەی مشتومڕەکانی ئەمڕۆ پێکدێنێت، بیرۆکە ناوەندییەکەی دەڵێت ئەو هێزە زاڵەی کە هەریەک لە توانای دەگمەن و ئارەزوو بۆ پابەندکردنی سیستەمی جیهانی هەیە، باشترین ڤاکسینە دژی ئاژاوەی نێودەوڵەتی مەترسیدار و گرانبەها. تیۆرەکە وای دەبینێت کە ئەگەر دەسەڵاتێکی زاڵ نەبێت ئەوا تاکە ڕێگا بۆ بەدیهێنانی ئاشتی و سەقامگیری ئەوەیە کە سیستەمێکی یاسایی و ستاندارد و پرەنسیپ و دامەزراوەیی دابمەزرێنێت کە هەموو دەوڵەتەکان ڕازین بە پابەند بوون لە بەرامبەر بەرژەوەندی ئاشتی و سەقامگیریدا. ئەمەش جێگرەوەیەکی ئاڵۆزە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئاراستە باشەکانی، چونکە هێزی زاڵ دەتوانێت ئەم سوودانە بەدەست بێنێت بە ڕێگایەکی زیاتر کاریگەر.

کەندالبێرگەر دەربارەی جیهانی نێوان هەردوو جەنگی جیهانی نووسیوویەتی، و دووپاتی کردۆتەوە کە ئاژاوەی ئابووری و سیاسی ئەو سەردەمە - ڕووخانی ستانداردی ئاڵتونی و خەمۆکی گەورە و ناسەقامگیری لە ئەوروپا و زیادبوونی هەڕەشەی فاشیستی - شکستی هەژموونی دەرخست. وە ئارەزوی بەریتانیا و توانەکەی بەرەو دواوە چوو لە بڵاوکردنەوەی هێزەکان و خەرجکردنی پارە بۆ پارێزگاریکردن لە باڵادەستیەکەی. وە تاکە دەوڵەتی ڕکابەری باوەڕپێکراو کە توانای گێڕانەوەی ئەو ڕۆڵەی هەیە، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەڵوێستێکی گۆشەگیریی وەرگرتبوو. نەبوونی دەوڵەتێکی زاڵ کە سەقامگیری بەدەست بهێنێت- دەوڵەتێک کە توانا و ئیرادەی سیاسی هەبێت بۆ بەکارهێنانی هێزەکەی لە پێناو پاراستنی سیستەم - بەشداربووە لە بڵاوبوونەوەی ئەو پاشەکشەیە لە کۆتاییدا بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم.

## کۆتایی سەردەمی هێز

بە بەکارهێنانی کۆمەڵێک پێوانەی فراوان بۆ مەزندەکردنی قەبارەی هێزی نەتەوەیی، لە دانیشتوانەوە بۆ بەرهەمهێنانی ئابووری و بۆ خەرجی سەربازی و توانای پیشەسازی، مێژووناسان ئەو ماوانەیان دیاری کردووە کە زاڵبوون ئەو لایەنە بووە کە تەنها دەوڵەتێک زۆر بە ئاشکرا چێژی لێ بینیوە، بە مانای بۆشایی نێوان ئەم دەوڵەتە و یەکێکی تر. بەڕای بیرمەند ولیام وۆلفۆرث، کە ئەم داتا شیکارییە فراوانانەی شیکردەوە، بەریتانیا لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی نۆزدەیەم و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەدوای جەنگی جیهانی دووەم، لە ساڵی ١٩٤٥ تا ١٩٥٥، بە دوو حاڵەت دادەنێت کە " ڕەنگدانەوەی گەورەترین توانای هێزە لە دەست سەرکردەی سیستەم". بەڵام ئەم دوو حاڵەتە کەم دەبێتەوە ئەگەر بەراورد بکرێت بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای جەنگی سارد. وۆلفۆرث لە ساڵی ١٩٩٩دا نوسیویەتی" وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یەکەم وڵاتی پێشەنگە لە مێژووی نێودەوڵەتی هاوچەرخدا کە باڵادەستییەکی یەکلاکەرەوەی هەیە لە هەموو پێکهاتە ئابووری و سەربازی و تەکنیکی و جیۆپۆلەتیکییەکان کە پشت بە بنەمای هێز دەبەستێت". وۆلفۆرث، بە دەربڕینی بۆچوونێک کە لەلایەن زۆرێک لە شیکەرەوەکانەوە دەنگی دایەوە - ئاماژە بەوە دەکات کە دەرکەوتنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک هێزێکی زاڵ بەشێوەیەکی تێکشکێنەر کە هیچ ڕکابەری باوەڕپێکراوی نیە لە هەموو بوارە جیاوازەکانی پێشبڕکێی نێودەوڵەتی، جیهانێکی تاک جەمسەری دروستکردووە. ئەمە پێکهاتەیەکی تەواو نوێ بوو لە مێژووی جیهاندا کە نەک تەنیا خاوەنی پێکهاتە پێویستەکان بوو بۆ ئاشتی و سەقامگیری جیهانی، بەڵکو توانای مانەوە و بەردەوام بوونیشی هەبوو لەگەڵ تێپەڕبوونی کات.

# کۆتایی سەردەمی هێز

## پێکهاتە نوێکان

سەرکەوتنی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەدابینکردنی سەقامگیریی جیهانی پشت بە هەژموون بەستوو یارمەتیدا بۆ هێنانەدی دوو ڕەهەندی نوێی دەسەڵات لەناو سیستەمی جیهانی. یەکێک لەو دوو ڕەهەندە" هێزی نەرم"ە، ئەو بیرۆکەیەی کە دەکرێت هێزی دەوڵەت لە ڕێگەی سەرنجڕاکێشی کولتوور و ئایدیاکانییەوە دەربیرێ و بەهێز بکرێت. ڕەهەندی دووەم بریتییە لە زۆربوونی نائاسایی ڕێکخراوەکان و پەیماننامەکان و یاسا نێودەوڵەتییەکان و ڕێککەوتنەکان کە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا لەلایەن زۆرێک لە وولاتەکانەوە واژۆ کراوە. ئەم چوارچێوەیە دامەزراوەییە گەشەسەندووە سیستەمێکی هاوکاری نێودەوڵەتی دروست کردووە کە لایەنەکانی تێدا بەشدارە و بابەتی زۆر زیاتر لە جاران دەگرێتەوە.

هێزی نەرم لە سەردەمی داگیرکاریدا پێشینەی زبری هەبوو (چ کۆلۆنیالیزمی ڕۆمانی و بەریتانی یان فەرەنسی)، و کۆلۆنیالیزم ئەرکی پەروەردەیی یان شارنشینیی گرتە ئەستۆ کە هەوڵی ئەدا دانیشتوانە داگیرکراوەکان فێری پرەنسیپ و شکۆکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بکات، لە ڕێگەی فریودان و دەستکەوتە مادیەکان و خۆشیە ڕووکەشەکان، یان لە ڕێگای بنیادنانی سیستەمی خوێندن و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری. بەڵام ڤێرژنی مۆدێرن، کە نەرمترین، بەرێزترین، ناسکترین و زیاتر پەیوەست بە پرەنسیپی یەکسانی، لەلایەن پرۆفیسۆری زانستە سیاسییەکان جۆزێف نای پێشکەش کرا، کە دواتر بوو بە بەرپرسێکی باڵا لە ئیدارەی بێل کلینتۆن لە ساڵی ١٩٩١، لە کتێبەکەی " ڕەهایی سەرکردایەتی سروستی گۆڕاوی هێزی ئەمریکی" کە لە ساڵی ١٩٩٠ دەرچوو. ئەم چەمکە ڕەگی داکوتا، و جۆزێف نای لە کتێبێکی ساڵی ٢٠٠٤دا بەناوی " هێزی نەرم" فراوانی کرد. ژێرنووسی ئەم کتێبە، "ئامرازەکانی سەرکەوتن لە سیاسەتی

جیهانیدا"، بیرۆکەی بنەڕەتی ئاشکرا دەکات.

هێزی نەرم، وەک جۆزێف نایی وێنای دەکات، جۆرێکە لە هێز کە پێوانەکردنی قورسە، بەڵام ئاسانە بۆ چاولێکردن و چاودێریکردن، ئەوە هێزی مۆم و ڕێزە، ئەو ناوبانگەیە کە لەلایەن دامەزراوە بەرێزەکانەوە بڵاودەکرێتەوە، ئەو ئابوریەیە کە ئەوانی تر خوازیارن هاوکاری بن یان ئاڵوگۆری لەگەڵ دا بکەن، و ڕۆشەنبیریەکی سەرنج ڕاکێشە. ئەم شێوازەی هێز لەوانەیە کەمتر قابیلی پێوانی ڕێژەیی بێت لە ژمارەی فڕۆکە

جەنگیەکان یان هێزە پیادەکان، یان ملیارەها بەرمیل نەوتی یەدەگ، بەلام نرخەکەی کەمتر ڕوون نیە. لە ساڵانی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم ئەوە ڕوون بوو کە دۆڵی سیلیکۆن و هۆلیوود چی زیاد دەکەن بۆ هێزی نەرمی ئەمریکا لە ڕێگای پێشەنگی لە داهێنانە تەکنەلۆجییە جیهانییەکان و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە سینەماییەکان کە تێکەڵ بە کەلتوری ئەمریکی بوون. هێزی نەرم بە تەنیا خەسڵەتێک نەبوو بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵکو هەژموونی ئەمریکا لەم بوارە نوێیەی هێزی زیندوو لە ناوەڕاستی ساڵانی ۱۹۹۰دا زۆر تەواو دیار بوو وەک زاڵبوونی لە بوارەکانی هێزە تەقلیدیەکان.

جیهان چێژی لە بەرزترین پلەی هاوکاری نێودەوڵەتی وەرگرت لە مێژوو؛ هەر لە دامەزرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ۱۹٤٥ حکومەتەکان زیاتر و زیاتر وەبەرهێنانیان کردووە لە پەرە پێدانی ئامرازی نوێ بۆ هاوکاری. وە لە ساڵی ۱۹۷۰ بۆ ۱۹۹۷ ژمارەی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان زیاتر لە سێ ئەوەندە بووە، وەزارەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەڵدەستێت بە بڵاوکردنەوەی لیستێکی پەیماننامەکان کە ئێستا وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کاری پێ دەکات، ئەم لیستە نزیکەی ٥٥۰ لاپەڕەیە، هەزاران پەیماننامە دەخاتەڕوو کە هەمووشتێک لەخۆ دەگرێت لە وورچەکانی جەمسەر و جولەی هاتووچۆ تا

## کۆتایی سەردەمی هێز

سوتەمەنی ناوەکی. پێوەرەکانی هەڵسوکەوت کە لە مەودایەکی فراوان کۆدەنگی لەسەر دراوە بە گوێرەی دەوڵەتەکان و سیستەمی ڕێککەوتنامەکان و ڕێکخراوەکان سەدەیەک پێش ئێستا نەدەکرا پێشبینی بکرێت. هەموو شتێک بەڕێوەدەبات لە مامەڵەکردنی زیندانیانی جەنگەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ماسیگرەکان و گومرگی پەیوەندییە تەلەفۆنییە نێودەوڵەتییەکان. هەروەها ڕێکەوتن یان ڕێکخراو هەیە بژاردەی وولاتەکان سنوردار دەکات، و بوارێک بۆ تێگەیشتن و چارەسەرکردنی جیاوازیەکان فەراهام دەکات لە هەموو بوارەکانی بازرگانی و پشتگیری دارایی و پەیوەندیەکان و کۆچکردن و بۆشایی دەرەوە و زۆربوونی ناوکی و ئەو جۆرانەی مەترسی لەناوچوونیان لەسەرە و پەتایەکان و تیرۆریزم و تاوان.

بیرمەندان ئەمە بە سیستەم ناودەبەن، کۆمەڵێک یاسا و پلاتفۆرم کە مامەڵە لەگەڵ بابەتێکی دیاریکراوی بەرژەوەندی هاوبەشدا دەکەن. کاتێک کە ئاڵنگاریەکی نوێی جیهانی دێتە ئاراوە، گۆڕانی کەش و هەوا یان قەیرانی دارایی دەتوانێت نمونەیەکی تازە بێت، غەریزەیەکی بەهێز هەیە کە پاڵ بە دەوڵەتەکانەوە دەنێت بۆ چاوپێکەوتن و هەوڵدان بۆ دروستکردنی سیستمێک کە لە ڕێگەیەوە بە یەکەوە دووچاری ئەم ئاڵنگاریە ببنەوە، نەوەک هەر دەوڵەتێک بەتەنیا پارێزگاری لە خۆی بکات. ئەم ڕەفتارە زۆر جیاوازە لە سیاسەتی هەلپەرستانەی نێوان دەوڵەتەکان و بەرژەوەندی تەسکی خۆپەرستی کە ماککافیلی و تۆماس هۆبس کاتانێک بە ئۆبلیسک ( مۆنۆمێنتێکی درێژ و چوار لا و تەسک)یان دائەنا. ئەمرۆ، وە لە جیهانێک کە لە ڕابردوودا نەئەتوانرا پێشبینی بکرێت، بە نزیکەیی ٢٠٠ دەوڵەتی سەربەخۆ و خاوەن سەروەرییەوە، کۆدەنگییەکی ئەخلاقی هەیە لەسەر ڕەفتاری گونجاوی دەوڵەتەکان گەورەتر لەوەی کە مرۆڤایەتی تا ئێستا دەیزانی لە هەر کاتێکی پێشتر.

تێکەڵبوونی هەژموون و پرەنسیپەکان بەسوود بووە بۆ سەقامگیریی جیهانی، و

ئەو دوو ڕێبازە کاریان لەگەڵ یەکتر کردۆوە لە جێگای ڕکابەری، خودی سیستەمی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەگەڵ کورسییە هەمیشەییەکانی و مافی ڤیتۆ لە ئەنجومەنی ئاسایش، بۆ پتەوکردنی هێزی سەرکەوتووانی جەنگی جیهانی دووەم دامەزراوە بەتایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەبەرگەی زۆرێک لە بارە تەقلیدییەکانی پەیوەست بە هژمۆنی گرتووە : بڵاوەپێکردنی سەربازان لە ئەوروپا و ئاسیا، و کارکردن وەک پۆلیسی جیهانی و جێبەجێکردنی پلانی مارشاڵ، و بەژداریکردن بە پشکی شێر لە بودجەی نەتەوە یەکگرتووەکان و بودجەی ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی تر. هەرچی ڕکابەرەکانی، یەکێتی سۆڤییەت، ئایدیۆلۆژیا و نەوت و چەکەکانی بەکارهێناوە بۆ پشتگیریکردنی کوتلەیەک لە دەوڵەتە پشتگیرەکانی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و لە سەرتاسەری جیهانی گەشەسەندوودا. وە لە ئەنجامی مەترسی وێرانکاری بێگومانی ناوەکی هەردوولا، هاوسەنگی هەردوو دەوڵەت هیچ بوارێکی ئەوتۆی نەهێشتۆتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی ململانێیە ناوەخۆییەکانن. یەکسەر دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت هەموو سەروەری و بارگرانی دەوڵەتی زاڵ گوازرایەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. چونکە خاوەنی سەروەرییەکی گەورەی سەربازی و گەورەترین ئابووری جیهان و وەبەرهێنان و پەیوەندییە بازرگانییەکانی جیهان و سیستەمێکی سیاسی بەهێز و جێگیر و خاکێکی نەتەوەیی پارێزراو بە ڕێگایەکی زۆر باش و تۆڕێکی بەهێزی دیبلۆماتکارەکان و سەرباز و سیخوڕەکان لە هەر کونجێکی گرنگی جیهان. هاوکات تۆڕی ڕێککەوتن و پلاتفۆرمە جیهانییە بەرچاوەکان ڕێگربوون لە توند و تیژی و ئاراستەکردنیان بەرەو گفتوگۆ و ڕێککەوتن. وا دەرکەوت کە تیۆریزانانی سەقامگیریی دەربارەی هەژموون لەسەر ڕاست بوون، چونکە ئەو هێزە پتەوەی کە لە چەک و پارەوە هاتووە، و ئەو هێزە نەرمەی کە لە لایەن کلتور و بیرۆکەوە دروست بووە، و پەیوەندی سەپێنراوەکانی نێوان دامەزراوەکان، هەموویان

## کۆتایی سەردەمی هێز

مانای ئەوە دەدەن کە سەلامەتییەکی دووروودرێژی ئەمریکی چاوەڕوانی جیهان دەکات.

### ئەگەر هەژمۆن نەبێت، ئەدی چییە؟

دوای دە ساڵ، وێنەکە ئاڵۆزتر بوو، هێرشەکانی ١١ ی سێپتەمبەر بەرگری ئەمریکای لە هێرشی ناوەخۆ تێکشکاند. و ناکۆکییە نەگونجاوەکانی عێراق و ئەفغانستان سنووری هێزی سەربازی خۆیان نیشان دا. و قەیرانی دارایی و پاشەکشە گەورەکە خاڵە لاوازییەکانی ئابووری دەرخست. لە ژێر هەردوو پارتە سەرەکییەکەی، ئیدارەکەی تووشی جەمسەرگیری سیاسی ناوخۆیی بوو. بەڵام لە هەمان کاتدا، هیچ ڕکابەرێکی ڕوون دەرنەکەوت. چونکە چین و هیندستان گەشەی گەورەیان بەدەست هێناوە بەڵام دوورن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و خاڵی لاوازیی ناوخۆیی جدییان هەیە. هەروەها ئەو هێزانەی کە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن سوود وەرگرن لە خاڵە لاوازییەکانی ئەمریکا، هیچ هاوپەیمانی و پەیمانێکی گرنگیان بۆ بەدەستهێنانی ئەمە دروست نەکردووە. توخمەکانی هاوسەنگی هێزی تەقلیدی - کە بە هۆیانەوە دەوڵەتەکان پلان دادەنێن بۆ بەرنگاربوونەوەی کاریگەری هاوپەیمانی وڵاتانی تر بە هەمان هێز، و بواری کاریگەریان کەم بکەنەوە - بە جێگیری ماوەتەوە. ڕوونە کەوا چەند وڵاتێک پێشبڕکێ دەکەن لە گفتوگۆ جیهانییەکان بۆ سەرکردایەتی لە هەموو شتێکدا، لە یاساکانی بازرگانییەوە بۆ گۆڕانی کەش و هەوا، بەڵام ئەمە زۆر جیاوازە لە کۆکردنەوەی چەک لە سنوورەکان. چونکە لەوەتەی کۆتایی پەیمانی وارسۆوە، هیچ هاوپەیمانییەکی سەربازی دژی ناتۆ دروست نەکراوە کە ئەمریکا سەرۆکایەتی دەکات. لەگەڵ ئەوەش پراکتیزەکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە لەڕووی سیاسییەوە لە ناوەخۆ دابەشکراوە، بۆ زاڵبوون جێگەی

پرسیارە. کەواتە چی ڕوودەدات؟ ئەم هەستەی ناڕەحەتی لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا نیگەرانی و دڵەڕاوکێیەکی زۆری لێ هەڵگەڕاوە.

یەک وەڵام بۆ ئەم دۆخە ئاماژەکردن بوو بە نیشانەکانی پاشەکشێی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەگەڵ کەمبوونەوەی توانای ئابووری و ئیرادەی سیاسی بۆ پێدانی خەرجیەکانی هەژمون. ئەمە بابەتێکی زۆر دووبارەیە: لە کتێبە بەناوبانگەکەی لە ساڵی ١٩٨٧دا "سەرهەڵدان و کەوتنی زلهێزەکان"، مێژوونووس پاول کێندی باسی لە ٥٠٠ ساڵ گۆڕانکاری لە سیستەمی هێزی جیهانیدا کرد و کۆتایی پێهێنا بە هۆشداریدان دەربارەی شکانی هەژموونی ئەمریکا بە پشتبەستن بە ئەزموونی ئیمپراتۆریەتەکانی پێشوو کاتێک کە داڕوخان بەهۆی نەبوونی توانای دابینکردنی سەرچاوەکان و کۆکردنەوەیان بۆ پشتگیریکردنی پڕۆسە سەربازیەکان کە لە سەرەوەی توانایان بوون. وادیاربوو کە ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت وەک ئەوە بێت کە پێشبینییەکانی کێندی بهێنێتەدی، بەڵام لە جیهانی دوای ٩\١١ ئەم پێشبینیانە دیسان گرنگ بە دیار کەوتنەوە. تەنانەت لایەنگرانی هەژموونی ئەمریکاش ترسی ئەوەیان هەبوو کە گەورەترین مەترسی بۆ سەر ڕیزبەندی جیهانی بەرزبونەوەی هەندێک ڕکابەری هەڵخەڵەتێنەر نەبوو، بەڵکو لە شکستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ڕۆڵگێڕانی خۆی بووە. نیاڵ فێرگسۆنی مێژوونووسی بەریتانی لە کتێبی "زەبەلاح: پاشان ئیمپڕاتۆڕیەتی ئەمریکا" ساڵی ٢٠٠٤ی خۆیدا ووتی: کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێویستی بەوەیە کاری زیاتر بکات بۆ ئەوەی وەک "ئیمپراتۆریەتییەکی لیبراڵی" بەرپرسیارێتی سەرکردایەتی خۆی لە ئەستۆ بگرێت. فێرگسۆن ئەوەشی زیاد کرد کە هەموو ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە لە سەردەمی دوای جەنگی جیهانی دووەمدا هەن بەس نین بۆ چارەسەرکردنی هەڕەشەکانی دەوڵەتە سەرلێشێواوەکان، یان تیرۆریزم یان نەخۆشییەکان، کە تەکنەلۆجیا تەوژمێکی نوێی پێداوە. و "ئەوەی

## کۆتایی سەردەمی هێز

پێویستە هێزێکی نوێی چالاکە کە توانای دەستتێوەردانی هەبێت، بۆ لەخۆگرتنی پەتاکان، و ڕووخاندنی دیکتاتۆر و ستەمکارەکان، و کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ بێنێت و ڕیشەکێشکردنی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان". بە واتایەکی تر ئەوەی پێویستە دەوڵەتێکی زاڵ و بەتوانا و کاریگەرە.

چەندین تێڕوانینی جیاواز هەیە لەسەر داهاتووی ڕکابەری نێودەوڵەتی، بیرمەندی پارێزگار ڕۆبێرت کیگان پێشبینی دەکات کە "سەدەی بیستەم هاوشێوەی سەدەی نۆزدەیەم دەبێت"، لەڕووی ڕکابەری زلهێزی وەک چین و ڕوسیا و هیندستان و ئەوروپایەکی یەکگرتوو لە پێناوی سەرکەوتن. تێڕوانینێکی تر ئەوەیە کە ئەگەر هێزە ڕکابەرەکان بە ئاشکرا بەرەنگاری هەژموونی ئەمریکا نەبنەوە، ئەوا ئەو ڕێگایانە بەکاردێنن کە بە "هاوسەنگی نەرم" ناسراوە، وەک ڕێککەوتنە نافەرمییەکان، کوتلەی دەنگدان لە پلاتفۆرمە نێودەوڵەتییەکاندا، یان ڕەتکردنەوەی داواکارییە دیپلۆماسی و سەربازیەکانی ئەمریکا بە ئامانجی کۆتکردنی و لاوازکردنی. بیرمەندانی تر مەترسیەکانی تری، وەک مەترسی فیرگسۆن، بە زیادەڕۆ دەبینن؛ چونکە هەژمونی ئەمریکی بەم شێوەیە خەلەلی تێ نەکەوتووە. تەنانەت لە جیهانێک کە ڕکابەری نوێ و جەمسەری دەسەڵاتی هەمەجۆری تێدایە - جیهانی دوای سەردەمی ئەمریکی، هەروەک فرێد زەکریا ناوی نا- ئەوا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چێژ لە سوودە دەگمەنەکان دەبینێت بۆ زیاد کردنی هێزی نەوەک لاوازکردنی.

هێشتا ئەوانی تر ئەترسن کەوا ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ئابووری جیهان و شێوازی ژیانمان ڕوویاندا ڕیشەیی بن بە شێوەیەک چیتر هەژمون یان بنکە جیهانیەکان ئەگەری بوونیان نەبێت. هەروەها ئەترسن لەوەی کە شێوەیەک لە شێوەکانی ئاژاوە - دۆخی سەرەتایی سیستەمی جیهانی - دەستی بە دەرکەوتن

کردووە. چونکە هەر لەساڵی ١٩٩٤ەوە ڕۆبرت کابلان تێبینی ئەو ئاژاوەی کرد کە سەرچاوە دەگرێت لە وڵاتە شکستخواردوو و ڕکابەرە کۆنەکانەوە، و سەرکەوتنی تۆڕە تیرۆرستی و تاوانیەکان کە بەرەنگاربوونەوەیان نیە، و لاوازی جیهانی بەیەک بەستراو، و خێرایی کاریگەری بە بڵاوبوونەوەی پەتاکان و کارەساتەکانی تر. ڕەنگە بێزارکەرترین ڕوانین لەلایەن پرۆفیسۆری زانستە سیاسییەکان ڕاندال شوایلەرەوە خرایە ڕوو، ئەو گۆڕانکارییانەی ئێستا لە جیهاندا ڕوو دەدات ئەچوێنێ بە سەرەتای ئاژاوە لە زانستی سروشتیدا، کاتێک سیستەم تێک دەچێت تا ئەو ڕادەیەی کە سروشت بە جۆرێک دەگۆڕێت کە ئەستەمە بوەستێنرێت و بیگەڕێندرێتەوە دواوە. شوایلەر پێی وایە کە زۆربوونی زانیاری و پەرتەوازەیی ناسنامە و بەرژەوەندیەکان، سیاسەتی نێودەوڵەتی لە بنچینەدا هەرەمەکی دەکات. دەشڵێت: "ئاژاوە دەسەڵاتی بەکارهێنراو لە ڕژێم کەم دەکاتەوە لێکی ئەترازێنێ، و کەس نازانێت دەسەڵات لە کوێیە چونکە لە هیچ شوێنێکدا نیە، وە بە بێ دەسەڵات هیچ جۆرە یاسایەک ئەگەری بوونی نابێت".

ئاشکرایە کە ڕیزبەندی جیهانی لە گۆڕانێکی بەردەوامدایە. هەرچەندە گفتوگۆکانی پێشوو گرینگن، بەڵام ڕەنگدانەوەی ئەو ڕاستیانە نیە ئاخۆ تێڕوانینە سەرەکیەکان لەسەر ئەو ناراستەیەی کە جیهان تێیدا دەجوڵێت تا ئەو ڕادەیە ڕوونە و کەوتۆتە ژێر حیکمەتێکی تەقلیدی گۆڕاوەوە. چەمکی لاوازبوونی هێز یارمەتیدەرە بۆ ڕوونکردنەوەی وێنەکە.

کێ لە گورگە خراپە گەورەکە دەترسێت؟

## هەڵوەشانەوەی تەقلیدی هێز

لە بنچینەدا گۆڕانکارییەکی کەم لەو ئامرازانە کراوە کە لەلایەن هێزە گەورەکانەوە بەکاردێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا،

## کۆتایی سەردەمی هێز

وەک چەک و پارە و شارەزایی دیپلۆماسی هەمیشە سەرکەوتوو بووە، هەروەها سوپایەکی بەهێز کە بە تازەترین کەرەستە و ژمارەیەکی زۆر لە جەنگاوەرە لێهاتووەکان ئامادەکراوە؛ و ئابووریەکی گەورە، و تەکنەلۆجیایەکی پێشکەوتوو، بنکەیەکی پتەو لە داهاتە سروشتیەکان؛ و ستافی دڵسۆز و ڕاهێنراوی باش لە دیملۆماتکاران و پارێزگاران و سیخوڕەکان؛ و ئایدۆلۆجیا یان سیستەمەی بەها سەرنج ڕاکێشەکان، ئەمانە هەمووی بەردەوام سەرچاوەی سەرەکی بوونە بۆ دەسەڵاتی نێودەوڵەتی. لە هەموو سەردەمێکی مێژووییدا، ئەم خەسڵەتانە سوودێکی بەخشیوە بە نەتەوە هەرە ئاوەدان و گەشەسەندوو و ئابووری پێشکەوتوو و جێگیری سیاسی و دەوڵەمەند بە سەرچاوەکان. سەرمایەی خاو خودی خۆی کەم نەبۆتەوە. ئەوەی کە دەست دەکات بە تەسک بوونەوە، کاریگەری ئەو ئامرازە تەقلیدیانەیە کە پشتی پێ دەبەسترێت و قابلیەتی بەکارهێنانی و کارتێکردنەکەی؛ ئینجا چ هێزی سەربازی یان ئابووری یان نەرم بێت.

### لە هێزی یەکلاکەرەوە تا سەردەمی هاوپەیمانیە بارە کاتییەکان

هەروەک لە بەشی پێشوودا بینیمان وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر لە کۆی هەموو وولاتانی تری خەرجکردووە لە جبەخانە و سوپا و خزمەتگوزاریە لۆجستیەکانی، ئەمەش خەرجکردنێکی بێ سوود نییە. ئاشتی ئەمریکایی، کە باڵادەستیی سەربازیی ئەمریکا ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی کۆتایی دەگێڕێت بۆ سەقامگیریی، هەر وەک واقیعێکی ڕاستی ماوەتەوە. ئەمڕۆش وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە شێوەیەکی فەرمی هەڵساوە بە گرەنتی کردنی زیاتر لە ٥٠ دەوڵەت. هێشتا جیاوازی لە خەرجکردنی سەربازی لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و وولاتانی تر - هەروەها فراوانبوونی گەورەی سەربازی ئەمریکا لە ١٣٠ وولات - بەندە بەو یەکە سەربازیە زەبەلاحانەی کە سەنتەریان گرتووە لە بنکە

ماوە درێژخایەنەکانەوە تا یەکە سەربازیە بچووکەکان کە لە بوارەکانی ڕاهێنان و پاراستنی ئاشتی و ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکان و چالاکیەکانی دژە یاخیبوون کاردەکەن.

هەروەها ئەمریکا سەرکردایەتی ناتۆ دەکات؛ کە گرنگترین هاوپەیمانی سەربازی جیهانە؛ و تەنها هاوپەیمانیە لە ڕووی قەبارە دوای ڕووخانی پەیمانی وارسۆی ڕکابەر. ئەمەش بەهێزترین نیشانەری زاڵبوونە کە دەتوانێت بوونی هەبێت. هاوپەیمانیەکان هەمیشە ئامرازێکی گرنگ بوون لە سیاسەتی زلهێزەکان، و پشتگیریکردنی دیپلۆماسییەتی بە هەڕەشەی ڕاستەقینە بە کردەی سەربازی، و سەپاندنی بوارەکانی کاریگەری و ناوچە سنوورداەکان بۆ ئەوانی تر، و بەرپەرچدانەوەی هێرشەکان بە دەستەبەرکردنی بەرگری هاوبەش. بە واتایەکی تر، ئەم هاوپەیمانیانە بلۆکی دروست کردنی ڕیزبەندی جیهانی بوون. چەند دەیەیەک شێوازی هاوپەیمانیەتی لە جیهاندا جێگیر ماوەتەوە، و ناتۆ و پەیمانی وارساو ڕژێمێکی توندیان بەسەر هەردوو بەرەی پەردەی ئاسنیندا سەپاند. لە جیهانی گەشەسەندوودا، دەوڵەتە تازە سەربەخۆکان زۆریان لێکرا یان ناچارکران یان خرانە نێو هاوپەیمانیەتەکان لەگەڵ ڕۆژئاوا یان کوتلەی کۆمۆنیستیدا. |

ئەمڕۆ وە بۆ زیاتر لە دە ساڵ دوای ئەوەی ئەندامانی پەیمانی وارسۆ پەیمانیەتەکەیان لە تەمموزی ١٩٩١ هەڵوەشاندەوە، ناتۆ هەر بە سەرکەوتوویی مایەوە. لە ڕاستیدا سێ کۆماری سۆڤیەتی پێشوو و حەوت وڵاتی دیکەی ئەندامی کوتلەی سۆڤیەتی پێشوو چوونە پاڵ ناتۆ. ناتۆ و ڕووسیا تا ئێستاش هەر وەک ڕکابەری یەکتر ماونەتەوە، لەو کاتەی ڕووسیادا دژی ئەوەیە کە زۆربەی دراوسێکانی چوونە هاوپەیمانی ناتۆ، ڕێگری دەکات لە بڵاوکردنەوەی هاوپەیمانێتییەکە بۆ بەرگری موشەکییەکەی لە ئەورووپای ناوەڕاستدا. هەرچۆنێک بێت هەردوو لایەن ڕایانگەیاندووە کە هاوبەشن نەک دوژمن، و لە

ساڵی ۲۰۰۲ەوە ئەنجومەنێکیان تەرخان کرد بۆ باشترکردنی پەیوەندییەکانیان و چارەسەرکردنی هەر ناکۆکییەک کە سەرهەڵدەدا. جگە لە ڕووسیا هیچ دوژمنێکی شاراوەی تری ناتۆ نییە، بارودۆخێک کە نائاساییە بۆ هاوپەیمانێکی سەرەکی گەورە، و ئەمەش وای کردووە کە بەدوای ڕێگای نوێدا بگەڕێت بۆ ئەوەی بە گرنگ و مانادار بمێنێتەوە. لەوانەیە ئەرکی ئەو لە ئەفغانستان ڕوونترین نموونە بێت، کاتێک وڵاتانی ناتۆ (۲۸ دەوڵەت) و ۲۱ وڵاتی تریش هەڵسان بە دابینکردنی سەرباز بۆ ئەم ئەرکە.

هەرچۆنێک بێت، باڵادەستیی ئاشکرای خۆی کە لە پشتەوە خاڵە لاوازییە زیادبووەکان دەشارێتەوە لە نەبوونی هەر هەڕەشەیەکی ڕاستی و لاوازی هێز لە نێوان ئەو دەوڵەتانەی کە تێیدا بەشدارن ڕەنگیداوەتەوە. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بە ڕادەیەکی زۆر زاڵ بووە بەسەر ئەرکی ئەفغانی، لە کاتێکدا کە زۆر وڵاتی تر بەشداریەکی ئاسایی یان ڕەمزی دەکەن. چەند دەوڵەتێک لە ئەفغانستان کشانەوە، بۆ نموونە دژایەتی ناوخۆیی بۆ بەردەوامی بوونی سەربازە هۆڵەندییەکان لە ئەفغانستان، لە مانگی شوباتی ۲۰۱۰دا بەشدارییان لە ڕووخانی حکومەتی هۆڵەندا کرد، ئەمەش بووە هۆی نزیکە بوونەوەی کشانەوەیان. بەشداربووانی تر وەک فەرەنسا و ئەڵمانیا ناڕەزاییان دەرخست بۆ داواکارییەکانی ئەمریکا بۆ ناردنی سەربازی زیاتر. سەرەڕای ئەوەش هەموو سەربازێک لە ئەفغانستان لە ژێر بنەما جیاوازەکاندا کاردەکات کە سەپێنراوە لەلایانە فەرمانە سەربازە نەتەوەییە تایبەتەکانی خۆی یان تەنانەت ئەنجومەنی یاسادانانی وڵاتەکەی. چونکە هەر یاسادانانێک یان کردارێک لە پەرلەمان، لە پراگ یان لاهای، گەیشتبێت لەوانەیە ئەو کارانە سنوردار بکات کە سەربازێکی ناتۆ دەتوانێت لەسەر زەوی شەڕ لەگەڵ تالیباندا بکات یان مەشق بە سەربازە ئەفغانیەکان بکات یان شەڕی بازرگانی تریاک بکات. ئەم سنوردارکردنانە وای لە هەندێک لە سەربازەکانی

ئەمەریکا کرد کە ناوی ئەو شتەی کە بە هێزی یارمەتی ئاسایشی نێودەوڵەتی (ئایساف) ناسراوە بگۆڕن بۆ " بینیم ئەمریکیەکان شەڕیان دەکرد I saw Americans Fight ".

لە کاتێکدا ناتۆ لە ژێر ئەم ناکۆکیانەدا تێدەکۆشێت، هەماهەنگی نێوان ئەندامەکانی لەگەڵ دامەزراوەی هاوتەریبدا پێشبڕکێ دەکات، چونکە یەکێتی ئەورووپاش - کە پێشتریش هەر ڕێکخراوێکی بەرگری بووە - لەگەڵ ناتۆدا بەیەکداچووە. یەکێتی ئەورووپا دەزگای تایبەتی خۆی هەیە بۆ سیاسەتی بەرگری، لە ناویاندا ئاژانسی بەرگری ئەورووپا و دەستەکانی تر، و ئەرکی دەرەکی خۆی ڕزگار دەکات، لەوانە ئاشتی پارێزی، یارمەتی سەربازی و یارمەتیدانی هێزە فرە نەتەوەکان. بەهەرحاڵ هەر ئەندامێکی دەوڵەتی یەکێتی ئەورووپا سوپاکەی خۆی پاراستووە. لە نێوان ناتۆ و حکوومەتە نیشتمانییەکان و ئاستەکانی فرە بیرۆکراسیەکان لە یەکێتی ئەورووپادا، ناتۆ بە شێوەیەکی زۆر بووە بە تێکەڵەیەک لە دەسەڵات و پلاتفۆڕمەکان کە ئەندامەکانیان تێکەڵ دەبن و بەیەکدادەچن، بەڵام بەبێ هیچ پلەو پایەی تایبەت ب دروستکردنی سیاسەت یان زنجیرە ڕوونەکانی سەرکردایەتی.

دەرکەوتنی "هاوپەیمانی ئارەزوومەندەکان"، وەک جۆرێکی نوێ لەپرۆژەی سەربازی فرە نەتەوە، بەڵگەیە بۆ دابەزینی دەسەڵاتی هاوپەیمانیەکان. لەوانەیە خراپترین دیاردەکانی ئەم پاشەکشەیە لە گروپە کاتیەکەی دەوڵەتەکان بدۆزرێتەوە کە ڕازی بوون بەشداری بکەن، یان پشتگیری بکەن، لە داگیرکردنی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣دا. بەڵام لە ئۆپەراسیۆنی ئەفغانیدا بە باشی ڕەنگی داوەتەوە، هەروەها لە هەوڵە ئەمنی و ئاشتی پارێز و مرۆییەکاندا، لە کاری بەهانەوەهاتنی بومەلەرزەوە بۆ پاراستنی ڕێگا ئاوییەکانی کەنارەکانی سۆماڵیا، دەوڵەتەکان بە هێزی سەربازی بەشداریان کرد سەرەڕای نەبوونی هاوپەیمانی فەرمی و

دەسەڵاتێکی زاڵ کە ناچاریان بکات لەسەر بەشداریکردن. وە لەبەرئەوەی "ئارەزوومەندەکان" لەسەر بنەمای کاتی و خەتەنەیی بەشداری دەکەن، ئەوا پشتیوانیکردنیان پەیوەستە بە پەرەسەندنە سیاسییەکانی وولاتەکانیان، و ئامادەباشیە بەردەوامەکانیان بۆ خەرجیە داراییەکان، و مامەڵەی لابەلایەکانیش کە دەتوانن لە بەرامبەر بەشداریکردنیان دانوستانی لەسەر بکەن، بۆ نمونە لە زۆر حالەتی ئەو دەوڵەتانەی کە بەژداربوون لە پرۆسەی داگیرکردنی عێراق ڕێککەوتنە لابەلاکە خۆی لە ئاسانکاری ڕێوشوێنەکانی ڤیزا ئەنواند بۆ هاووڵاتیەکانیان بۆ چوونە نێو وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

سەبارەت بە هاوپەیمانە تازە ڕاستەقینەکانی جیهان کە لە سەردەمی ئاشتی ئەمریکادا دەرکەوتوون، هەندێکیان جگە لە پلاتفۆرمێک بۆ هاوکاری سەربازی لە نێوان ئەندامانی ڕێکخراوێکی هەرێمی هاوشێوەی یەکێتی ئەوروپادا هیچی تر نین، بۆ نمونە یەکێتی ئەفریقی، هێزی تایبەتی هەیە بۆ پاراستنی ئاشتی بۆ دەستتێوەردان لە ململانێیە هەرێمیەکان. و ئەنجومەنی بەرگری ئەمریکای باشوور پەیوەندی سەربازی لە ئەمریکای لاتین دروست دەکات. هەرچۆنێک بێت، ئەم هاوپەیمانیە نوێیانە ناگەن بە پلەی هاوپەیمانە تەقلیدیەکان کە لەسەر بنەمای هاوکاری پتە، و ئاڵوگۆڕی پلانەکان و تەکنەلۆجیا، و پابەندبوون بە بەرگری هاوبەشەوە دامەزراوە. لەوانەیە یەکێک پێشبینی هاوپەیمانیەکی نوێ بکات کە لەسەر هێزێکی ڕکابەری سەرەکی وەک چین یان ڕووسیا پێک بێت وەک هەوڵێک بۆ زیندووکردنەوەی ڕکابەرێک بۆ جێگرتنەوەی پەیمانی وارسۆ. لە جیاتی ئەوە، چالاکترین هەوڵ - هەرچەندە سەرکەوتوو نەبوو - هەوڵەکانی هیوگۆ چۆفێزی سەرۆکی ڤەنزوێلا بوو بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانی سەربازی لەگەڵ کۆبا، بۆلیڤیا، و دەوڵەتە دڵسۆزەکانی تر، بۆ ئەوەی ببێتە پێگەیەکی هێزێکی هەرێمی دژە ئەمریکی. زۆرترین نوێنەری "هاوپەیمانی" ئەمڕۆ لە ڕاستیدا لە نێوان

دەوڵەتەکان و ئەکتەرە نادەوڵەتییەکاندایە، بۆ نموونە: پشتگیری ئێران بۆ حیزبوڵلا و حەماس، ڕۆڵی ڤەنزوێلا وەک نێوەندێک لە نێوان هێزە چەکدارەکانی شۆڕشگێڕی کۆلۆمبیا (فارک) و ڕێکخراوەکانی وەک ڕێکخراوی ئیتا توندڕەو لە ناوچەی باسک لە ئیسپانیا.

و ئەو بوارە سەربازییەی کە هەندێک لە پلەبەندییە تەقلیدیەکان وەک خۆی ماونەتەوە، فرۆشتنی چەکە، بە لایەنی کەمەوە بواری چەکی ئاسایی. هەمان ئەم دەوڵەتانەی کە فرۆشیاری چەکن - ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ڕووسیا، چین، فەرەنسا، ئەڵمانیا و ئیتالیا- هێشتا بەردەوامن لە دەستبەسەرداگرتنی زۆربەی ڕێکەوتنەکانی چەک، وە بۆ دەیان ساڵە پێگەیان لە پێشەوە هەر بە نەگۆڕی ماوەتەوە. بەڵام ئەو فرۆشتنە فەرمیانەی کە حکومەتەکان بە پارەدان پشتگیری دەکات تەنها یەک بەشی بازرگانیی ڕاستەقینەی جیهانی چەک پێکدێنێت. هەروەک ڕاپۆرتی مانگی نیسانی ٢٠١١ی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕایگەیاند، " بازرگانی چەک لەم چەند دەیەی دواییدا لە پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان بەرپرسانی حکومەت یان بریکارەکانەوە گۆڕا بۆ بەکارهێنانی هاوبەشی نێوەندەکان کە بە شێوەیەکی تایبەت لە ژینگەیەکی جیهانگێری کاردەکەن، و زۆرجار لە ناوچە جیاوازەکانیش کاردەکەن." ئەم بەشەی بازرگانی چەکەکان، ناڕێکخراو، کە زۆرجار هیچ وڵاتێکی نیە، دەکەوێتە دەرەوەی کۆنترۆڵ، وە ئاماژە بە کەمبوونەوەی چنگی وەزارەتەکانی بەرگریە نەتەوەیی دەکات لە ژینگەی ململانێی چەکداریدا، ئەمەش نیشانەیەکی ترە لە نیشانەکانی هەڵوەشانەوەی هێز.

## پاشەکشەی دیپلۆماسی ئابوری

جگە لەهاوپەیمانییە سەربازییەکان زلهێزەکان دەستیان کردووە بەبەکارهێنانی

## کۆتایی سەردەمی هێز

قەرزە ئابوورییەکان وەک ئامرازێک بۆ ئەوەی وڵاتانی تر پشتگیری بەرژەوەندیەکانیان بکەن. و راستەوخۆترین رێگا لەم رووەوە یارمەتیە دوولایەنەکانە - واتە راستەوخۆ لە حکومەتێکەوە دێت بۆ حکومەتێکی تر - لە شێوەی قەرز، بەخشین، بازرگانی پەسەند یان مامەڵەی سەرچاوە دێت. دیپلۆماسیەتی ئابووریش دەکرێت سزایی هەبێت، لە شێوەی بەربەستی بازرگانی لە دژی دەوڵەتێکی ئامانجدار، بایکۆتکردن، ئابڵوقەدان یان سەپاندنی سزاکان لە دژی دامەزراوە ئابوورییەکانی.

لێرەش دووبارە، هەمان شێواز بەردەوام بوو، بەڵام کاریگەریان وەک نیشاندەری هێزێک کەم بۆتەوە. بە هۆی یەکخستنی ئابووری جیهانی، پشتبەستنی هەر نەتەوەیەک بە پێداویستیەکان، کڕیارەکان یان دەرماڵەی هەر دەوڵەتێکی تر بە شێوەیەکی بەرچاو کەمتر بووە. بەربەستە بازرگانییە تێکچووەکان و بازاڕەکانی کراوەکانی سەرمایە لە مێژە ئامانجی ئەمەریکا و وڵاتانی دەوڵەمەندی دیکە بوون لە وتووێژەکانی بازرگانی نێودەوڵەتیدا. سەرکەوتنی ئەم دەوڵەتانە - لەگەڵ برەودانە مەودا فراوانەکەی کۆدەنگی واشنتۆن وەک هێزێکی پۆلیسی بۆ بەدەستهێنانی قەرز لە بانکی جیهانی و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و دامەزراوەکانی تر - کاریگەرییەکی پێچەوانەیان هەبووە، چونکە بووە هۆی لاوازکردنی چنگی ئەمریکا یان دەسەڵاتی داگیرکەری پێشوو وەک بەریتانیا و فەرەنسا لەسەر ئەو دەوڵەتانەی کە لە فەلەکی دەسەڵاتی خۆی نەخولێتەوە.

سزاکانی سەر ئێران بەئامانجی پەیڕەوکردنی بەرنامە ناوەکییەکەی بۆ یاسا و رێسا نێودەوڵەتییەکانی جێبەجێکراو ئەو جیاکاریە ئەنوێنێت کە یاساکە جێگێر دەکات. چونکە نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا و چەند وڵاتێکی دیکە سنووردارکردنی فراوانیان سەپاندووە لەسەر بازرگانی لەگەڵ ئێران،

لەوانە گەمارۆی نەوتی ئێران و کەمکردنەوەی مامەڵەکان لەگەڵ بانکی ناوەندیەکەی، و سنوردارکردنی گەشت و گەشتیاری. بەڵام ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پێویستە بۆ زۆرێک لە هاوپەیمانەکانی لێخۆشبوون بکات کە پشت بە نەوتی ئێران دەبەستن، و هەروەها تووشی ئەو گرفتە گرانە بوو: ئایا سزا بەسەر وڵاتانی دۆستی وەک کۆریای باشوور و هیندستاندا سەپێنراوە و لەسەر وڵاتانی ڕکابەر کە توانایەکی گەورەیان هەیە بۆ تۆڵەسەندنەوە، وەک چین، بەهۆی ئارەزوو نەبوونی لە کەمکردنەوەی فرۆشتنەکانی؟

بەکارهێنانی هێزی دەوڵەت لە ڕێگەی تەرخانکردنی یارمەتی بۆ وڵاتانی پەسەندکراو بۆتە شتێکی زۆر بەربڵاو. لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا تەنیا پێنج یان شەش دەزگای یارمەتی نەتەوەیی هەبوون، و ئەمڕۆ زیاتر لە ٦٠ دەزگایان هەیە. لە پەنجاکان ٨٨٪ ی یارمەتی لە سێ وڵاتەوە دەهاتن: وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (٥٨٪)، فەڕەنسا (٢٢٪)، و بەریتانیا (٨٪). یارمەتی دوولایەنەکانیش یەکەم فراوانبوونی گەورەی لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەم ئەزموون کرد، کاتێک یابان، کەنەدا و زۆربەی ووڵاتانی ئەوروپا دەزگای یارمەتی بیانییان دامەزراند. بە خێرایی هۆڵەندا و دەوڵەتەکانی ئیسکاندینافیا بوون بە یاریزانی سەرەکی، بە بەراورد بە داهاتی نەتەوەیی خۆیان، بە بەشێکی گەورەتر لە بەشی ئەمریکا، بەریتانیا یان فەرەنسا بەشداریان کرد. وە لە ساڵانی حافتاکاندا، داهاتی نەوتی وڵاتانی عەرەبی ڕێگەی بە دروستکردنی سندوقی یارمەتی پەرەپێدان دا کە بۆ پشتگیریکردنی پرۆژەکان لە وڵاتانی موسڵمانان و لە سەرتاسەری ئەفریقادا بەکاریان دەهێنرا. پاشان دیمەنەکە لە ساڵانی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم دووبارە بەرفراوان بووەوە دوای ئەوەی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات بوون بە وڵاتانی کۆمەککەر، و وڵاتانی گەورەی دەرکەوتوو، وەک هیندستان و بەرازیل، بوون بە یەکێک لە ووڵاتە سەرەکیەکان لە دابینکردنی یارمەتیەکان. تا

ساڵی ٢٠٠٩، ئەمەریکا، فەرەنسا و شانشینی یەکگرتوو تەنیا ٤٠٪ ی تەواوی یارمەتیە فەرمییەکانی گەشەپێدانیان لە خۆ گرت.

ئەمەش تەنیا بەشی دوولایەنەی یارمەتییە، کە ٧٠٪ ی لێشاوەکانی پێک دێنێت. بەلایەنی کەمەوە ٢٦٣ بریکاری یارمەتی هەمەلایەن هەیە، لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانییەوە بۆ گرووپە هەرێمییەکان، وەک سندوقی گەشەپێدانی باکوور (ئەوروپا) یان ئاژانسە تایبەتمەندەکان، وەک سەنتەری ماسی جیهانی یان ئەنجومەنی نێودەوڵەتی دژی نەخۆشیەکانی کەمی یۆد. لە سەرووی هەموو شتێکەوە، فراوانبوونی یارمەتیە تایبەتەکان دێت لە ڕێگەی ڕێکخراوە ناحکومییەکان کە بەپێی بەرنامەی خۆیان کار دەکەن. لە ساڵی ٢٠٠٧، یارمەتی دوولایەنە و چەندلایەنە بۆ گەشەپێدانی فەرمی گەیشتە نزیکەی ١٠٠ ملیار دۆلار، وە کۆی گشتی یارمەتیە تایبەتەکان گەیشتە نزیکەی ٦٠ ملیار دۆلار. مەزەندەکان ئاماژە بەوە دەدەن کە بوارەکانی یارمەتیە تایبەتیەکانی جیهان زیاتر فەرمانبەران لەخۆ بگرێت لە ڕێکخراوە حکومەتیەکان و فرەلایەنەکان کە زیاتر و کاریگەرتر ڕکابەری دەکەن لەگەڵیدا.

زۆربوونی سەرچاوەکان مانای ئەوەیە کە دەوڵەتی وەرگر مامەڵە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هاوبەشەکان دەکات نەوەک لەگەڵ کەمینەیەک کە دیمەنەکە قۆرخ دەکات و دەتوانێت هەژموونی دەسەڵاتە ناهاوتاکەی بکات بەسەر حکومەتەکەی. لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەم، تێکڕای ١٢ بەخشەر هەبوو کە پارەی حکومەتی بیانی دابەش دەکرد بۆ هەر دەوڵەتێکی وەرگر، لە ماوەی (٢٠٠١-٢٠٠٥)، ژمارەیان بەرزبووەوە بۆ ٣٣، و پەرتەوازەبوونی هێزی ئابووری زیاتر دەردەکەوێت کاتێک دێتە سەر وەبەرهێنانی بیانی. ئەو ڕۆژانە بەسەرچوون کە کۆمپانیای میوەجاتی یەکگرتوو کەناڵێکی دروست دەکرد بۆ بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە " کۆماریەکانی مۆز". هەروەها کۆمپانیا

فرەنەتەوەییەکان چیتر سیمبۆلی نەتەوەیی وڵاتەکانیان نین، و بەرژەوەندی خۆیان بەدەست دەهێنن، و وەک دەزگایەکی لایەنگیر لەگەڵ سیاسەتەکانی دەرەوەی خۆیاندا کار دەکەن. لە نێوان فراوانبوونی بازاڕە جیهانییەکان و چالاکییە دەرماڵەکان و ئاسانکارییەکانی بەرهەمهێنان، و شەپۆلی یەکگرتن و دەستکەوت، و وەبەرهێنان لەلایەن تاکی بازرگانی گەورەوە، کۆمپانیا فرە نەتەوەکان ئێستا پەیوەست نین بە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکانیان، وزیاتر ئازادن تێیدا لە هەموو کاتێکی تر. بۆ نمونە، یەکێک دەتوانێت چ بەرژەوەندیەکی نەتەوەیی تایبەت بخاتە پاڵ کۆمپانیای ئارسلۆرمیتاڵ- گەورەترین کۆمپانیا بۆ داواکردن لە جیهان- کە سەنتەرەکەی لە ئەوروپایە، و پشکەکانی لە بۆڕسەکانی شەش نەتەوەدا ڕیزکراون، لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی سەرەکی لەلایەن ملیاردێرێکی هیندییەوە خاوەنداری دەکرێت؟

لە ڕاستیدا ئەگەر دەوڵەتێک هەبێت فراوانبوونی لە بەرژەوەندیەکانی بەخۆوە بینیبێت لە ڕێگای وەبەرهێنانی بیانیەوە لەم ساڵانەی دوایی، ئەوا ئەوانەن کە خاوەن ئابووری بەرزن کە کۆمپانیاکانی بوون بە وەبەرهێنەرە چالاکە نێودەوڵەتیەکان، بەتایبەتی لە بوارەکانی کشتوکاڵ و داهاتە سروشیتەکان و تەلارسازی و پەیوەندیەکان. پترۆبراسی بەرازیلی یان کۆمپانیای نەتەوەیی چینی بۆ نەوتی دەریایی، کە تایبەتمەندن لە بواری نەوت، و کۆمپانیای لاستیکی سیم داربی مالیزی، و کۆمپانیای چیمەنتۆی مەکسیکی سیمیکس، و کۆمپانیای خۆراکی مەکسیکی بیمبۆ، و ئێم تی ئێنی ئەفریقیای باشوور یان بهارتی ئێر تلی هیندی، کە تایبەتمەندن لە خزمەتگوزاریەکانی مۆبایل، هەموویان تەنها نموونەیەکن لە نموونەکانی ئەو کۆمپانیایانەی کە چوونە نێو ئەوەی ناونراوە بە وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆی بیانی باشور - ئەو باشورەی کە ئاژانسە بەهێزەکانی هاندانی وەبەرهێنان پشتگیریان دەکات، یان بانکەکانی هەنارده وهاورده یان

بیمەکانی دژی مەترسیە سیاسیەکان. مەزەندە دەکرێت ۲۰ هەزار کۆمپانیای فرە نەتەوە لە وڵاتانی تازە گەشەسەندوو هەبێت . لەگەڵ ئەوەش هێشتا وەبەرهێنانەکانی وڵاتانی گەشەسەندوو بەردەوامن لە هەژمارکردنی ڕێژەیەکی کەم لە وەبەرهێنانی بیانی جیهانی، بەڵام لە ساڵی ۱۹۹۱دا لە تەنیا ۱۲ ملیار دۆلارەوە بەرزبۆتەوە بۆ ۳۸٤ ملیار دۆلار لە ساڵی ۲۰۱۱دا. وە ڕێژەیەکی زۆر لەم برە ڕۆیشتووە بۆ وەبەرهێنانەکان لە وڵاتە گەشەسەندووەکانی تر. لە ساڵی ۲۰۱۱ بەشی وەبەرهێنەرەکانی وڵاتە گەشەسەندووەکان لە چالاکیەکانی پێکەوەبەستان و دەستبەسەرداگرتنی جیهانی گەورەتر بوو لە ٤٠%. وە ئەوەی دەردەچێت لە دابەشکردن بۆ بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکان و کارمەندان و دەرکەوتنی براندەکان، ئەو بیرۆکەیە کۆنە ڕەتدەکاتەوە کە وەبەرهێنانی بیانی ئامرازێکی سیاسیە بۆ وڵاتانی دەوڵەمەند.

وە هێشتا دیپلۆماسیەتی ئابووری بەردەوامە لە هەبوونی باشترین دەرفەت بۆ ئەوەی ببێتە کاریگەریەکی سیاسی لەو ناوچانەی کە پێویستییەکان تێیاندا زۆر سەختن، و پێشبڕکێ نێوان هاوبەشەکانی تر و کەرتە تایبەتەکان لە کەمترین ئاستیەتی. لەم ساڵانەی دواییدا، ئەمە بەسەر ئەفریقیا جێبەجێ دەکرا- چین و ڕۆژئاوا پێشبڕکێیان دەکرد لە پێناو دەسەڵات - بەهۆی یەدەگەکانی نەوت و ناسەقامگیری سیاسی. کاریگەری چین لە ئەفریقیا لە ماوەی ۱۰ ساڵی ڕابردوودا زیادی کردووە دوای ئەوەی چین ڕێگا و نەخۆشخانە و ژێرخانەکانی تری دروست کرد، و بەسەر کۆمپانیاکانی ڕۆژئاوادا زاڵ بوو لە بەدەستهێنانی سەرمایەی نەوت و خێراکردنی پرۆژەکان، بە مەرجێکی کەم یان نەبوونی هیچ مەرجێک لەو مەرجە سەرەکیانە یان ئیداریە توندانەی کە دامەزراوەکانی پارەپێدانی ڕۆژئاوایی دەیانسەپاند. دروستکردنی بارەگای یەکێتی ئەفریقیا لە ئەدیس ئەبابا بە نرخی ۲۰۰ ملیۆن دۆلار، نوێترین خەڵاتی دیار بوو کە چین بە ئەفریقای بەخشی. ئەم

بەخشینە، لەگەڵ پاڵپشتی سەروەریی دەوڵەتە وەرگرەکان و چاوپۆشی کردن لە بزوتنەوە یاخیبووکان و ناتارامی سیاسیەکان - متمانەی و شکۆی دا بە چین لەنێو نوخبەی سیاسی ئەفریقی، و ڕکابەرییەکی بەهێزی بۆ کۆمپانیاو دامەزراوە فەرەنسی و ئەمریکییەکان دروستکرد. بەڵام سەرەڕای گەشەی خێرای کاریگەریی چینی لە ئەفریقا، بەڵام هەروەها دووچاری هەڵوەشانەوەش دێت، لەگەڵ فراوانبوونی وەبەرهێنانی وڵاتانی تری کیشوەرەکە، بەتایبەتی هیندستان، و ئەفریقای باشوور و وڵاتانی عەرەبی.

### هێزی نەرم بۆ هەمووان

ئەگەر کاریگەری سەربازی و ئابووری زلهێزەکان لاواز بووە؛ ئەوا بە هەمان ڕادە کاریگەری هەبووە لەسەر زاڵبوونیان لە دەسەلاتی نەرمدا، هەرچەندە قورسە قەبارەی ئەم کاریگەرییە بپێورێت. پڕپڕۆژەی "بیۆ" بۆ ئاراستە جیهانیەکان، کە لە ساڵی ٢٠٠٢ەوە ڕاپرسی لە چەند وڵاتێکدا ئەنجام داوە- ئەوە دووپات دەکاتەوە کە وێنەی جیهانیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە زۆربەی بەشەکانی جیهان پاشەکشەی کردووە لە ماوەی ئیدارەی جۆرج دەبلیو بۆش، بە تایبەتی دوای داگیرکردنی عێراق، و وادەردەکەوت کە بەرەو باشتر چوویێت - هەندێ جار نەگەڕاوە بۆ ئاستەکانی ٢٠٠٢ یان تێپەڕاند، و هەندێ جاریش نەدەگەیشت بەو ئاستانە - پاش هەڵبژاردنی باراک ئۆباما. بۆ نموونە، لەئەڵمانیا ٦٠٪ ی ئەوانەی ڕاپرسی ڕای گشتی گرتبوونیانەوە لەساڵی ٢٠٠٢ سەرنجێکی ئەرێنیان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەبوو لەچاو تەنیا ٣٠٪ لەساڵی ٢٠٠٧، و ٦٤% لە ساڵی ٢٠٠٩. لەتورکیا تێڕوانینی ئیجابی بەرامبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەساڵی ٢٠٠٢ لە ٣٠٪ دابەزیوە بۆ ٩٪ لەساڵی ٢٠٠٧، و دواتر لەساڵی ٢٠٠٩ بۆ ١٤٪ زیادیکردووە. بەم پێوانەیە هێزی نەرمی ئەمریکا دوورە لە ڕێک و

پێکی و سەقامگیری: چونکە لە ساڵی ۲۰۰۹دا پەسەندی ئەمریکا گەیشتە ٪۷۸ لە نایجیریا و ٪٦۹ لە بەریتانیا و ٪٤۷ لە چین و ٪۳۸ لە ئەرجەنتین و ٪۲٥ لە ئوردن. سەرەڕای ئەوەش تا ساڵی ۲۰۱۲ ناوبانگی باراک ئۆباما لە زۆربەی وڵاتاندا کەمبووەوە.

هەمان پرسیار سەبارەت بە چین ئەمیش ئەنجامی نادیار دەدات، کاتێک گەورەترین پێشکەوتن لە وێنەی چین تۆمارکرا لە نایجیریا (لە ٪٥۹ لە ساڵی ۲۰۰٦ بۆ ٪۸٥ لە ساڵی ۲۰۰۹ بە بەراورد بە دابەزینی تورکیا (لە ٤۰% لە ساڵی ۲۰۰٥ بۆ ٪۱٦ لە ساڵی ۲۰۰۹) جگە لە ئەنجامەکانی تر لە ٤۰% بۆ ٥۰% لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی ڕاپرسیان کردووە. ئەوەی کە زۆر دەردەخات ئەوەیە کە پرۆژەی پیو لە ساڵی ۲۰۱۱دا دەریخست کە زۆرینەی ئەوانەی کە بەشداریان کرد لە ڕاپرسی لە ۱٥ دەوڵەت لە تێکڕای ۲۲ دەوڵەت دەڵێن چین جێگای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەگرێتەوە، یان گرتوویەتیەوە؛ بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی گەورەی سەرکردە لە جیهان. هەرچی تێڕوانینەکان بەرامبەر بە یەکێتی ئەورووپا تێکەڵ بوون، کاتێک وێنەی گشتی کەمبوویەوە لە ۱۳ دەوڵەت لە کۆی ۲۰ دەوڵەت لە ساڵی ۲۰۱۰ بۆ ۲۰۱۱، لە هەمان کاتدا تێڕوانینەکان بەرامبەر ڕووسیا بە نەرێنی دەچێت، و تێڕوانینەکانیش لەسەر ئێران نەرێنیترە وەک لە ڕووسیا، لەگەڵ چەند جیاکارییەکی بەرچاوی کەم (بۆ نموونە لە ساڵی ۲۰۰۹، ٥۷% لوبنانیەکان تێڕوانینی ئەرێنیان بەرامبەر ڕووسیا هەڵگرتبوو، و ۷٤% ی پاکستانیەکان تێڕوانینی ئەرێنیان بەرامبەر ئێران هەڵگرتبوو).

هەموو ئەمانە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە هێزی نەرم، بەلایەنی کەمەوە، چەمکێکی ناجێگیرە و خێرا کاریگەر دەبێت بە گۆڕانکارییە کورتخایەنە لەناکاوەکان لە کاروباری جیهاندا، لە ژینگەیەکدا کە هەواڵەکان لە هەموو کاتێکی تر خێراتر دەجوڵێن. بەڵام ئەوە نەیهێشتووە زۆرێک لە دەوڵەتەکان ئەو

چەمکە بگرنەبەر، و بەدوای ڕێگاکاندا بن بۆ زیادکردنی هێزی نەرمیان. توێژەر جۆشوا کیر لانتزیک دەڵێت کە چین لە ساڵی ۱۹۹۷ ڕووی کردە ستراتیژی هێزی نەرم، کاتێک ڕەتی کردەوە کە نرخی دراوەکەی دابەزێت بەسیفەتی "بەرگری لە ئاسیا". لەو کاتەوە چین بووەتە وڵاتێکی سەرەکی بۆ یارمەتیدانی زۆرێک لە وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، و مەودای یارمەتیەکان و پرۆژەکانی فراوانکرد لە ئەفریقا، و دابەشکردنی بەرنامە تەلەفزیۆنییە نیشتمانییەکانی زیاتر کرد و پەیمانگای زمان و ڕۆشنبیری کۆنفۆسی لە هەموو جیهاندا کردەوە. لە مانگی شوباتی ۲۰۱۲ تەلەفزیۆنی ناوەندی چین هەوڵێکی دەستپێکرد بۆ بەرهەمهێنانی بەرنامە بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆیە ستۆدیۆیەکە لە واشنتۆنی پایتەخت کردەوە و زیاتر لە ٦٠ کارمەندی نێودەوڵەتی تێدا بوو. هەروەها چین بوو بە ئامانجێک بۆ هونەرمەندان و تەلارسازانی نێودەوڵەتی، و هەستکردن بە زیادبوونی گرنگیەکەی وا لە دایک و باوکانی جیهان دەکات کە ڕەچاوی تۆمارکردنی منداڵەکانیان بکەن لە قوتابخانەکانی مەندرین بۆ فێربوونی زمانی چینی. هێزی نەرم ستراتیژێکی ڕوونە بۆ چین.

لە هیندستان، بە پێچەوانەوە، هێزی نەرم ئەوەندە لەپێشینەی پەیژەی سیاسەتدا نییە وەک ئەوەی جێگەی سەرنجە لە نێوان شیکەرەوەکان کە هیواخوازن ئەو وڵاتە لە ئێستاوە هێزێکی نەرمی کەڵەکە کردبێت بە هۆی ئەوەی دەوڵەتێکی دیموکراسی و زۆر نەوەی لە گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان و ئێستا وەبەرهێنەرەکانی بۆخۆی ڕاکێشاوە. شاشی ثارۆر، نووسەر و بەرپرسی پێشووی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە بووە بە سیاسەتمەدار و وەزیر لە حکومەتی هیندستان، وتی: "هیندستان توانایەکی دەگمەنی هەیە بۆ گێڕانەوەی باوەڕپێکراوترین و سەرنجڕاکێشترین چیرۆک لەچاو چیرۆکی ڕکابەرەکانی". سەرۆکی پرۆگرامە کلتورییە هیندییەکان لە دەرەوەی وڵات ناوبانگی یۆگا وەک توخمێکی هێزی نەرم

ناوزەد کرد. سەرەڕای ئەو لێڵییەی کە لە هەموو ئەمانە دەردەکەوێت، بەڵام ئەو ناوچەیەی کە هێزی نەرمی هیندی بە گشتی لێی پەسەند دەکرێت بۆلیوودە، گەورەترین پیشەسازی هەناردەی فیلمی جیهانە، پیشەسازییەکە بۆ دەیان ساڵ لە سەرتاسەری ئاسیا و ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەوروپای ڕۆژهەڵات سەرسامکەری بەدەست هێناوە، وە ئێستا دەستی کردووە بە دەستبەسەر داگرتنی بازارە بازرگانیە ڕۆژئاواییە سەرەکیەکان.

ئەگەر چوونە ناوەوەی میدیا و ناوبانگەکەی لە نێوان باوەڕپێکراوترین پێوەرەکانی هێزی نەرم بێت، هەروەک هۆلیوود و بۆلیوود دەریدەخەن، ئەوا ئەو دیمەنەش ئاشکرا دەکەن کە زنجیرە دراما مەکسیکی، و کۆڵۆمبی، و فیلمە نەجیرییە کەم بودجەکان، و بەرنامەی واقیعی ئەفریقیای باشوور بۆ فراوانکردنی مەودای دەسەڵات و کاریگەریەکان، تێیدا کاردەکەن. لە ڕوسیا و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، بۆ نموونە، کۆتایی جەنگی سارد بووە هۆی ئەوەی جبەخانەیەکی گەورەی چەکی زیادە لە بازاڕەکانی جیهان پیشان بدرێت، و کۆتایی هاتنی قۆرخکردنی تەلەفزیۆنی دەوڵەت بۆشاییەکی گەورەی دروستکرد بە زنجیرە درامایە بێ ماناکانی ئەمریکای لاتینەوە پڕکرانەوە، کە بووە هۆی دروست بوونی حالەتی ئالودەبوونی ئەم درامایانە، و کردنەوەی بازاڕیشیان. لەباشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا نەوەیەکی تەواوی هەوادار هەیە کە کۆریای باشوور دەناسن نەک بەهۆی ڕوویەڕووبوونەوە لەگەڵ کۆریای باکوور یان ماوەی دیکتاتۆرییەتی لە ساڵانی حەفتاکان، بەڵکو بەهۆی یارییە ڤیدیۆییەکانی و ئەستێرەکانی پۆپ و زنجیرە تەلەفزیۆنیەکانی " ئاوازەکانی زستان ". حکومەتی کۆریا بە سپۆنسەرکردنی کۆنسێرت و پێشکەشکردنی زمان و چین و توێژەکانی چێشتلێنان لە ناوەندە کولتووریەکانی خۆی لە ناوچەکەدا سوود لەم لایەنە وەردەگرێت. چونکە کاتێک دەرفەتێک هەبوو بۆ فراوانکردنی هێزی نەرم، ئیستغلالکردنەکەی ئاسانە، و

زۆرجاریش خەرجیەکەی زۆر کەمە. دوا قەڵاکان کە کەلەپوری کۆری داگیرکرد ئەوانەی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکان، کە ڕاپەری کۆری پسی PSY لەشێوەی سەما و گۆرانیەکانی کە بە "ستایلی گانگنام" ناسراوە جۆش و خرۆشی دروست کردووە. (گانگنام یەکێکە لە گەڕەکە گرانبەهاکانی سیئۆل). ئەستێرەیەکی تری کەی پۆپیش فەیلەقی هەوادارانی بردۆتەوە: ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز بلاویکردەوە کە گۆرانی و ئەلبومەکانی گۆرانیبێژی ڕیسی جای پارک (پسی) و ئەلبومەکانی لە ساڵی ٢٠١٠ەوە لە لوتکەی لیستی ڕیدس و بلوز/سۆل لە ماڵپەڕی ئایتیونز داگیرکردووە لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا و دەنیمارک. ئەگەر پێگەی جیهانی کۆمپانیاکانی کاڵای بەکاربەر زیاد بکەین؛ وەک سامسۆنگ، هیوندای، کیا و ئێل جی، ئەم پێشکەوتنە کلتوریانە یارمەتیدەرن بۆ بەهێزکردنی براندی جیهانی کوریای جنوبی، لە ئیندێکسی ئەنهۆڵت JFK Roper Brand Index بۆ براندە بازرگانیەکانی وولاتان، کە ڕاپرسی ٢٠ هەزار کەسی لە ٢٠ وولات کردووە بۆ ڕێکخستنی مارکەکان بۆ ٥٠ وولات، ڕیزبەندی کۆریای باشوور لە پلەی ٣٣ لە ساڵی ٣٠٠٨ بوو بە ٢٧ لە ٢٠١١.

### یاسای نوێیەکانی جیۆپۆلەتیک

بێشک قەتەر یەکێکە لە باشترین نموونەکانی وڵاتانی بچووک کە هاوپەیمانی ئارەزوومەندانە و دیپلۆماسیەتی ئابووریان بەکارهێناوە (بە مانای پارەیەکی زۆر و هێزی نەرم بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانیان). ئەو لە پێشەنگی هەوڵەکان بوو بۆ ڕووخاندنی موعەممەر قەزافی سەرۆکی لیبیا بەدابینکردنی پارە و مەشق و چەک بۆ یاخیبووان،وە هەر زوو داوای چەکدارکردنی یاخیبووانی لەسوریا کرد. هەروەها هەوڵیدا لە یەمەن و ئیتیۆپیا و ئیندۆنیزیا و فەلەستین و

لوبنان نێوەندگیری بکات. وە لە ڕێگەی سندوقی وەبەرهێنانەوە بە سەرمایەی ٨٥ ملیار دۆلار، قەتەر پشکی بازرگانی و کۆمپانیاکانی کڕیوە، لە فۆلکس واگنەوە بۆ یانەی تۆپی پێی پاریس سان جێرمان. نەک هەر لە پشت ئەوەوە وەستاوە کە دەکرێت کاریگەرترین دامەزراوەی نوێی هەواڵی" جەزیرە " بێت، بەڵکو بە دروستکردنی باشترین مۆزەخانەی هونەری ئیسلامی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناوبانگی خۆی وەک سەنتەرێکی ڕۆشنبیری بنیاد ناوە و هەروەها بە کڕینی هونەر و ئەو تابلۆیانەی کە لەلایەن کەسانی وەک وارهول و روثکۆ و سیزان و کونز و لیختنشتاین کێشراوە.

بەڵام مرۆڤ پێویستی بەوە نیە کە بەرزبێتەوە بۆ لووتکەی سەرمایەیەکی زۆری سەرچاوەکانی نەوت بۆ ئەوەی شان لە شانی گەورەکان بدات، چونکە هەر گروپێکی بچوکی دەوڵەتەکان کە مەرج نییە دراوسێ بن یان مێژوویەکی هاوبەش بەیەکیانەوە ببەستێتەوە، دەکرێت بە شێوەیەکی خێراتر ئەنجامەکەن بە دەست بێنێت لە ڕێگای کارکردن لەگەڵ یەک، لە جیاتی پەنابردن بۆ ڕێکخراوە نێودەوڵەتیە ماندوکەرەکان. هەروەها ئەو سیاسەتە دەرەکیەی کە زیاتر چاوی بڕیبووە جوگرافیا، ئەوەی تەنیا تیشکی ئەخستە سەر دراوسێ ڕاستەوخۆکانی، ئێستا دەتوانێت بگات بە ژمارەیەکی زۆری وولاتان؛ وە ئەو دەوڵەتانەی کە دوانەکەوێت لە قواستنەوەی ئەم هەڵیە ئەوا سیفاتە ڕکابەریەکەی لەدەست دەدات.

هیچ کام لەم بنەمایانە نکۆڵی لە بەهای سوپایەکی گەورە یان سەرچاوەی زۆر ناکات. بەڵام هەموویان بە شێوەیەکی لۆژیکیی ئەگەڕێنەوە بۆ هەڵوەشانەوەی هێز، و پێکهێنانی بناغەی جۆرێکی نوێی سیاسەتی نێودەوڵەتی.

### تەنها بڵێ نەخێر

کاتێک سەرکەوتووەکانی جەنگی جیهانی دووەم سیستەمی نەتەوە

یەکگرتووەکانیان دامەزراند، دڵنیابوونن کە بە شێوەیەک دابڕێژن کە بەرژەوەندیەکانیان بپارێزێت. بۆ نموونە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت و چین و فەرەنسا و بەریتانیا کورسی هەمیشەییان بۆخۆیان داناوە لە ئەنجومەنی ئاسایش، کە ئەرکی مامەڵەکردنە لەگەڵ جدیترین قەیرانی نێودەوڵەتی. هەروەها ئەم وولاتانە زامنی ئەوەیان کردبوو کە پارێزگاری لە دەسەلاتیان دەکەن بە ڕەتکردنەوەی هەر بڕیارێک ( مافی ڤیتۆ). ئەم ڕێکخستنە لە کاروباری نێو دەوڵەتیدا بیدعەیەک بوو، لەو حەڵەتەشدا سەرکەوتوو بوو لە بەدەست هێنانی ئەوەی کە دیزاینەرەکانی چاوەڕێیان دەکرد. چونکە توانای پێنج ئەندامە هەمیشەییەکە (هەموویان دەوڵەتانی ناوکین) بۆ ڕێگەگرتن لە هەر کارێک کە هەڕەشە لە بەرژەوەندیەکانیان بکات ئامرازێکی تری بەسوودی پێداون بۆ بەکارهێنانی لە کەش و هەوا ئاڵۆزەکەی پێشبڕکێ کە بووە هۆی دابەشبوونی جیهان لە نێوان بوارەکانی دەسەلاتی ڕۆژئاوا و سۆڤیەتی. ٢٦٩ جار مافی ڤیتۆی بەکار هاتووە لە نێوان سالانی ١٩٤٦ و ٢٠١٢، کە زیاتر لە ٢٢٥ جار پێش سالی ١٩٩٠ ڕووی داوە. یەکێتی سۆڤییەت لە سالانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ەکاندا زۆرترین ڤیتۆی بەکار هێاوە و دواتر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بە شێوەیەکی سەرەکی بەکاری هێنا بۆ ڕێگەگرتن لە هەر بڕیارێکی ئیدانەکردنی سیاسەتی ئیسرائیل بەرامبەر بە لوبنانیەکان یان فەلەستینیەکان. لە دەیەی ڕابردوودا دەسەلاتی ڤیتۆ بە دەگمەن لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەکارهاتووە و نە فەرەنسا و نە بەریتانیا لە ماوەی ٥٠ ساڵدا بەکاریان نەهێناوە. بەلام لە سالی ٢٠٠٦ەوە چین و ڕووسیا بۆ پاراستنی دەوڵەتە سەرەڕۆکانی وەک زیمبابۆی و مایانمار و سوریا دژی تاوانبارکردن و سزادان بەکاریان هێناوە.

بەڵام ئەگەر دەسەلاتی ڤیتۆی هێزە سەرەکیە تەقلیدییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان زۆربەی کات بەکارنەهێنرێت، ئەوا دەسەلاتەکانی تری ڤیتۆ دەست

دەکەن بە گەشانەوە. لەم ڕووەوە، یەکێتی ئەوروپا یەکێکە لەو گۆڕەپانانەی ڤیتۆ سەلماندوویەتی کە زۆر کاریگەرە بۆ تاکە دەوڵەتەکان. لە ساڵی ١٩٦٣، کاتێک یەکێتی ئەوروپا تەنها شەش ئەندامی هەبوو و هەژمونی هاوپەیمانی فەرەنسی-ئەڵمانی لەسەر بوو، چارلس دیگۆل مافی ڤیتۆی بەکار هێنا دژی داواکاری بەریتانیا بۆ نێو یەکێتیەکە. ئەو ناڕەزایی خۆی لە ساڵی ١٩٦٧ دووبارە کردەوە، هەرچەندە هەر پێنج هاوبەشەکەی دیکەی فەرەنسا پشتگیری داواکارییەکەی بەریتانیایان کرد. تەنیا دوای کۆچی دوایی دیگۆل لە ساڵی ١٩٦٩ هەڵوێستی فەرەنسا هێور بووەوە؛ کە ئەمەش بووە هۆی ڕازیبوون بە بەژداربوونی بەریتانیا و دانمارک و ئیرلەندا لە ساڵی ١٩٧٣. ڤیتۆی فەرەنسی نموونەی هێزێکی سەرەکی بوو: چونکە فەرەنسا یەکێک بوو لە یاریزانە زاڵەکانی کۆمەڵگەی ئابووری ئەوروپا لەو کاتەدا و ڤیتۆی خۆی بەکار دەهێنا بۆ ڕێگریکردن لە کەسانی تر لە بردنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی؛ ئەمەش هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ مافی ڤیتۆ لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی.

لە ئەنجامی فراوانبوونی جێگیری ئەندامێتی یەکێتی ئەوروپا و بنەمای کۆدەنگی لە بڕیاری سەرەکیدا، یەک لەدوای یەک دەسەڵاتی گەورە دراوە بە هەر دەوڵەتێکی نوێ، تا ئەو ڕادەیەی هەندێک لە شیکەرەوەکان پرسیاریان کردووە: بۆچی ئەندامە بەردەستەکان ئەوەندە پەرۆش بوون لە قبوڵکردنی هەر ئەندامێکی نوێ لە بنەڕەتدا؟ هەموو شەپۆلێکی ئەندامە نوێکان سوودی، زۆر جار ماددی، خۆی بەدەست دەهێنا لە ڕێگەی هەڕەشەکردن بە بەربەستی خستنە پێش هەر دەستپێشخەریەکی نوێ. ترسی ریفراندۆمی بەریتانی لە بەشداریکردنی لە کۆمەڵگەی ئابووری ئەوروپا لە ساڵی ١٩٧٥دا، فەرەنسا و ئەڵمانیای هاندا کە ڕازی بن بە مەرجی نوێی دارایی بۆ ئەندامێتی کە بە زۆری لە بەرژەوەندی بەریتانیادا بوون. یۆنان، کە لە ساڵی ١٩٨١ بەشداری کرد، و ئیسپانیا و پورتوگال،

کە لە ساڵی ١٩٨٦ بەشداریان کرد، دواتر توانیان سوودە داراییەکانی ئەندامانی دیکە بەدەست بهێنن لە بەرامبەر ڕێگری نەکردنی پەیمانە نوێکان کە ئامانجیان پەرەپێدان بە یەکگرتنە، وەک پەیماننامەی ماستریخت و ناساندنی دراوی هاوبەش.

ئەمرۆ یەکێتی ئەوروپا سیستمێکی "زۆرینەی دەنگی شیاو" بەکاردێنێت لەسەر بنەمای هاوکێشەیەکی ئاڵۆز کە دەنگەکان بەپێی سەرژمێری دانیشتوان لەنێوان دەوڵەتاندا دابەش دەکات و پێویستی بە ٢٥٥ دەنگ هەیە لەکۆی ٣٤٥ دەنگ بۆ ئەوەی هەر کردەوەیەک لەئەنجومەنی ئەوروپا ڕێگەی پێبدرێت. ئەم سیستەمە وڵاتە بچووکەکان دەپارێزێت و ڕێگە لە دەوڵەتە گەورەکان دەگرێت لە سەپاندنی هەر دەستپێشخەرییەک. هەرچۆنێک بێت، کێشە گرنگەکان، وەک سیاسەتی هاوبەشی نوێ، و گەورەبوونی زیاتری یەکێتی ئەوروپا، هێشتا پێویستی بە کۆدەنگی ڕەها هەیە و هەموو ساڵێک دەوڵەتە بچووکەکان چەندین کرداری ڤیتۆ دەکەن بۆ بەربەست خستنە پێش چەندین ڕێکار. بۆ نموونە، پۆڵەندا لە ساڵی ٢٠٠٧دا ڕێکەوتنی هاوبەشی بازرگانیی یەکێتی ئەوروپا و ڕوسیای ڤیتۆ کرد، تاوەکو ڕووسیا قەدەغەی هاوردەکردنی گۆشتی پۆڵەندی لابرد. لیتوانیاش هەمان ڕێکەوتنی ڤیتۆ کرد تا ئەو کاتەی هاوبەشەکانی لە یەکێتی ئەوروپا ڕازی بوون کە پشتگیری لە پێگەی خۆی بکەن سەبارەت بە گرفتە زۆرەکانی لەگەڵ ڕووسیادا، لەوانەش پرسی قەرەبووکردنەوەی لیتوانییەکان ئەوانەی دیپۆرتی کامپی کار لە سیبریا کراون. هۆڵەندا گفتوگۆکانی چوونەژوورەوەی سربیای بۆ یەکێتی ئەوروپا ڕاگرت بەهۆی شکستهێنانی حکومەتی سربیا لە ڕادەستکردنی تۆمەتبارانی جەنگ بۆ دادگای تاوانی نێودەوڵەتی لە لاهای. بەم شێوەیە، وڵاتە بچووکەکان هەندێک جار لەسەر کێشە گرنگەکان ڤیتۆیان بەکار هێناوە، بەڵام هەندێک جار لەسەر ئەو کێشانەیە کە لەوانەیە بۆ ئەندامانی باڵای یەکێتی

ئەوروپا بچووک بن، یان بۆ وولآتانی تر کە دەیانەوێت مامەڵە لەگەڵ هەموو یەکێتی ئەوروپادا بکەن.

دەوڵەتە بچووکەکان دەتوانن و دوودڵ نابن لە بلۆککردنی هەر ژمارەیەک لە دەستپێشخەرییە نێونەتەوەییەکان، لە ڕێگەی ناتەبایی و پابەندبوونیان بە هەڵوێستەکانیان. چونکە کاتێک لوتکەی کەش و هەوای کۆپنهاگن، کە لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩دا بەڕێوەچوو، شکستی هێنا، گلەیی لە چەندین هۆکار کرا- دوودڵی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و چین بۆ ئەوەی ڕێکەوتنێک ئەنجام بدەن، هەروەها گوومانی وڵاتە پیشەسازییە گەورەکان یان گەشە سەندووەکان - بەڵام ئەوەی لە کۆتاییدا کە ڕێگری لێکرد، هەرچەندە لاوازیش بوو، ڕێگری هاوپەیمانیەک بوو کە پێشتر لەبەر چاو نەگیرابوو: ڤنزویلا، و بۆلیڤیا، و سودان، و توفالۆی بچووک کە دەکەوێتە ناو زەریای هێمن. نوێنەری سودانی پێشنیارەکانی وڵاتانی دەوڵەمەندی بە هۆلۆکاست چواند و نوێنەری ڤەنزوێلا دەستی خۆی بریندار کرد بۆ ئەوەی بپرسێت ئایا بۆ گوێگرتن لێی پێویستی بە خوێنە. . کردارەکانیان بە هەزەلی وەسف کرا، بەڵام ناڕەزاییەکانی وڵاتەکەیان شڵەژان و ناڕەزاییان لە کۆبوونەوەیەک، کە خۆی دابەشکراوبوو، زیاتر کرد. لەکۆتایدا ئەم لوتکەیە ڕێککەوتنەکەی پەسەند نەکرد، بەڵام لەجیاتی ئەوە "ڕەچاوی کرد"، کە بووە هۆی گاڵتەجارکردن بە هەوڵەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا و چین و بەرازیل و هیندستان و دانوستانکارانی تری وڵاتە گەورەکان، و ئاماژەیەکی بێهیوای نارد لەسەر پابەندبوونی جیهانی بۆ پەیڕەوکردنی شێوازێکی هاوبەش بۆ چارەسەرکردنی گۆڕانەکانی کەش و هەوا.

یەکێتی ئەوروپا سەرکەوتوو بوو لە گەیشتن بە ڕێککەوتن لە گفتوگۆکانی گۆڕانی کەش و هەوای دیربان کە لە کانوونی یەکەمی ٢٠١١ لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ئەنجام درا، پاشان دەرکەوت کە سیاسەتە تایبەتەکەی دەربارەی

گۆڕانی کەش و هەوا دوای سێ مانگ بەهۆی ڤیتۆیەک کە لەلایەن پۆڵەندا ڕەتبۆتەوە چونکە پۆلەندا بە ڕادەیەکی زۆر پشت بە خەڵوز دەبەستێت.

ئەی بۆچی ڤیتۆکان ئەمڕۆ زۆر سەرکەوتووانە کار دەکەن بۆ وڵاتە بچووکەکان؟ هۆکاری سەرەکی، کە لە ڕووکەشدا ناکۆکی پێوە دیارە، زۆربوونی ئەو ڕێکخراوانەیە کە ئامانجیان هاوکاری نێودەوڵەتیە لەسەر زۆرێک لە کێشەکان. تا ژمارەی ئەو جۆرە ڕێکخراوانە زیاتر بێت، چانسی هەر دەوڵەتێک زیاتر دەبێت بۆ هەڵوێست وەرگرتن لەسەر کێشەیەکی تەسک یان کێشەیەکی ئایدۆلۆژی یان تەنانەت بابەتێکی گاڵتەجاڕی کە زۆرجار سیاسەتێکی کورتخایەنی ناوخۆیی دروست دەکات، نەک لەبەر هیچ بەرگریکردنێک لە پرەنسیپ. بەڵام مافی ڤیتۆی دەوڵەتە بچووکەکانیش سەردەکەون، چونکە دەوڵەتە گەورەکان بێ بەش دەکەن هەمان ئامرازی سەرنج ڕاکێشان و تۆقاندن بەکار بێنن کە بۆ ناچارکردنی دەوڵەتە بچووکەکان بۆ ملکەچبوون و کڕنۆشدان بەکار دەهات. لاوازبوونی هێزی سەربازی و ئابووری وادەکات دەوڵەتە بچووکەکان کەمتر دووچاری سزا بەهێزەکان دەکات لە ژیانی تەقلیدی و هاوبەشە بازرگانییەکان. هەروەها بڵاوبوونەوەی هەواڵ و کەناڵەکانی پەیوەندی ڕێگای نوێی بۆ وڵاتە بچووکەکان فەراهام کردووە بۆ بڵاوکردنەوەی کێشەکانیان ڕاستەوخۆ بۆ ڕای گشتی جیهانی، کە پشتیوانی و هاوسۆزییان بۆ دەهەژێنێت، نەک سنورداركردنیان بۆ دانوستانە داخراوەکان.

لەباڵیۆزەکانەوە بۆ ڕێکخراوەناحکومیەکان کە حکومەت ڕێکی دەخات: نێردراوە نوێیەکان

ئایا باڵوێزەکانی ئەمریکا بوونەوەرە لەناوچووەکانن؟ ئەم پرسیارە لە ساڵی ١٩٨٤ لەلایەن ئیلمر بلیشکە کرا، پرۆفیسۆری دیاری مێژووی دیپلۆماسیە کە ئێستا خەریکە کاڵ دەبێتەوە. بلیشک ئاماژەی بەوە گۆڕانکارییانە کرد کە بریتیبوون لە لابردنی دەستپێشخەری و سەروەری باڵیۆزەکان وەک نوێنەری

وولاتەکانیان، لەوانە ئاسانکردنی گەشت، و بەردەستبوونی تەکنەلۆجیای پەیوەندییەکان، و دەرکەوتنی ڕێگای نوێ بۆ حکومەتەکان بۆ پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ جەماوەری دەوڵەتەکانی تر، و کاریگەری زۆربوونی

دەوڵەتە نەتەوەییەکان، بە دەوڵەتە زۆر بچووکەکانیشەوە، هەریەکەیان هێڵی دیپلۆماسی تایبەت بەخۆی بەکار دەهێنێت. بە هەر حاڵ ئەم گۆڕانکاریانە لە سێ دەیەی دواتر زیادیان کردووە.

بیرۆکەی دابەزینی دبلۆماسی وەک مافێکی پیشەیی بیرۆکەیەکی نوێ نییە، لە ساڵی ١٩٦٢ بیرمەند جۆزێف کۆربل (کۆچبەری چیکی و باوکی مادلین ئۆلبریات) دەربارەی "پاشەکشەی دیپلۆماسی" نووسی ئەو کاتەیە کە بەها و میتۆدە کۆنانەکان دەستیان بە ڕووخانکرد ئەوانەی لە پیشەی دیبلۆماتکاریدا لە ماوەی سەدەکان پێشکەوتن . ئەم بەها و شێوازانە بریتی بوون لە ئازادی ڕەفتار و ئەتەکێتی هەڵسوکەوت و خۆڕاگری و زانینی تەواوی بابەتەکانی پەیوەندیدار بە پیشە و دوودڵی لە ڕیکلامکردن یان بوون بە ناوبانگی پێشوەختە. کوربیل نوسیویەتی : "جیهانی دیپلۆماسی مۆدێرن پێشێلکاریی زۆری کردووە و دووبارە بۆتەوە بەرامبەر ئەو یاسا بنەڕەتیانەی کە لە ژێر بنەمای دیپلۆماسییەت داندراوە، و بە داخەوە کەسێک خۆی دەدۆزێتەوە کە ناچارە ئەوە زیاد بکات کە گوناهەکە ڕێژەکەی تایبەت نیە لە بەشی کۆمۆنیستی ئەم جیهانە". جگە لە لاوازکردنی ئەم بەها تەقلیدیانە، کۆربێل ئاماژەی بەوەش کرد کە سیاسەتمەداران لە کۆبوونەوەکانی لوتکە و وەزارەتەکانی دەوڵەتدا سنوری دیپلۆماتکارانیان بەزاندووە، هەرچەندە بۆ چەندین ساڵە سەرکردەکانی دەوڵەت و وەزیرانی دەرەوە بە دەگمەن گەشتیان کردووە بۆ دەرەوە. ئاماژەی بەوەشکرد، کە دیموکراسییەکان بۆشایی بۆ وڵاتانی تر دروست دەکەن بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ کێشەکانیان بخەنەڕوو، تەنانەت کاتێک هاوشێوە ئەمە وەرناگرێتەوە؛ بۆیە سەرۆکەکانی سۆڤیەت دەزگایەکیان

هەبوو لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا بەڵام ئەمریکیەکان ئەم دەزگا ڕاستەوخۆیەیان نەبوو بۆ جەماوەری سۆڤیەت.

ئەم کەناڵە ڕاستەوخۆیانە لەم ڕۆژانەدا زیادیان کردووە، و گۆڕاون بۆ فراوانی لە گرووپە سیاسی و قەومی و دینیەکان، و گروپەکانی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ؛ و داکۆکیکارانی مافی مرۆڤ لەلایەن کۆمەڵگا پەنابەرە بەهێزەکانەوە لە جیاتی وڵاتانی بنچینە، یان لەلایەن کۆچبەران لە جیاتی وڵاتە میوانەکانیان، و ڕوومالکردنی هەواڵی دۆستانە و دەقی پەیوەندیە گشتیە بڵاوکراوەکان لە ڕۆژنامەکان؛ و ئەو چالاکیانەی کە ڕێکخراوە ڕۆشنبیریەکان یان گەشتیاریەکان بەڕێوەی دەبەن؛ و ئەو چالاکیانەی کە پارێزەران و ئەندامانی کۆمەڵەکانی فشاری بەکرێگیراوی پێشوەختە پێی هەڵدەستن؛ و لێشاوێک لە بلۆگ و پلاتفۆرمەکانی گفتوگۆ و پڕوپاگەندە لە بۆشایی ئەلکترۆنی. بۆ هەندێک لە دەوڵەتەکان، ئەبینین ئەو ڕێکخراوە ناحکومییانەی کە حکومەت بەڕێوەیانن دەبات پارێزەری سەرەکین بۆ بەرژەوەندی وڵات لە دەرەوە، نەک ئەوانەی کە بە پرۆتۆکۆل و کۆت و بەندی ئەمنی خۆیان لە باڵیۆزخانە کار دەکەن. ئایا ئەو ڕێکخراوە ناحکومیەکانە چین کە لەلایەن حکومەتەوە ڕێکخراوە؟ ئەوانە ڕێکخراوی ساختەکارن وا لەوانی تر دەکات تێبگەن کە بەشێکن لە کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵام لە ڕاستیدا لە لایەن حکومەتێک یان گروپێکەوە هان دەدرێن یان ئاراستە دەکرێن بۆ ئەوەی کاریان بۆ بکەن.

بۆ نموونە، یەکێک لە ڕێکخراوە ناحکومیەکان باڵەخانەیەکی نوسینگەی پارێزراوی جوان لە ناوچەی تشیوداکو لە تۆکیۆ لە نزیک کۆشکی ئیمپڕاتۆری داگیر دەکات. ئەمە تچونگریۆنە، فیدراسیۆنی گشتی کۆریە نیشتەجێبوەکان لە ژاپۆن کە نزیکەی ١٥٠ هەزار ئەندامی هەیە، و چەند جارێک خزمەتی کۆمەڵگەیەکی نەژادی گەورەتر دەکات ، چونکە نزیکەی ٦٠ قوتابخانە

بەڕێوەدەبات، کە زانکۆیەکی تێدایە، هەروەها خاوەنی کۆمپانیا و بزنسە لەوانە بانکەکان و چالاکیەکانی قومارکردن لە هۆڵەکانی " ئەلباتشینکو" ی بەناوبانگ لە یابان. بەڵام هەروەها پاسەپۆرتیش دەردەکات، چونکە ئەم فیدراسیۆنە لە ڕاستیدا وەک باڵیۆزخانەی کۆریای باکوور کاردەکات لە تۆکیۆ، کە هیچ باڵیۆزخانەیەکی کۆریای باکوور لە ژاپۆن نییە. یەکێتیەکە بە دڵسۆزییەوە ئایدۆلۆژیای ڕژێمی کیم جۆنگ ئون لە قوتابخانەکانی بەرز دەکاتەوە. لە ماوەی چەند ساڵێکدا کۆریای باکوور دابڕاو و هەژار بووە، بەڵام یەکێتی هەر بەردەوام بووە لە کارەکانی. دەرماڵەی ڕاستەوخۆ لە حکومەتی کۆریای باکوور لەدەست داوە، و یابان هەندێک لە قەرزەکانی باجی کشاندۆتەوە. کاتێکیش کەوتە نێو قەرزەوە، ئەفسەرێکی پێشووی هەواڵگری یابانی هەوڵیدا سوود لە پێویستیەکەی وەربگرێت و لە بارەگاکەی دووری خاتەوە. یەکێتی گشتی کۆرییە نیشتەجێبووەکان کە لە یابان هانی کۆرییەکانی ژاپۆن دەدات بۆ پاراستنی ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان، و دوورکەوتنەوە لە دامەزراوە ژاپۆنییەکان، بەڵام بە بڕیاری دادگاکانی ژاپۆن ڕازی بوو بۆ گەڕاندنەوەی خاوەندارێتی بیناکە.

هەموو ڕێکخراوە ناحکومییەکان کە حکومەت ڕێکیان دەخات خراپ نین: سندوقی نەتەوەیی ئەمریکا بۆ دیموکراسی لەلایەن حکومەتی ئەمریکاوە دابین دەکرێت، ڕێکخراوێکی تایبەت و قازانج نەویستە کە لە ساڵی ١٩٨٣ دامەزراوە بۆ پشتگیریکردنی دامەزراوە دیموکراسییەکان لە جیهاندا. ئەم تایبەتمەندیە وای لێدەکات ڕێکخراوێکی ناحکومی بێت کە حکومەت بەڕێوەی دەبات. لەسەر ئەم بنەمایە چالاکییەکەی نەیارەکانی تووڕە کردووە، لەوانەش حکومەتی ڕووسیا و ڕۆژنامەیەکی چینی کە ڕێکلامەکانی دیموکراسی بە پاڵپشتی ئەمەریکایی بە "خۆخزمەتکردن و زۆرداری و نائەخلاقی" ناوزەدا کردووە. پرۆژەکانی ڕێکخراوە ناحکومییەکان دەتوانن زۆر داهێنەر بن، بۆ نمونە ئەو پرۆگرامە ساڵانەیەی کە

لەلایەن حکومەتی هوگۆ چاڤێزەوە لە ڤەنزوێلا دانرا بۆ پشتگیریکردنی ڕۆنی گەرمکەرەوەی هەرزان بۆ هەزاران خێزان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە ڕێگای ئەو خەڵاتانەی کە کۆمپانیای نەوتی ڤەنزویلی ئەیدا بە یەکێک لە کۆمپانیاکانی ووزە لە بۆستن کە لە لایەن جو کنیدی بەڕێوەدەبرا، ئەندامی پێشوی کۆنگرێس و نەوەی خانەوادە سیاسیە بەناوبانگەکە.

وەک ئەم نموونانە دەریدەخەن، ڕێکخراوە ناحکومییەکان نوێنەرایەتی گروپێکی هەمەجۆر و تێکەڵ دەکەن، و لە کاتێکی نزیکیش ون نابن. بۆچی؟ چونکە بەربەستە لاوازەکانی سیاسی و ئابووری و ئینفۆرماتیکی وای لێکردووە زۆر باشتربێت لە هەر جێگرێکی سەرۆکی ئەرکی دیپلۆماسی یان بەرپرسێکی سیاسی یان هاوپێچێکی زانستی کارەکەی بە چەندین کۆت و ڕێسای یاسایی پەکی کەوتوە. بۆیە بەکارهێنانی هەر یەکێک لەو ڕێکخراوانە لەسەر بابەتێک پێویستی بە گرنگی بەپەلە هەیە کە دەکرێت خەرجیەکەی زۆر کەمتر بێت لە حەشدی کارمەندان و سەرچاوەکان لە بواری دیپلۆماسیدا، یان دامەزراندنی گروپێکی فشار یان کۆمپانیایەکی پەیوەندییە گشتیە گرانبەهاکان. سایبەر سپەیس ( بۆشایی ئەلکترۆنی ) ڕێکخراوە ناحکومییەکانی خۆی دروست دەکات، لە شێوەی بلۆگەر و ڤیدیۆگر و دەنگەکانی تر لەسەر ئینتەرنێت بە مەبەستی پشتگیریکردنی تێڕوانینی حکومەت و لەوانەیە وەڵامی هاندان و پارەدانی دۆستانە بداتەوە.

### هاوپەیمانیە کەم ئەندامەکان

زۆربوونی هاوبەشەکانی کار، هەندێک ڕەسمی تر لە ئەوانی تر، لە نێوان ئەو دەوڵەتانەی کە گرینگی بە یەک کێشە یان یەکێکی تر ئەدەن، ڕەنگدانەوەی گۆڕانی دەسەڵاتە لە بواری جیۆپۆلەتیکی ئەمڕۆدا. گروپی کیرنز، کە لە ساڵی

١٩٨٦ بۆ چاکسازی بازرگانی کشتوکاڵی دامەزراوە، توانی ١٩ دەوڵەت کۆبکاتەوە کە هەناردەی خۆراکیان دەکرد، لەوانە کەنەدا، پاراگوای، ئەفریقای باشوور، ئەرجەنتین و فلیپین؛ بۆ فشارخستنە سەر کەمکردنەوەی گومرگ و کۆمەککردنی کاڵاکان. هەروەها گروپی بریکس - بەرازیل و ڕووسیا و هیندستان و چین و ئەفریقای باشوور- یەکەم کۆبوونەوەی لوتکەیان لە ڕووسیا لە ساڵی ٢٠٠٩ ئەنجامدا، هەرچەندە زاراوەی بریکس دوو ساڵ لەمەوپێش لەلایەن خاوەن بانکێکی گۆڵدمان ساکس دراوە، و بڵاوبووەوە بۆ بازنە داراییەکان پێش ئەوەی سیاسیەکان قووتی بدەن. ڕوسیاش سەر بەگروپی وڵاتانی پیشەسازی دووەم (٨-G)ە؛ مەکسیک و ئەفریقای باشوور چوونە پاڵ بەرازیل و هیندستان و چین بۆ پێکهێنانی پێنج وڵاتی زیادکراو بۆ دووەم وڵاتە پیشەسازییەکان (G٨+٥). دوو گروپی جیاوازی بیستیش (G-٢٠) هەیە، کە یەکێکیان لە وەزیرە داراییەکان و پارێزگارەکانی بانکی ناوەندی ١٩ دەوڵەتی گەورە و یەکێتی ئەوروپا پێک دێت، گرووپی دووەمیش کۆمەڵی وڵاتانی پێشکەوتووە کە ئێستا ژمارەیان زیاتر لە ٢٠ وڵاتە. ئەندامێتی ئەو دوو گرووپە بەیەکدا دەچن. کوتلەی نوێی بازرگانی و ئاژانسەکانی هاوکاری هەرێمی لە هەموو جیهاندا دەستیان بە دەردەکەوتن کرد. هاوپەیمانی بۆلیڤاری ئەمریکا کە لە ساڵی ٢٠٠٥ لە لایەن ڤەنزوێلا و کوباوە دەستی پێکردبوو، حەوت دەوڵەت لەخۆ دەگرێت، ئیکوادۆر، نیکاراگوا، سەینت ڤینسنت، گریناديس، کۆماری دۆمینیکان، ئەنتیگوا و باربودا لە کاریبی. ئەمە وەک ڕێکەوتنێکی بازرگانی وایە، بەڵام ئاواتی سیاسی فراوانتری هەیە، یەکێک لەو قازانجانەی کە وڵاتانی ئەندام هاوبەشی دەکەن چاودێری پزیشکی چاوە (کە لەلایەن کۆبا دابین کراوە و لەلایەن نەوتی ڤەنزوێلاوە پشتگیری دەکرێت).

تایبەتمەندی سەرەکی هاوبەشیش ئەوەیە کە ئەم گرووپانە هیچ گروپێکیان تێدا نیە کە هەوڵ بدات ببێتە هاوپەیمانی جیهانی گشتگیر. ئەوان ڕێگە بە

ئەندامێتی نادەن تەنیا بۆ ئەوانەی کە هاوبەشی تێڕوانین یان نیگەرانییەکانیانن، و بەم شێوەیە زیاتر هاوشێوەی "هاوپەیمانیەتیی ئارەزوومەندان"ە کە بەشداریان کرد لە هەردوو جەنگی ئەمریکا

عێراق و ئەفغانستان وەک لە نەتەوە یەکگرتووەکان یان دانوستانە نێودەوڵەتیەکان تایبەت بە گۆڕانی کەش و هەوا. بۆ نمونە لە مانگی ئازاری ٢٠١٢دا، ئەندامانی کۆمەڵەی بریکس گفتوگۆیان کرد لەسەر دامەزراندنی بانکی گەشەپێدانی هاوبەش بۆ کۆکردنەوەی پاشەکەوتی نێوان وڵاتان، و هاندانی پەیوەندی بازرگانی زیاتر، بە تایبەتی لە نێوان ئەندامانی تر و ڕوسیا و چین.

وە ئەم کۆبوونەوانە چانسی زیاتریان هەیە بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانەی کە بەنیازن بیکەن ئەنجام بدەن. لە ڕاستیدا، ڕێکەوتنە جیهانییەکان زۆر دەگمەن بوونە، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە ڕاستیدا کاریگەرن. دوا ڕێکەوتنی بازرگانی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٤ ڕوویدا، ئەمەش ڕێککەوتننامەی تایبەتە بە دامەزراندنی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پرۆتۆکۆلی کیۆتۆی پەسەند نەکرد، و زۆرێک لەو دەوڵەتانەی کە ئیمزایان کردووە ئەنجامی ئامانجیان بەدەست نەهێناوە، جاڕنامەی هەزارەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ١٩٢ وڵات لە ساڵی ٢٠٠٠ واژۆیان لەسەر کرد، زۆرێک لە ئامانجە کۆمەڵایەتیە جیهانیەکانی داڕشت کە پێویستە بێنە دی بە هاتنی ساڵی ٢٠١٥. شکستە تەواوەکەی لوتکەی کۆپنهاگن، کە هەوڵێکی دیپلۆماسیی فراوان درا لە دژی ئەنجامێک کە لە باشترین ڕەمزی خۆیدایە، تایبەتمەندییەکی زاڵە بۆ دەستپێشخەرییە هەمەلایەنەکان کە ئامانج لێی بەدەستهێنانی پابەندبوونێکی جیهانییە.

جێگرەوەی ئەمەش ئەو شتەیە کە پێی دەوترێت هەوڵدانی ئەندامێتی سنووردار (هەوڵەکان لەلایەن گروپێکی بچووکی دەوڵەتان بۆ چارەسەرکردنی کێشە تایبەتەکان). ئەم هەوڵدانە ئەندامێتیە سنووردارە بریتییە لە کۆکردنەوەی کەمترین

## کۆتایی سەردەمی هێز

ژمارەی دەوڵەتان کە پێویستە بۆ گۆڕینی شێوازی چارەسەرکردنی جیهان بۆ کێشەیەکی تایبەت، بۆ نموونە: ١٠ وڵاتی زۆرترین پیسکردنی ژینگەیی، ٢٠ ووڵاتی زۆرترین بەکارهێنەری ئەو نەوە ماسیانەی کە دووچاری لەناوچوونن، ١٠ دەوڵەتی سەرەکی کە بەشدارن لە یارمەتیدانی ئەفریقی وەک دەوڵەتانی بەخشەر یان وەرگر، و هاوشێوەی ئەوە. هەروەها هەوڵیدانی ئەندامێتی سنووردارەکان دەتوانن خزمەت بە دەوڵەتە بچووکەکان بکەن، ئەگەر شێوەی هاوپەیمانیە کەم ئەندامەکان وەرگرن ئەوانەی چانسی سەرکەوتنیان زیاترە، و ئەوانەی پەکیان ناخرێت لە لایەن هێزە دەسەڵاتدارەکانەوە کە کاریگەریان کەم دەبێتەوە. هەرچۆنێک بێت، ئەم هەوڵدانە ئەندامێتیە سنووردارانە دووچاری هەڵوەشانەوەی هێزدەبنەوە و کاریگەریان لێ دەکات. لەبەرئەوەی زۆرێک لەو کۆبوونەوانە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو سەرهەڵدەدەن و ئەو فشارە ئەخلاقیانەیان تێدا نیە کە لەلایەن ئەندامێتی جیهانی دەسەپێنرێت، ئەوا زیاتر تووشی هەڵوەشانەوە یان لێکترازان دەبێت کاتێک حکومەتی ئەندام دەکەوێت، یان هاوڵاتیانی ڕێگری دەکەن، یان ئەولەویەتی سیاسەتەکەی دەگۆڕێت.

### ئایا هیچ بەرپرسێک لێرە هەیە؟

بنبڕکردنی زنجیرەی هەرەمی مانای ئەوەیە کە چیتر ناکرێت هیچ گروپێکی بچووک لە دەوڵەتە زاڵەکان (هەروەها یەک دەوڵەتی دەسەڵاتدار) کۆنترۆڵی ڕێڕەوی هاریکاری نێودەوڵەتی بکەن و چۆن جیهان قەیرانی ئێستا و داهاتوو چارەسەر بکات. هەروەها بە مانای تێپەڕاندنی دامەزراوەی دیبلۆماسی تەقلیدی دێت - وەزیرانی دەرەوە و باڵوێزخانەوە کارمەندەکانیان و دەزگا یارمەتیە نیشتیمانیەکان و دامەزراوە دوولایەنەکانی تر- کە کۆنترۆڵی مەرجەکانی بەشداریکردنی سنوورەکان دەکەن. دیبلۆماتکارەکان جارێک پاسەوان و پارێزەری

ستانداردی دیاریکراوی مامەڵە و کارلێک بوون، ئێستا ڕۆڵی نێوەندگیریان لێ ئیدانە کردوون، و سوودەکانی کارامەیی سیاسی کەم بۆتەوە؛ لە دیمەنێک پڕە لە دەستپێشخەرییەکانی دەوڵەتە بچووکەکان، و ئەو ڕەواجدانەی کە لایەنە کاریگەرە نادەوڵەتیەکان و کەناڵە ڕاستەخۆکانی پەیوەندی لەگەڵ ڕای گشتی دەرەوە پێی هەڵدەستن.

دامەزراوەکانی هاوکاری و لادان، کە لە حەوت دەیەی ڕابردوودا دروست کراوە، بەگوێرەی پێویست بەهێز بووە بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە کۆتایی هێنانی بە سەردەمی داگیرکاری، و بەرەنگاری دەستبەسەرداگرتنەکان و داگیرکردنەکان، و کەمکردنەوەی جیابوونەوە لە ناو دەوڵەتەکان. لە هەمان کاتدا، هەڵوەشانەوەی ئەو یەکێتییە زەبەلاحانەی کە بە ئایدیولۆجیا و هێزی یەکێتی سۆڤیەت و یوگوسلافیا بەرگەی خۆیان دەپاراست ئەو جیاکاریە دەنوێنن کە جەخت لە یاسا دەکاتەوە، بۆیە هێشتا دەوڵەتە باڵادەستەکان خاوەن سەرەوەرین، کە دیاردەیەکە گاڵتەی پێ ناکرێت: سوپاکان، و چاودێری سنور، و دراوەکان، و سیاسەتی ئابوری، و سیستەمی باج. کێبڕکێی نێوان دەوڵەتەکان لەگەڵ دەربڕینی لە ڕێگەی دانوستان و هاوپەیمانی و ڕێککەوتن و پروپاگەندە و ڕووبەڕووبوونەوە لەناو ناچن.

هەروەها، کلک هەمیشە سەگ ناهەژێنێت؛ هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یان چین زۆر بەرزترە لە هەر وڵاتێکی بچووکی ئەوروپی، لاتینی یان ئاسیایی، لە ڕووی تیۆری و بە نزیکەیی لە ڕووی پراکتیکیش. ئەوەی ماوەتەوە کاریگەری ئەو هێزەیە نەوەک تواناکانی هێز. چونکە سەرۆکی ئەمەریکا وا دەکات لایەنەکەی تر لە هەر کاتژمێرێکدا لە هەر شوێنێکی جیهان وەڵامی تەلەفۆنەکەی بداتەوە. وە دەشتوانێ هەر کۆبوونەوەیەکی سەرۆکەکانی هاوڕێی بشکێنێت، و دووبارە ئاڕاستەکردنی دیالۆگەکە. بەو پێوەرە ئەبینین کاریگەری سەرۆک وەزیرانی چین لەزیادبووندایە. ئەمانە ئەو دینامیکانەن کە لە کۆنفرانسە

نێودەوڵەتیەکان و کۆبوونەوەکانی لووتکە بەدەر دەکەون، و کاریگەری لەسەر ئەنجامە کۆتاییەکان هەیە. چاودێریکردن و لەنزیکەوە پەیڕەوکردنی ئەم دینامیکانە تەنیا دوو مەسەلەی نیشتمانپەروەری یان شێوازی دەرەوەی ڕێگا نییە، ئەوان کاریگەرییەکی بەرچاویان هەیە.

بەڵام هەڵوەشانەوەی دەسەڵات بەو مانایەی کە خولیای ئەو هێزە گەورەیەی کە لە هەڵکشاندایە یان هێزەکە لە دابەزیندایە - وەک ئەوەی لە کۆتاییدا بواری جیۆپۆلەتیکی گۆڕاوە بۆ یارییەکی سفری لە نێو نوخبەی جیهان - هیچ نیە جگە لە خافڵاندنێک لە گرینگترین شتەکان. بەڵێ، هەموو ئەو پرسانەی کە دەوڵەتاکان ڕووبەڕووی دەبنەوە لە خۆیدا بابەتێکی گرنگە، و هیچ گومانی تێدانیە کە هاوچەشنی هێزە سەربازییەکان لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، روسیا و چین جێی بایەخە؛ و هەروەها سروشتی وەڵامدانەوەی چین بۆ داواکاریەکانی ئەمریکا بۆ بەڕێوەبردنی دراوی نەتەوەیی خۆی بە شێوەیەکی جیاواز، هەروەها جیاوازی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکێتی ئەوروپی دەربارەی سیاسەتی دەرەوە و پشتگیری کشتوکاڵی و ڕاوەدوونانی تاوانبارانی جەنگ، و هەڵوێستەکانی چین و هیند لە بارەی درووستبوونە کاربۆنیەکان. بەڵام هیچ کام لەمانە مانای ڕووخانی دەوڵەتێکی زاڵ و هەڵسانی یەکێکی تر نییە لە شوێنی خۆیدا. زلهێزەکانی داهاتوو وەک ئەوانی ڕابردوو نابن.

وە وەک ئەوانیش ڕەفتار ناکات. چونکە ڕووبەری مانۆڕکردنە بەردەست بۆ ئەوان تەسک بۆتەوە، و توانای هێزی بچووک بۆ ڕێگریکردن، ئاراستەکردنەوە یان پشتگوێخستنیان بەردەوام دەبێت لە گەشەکردندا.

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە تێڕوانینی جێگرەوە دروستە؟ ئایا جیهان لە سەدەی بیست و یەکدا بەرەو وەشانێکی نوێی هاوچەرخی جەنگی "هەموو دژی هەموو" دەڕوات وەک ئەوەی تۆماس هۆبس باسی کردووە، وە کە زیاتر ئاڵۆز بووە بە

بەیەکداچوون و کاڵبوونی هێڵە جیاکەرەوەکانی نێوان دەوڵەتە نەتەوەییەکان و ئەکتەرە نادەوڵەتەکان و لێشاوی داراییە بێ بەربەستەکان و کۆمەڵە خێرخوازیەکان و ڕێکخراوە ناحکومیەکان و ڕێکخراوە ناحکومیەکانی کە حکومەت بەڕێوەی دەبات و هەموو جۆرێک لە ئاژانسە ئازادەکان؟ وەڵامە ئۆتۆماتیکیەکە بەڵێیە، ئەگەر لەگەڵ هەڵوەشانەوەی دەسەڵات ڕانەیەین و نێینە باوەڕ بە گۆڕانی ڕێگاکانی هاوکاریکردن لە دەرەوەی سنور، لە چوارچێوەی ناوەوە و دەرەوەی حکومەتەکان بەهەمان ئاست.

هیچ هۆکارێک نییە لە کردنی ئەنە ڕێگریمان لێ بکات، چونکە ڕووخانی ڕیزبەندی جیهانی چەند جارێک پێشبینی کراوە لە کاتی گۆڕانی تەکنەلۆجیا و بەردەوامی ئاڵۆزی کولتووری و دیمۆگرافی. تۆماس مالتۆس پێشبینی کرد کە جیهان بەرگەی هیچ فراوانبوونێکی دانیشتوان ناگرێت. بەڵام خۆڕاگر بوو. کاتێک مارکسیەکان شۆڕشی پیشەسازی و فراوانبوونی بازاڕو بازرگانی جیهانیان لەسەدەی نۆزدەیەم بینی، چاوەڕوانی ڕووخانی سیستەمی سەرمایەدارییان دەکرد لەژێر سەنگی ناکۆکییە ناوخۆییەکاندا. ئەمەش ڕووی نەدا. جەنگی جیهانی دووەم و هۆلۆکۆستیش باوەڕی ئێمەیان بەسروشتی ئەخلاقی مرۆڤ بەقووڵی هەژاندووە، بەڵام ئەو بنەماو دامەزراوانەی کە لەلایەن جیهانەوە لە وەڵامدا دروستکراوە تا ئەمڕۆ ماونەتەوە. لەناوچوونی ناوکیش، کە هەڕەشەی سەرەکی بوو لە ساڵانی پانجاکان و شەستەکانی سەدەی بیستەم، ڕووی نەدا.

کۆمەڵێک لە هەڕەشە و قەیرانەکانی ئەمڕۆی نێودەوڵەتی - لە گەرمبوونی جیهانی و کەمبوونەوەی سەرچاوەکانەوە بو بەربڵاوبوونی ناوەکی و قاچاخچێتی و بنچینەگەری ئایینی و هتد - هەن و پلەبەندی دەوڵەتەکانیش بەردەوام لە گۆڕاندان، و چیتر پیادەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت وەک جاران نەماوە. بەراوردکردنەکە دەکرێت سەرسوڕهێنەر بێت. چونکە هەر کۆمەڵکوژییەکی نوێ

یان ڕووداوی تەقاینەوە یان کارەساتێکی ژینگەیی جارێکی تر ئێمە دەهەژێنێت، و هەموو ئاکامە نادیار و سەختەکانی کۆنفرانس و لوتکەکان دڵنەوایی یان هیوایەکمان پێ نادات کە شایەنی باس بێت. وە لەوانەشە وا دەربکەوێت کە هیچ کەسێک بەرپرسیار نییە. ئەو هەستە و ئەو ئاڕاستانەی کە دەیوروژێنن بەردەوام دەبن. بەڵام سەیرکردن بۆ دەوڵەتێکی زاڵی ئێستایەکی یان نوێ، یان بۆ لیژنەیەک لە دەوڵەتە نوخبەکان کە کۆنترۆڵی دۆخەکە بکەن، جۆرێکە لە هەوڵی بێ هیوا و کە چارەنووسی سەرنەکەوتنی بۆ نەنوسراوە. چارەسەرەکان بۆ بەرەنگارییە نوێیەکان کە دووچاری هاریکاری نێودەوڵەتی و لە کۆتایی دا دابەشبوونی هەسارەکە دەبێتەوە لە دیمەنێکدا دەردەکەون کە تێیدا بەدەستهێنانی هێز لە جاران ئاسانترە، بەڵام بەکارهێنانی یان هێشتنەوەی گرانترە.

## بەشی هەشتەم

## شتەکان وەک پێشتر ناڕۆن بەڕێوە

## کەوتنی هەژموونی کۆمپانیاکان لە ژێر ئابلۆقەدا

بۆ دەیان ساڵە "حەوت خوشکەکە" ئەو کۆمپانیا زەبەلاحە یەکخراوە ستوونیانە، وەک ئێکسۆن و شێل، زاڵبوون بەسەر پیشەسازی نەوتدا، و پێنج کۆمپانیای گەورەی تر کۆنترۆڵی ژمێریارییان کردووە، و سێ کۆمپانیا گەورەی تریش کۆنترۆڵی پیشەسازی ئۆتۆمۆبیلیان کردووە، هەروەک سێ تۆڕە تەلەڤزیۆنییەکان دیانکرد لە بواری پەخشی تەلەڤزیۆندا، و پاشان هەردوو کۆمپانیای کۆمپیوتەر لە بواری تەکنەلۆجیای زانیاریەکان. ئەم شێوازە لە زۆربەی کەرتەکانی تردا زاڵ هەبوو: چەند کۆمپانیایەکی کەم دەستیان بەسەر بازاڕە تایبەتەکانیاندا گرت، و ئەوەندە گەورە و دەوڵەمەند و بەهێز و باش دامەزرابوون کە لابردنیان شتێکی باوەڕپێکراو نەبوو.

ئەمە تەواو بوو، کاتی ئەم پێکهاتە ستاتیکانە کۆتاییان پێ هاتووە و چیدی زاڵ نین بەسەر هیچ سێکتەرێکی ئابووری جیهانیدا، و پێشبڕکێ بۆ پێشەنگی لە هەموو کاتێکی تر توندترە، لەوانەیە شێڵ، مۆبیل یان سۆنی هێشتا لە لووتکە بێت یان نزیک بێت لێی، بەڵام هێزی بازاڕ و هەژموونیان کەم بووەتەوە و لاوازبووە، چونکە ڕکابەرە نوێیەکان دەستیان بەسەر بەشێکی زۆری بازاڕە تەقلیدیەکاندا گرتووە. سەرەڕای ئەوەش، زۆرێک لە کۆمپانیا زۆر بەناوبانگەکان وون بوون، وەک "کۆداک مۆمێنتس" چیدی بوونی نەما، وەک نموونەیەک لە براندێکی بەناوبانگ کە لە ساڵی ٢٠١٢ لە " زبڵدانی مێژوو" کۆتایی پێهات.

لیستی ئەو کۆمپانیایانەی ئێستا لەپێشەوەن ناوی نوێ لەخۆدەگرێت، کە

## کۆتایی سەردەمی هێز

زۆرێک لەو کۆمپانیایانە لەخۆ دەگرێت کە لە ناوچە نەناسراوەکانەوە هاتوون بۆ دامەزراندنی کۆمپانیا جیهانیەکان، لەوانە ئیستۆنیا (Skype)، هیندستان (میتاڵ ستیل)، بەرازیل (ئیمبرەیر) و گالیسیا لەئیسپانیا

(زارا). ئینجا ئەوانەی لووتکە چ هاتووە نوێیەکان بن یان نا، ئیتر دڵنیا نین کەی وەک ڕابردوو لەنێو سەرکردەکاندا دەمێننەوە.

ئێمە باسی ئەوە ناکەین کە کۆمپانیایەکی زەبەلاح کۆمپانیایەکی زەبەلاحی تر لادەبات، چونکە ئەو بۆشاییەی کە جارێک لەلایەن سەرکردە گەورەکانەوە کۆنترۆلکرابوو لەلایەن کۆمەڵێک یاریزانی جیاوازەوە پڕکرایتەوە کە پشت بە یاسا نوێیەکان و سەرچاوەکانی هێز و ستراتیژی پێشبڕکێ دەبەستن. سروشتی ئەو دەسەڵاتەی کە جارانێک لەلایەن کۆمپانیا کۆنەکان و خاوەنەکانیان چێژی لێوەردەگیرا، گۆڕاوە.

ئەمە چۆن؟ پیشەسازی نەوت نمونەیەکی ڕوونە، لەبەر ئەوە بەکەڵک دێت بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی ڕوویدا. ئەو کۆمپانیایانەی کە بە "حەوت خوشک" ناسراون، کە لە ساڵانی ١٩٤٠ تا ١٩٧٠ دەستیان بەسەر کەرتی نەوتدا گرتووبوو، لە لایەن کۆمپانیا هاوشێوەکانەوە جێگەیان نەگیراوە، لە ڕاستیدا پیشەسازی نەوت ئێستا زیاتر پارچەپارچە و کەمتر بە ستوونی یەکخراوە. دروستکردنی بازاڕی داهاتووی نوێ و بازرگانی زیاتر بە نەوت لەسەر بنەمای نرخێکی بەپەلە بەشێوەیەکی ڕیشەیی شێوازی کڕین و فرۆشتنی نەوتی گۆڕیوە. پیشەسازیەکە بە "سەربەخۆ"یە نوێیەکان پڕبووە: کۆمپانیا بچووکەکان کە پێشبڕکێ دەکەن لەگەڵ زەبەلاحەکانی وەک ئێکسۆن مۆبیل، شیڤرۆن و بریستش پترۆل، وە ئەیانخەنە خوارەوە لە هەندێک حاڵەتدا. هەروەها یاریزانە نوێیەکان لە پیشەسازی نەوتدا بریتین لەو کۆمپانیایانەی لەلایەن حکومەتەوە خاوەنداریەتیان دەکرێت کە زیاتر پێشبڕکێ دەکەن و زیاتر باوەڕیان بە کۆنترۆڵکردنی سەرچاوەکانی وزەی وڵاتەکانیان هەیە. سندوقە

زەبەلاحەکانی دەرماڵەدان کە کاریگەری بێوێنەیان هەیە لە بواری خاوەندارێتی و لێپرسینەوە و دارایی ئێستا بەشێکن لە دیمەنی پیشەسازی نەوت، وە لەوانەیە وەک خاوەن بەرژەوەندیەکی کاریگەر هەڵسوکەوت بکات لە جیاتی کۆمپانیا گەورەکان یان پارەدارەکان کە سەرمایە دابین دەکەن بۆ کۆمپانیا بچووکەکان. لە ڕابردوودا حەوت خوشکەکە تەنها ئەو کۆمپانیایانە بوون کە بە ئازادی دەستیان دەگەیشت بە سامانە داراییە گەورەکان کە پێویست بوو بۆ بەشداریکردن لە بازاڕی نەوتدا. ئەمڕۆ، سوپاس بۆ یاریزانە نوێیەکان ( سندوقەکانی دەرماڵە، کۆمپانیا تایبەتەکانی پشکەکان) و ئامرازە داراییە نوێیەکان و پێوەرە دامەزراوەییەکانی تر (ئاڵوگۆری نوێ)، وای کردووە کە کۆمپانیا بچووکەکان بتوانن سەرمایەیان هەبێت بۆ پێشبڕکێکردن لەو پرۆژانەی کە جاری کۆمپانیا زەبەلاحە نەوتیەکان قۆرخیان کردبوو. لەکۆتایدا هەموو ئەو بەشداربووانەی بواری پیشەسازی نەوت دەبێت مامەڵە لەگەڵ وردبینی و دەستێوەردانی بێوێنەی حکومەت و چالاکوانان و گرووپەکانی پاراستنی ژینگە و وەبەرهێنانی دامەزراوەیی و سەندیکاکانی کرێکاران و میدیا و گرفتەکانی تر بکەن.

پاولۆ ساکرۆنی، بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای زەبەلاحی نەوتی ئیتالی ئێن ئای ئێن ئای پێی ووتم: "کاتێک سەیری ئەوە دەکەم کە چۆن سەرکردەکانی کۆمپانیا گەورەکانی نەوت لە ساڵانی ١٩٦٠ و ١٩٧٠ و ١٩٨٠کان بڕیاری خۆیان داوە و کاروبارەکانیان بەڕێوەبردووە، سەرم ئەسوڕمێ دەربارەی ئەو ئازادیە و سەربەخۆییەی کە هەیانبوو. لەو پێگەیەی منەوە، ئاشکرایە کە بەڕێوەبەری گشتی هەر کۆمپانیایەکی نەوت لەم ڕۆژانەدا هێزی زۆر کەمترە لەو کەسانەی پێش ئێمە بوون."

شتێکی هاوشێوە لە کەرتی بانکدا ڕوودەدات؛ ژمارەیەک لە بانکە گەورەکانی دامەزراوەکان ون بوون، یان دەستیان بەسەردا گیراوە؛ لە ئەنجامی

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئاڵۆزی دارایی جیهانی ساڵی ٢٠٠٨، کە ئەمەش لە بەرامبەردا بووە هۆی سەرنجدانێکی زیاتر. تا ساڵی ٢٠١٢، پێنج بانک (جی پی مۆرگان، بانکی ئەمریکا، سیتی گروپ، وێلز فارگۆ و گۆلدمان ساکس گروپ) سەرمایەکەیان یەکسانە نەبوو بە نیوەی قەبارەی ئابووری ئەمریکا. بە نزیکەیی هەمان شت بەسەر شانشینی یەکگرتوودا جێبەجێ دەکرێت، کە پێنج لە بانکە گەورەکان زاڵبوون بەسەر کەرتی لە دوو دەیەی ڕابردوودا - بارکلەیس، گروپی ئێچ ئێس بی سی هۆڵدینگز، گروپی بانکی لۆیدز، بانکی ڕۆیال لە گروپی سکۆتلاند و سانتاندەر - لقی شانشینی یەکگرتوو ( ئەوەی کە ناوەی بانکی ئابی نەتەوەیی بوو تاوەکو لەلایەن بانکی ستاندەری ئیسپانی کڕاوە لە ساڵی ٢٠٠٤). بەڵام لە چەند ساڵی ڕابردوودا، زیادبوونی نیگەرانییە گشتییەکان لە ئەنجامی قەیرانی دارایی و ئابڕووچوونەکان، وەک دەستکاریکردنی ڕێژەی قازانج لەلایەن بانکی بارکیلس و پلان گێڕان لە گواستنەوەی دارایی نایاسایی (ئێچ ئێس بی سی و ستاندەرد چارتەرد) کاردانەوەی توندی لێکەوتەوە؛ کە لە دەرەنجامدا لێشاوێک لە تابلۆ و ڕێکخراوەکانی لێ دروست بوو کە سنور بۆ ئەو سەربەخۆییە دادەنێت کە عادەتەن ئەم بانکانە هەیانبوو. سەرەڕای ئەوەش، یاریزانانی نوێ دەرکەوتن، وەک بازرگانێکی بەریتانی ڕیچارد برانسۆن، کە کۆمپانیاکەی " ڤێرجین مۆنی" هەڵسا بە کڕینی بانکی " نۆرثرن ڕۆک"ی پڕکێشە، و بەدوای ئەوەدا بوو ببێت بە هێزێک لە بازاڕی کاڵای بەکاربەردا؛ هەموو ئەم خاڵانە ئاماژە بۆ ئەو فشارە پێشبڕکێیە نوێیەیە دەکات کە دووچاری یاریزانە گەورە تەقلیدیەکان بۆتەوە لە کەرتی بانکی. وەک یەکێک لە شیکەرەوەکان لە ساڵی ٢٠١٢ بە بلومبێرگی گوت، "گۆڕانێکی پێکهاتەیی گەورە لە بازاری بەریتانیا ڕوودەدات گەورەتر لەهەر گۆڕانێک کە لە مێژووی هاوچەرخ ڕوویدابێت."

بەڵام ڕکابەرە گەورەکانی بانکە گەورە زاڵەکان بریتین لە سندوقەکانی

دەرماڵە و یاریزانە داراییە نوێیەکانی تر کە وەک بانکە گەورەکان ئازادی دەستیان گەیشتنیانن هەیە بە سەرچاوەکان، و دەتوانن خێراتر بجوڵێنن و چوستیەکی زۆر زیاتریان هەیە، لە سەرەتای ساڵی ۲۰۱۱، کە ئابووری جیهانی هێشتا دەیناڵاند بەدەست دەرەنجامەکانی قەیرانەکە، ڕۆژنامەی فاینەنشیاڵ تایمز لەسەر چاکبوونەوەی سندوقەکانی دەرماڵە ئەمەیان نووستی:

باشترین سەندوقەکانی دەرماڵە ۲۸ ملیار دۆلاریان قازانج بەدەست هێنا بۆ بەکاربەرەکانیان لە نیوەی دووەمی ساڵی ڕابردوو، زیاتر لە نزیکەی دوو ملیار دۆلار لە کۆی قازانجەکانی بانکەکانی گۆڵدمان ساکس، و جی پی مۆرگان، سیتی گروپ، و مۆرگان ستانلی، بارکلیز، و ئێچ ئێس بی سی بەیەکەوە، ئەمەش بە پێی داتا تازە بەردەستەکان. تەنانەت گەورەترین سندوقی دەرماڵە تەنیا چەند سەد فەرمانبەرێکی هەیە، لە کاتێکدا ئەم شەش بانکە ژمارەی فەرمانبەرانی دەگاتە نیو ملیۆن فەرمانبەر. وە بە پێی داتاکان، تێکڕای ئەو قازاجانەی کە باشترین ۱۰ سندوقی دەرماڵە بۆ وەبەرهێنانی بەدەستیان هێناوە گەیشتە ۱۸۲ ملیار دۆلار لەوەتەی کاتی دامەزراندنیەوە، کاتێک جۆرج سورۆس ۳۵ ملیار دۆلاری بەدەست هێنا بۆ بەکاربەرەکانی پاش دابەزاندنی هەموو باجەکان هەر لە کاتی دامەزراندنی سندوقی کوانتەم لە ساڵی ۱۹۷۳. کەچی سندوقی جۆن بولسۆنن " بولسۆن و هاوبەشەکانی " دەستی کرد بە شان لە شاندانی سنوقی سورروس وەک سندوقێکی دەرماڵە کە بەرزترین قازانجی بۆ وەبەرهێنەرەکانی بەدەست هێنا، پاش تۆمارکردنی قازانجەکان کە گەیشتە ۸.۵ ملیار دۆلار لە نیوەی دووەمی ساڵی ۲۰۱۰.

بانکارە گەورەکان بەدەست کەمبوونەوەی ئازادی کارکردنیان دەناڵێنن، هەروەک هاوشێوەکانیان لە کەرتە نەوتیەکان، بەڕێوەبەری جێبەجێکردنی بانکی جی پی مۆرگان، جەیمی دیمۆن، بانکێکی گەورەتر لە ویلیام هاریسۆنی پێشووتر

بەڕێوە دەبات، بەڵام وەک بەردەوامبوونی سکاڵاکانی دەربارەی چاودێری حکومەت و فشارەکانی چالاکوانان ئامازەیان پێ دەدا، ئەوا بەدەست کۆتی زیاتریش دەیناڵاند لەوەی کەپێی هەڵدەستا. جەیمی دیمۆن پێیوابوو کە جەماوەری گشتی و ڕێکخەرەکان باشتر دەبن ئەگەر متمانەیان بە خۆسانسۆڕی بانکەکان و پێشبڕکێکان هەبێت، بەڵام ئەوە قورس بوو کە بەرگری لەو بۆچوونە بکرێت کاتێک لە ساڵی ٢٠١٢دا دەرکەوت کە بانکەکەی بە نزیکەیی ٦ ملیار دۆلار زیانی بەرکەوتووە کە هەندێک لە هاوپیشەکانی شاردبوویانەوە و ئەندامانی گروپی بەڕێوەبرنی باڵای متمانەپێکراو لە ئیدارەکەی هەستیان پێ نەکردبوو.

لە لایەکی ترەوە، پیشەسازی ڕۆژنامە نمونەیەکی تری پەردە لەسەر لابردن بوو: چونکە ئەو چیرۆکی ئاساییەی لەو بەدبەختیانەی بەسەری هات ئەوەیە کە کرایگسلیست و گووگڵ سەرچاوەیەکی سەرەکیان ڕاکێشا لە ڕێبەرە تەقلیدیەکانی پیشەسازی بۆ داهاتەکانی ( ڕیکلامە پۆلێنکراوەکان). بەڵام ئەوەی بەسەر ڕۆژنامەکاندا هات زۆر سەرنج ڕاکێشتر و ناخۆشترە لە تەنها گۆڕینێک لە پشکی بازاڕ لە ڕیکلامە پۆلێنکراوەکان لە گروپێک لە کۆمپانیاکانەوە بۆ گروپێکی تر. ئەو دەسەڵاتەی کە ئێستا خاوەنەکانی کرایگسلیست و بەڕێوەبەرەکانی زۆر جیاوازترە لەو دەسەڵاتەی کە پێشتر بنەماڵەی گراهام، خاوەنی واشنتۆن پۆست، یان خێزانی ئۆکس سۆلزبێرگەر، کە کۆنترۆڵی نیویۆرک تایمز دەکەن، خاوەنی بوون. ئەم خاوەن پشکە کۆنترۆڵکەرانە، وەک بنەماڵەی موردۆکس، بنەماڵەی بێرلوسکۆنی، یان چەندین خێزانی خاوەنی میدیا لە جیهاندا هێشتا کاریگەریان هەیە، بەڵام دەبێت بەکاری بهێنن و بە شێوەیەکی جیاواز لە پێشینەکانیان شەڕ بکەن لە پێناو پاراستنی .

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە ئێکسۆن مۆبیل لە لایەن کۆمپانیایەکی نەوتی سەربەخۆ لادەبرێت، یان ئەوەی کە جەی پی مۆرگان چەیس یەکێک لە

سندوقەکانی دەرماڵە لادەبرێت، یان نیویۆرک تایمز لە لایەن هەفینگتۆن پۆستەوە لادەبرێت؟ بە دڵنیاییەوە وەڵامەکە نەخێرە. ئەمانە کۆمپانیا گەورەکانن کە خاوەنی سەرچاوەیەکی زۆر و تایبەتمەندە پێشبڕکێیە بێهاوتاکانن کە زاڵبوون لە بوارەکانیان مسۆگەر دەکەن. لە لایەکی دیکەوە دەکرا هەمان شت لە ساڵانی ١٩٩٠دا سەبارەت بە کۆداک بوترێت کە جارێک زاڵ بوو و ئێستا مایەپووچ بوویەوە، یان لە ساڵی ٢٠٠٧دا سەبارەت بە گەورەترین کۆمپانیای بیمەی جیهانی، کۆمپانیای ئای ئەی جی، کە حکومەت دوای یەک ساڵ دەبوو لە وونبوون ڕزگاری بکات کاتێک بڕێکی زۆری لە پارەی بەردەست ڕژاندە ناوی کە گەیشتە ٨٥ ملیار دۆلار. کێ دەیوت لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٢دا یەکێک لە بانکارە بەهێزەکانی جیهان، بۆب دایمۆند، بەڕێوەبەری بانکی بارکلیس، لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا دوای ئەوەی دەرکەوت کە بانکەکەی دەستی هەبووە لە دەستکاریکردنی ڕێژەی قازانجدا؟ کۆمپانیا گەورەکان کە مایەپووچ دەبن و واز لە کارکردن دێنن، و سەرکردە گەورەکانی بازرگانی کە لەسەر شەقامەکان ، یان تەنانەت زیندانەکانیش، کۆتاییان پێدێت، شتێکی نوێ نین. ئەوەی تازەیە وەک ئەم پەڕانەی خوارەوە دەریدەخەن، ئەگەری کەوتنەخوارەوەی هەر کۆمپانیایەکی پێشەنگ زیاتر بووە، هەروەک ئەگەری ئەوە هەیە کە سەرۆکی هەر کۆمپانیایەک لە ڕووداوێکدا تێوەگلێت کە زیان بە ناوبانگی بگەیەنێت.

سەرەڕای ئەوەش، گەورەترین و گرینگترین کاریگەری هەڵوەشانەوەی دەسەڵات لە بازرگانیدا ئەوە نییە کە کۆمپانیاکان ئێستا زیاتر دووچاری لەناوبردن دەبنەوە، بەڵکو لەوەیە کە ڕووبەڕووی تۆڕێکی چڕتر لە کۆتەکان دەبنەوە کە توانای کارکردنیان سنووردار دەکات.

زۆرێک لە کەرتە بازرگانیە جیاوازەکان کەوتوونەتە ژێرباری شۆڕشی پێکهاتەیی: لە ئاژانسەکانی گەشتەوە بۆ پیشەسازی کانزا، لە فرۆشتنی کتێبەوە

بۆ پیشەسازی فرۆکە سەرنشینەکان. بەرەنگاربوونەوەکە لە ڕاستیدا، دروستکردنی پیشەسازییەکە کە ئەم شۆڕشە بونیادییەی تێدا ڕوویداوە، کە تێیدا هێزی یاریزانە گەورەکان زۆر ئاستەنگی تێدا نەبێت و زیاتر بەرەو نەمان نەڕوات.

## لە وولاتانی بەڕێوبەرەکان و دەسەڵات و پلەبەندی

کێ لێرە بەرپرسیارە؟ لە جیهانی بازرگاری ئەم پرسیارە وەڵامێکی ڕوونی پێویستە، و بێگومان لە سوپاش پلەبەندی هەرەمی دێت. هەمان شت بەسەر کۆمپانیاکانیش جێبەجێ دەکرێت، چونکە ئەمانە دامەزراوەی دیموکراسی نین. لە ژینگەیەکدا کە هەموو خولەکێک بڕیار لەسەر سەرچاوەکان و نرخەکان و دەستەبەرکردن و کرێکاران دەدرێت و ئەنجامەکان لە دەرەنجامەکەدا دەردەچێت و دەبێت قەوارەیەک بکەوێتە ژێر بەرپرسیار و چاکە بۆ ئەو بگەڕێتەوە و لە کۆتاییدا سەرکۆنە بکرێت. پۆستی بەڕێوەبەری جێبەجێکار ئاماژە بە فەرمان و پابەندبوون و سەرکردایەتی دەکات. ئەوە پێگەیەکە کە لەگەڵ تایبەتمەندییە ڕەمزییە تەقلیدییەکان و بەرژەوەندییە زیادەکان دێت کە لە دەسەڵاتی کۆمپانیادا ناسراوە: نووسینگەیەک دەکەوێتە گۆشە و فڕۆکەی کۆمپانیا و ئەندامێتی یانە لوکسەکان و بێگومان مووچەکانیش. لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمەوە تا ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٧٠ بەهای ناوەندی ڕاستەقینەی مووچەی جێبەجێکارەکان بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەری جێگیر بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٠ بۆ ١٩٩٦، نرخی ڕاستەقینەی مووچەی بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە کۆمپانیای ستاندرد ئاند بۆرز ٥٠٠ بە ڕێژەی زیاتر لە ٥٪ بەرزبۆو ساڵانە، وە بە شەوەیەکی گشتی ئاستی پێدانی بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکان لە دوای ساڵی ١٩٩٨ەوە بە نزیکەیی دوو ئەوەندەی سەرەتای ئەو دەیەیە بەرز بووەوە. وە بە پلەی جیاوازیش، مووچەی

بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە هەموو جیهاندا بە هەمان ئاراستە ڕۆیشتووە.

ئەوە کارێکی خەڵات بەخشە ئەگەر بتوانیت بەدەستی بهێنیت، بەڵام لە ژێر ڕووکەشی ئیمتیازاتە باڵاکان ڕاستییەکی تر هەیە، چونکە هێز لە کەرتی کۆمپانیاکان دەستی بە کەمبوونەوە کردووە، وای لێهاتووە بە زەحمەت پارێزگاری لێ بکرێت.

ئەمە ڕۆمانێکی گووتن نیە: بەڵگەی ئامارەکان بە ڕوونی ئەوە دەردەخات کە دەستگرتنی جێبەجێکارەکان لەسەر کارەکانیان لاواز بووە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە هێشتا شوێنی گەورەترین ژمارەی کۆمپانیا گەورەکانە، ڕێژەی گۆڕینی بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکان لە ساڵانی ١٩٩٠دا لە دوو دەیەی پێشوو زیاتر بووە، و لەو کاتەوە ئەم ئاراستەیە تیژتربووە. بەڕێوبەری هەر کۆمپانیایەکی فۆرچنی ٥٠٠ لە ساڵی ١٩٩٢، ٣٦٪ ئەگەری هەبوو بۆ ماوەی پێنج ساڵی داهاتوو لە ئۆفیسەکە بمێنێتەوە. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٨ ئەم ئەگەرە بۆ ٢٥٪ دابەزیوە. بە پێی ڕاوێژکاری بەڕێوەبردنی جۆن چالێنجەر، ماوەی بەڕێوەبردنی جێبەجێکارەکان لە ئۆفیس لە ١٠ ساڵەوە دابەزیوە لە ساڵانی ١٩٩٠ بۆ نزیکەی پێنج ساڵ و نیو لە ساڵانی ڕابردوودا، ڕەوتێک کە بە چەندین لێکۆڵینەوە پەسەند کراوە. لە توێژینەوەیەکی تر دەرکەوت کە نزیکەی ٨٠٪ ی جێبەجێکارەکانی کۆمپانیاکانی هاتوو لە لیستی ستاندەرد ئاند بۆروز ٥٠٠ لە پۆستەکانیان لابران پێش تەمەنی خانەنشینی. هەروەها ڕێژەی جێگۆڕکێی ناوخۆیی (کە لەلایەن دەستەی بەڕێوبەرەکان سەپێنراوە) و جێگرەوە دەرەکییەکان (بەهۆی یەکگرتن و تێکشکانی کۆمپانیاکان) لە نەوەدەکانەوە بۆ سەرەتای دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەک زیادی کردووە. لە ساڵی ٢٠٠٩ توێژینەوەیەکی تر دەریخست کە ١٥٪ ی جێبەجێکارەکانی ئەمەریکا هەموو ساڵێک جێگۆڕکێیان بۆ کراوە. داتاکان جیاوازن بەپێی نمونەی کۆمپانیاکان، بەڵام ئاراستە سەرەکیەکە ڕوونە:

## کۆتایی سەردەمی هێز

شتەکان زیاتر و زیاتر ناڕوون بوونە بۆ ئەوانەی کە لە کۆتاییدا کۆتا بەرپرسیارێتیان بۆ دەگەڕێتەوە.

ئەم ڕەوتە جیهانییە، نەک تەنها ئەمریکی، و کۆمپانیای "بوز و هاوبەشەکانی" چاودێری ئەم گۆڕانکارییەی جێبەجێکارەکان دەکەن لە زیاتر لە ۲۵۰۰ کۆمپانیای لیستکراو لە بازاڕەکانی سەرمایەی جیهانی. تەنیا لەساڵی ۲۰۱۱دا ٤.١٤٪ ی لە جێبەجێکارە گەورەکانی جیهان کارەکانیان بەجێ هێشتووە، و ڕێژەی جێگرەوەکە لە بەرزترین بوو لە نێوان زیاتر لە ۲٥۰ کۆمپانیا، هەروەکو لە ساڵی ۲۰۰٥ەوە بەم شێوەیە بووە. ئەم ئاراستەیەش لە ماوەی دوازدە ساڵی رابردوو بەردەوام ڕوویداوە. بە ڕێژەیەکی مامناوەن زیاتر لە ١٤%ی بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکان جێگۆڕ کراون لە باشترین ۲٥۰ کۆمپانیا بەراورد بە ١٢% ی ئەو کۆپمانیایانەی کە پلەکانی ۲٥١ بۆ ۲٥۰۰یان گرتووە. ئەم ڕێژەیە کۆتایی پێهێنان بە کارکردن دەگرێتەوە بەهۆی پلانی خانەنشینی و نەخۆشی و هاوشێوەکان، بەڵام توێژینەوەکە بۆی دەرکەوت کە --- دەرکردنی زۆرەملێی جێبەجێکارەکان - لە هەردوو وڵاتی ئەمریکا و ئەوروپا لە زیادبووندایە. هەرچی لە بەشەکانی تری جیهان، کە بازرگانی و بزنسەکان بە خێراترین ڕیتم گەشە دەکەن، دەستی کردووە بە گەیشت بە رۆژئاواش. لە یابان، هەرچەندە کلتوری تەقلیدی کۆمپانیاکان وادەکات لە کار لادانی جێبەجێکارێکی گەورە شتێکی بە نزیکەیی حەرام بێت، بەڵام دەرکردنی زۆرەملێ لە ساڵی ۲۰۰۸دا چوار ئەوەندە بووە و بەردەوام بە بەرزتین ئاستی مێژوویی خۆیان ماوەتەوە. هەروەها کۆمپانیای بورزو و هاوبەشەکانی ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە جێبەجێکارەکان لە سەرانسەری جیهاندا ئەگەری زۆر کەمتریان هەیە بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی ئەنجومەنە ئیداریەکان، ئەمەش نیشانەیەکی ترە بۆ زیادبوونی کۆتە سەپێنراوەکان لەسەر هێزی جێبەجێکاری کۆمپانیا.

باری بەڕێوەبەرەکان بەسەر کۆمپانیاکانیشیان جێبەجێ دەکرێت؛ چونکە ئەو ماوەیەی کە کۆمپانیا لە لووتکە دەمێنێتەوە بە شێوەیەکی بەرچاو کەمبۆتەوە. ئەمەش ڕەوتێکی زۆر خێرا و فرمیی نییە کە چەند ساڵی ڕابردوو پێ ناسرا بێت، هەرچەندە قەیرانی ئابووری وای کردووە زیاتر بەرچاو بێت. ئەوەی ئێمە دەیبینین دیاردەیەکی قووڵی گۆڕانە.

دووبارە، بەڵگەی ئاماریی یەکلاکەرەوەکان، لەساڵی ١٩٨١، ئەگەر هەر پێنج کۆمپانیایێک لە نێو پێنج کۆمپانیا یەکەمەکانی بوارەکەیان بووایە، ئەوا ئەگەری کەوتنی لەو پێگەیە پاش پێنج ساڵ ١٠%ی تێپەڕنەدەکرد، تا ساڵی ١٩٩٨ ئەم ئەگەر بۆ ٢٥% بەرزبوویەوە، وە لە سەد کۆمپانیا یەکەمەکانی لیستکراو لە فۆرچن ٥٠٠ لە ساڵی ٢٠١٠ تەنیا ٦٦ کۆمپانیا لیستکراوی لە ساڵی ٢٠٠٠ی تێدابوو، وە ٣٦ کۆمپانیاشی تێدابوو کە لە ساڵی ٢٠٠٠ بوونیان نەبوو. وە بە گوێرەی شیکردنەوەی ئاماریی وورد، دییگۆ کۆمین لە زانکۆی هارڤارد و تۆماس فیلیپس لە زانکۆی نیویۆرک بۆیان دەرکەوت کە لە ماوەی سی ساڵی رابردوو " ماوەی چاوەڕوانکراو بۆ مانەوەی هەر کۆمپانیایێکی دیاریکراو لە پێشەنگ بە شێوەیەکی زۆر گەورە دابەزیوە". ئەمە ڕەوتێکی جیهانییە کە هاوکاتە لەگەڵ فراوانبوونی مەودای جوگرافی بۆ ڕکابەری. زیاتر لەمەش، لیستی ڕیزبەندی کۆمپانیاکان کە لەلایەن دامەزراوەی فۆربس لە ساڵی ٢٠١٢ دەرچووە، کە زیاتر لە ٢٥٠٠ کۆمپانیا لە جیهان لەخۆدەگرێت، ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە ٥٢٤ لەم کۆمپانیایانە سەنتەرەکانیان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، وە زیاتر لە ٢٠٠ کۆمپانیا کەمتر لە پێنج ساڵ لە پێشەنگ مانەوە، بەرامبەر بە ١٤ کۆمپانیا لە ساڵی داهاتوو؛ چونکە کۆمپانیای زیاتر لە جیهان شوێنی سەنتەریان بردۆتە چین و هیند و کۆریاو مەکسیک و بەرازیل و تایلاند و فلیپین و وولاتانی کەنداو. چین نزیک بوو لە پڕکردنەوەی بۆشایی نێوان خۆی و ویلایەتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یابان لەم ڕووەوە، ئێستا بۆتە سێیەم وولاتی گەورە لە ڕووی جێگیربوونی کۆمپانیاکان تێیدا، کە بە ژمارەی ١٥ کۆمپانیا زیاتری کردووە لەوەی کە هەبوو لە ساڵی ٢٠١١. وە کۆمپانیا نوێیەکانیش دەستیان کرد بە چوونەژوورەوە لەم بوارە، وەک ئیکۆبترۆلی کۆلۆمبی، و کۆمپانیای زەریای هێمنی چینی بۆ بیمە، هەرچی کۆمپانیاکانی ترە وەک لیمان براثەرز و کوداک ( هەردووکیان وەستاون)، و واتشوفیا ( ویلز فارگۆ دەستی بەسەرداگرت)، و میریل لینش ( ئێستا بانکێکی ئەمریکی خاوەنیەتی)، و ئەنهایزر-بوش ( کوتلەی کۆمپانیاکان لە بەلجیکا دەستی بەسەرداگرت کە ڕەگی هەیە لە یەکێ لە کۆمپانیاکانی بەرازیل کە لە بواری بەرهەم هێنانی بیرە کاردەکات)، ئەوانە لەبەرچاوگرتن کەوتن.

## کاریگەری جیهانگیری لەسەر چڕبوونەوەی پیشەسازی

دیارنەمانی کۆمپانیا و براندە ناسراوە بازرگانیەکان کە جارێک خۆشەویست بوون لە رابردوو مانای ئەوە ناگەیەنێت کە چڕبوونەوەی پیشەسازی لە زۆر کەرتی بازرگانیدا هێندەی جاران بەرز نییە، و لە هەندێک حاڵەتدا لە ڕابردوو بەرزترە. بۆ نموونە لە ساڵی ٢٠٠٧دا زانیاری لەسەر پیشەسازی خۆراکی ئاژەڵانی ماڵدار لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەریخستووە کە تەنیا یەک کارگە هەیە کە زیاتر لە ١٥٠ بەرهەمی بە ناوی جیاواز بەرهەم هێناوە. دوو کۆمپانیا ٨٠٪ ی بازاڕی بیرەی ئەمەریکا کۆنترۆڵ دەکەن، و دوو کۆمپانیاش ٧٠٪ ی هەویری ددانی ئەمریکی بەرهەم دەهێنن، و بەم شێوەیە. لە نموونەیەکی تردا، نووسەر باری لەین باسی کردووە، کۆمپانیای لۆکسۆتیکای ئیتالی، نەک تەنها کۆنترۆڵی زۆرێک لە دوکانە سەرەکیەکانی کەرەستەی بینایی بە پارچە دەکات لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەڵکو کۆنترۆڵی زۆرێک لە چاویلکەی براندە

ناسراوەکانیش دەکات کە لەلایەن ئەم کۆگایانەوە فرۆشراون. وە خاوەن پشکە سەرەکییەکەی لۆکسۆتیکا، لیۆناردۆ دێل ڤێشیۆ، یەکێکە لە دەوڵەمەندترینەکانی جیهان، لە ڕیزبەندی ٧٤ی لیستی فۆربسە بۆ ملیاردێرانی جیهان.

لە ئاستی جیهانیدا، ئاستەکانی چڕبوونەوەی پیشەسازی بە شێوەیەکی زۆر جیاواز دەبێت بەگوێرەی کەرت؛ چونکە پیشەسازی ئەڵماس لەلایەن گروپی کۆمپانیاکانی دی بیرزی زاڵەوە بەڕێوەدەبرێت، کە نرخەکان دادەنێت و کۆنترۆڵی لێشاوی ئەڵماسی خاو دەکات بۆ ئەو کۆمپانیایانەی کە ئەڵماس دەبڕن و پاکیان دەکەنەوە. دی بیرز خاوەنی ٦٠٪ ی بازاری ئەڵماسی خاوە، کە وای لێدەکات کاریگەریەکی بەهێز هەبێت لە دانانی نرخ. وە لە پیشەسازی چیپسی کۆمپیوتەردا، ئینتێل ٨٠٪ ی بازاری یەکەکانی چارەسەرکردنی ناوەندی (سی پی یو) کۆنترۆڵ دەکات. لە پیشەسازیەکانی تریش کە چڕیەکی بەزری تێدایە بەسە بۆ سەرنج ڕاکێشانی ئاژانسەکانی دژە قۆرخکاریە ئەمریکی یان ئەوروپیەکان، بریتین لە تۆوی دانەوێڵە ( هەردوو کۆمپانیا مونساتنو و دوبەنت زاڵن تێیدا)، و تۆڕەکانی پارەدانی دارایی ( ڤیزاکارد و ماستەرکارد تێیدا زاڵن)، وبزوێنەرەکانی گەڕان لە ئینتەرنێت ( گووگڵ ٦٣%ی چالاکیەکانی گەڕانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کۆنترۆڵ کردووە، و ٩٠%ی لەگەشەی پرۆسەکانی گەڕان).

بەڵام پیشەسازیەکانی تر کەمتر چڕبوونە، سەرەڕای چالاکیەکانی یەکگرتنە گەرمەکان کە چەند ساڵێکە بەردەوامە. لە ڕاستیدا، وەک پرۆفیسۆری بازرگانی و نووسەری پانکاج گیناوات لە کتێبەکەی بەناوی " جیهانی ٣.٠: خۆشگوزەرانی جیهانی و چۆنییەتی بەدەستهێنانی " دەڵێت "لە زۆربەی حاڵەتەکاندا جیهانگیری وا دیارە هانی پێشبڕکێی زیاتر دەدات نەوەک چڕبوونەوەی پیشەسازی". نمونەیەکی بەرچاو بۆ ئەمە پیشەسازی ئۆتۆمۆبیلە، داتاکان ئەوە پیشان دەدەن کە

پێنج لە گەورەترین کۆمپانیاکانی ئۆتۆمبێلی سەرەکی جیهان لە ساڵی ١٩٩٨دا ٥٤٪ پشکی بەرهەمهێنانیان هەبووە، وە لە ساڵی ٢٠٠٨ ٤٨٪ی تێپەڕ نەکرد، ئەمەش کەمبوونەوەیەکی بچووکە بەڵام گرنگە. بە فراوانکردنی شیکردنەوەکە بۆ ١٠ کۆمپانیای لوتکە لە پیشەسازی ئۆتۆمۆبیل، بوونی کەم بوونەوە لە چڕبوونەوەی پیشەسازیش دەرکەوت. ئەم ڕەوتە ماوەیەکی زۆرە بەردەوامە. لە ساڵانی ١٩٦٠دا، ١٠ کۆمپانیای یەکەم ٨٥٪ ی کۆی بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێلی جیهانیان بەرهەم هێنا؛ ئەم ڕێژەیە بە نزیکەیی ٧٠% دابەزیەوە تا ئێستا. پارچەکردنی بازاڕ تا ڕادەیەک ڕەنگدانەوەی سەرهەڵدانی یاریزانە نوێیەکانە لە وڵاتانی وەک کۆریا و هیندستان و چین و ئەوانی تر، یان بڵاوبوونەوەیەکی جیهانی بۆ ئەم یاریزانە نوێیانە. بۆ نمونە، هیوندای لە ساڵی ٢٠١١دا نەک تەنها پێنجەم گەورەترین کۆمپانیای ئۆتۆمۆبیلی جیهان بوو، بەڵکو گەورەترین کۆمپانیای جیهانیش بوو لە ڕووی قازانجەوە. بە سەیرکردنی چڕی پیشەسازی لە نێوان پێنج کۆمپانیای لوتکە لە ١١ ناوچەی پیشەسازی لە ساڵانی ١٩٨٠کان بۆ ٢٠٠٠کان، گیناواث بۆی دەرکەوت کە تێکڕای چڕی پیشەسازی لەم پێنج کۆمپانیایەدا لە ٣٨٪ ەوە دابەزیوە بۆ ٣٥٪، و ئەم دابەزینەش ڕوونتر دەبێت ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پەنجاکانی سەدەی بیستەم.

## هێزی براندە بازرگانیەکان و دووچاری مەترسی بوونەوەیان

چەندین کۆمپانیا لەناکاو ون بوون دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر بەناوبانگ بوون و خۆشەویست بوون. چەندین ناوی بەناوبانگ هەبوون ڕۆژێک لە ڕۆژان ناسراو و بەناوبانگ بوون لە تاکفرۆشی، بانکی، هێڵی ئاسمانی، و تەنانەت تەکنەلۆجیا - ئایا کۆمپانیای کۆمپاکتان لەبیرە؟ - دەستی کردووە بە گۆڕان بۆ بیرەوەریە کاڵەکان. لە لایەکی ترەوە، هەندێک لە ناوە هەرە بەناوبانگەکانی جیهان

چەند ساڵێک پێش ئێستا بوونیان نەبوو وەک تویتەر کە لە ساڵی ٢٠٠٦ دامەزراوە. وەک بەکارهێنەرەکان، ئێمەش زۆر لەسەر ئەم پێشکەوتنانە ڕاهاتووین. لە ڕاستیدا، بێ مەبەست، بەکارهێنەران ئامرازی هەندێک لەو گۆڕانە بوون، کە بەشێکیان پاڵپێوەنراوە بەهۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی کارەساتەکان کە کۆمپانیا ناسراوەکان تێیدا ڕوویانداوە، و زیادبوونی کاریگەری ئەو کارەساتانە - ڕووداوگەلێک کە ناوبانگ و بەرهەمەکانی کۆمپانیاکە لە ناوکدا دەهەژێنێت و نرخی پشکەکانی دێنێتە خوارە و لە ئەنجامدا کڕیارەکانی لێی ڕادەکەن. توێژینەوەیەکی ساڵی ٢٠١٠ ئاشکرای کرد کە دوو دەیە پێش ئێستا ئەگەری تووشبوونی کۆمپانیاکان لە ماوەی پێنج ساڵ بە کارەساتێک ناوبانگەکەی بهەژێنێت دەکاتە ٢٠% بە ڕێژەیەکی مامناوەند، لە کاتێکدا ئێستا ئەم ئەگەرە یەکسانە بە ٨٢%.

ئایا ئەمە لەبەر دزەکردنی نەوت و برێکە شکستخواردووەکان و لێدوانە چەقبەستووەکانە کە ئەمڕۆ بڵاوبونەوەیان لەچاو ٢٠ ساڵ پێش ئێستا چوار ئەوەندە زیاتر بووە؟ وەڵامەکە نەخێرە، بەڵام بڵاوبوونەوەی زۆر زیاتر و زیاتر خێرا بووە، و دەنگۆیە فراوانەکەی زۆرجار ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ سزایەکی قورس.

لەم چوارچێوەیەدا، هیچ کەسێک نابێت سەرسام بێت کە دیارترین نیشانەی هێزی ئابووریش - سامانی تاکەکەسی - گۆڕانکاری خێرای بەسەردا دێت. (لە ساڵی ٢٠١٢ەوە، بلومبێرگ نیوز ڕۆژانە ڕیزبەندی ٢٠ ملیاردێری جیهانی پێشکەش دەکات، کە لە کاتژمێر ٥:٣٠ پاشنیوەڕۆ بەکاتی نیویۆرک نوێ دەکرایەوە). ژمارەی ملیاردێرانی جیهان لەم ساڵانەی دواییدا زیادیکردووەوە گەیشتووەتە

١٢٢٦ ملیاردێر لە ساڵی ٢٠١٢. ڕووسیەکان و ئاسیاییەکان و ڕۆژهەڵاتە ناوەڕاستیەکان و لاتینیەکان ڕێژەیەکی زیاتریان هەیە لە نێوان ئەم دەوڵەمەندانە.

ئەوەی جێگای سەرنج ڕاکێشە، ئەوەیە ملیاردێری هیندی ئانیل ئەمبانی (لە بواری پیشەسازی کاردەکات) کە زۆربەی سامانەکانی لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٧ و ٢٠٠٨ دا بەدەست هێنا، یەکێک بوو لەو کەسانەی کە گەورەترین زیانی لە ساڵی دواتر بەرکەوت (هەرچەندە هێشتا لە ساڵی ٢٠١٢ لە پلەی ١١٨یەمدا بووە). بەپێی توێژینەوەیەک کە کۆمپانیای وێلث-ئێکس ئەنجامی داوە کە پسپۆرە لەبارەی زانیاری سامان و ملیاردێرەکان، ملیاردێرە چینییەکان نزیکەی سێیەکی سامانیان بەیەکەوە لە نێوان ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١١ و ناوەڕاستی ساڵی ٢٠١٢دا لەدەستدا.

هیچ کەسێکیش فرمێسک نارێژێت لە هاوسۆزی لەگەڵ دەوڵەمەندە گەورەکاندا لە نەهامەتییەکانیاندا، بەڵام هەڵچوونە بەرچاوەکان لە پۆلێنکردنی دەوڵەمەندانی جیهاندا وێنەی ئەو نائارامییە ئاشکرا دەکات کە لە لوتکەی جیهانی بازرگانیدا زاڵە - چ بۆ بەڕێوەبەران، کۆمپانیا یان براندەکان - کە برەکەی زیاتر دەبێت بەراورد لەگەڵ هەر کاتێکی نزیک لە مێژوودا، لە گۆڕەپانێکی بازرگانی کە زۆر جیهانگیرتر و هەمەجۆرتر بووە لە هەرکاتێکی تر لە ڕابردوو.

ئاڵۆزییەکانی لووتکە ناکۆکیەکی سەیر بەرپادەکات لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت ئێمە ئێستا لە سەردەمێک دەژین کۆمپانیاکان چێژ لە هێزێکی بێ وێنە دەبینن. گوومان نیە لەوەی ئەو پێشکەوتنەی کە ساڵانی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم بەخۆیەوە بینی پۆستەکانی لە کۆمپانیاکان بریقەدارتر و گەورەتر کرد، و سەرکەوتنی ئابوری تەکنەلۆجیای خێرا نەوەیەکی نوێی دروست کردن لە پاڵەوانەکانی بازرگانی؛ وەک سەرۆکی کۆمپانیاکانی ئەپڵ و ئۆراکل و سیسکۆ و گووگڵ و هاوشێوەکانیان، ئەمە جگە لەو یاریزانە درەوشاوانەی کە لە جیهانی پەرەی دراو و کارە بانکیەکان کار دەکەن. لە ئەوروپا لە جیهانی کۆمپانیاکان هێما نوێکان دەرکەوتن لە ئەنجامی چاکسازی ڕێکخستن و تایبەتکردن و دروستکردنی بازاڕێکی تاک. ملیاردێری فێڵباز لە ڕوسیا

دەرکەوت، و وڵاتانی جیهانی سێیەم سەرکەوتوو بوون لە بەرهەمهێنانی ئیمپراتۆریەتی بازرگانی گەشەپێدراو و مارکەکان و دەوڵەمەندە گەورەکان، کە جارانێک جێگای گاڵتە پێکردن بوون بەهۆی هەژاری و کۆنترۆڵی دەوڵەت. ڕەخنەگرانی ڕاستەکان ئاماژەیان بە مەترسی ئەو هەژموونە نوێیە کردووە کە سەرمایەدارەکان پیادەی دەکەن و دواکەوتووانیان بەسەریدا دەڵێن، بەڵام دووکەس ناکۆک نابن لەسەر هەبوونی.

پاشەکشێی جیهانی و قەیرانی دارایی هیچ ڕوونکردنەوەیەکیان بۆمان زیاد نەکرد لەسەر هێزی کۆمپانیاکان کە شایەنی باس بێت؛ چونکە لە لایەک پێویستی بۆ دەستێوەردانی حکومەت لە پێناو بنبڕکردنی هەڵسوکەوتی کۆمپانیا فێڵبازەکان ڕوونە، بەڵام ئەو بیرۆکەیەش ئاشکرا بوو کە دەڵێت هەندێک لە دامەزراوەکان - بانکەکان و کۆمپانیاکانی بیمە و کۆمپانیاکانی دروستکردنی ئۆتۆمۆبێل - " گەورەترە لەوەی شکست بێنێت"؛ و ڕێگایان پێ نادرێت لە بواری کارەکانیان دەربچن بەبێ ئەوەی ببنە هۆکارێک بۆ دەرەنجامە پێچەوانە گەورەکان لەسەر هەردوو ئاستی هەرێمی و نەتەوەیی و تەنانەت جیهانیش. وە هەندێک لە کۆمپانیاکانی وەک جەنەڕاڵ مۆتۆرس و کرایسلەر لە ڕێگای دەستێوەردانی حکومەتەوە ڕزگار کران. هەندێکی تریشیان، وەک لیان براثەرس، ڕێگەیان پێدرا لە جیهانی بازرگانی بچنە دەرەوە. وە ئەو بانکانەیە کە چەمانەوە بە شێوەیەک کە چیتر ناتوانێت لە ژیان بمێنێتەوە بۆ بانکە گەورەکان فرۆشران، کە وایکردن دامەزراوەی زەبەلاحی قەبارە گەورەتر لە جاران دروست ببێت، و بانگەشەی ڕەخنەگرانیش بەهێزتر بکات ئەوانەی کە پێیان وابوو هێز لە چوارچێوەیەکی تەسکی نوخبەیەکی دارایی چڕبۆتەوە کە هیچ کەسێک شان لە شانی نادات. گومان نیە ئەمڕۆ چەند کۆمپانیایێکی زەبەلاح هەیە پێش چەند دەیەیەک بەر لە ئێستا پێشبینی نەدەکران، و هەندێک لە کۆمپانیاکانیش بە شێوەیەکی گەورە

بارودۆخیان بەهێز کردووە. وە ڕوونیشە کە یاساکانی دژە قۆرخکاری و تابلۆ سەرەکیەکانی تر، چ لە ئەمریکای باکور یان ئەوروپا یان هەر جێگایەکی تر، نەیانتوانیوە لەگەڵ ئەو ڕێکارو ئامرازانە بڕۆن کە کۆمپانیاکان لەسەر بنەمای ڕۆژانە بەکاریان هێناوە، بە تایبەت لە بواری دارایی.

ئەی واقیعی ئێمە چیە؟ ئایا خۆی لە هێزی کۆمپانیا بێ سانسۆرەکان دەنوێنێت کە بارگرانی خەرجیەکان و قەرزەکان دەخاتە سەر شانی حکومەت و باجدەرەکان لە کاتێکدا مووچەکان و قازانجە زۆرەکان بۆ بەڕێوەبەرکانی ئەگێڕتەوە؟ یان خۆی لە بازرگانە پێشەنگە بێ متمانەکان ئەنوێنێ ئەوانەی بەردەوام دووچاری مەترسی فشار دەبنەوە لەلایەن یاریزانە نوێیەکان و تەکنەلۆجیە مۆدێرنەکان، و ناوبانگیان دەهەژێت بەو کارەساتانەی کە تووشی کۆمپانیاکانیان دەبێت، و دەکەونە ژێر پشکنین و لێپرسینەوەی شیکەرەوەکانی بازارەکان، و لە کۆتاییدا خاوەن پۆستە هاروهاجەکان و ئەنجومەنی ئیدارە تووڕەکان لە پۆستەکانیان لایان ئەبەن؟ بە دەربڕینێکی تر، چی بەسەر ئەو هێزەدا دێت کە کۆمپانیاکان و بەڕێوەبەرە جێبەجێکارە گەورەکان خاوەنیەتی؟

## هێزی بازار: دژە ڤاکیسن بۆ نەموونی ئاسایش لە بواری بازرگانی

بۆ تێگەیشتن لەو هێزە سەرەکیانەی کە گۆڕانێکیان دروست کردووە لە هێزی کۆمپانیاکان لە سەدەی بیست و یەکەم و بیستەم، پێویستە لە سەرمان چاوێک بخشێنینەوە بەسەر ئەو چەمکەی کە لە بەشی دووەمدا باسمان کردووە، کە ئەویش هێزی بازاڕە.

شیکردنەوەی ئابووری تەواو بوونی ڕکابەریەکی کراوە و توند لەبەرچاو دەگرێت، واتە گۆڕانکاریە لەناکاوەکان دۆخێکی سروشتیە لە سیستەمی

سەرمایەداری، چونکە ڕکابەری هەندێک کۆمپانیا ئەخات بە زەوی و هەندێکیشان پاداشت ئەکات. ئەو دۆخە ناوازەی کە بە " ڕکابەری تەواو "ناسراوە هیچ بوارێک ناهێڵێت بۆ قۆرخکاری یان کارتێلەکان ( یەکێتیەکانی بەرهەمهێنان)، یان ژمارەیەکی کەم لە کۆمپانیا گەورەکان زاڵبن، جگە لە زاڵبوونی بەردەوامیان بۆ چەندەها ساڵ.

ڕاستیەکەش زۆر بە روونی جیاوازە؛ هەندێک لە کۆمپانیاکان بەردەوام دەبن لە کاتێکدا هەندێکی تریان نامێنن؛ و وەبەرهێنەرەکان و جێبەجێکارە دێرینەکان بۆ چەندەها دەیە کۆنتڕۆڵ دەکەن لە کاتێکدا هەندێکی تریان بە هەمان خێرایی کە دەرچوونیان وون دەبن؛ و هەندێک لە براندە بازرگانیەکان وەک بەرهەمێکی پیشەسازی زوو لەناوچوو دەردەکەوێت لە شێوی مۆدەیەکی کاتی؛ لە کاتێکیشدا براندە بازرگانیەکانی تر دەتوانێت بەردەوام بێت و سەربکەوێت بەسەر هەر ژمارەیەک لە گۆڕانکاری تەکنەلۆجی، و فراوانبوون یان شکستەکانی بازار، یان گۆڕانە ئیداریەکان. وە هەندێک لە کۆمپانیا گەورەکان وادەکەن ڕکابەریان ئەستەم بێت بۆ ئەوانی تر لە بازاڕەکانیان، و کۆمەڵە بچووکەکان لەو کۆمپانیایانەی کە لە هەمان بوار کاردەکەن پەنا دەبەن بۆ کارکردن لە نێوان خۆیان بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج بۆ درێژترین ماوە. هەروەها سروشتی هەندێک لە کەرتەکان بەربەستی گەورەی تێدانیە بەرامبەر هاتووەکان کە ئاسانکاری دەکات بۆ چوونە ژوورەوەی ڕکابەرە نوێیەکان ( وەک ڕێستورانەکان و پیشەسازی جل و بەرگ )؛ وە لە هەندێک کەرتی تر بەربەستەکان زۆر بەرز دەبن بە شێوەیەک ئەستەم دەبێت لەسەر کۆمپانیا نوێیەکان کە ڕکابەری کۆمپانیا زاڵەکان بکەن ( کارگەکانی کانزاکان، و مۆبایلەکان).

بە دەربڕینێکی تر، کاری سەرمایەداری کۆمەڵێکی فراوان و جۆراوجۆری لە شێوازەکان و پێشبینیەکان لەخۆ دەگرێت کە لە زمانی هێماکان خۆی بەدەردەخات

کە لە کۆمەڵگەی وەبەرهێنان و بەکاربەران بەکار دێت. ئەم شێوازو پێشبینیانە ڕکابەری دووانەی بەردەوام دروست دەکات ( بۆینگ دژی ئێرباس، کۆکاکۆلا دژی پیپسی، هێرتز دژی ئەفیس)؛ و ناوەی براندەکان دەگۆڕێت بۆ ناوە بەربڵاوەکان ( زیرۆکس، هۆفر، کلینکس)؛ و هەیبەتێک بۆ هەندێک لە براندەکان زیاد دەکات ( ڕۆلێکس، تای بی ئێم) و سروشتی کرداری بۆ هەندێکی تر زیاد ئەکات ( تایمیکس، دیل). کاتێک ناوەکان لادەبرێن، بێ بەزەییانە لادەبرێن. چونکە چ کۆمپانیای بان ئێم، یان وێلوێرث، یان کۆداک، یان وانگ بێت، کۆتایی کۆمپانیاکە لەناوچوون و بزربوونە، ئینجا چ بە هەڵوەشانەوە یان بە یەکگرتنی لەگەڵ کۆمپانیایێکی تر بێت.

ئەم گۆڕانە بەردەوامە لە هێماکان و بەرهەمەکان و کەسەکان و ناوەکان بە شێوەیەکی زۆر بە چالاکیەکانی ڕۆژانەی فرۆشیاران و کڕیاران پشتگیری دەکرێت، هەروەها مەترسیدان لە پێناو بەدەستهێنانی شتێک، ڕووداوێک، هەڵەیێک، یان سودفەیێک. بەڵام هێزیش پشتگیری دەکات. لێرەدا هێزی بازار دێت: ئەو هێزەیە کە توانای سەپاندنی نرخی کاڵاکان و خزمەتگوزاریەکان دەدات زیاترە لە خەرجیە دیاریکراوەکان، و پاشان بەدەستهێنانی قازانجی زیاتر و هەمیشەتر بەبێ هاتنەخوارەوە لە پشکی بازاری. هەرچەند هێزی بازاری کۆمپانیا زیاتر بێت، توانای لە دیاریکردنی نرخە تایبەتەکان زیاتر دەبێت بە شێوەیەکی سەربەخۆتر و بەبێ نیگەرانی لەبارەی ڕکابەرەکان. وە هەرچەندە بوونی هێزی بازار لە کەرتێک یان بازارێکی دیاریکراو زیاتربێت، پێکهاتە پیشەسازیەکانی سەقامگیرتر دەبێت و ڕیزبەندی کۆمپانیاکان جێگیرتر دەبێت.

لە ژیانی واقیعی، ئەو بەرهەمانەی کە مایەی جێگۆڕکێیان نیە لە نێوان خۆیان، و تەنانە ئەگەر هەشیان بێت، خاوەن تایبەتمەندی براندە بازرگانیەکانن کە لە ڕێگای ڕێکلامەکانەوە ڕەواجی بۆ دەدرێت. وە لە ژیانی ڕۆژانە کۆمپانیاکان

ناتوانن هەمان زانیاریان دەستکەوێت. وە هەمان یاسا و ڕێسا پێویستەکانیان نیە بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانیان یان چارەسەرکردنی کێشەکانیان، یان هەمان پشتگیری شاراوە یان ئاشکرا لەلایەن حکومەتەوە، یان هەمان ئازادی بۆ بەدەست هێنانی داهاتە بەنرخەکان. چونکە سنوورەکانی خاوەندارێتی فکری گرینگیەکەی جیاوازە لە سویسرا وەک لەوەی لە چینە؛ چونکە هەر کۆمپانیاییێکی ئەمریکی بەشی "کاروبارەکانی حکومەتی" هەیە کە بەشێکی گەورەیە تایبەتکراوە بۆ بەدەست هێنانی پشتگیری سیاسیەکان لە واشنتۆن، و هەر کۆمپانیاییێکی ڕووسی یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی رووسی دایانمەزراندووە بەهۆی هاوڕێیەتی کەسێتیەکانیەوە لەگەڵ کرملین، و هەر کۆمپانیاییێکی هیندی چەندەها دەیەیە ڕێگای خۆی ئەدۆزێتەوە بۆ تێپەڕاندنی داواکاریەکانی ڕێگەپێدان و بیرۆکراتیە بێزارکەر و ڕەچەڵەکیەکان؛ هەریەک لەمانە دووچاری ژینگەیێکی ڕێکخستنی ڕیشەیی جیاواز دەبێتەوە لەوەی کە کۆمپانیاکانی تر دووچاری دەبنەوە، لەمەش زیاتر لەوەی کە کۆمپانیا بچووکەکان دووچاری دەبنەوە بۆ چوونە نێو پیشەسازی بۆ یەکەم جار. هەروەها کۆمپانیاکان جیاوازن لە ڕووی ئەو داهاتە ناوەخۆییانەی کە هەیەتی بۆ ڕاهێنانی فەرمانبەران و پێشخستنی بەرهەمە نوێیەکان. هەموو ئەم جیاوازیانە لە مەودای بازرگانی و داهاتەکان و زینگەی کارکردن کاریگەری هەیە لەسەر خەرجی کارکردن و بڕیارەکانی فراوانکردنی چالاکیەکان و هەڵبژاردن لە نێوان بەرهەم هێنانی کالایەکی دیاریکراو لەناوەوەی کۆمپانیا یان پشتبەستن بە بەڵێندەرێک بۆ بەرهەم هێنانی. بە کورتی ئەم جیاوازیانە پێکهاتەی پیشەسازیەکان دروست دەکات.

نزیکەی پێش سەدەک لە ئێستا، لقێکی تەواو لە زانستی ئابووری بنیادنرا - بەناوی ڕێکخستنی پیشەسازی - بۆ تێگەیشتن لە پێکهاتەی پیشەسازی و ڕوونکردنەوەی ئەو هۆکارانەی کە وایلێدەکات بگۆڕێت، یان نەگۆڕێت. وە

## کۆتایی سەردەمی هێز

هەروەک لە بەشی سێیەم گفتوگۆمان لەسەر کرد، ئەم بوارە زانستیە پشتی بە بیرۆکەکانی زانای ئابوری بەریتانی ڕۆنالد کوس بەستووە لە ساڵی ١٩٣٧ یەکەم کەس کە بیرۆکەی خەرجیەکانی مامەڵەکانی پێشکەش، کرد کە یارمەتیدەرە لە شیکردنەوەی ئەو هۆکارانەی وادەکات کۆمپانیاکان و پیشەسازیەکان شێوەی دیاریکراو وەربگرن.

ئەو کۆمپانیایانەی کە بەرێگەیەک لە ڕێگەکانی زاڵن بەسەر پیشەسازی یان بازار بڕێکی زۆر گەورە لە تواناکەیان خەرج دەکەن بۆ هێشتنەوەی دۆخەکان وەکو خۆی. ئامانجی هەر کۆمپانیایەکیش پێشکەشکردنی بازارێکی سەرنجڕاکێش و تاکە بە شێوەیەک قورس بێت بۆ هەر کۆمپانیایێکی تر لاسایی یان کۆپی بکاتەوە. وە لەوانەیە کۆمپانیاکە پێگەی خۆی بپارێزێت لە ڕێگای لادانی ئەوانی تر، یان لە ڕێگای دەست تێوەردان لەگەڵیان. ڕەنگە لابردنی ڕکابەرەکان لە ڕێگای خستنەڕووی کاڵاکان و خزمەتگوزاریەکان بە نرخێکی کەمتر لە نرخی ڕکابەرەکان بێت، یان سەرکەوتن بەسەریان لە ڕووی کوالیتی یان داهێنان، یانیش خنکاندنی بازار بە ڕێکلامە بازرگانیەکان. هەرچی دەست تێوەردانە ئەوا دەکرێت لە شێوەی دانانی بەربەستەکان بێت کەوا دەکات قورس یان ئەستەم بێت لەسەر هەر رکابەرێکی نوێ بێتە ژوورەوە، بەتایبەت کاتێک کۆمپانیا زاڵەکان بە شێوەیەکی شاراوە ( یان ئاشکرا) هەڵدەستن بە هەماهەنگی کردن لە ئیستراتیجیەکانی نرخدانان و فرۆشتنەکان لە نێوان خۆیان، یان پێوەرە تەکنەلۆجیاکان، یان بەکارهێنانی کەمپینەکانی پەیوەندیە گشتیەکان و یەکێتیە پیشەسازیەکان بۆ داواکردنێکی ڕوون بۆ دانانی تابلۆ و ڕێکخراوەکان کە پارێزگاری بۆ دابین بکات. ئەو هۆکارانەی کە وادەکات کۆمپانیا زاڵەکان پەیڕەوەی بکەن لە لابردن و دەست تێوەردان، ئینجا هەر هۆکارێک بێت، شەفەقی ڕکابەرە نوێیەکانیش سنوردار دەکات، و پاشان بەربەست دادەنێت لەبەردەم هاتنەژوورەوەیان کە لەوانەیە نەتوانن

بەسەریدا زاڵبن.

ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی ئابووریناسان، ئەوانەی کە هەوڵی سنوردارکردنی هێزی بازاری راستەقینە دەدەن، هەڵدەستن بە تێپەڕاندنی ژمارەکان لە زۆربەی کات، بۆ ئەوەی ئەو بابەتە نەوعیە لابەن کە پەیوەندی بە ڕادەی زەحمەتی ئەو بەربەستانە هەیە کە ڕێگرە لە هاتنە ژوورەوە لە هەر بوارێکی دیاریکراودا. هەروەها پێوەری بڕیش هەیە بۆ هێزی بازار، بەڵام ئەستەمە بەکارهێنانی.

پێوەرە زیاتر بەسوودەکان ئەو پێوەرانەن کە ئابووریناسان بەکاری دەهێنن بۆ دیاریکردنی هێزی بازار لە هەر پیشەسازیەکی دیاریکراو لە جیاتی هێزی بازار لەسەر ئاستی یەک کۆمپانیا. کۆمەڵێکی جۆراوجۆر لەم پێوەرانە بەردەستن، سادەترینیان ئیندێکسی تەرکیزی پیشەسازیە لە کۆمپانیا گەورەکان، ئەوەی تێکڕای پشکەکانی بازاری کۆمپانیا پێشەنگەکان کۆدەکاتەوە ( بۆ نموونە، چوار یان پێنج یان دە یەکەمەکان لە فرۆشتن یان سەرمایە) لە بوارێک یان ئابووریەکی دیاریکراودا.

بەڵام هێزی بازار تەنها لە تەرکیزی پیشەسازی چڕ نەبۆتەوە؛ چونکە لە هەندێک لە ئابووریەکان یان پیشەسازیەکان کە بە پلەیەکەی بەرز بە ڕێکخستنی یاسایی دەناسرێت، لەوانەیە کۆمپانیا بچووکەکان بە شێوەیەکی ڕێژەیی سوود لە هێزی بازار وەربگرێت تەنها لەبەرئەوەی لەناو پەرژینی پاراستنی حکومەت یان نیپۆتیزمی سیاسیە. هەر کۆمپانیایەکی بەکرێدانی ئۆتۆمۆبێل وەک نموونە وەبگرە کە مافی تایبەتی هەیە بۆ گواستنەوەی سەرنشینە هاتووەکان لە فڕۆکەخانەیەکی دیاریکراو. بە هەمان شێوە، تەنها بوونی تەرکیزی پیشەسازی مانای ئەوە ناگەیەنێت کە کۆمپانیاکان بە شێوەیەکی کەمتر قۆرخکار هەڵسوکەوت دەکەن بە جۆرێک بە ئاشکرا یان نهێنی دەست تێوەردان دەکەن بۆ

مانەوەی نرخەکان بە گرانی؛ چونکە لەوانەیە ڕکابەری لە نێوانیان توند و دڕندانە بێت. ئەو هۆکارانەی تریش کە بەشدارە لە هێزی بازار، وەک توانا لەسەر ئەزموونکردنی فشار لە پێناو دۆزینەوەی مامەڵە و یاسا پەسەندەکان، ڕاستەوخۆ سەرچاوە ناگرن لە تەرکیزی پیشەسازی. چونکە ئەو پەیوەندی بازرگانیانەی کە نوێنەرایەتی هەر پیشەسازیەکی پەرتەوازە دەکات (بۆ نموونە کۆمەڵەی ژمێریارەکان یان ددانسازەکان) لەوانەیە سەرکەوتوو بێت لە فشار خستنەسەر و بەدەستهێنانی ئەنجامە ئەرێنیەکان کە کەمتر نیە لە ئەنجامەکانی ئەو کەسانەی کە لە جیاتی هەر پیشەسازیەکی تەرکیزکراو کار دەکەن (وەک پیشەسازی چیمەنتۆ یان تەلەفۆن).

بۆیە بوونی یەک پێوەری بڕی بۆ تێگەیشتن لە کارکردنی هێزی بازار بەس نیە. باشترین پێوەر بۆ قەبارەی هێزی بازار و سەقامگیری پێکهاتەی پیشەسازی و تایبەتمەندی پاراستن کە کۆمپانیا گەورەکان سوودی لێ وەردەگرن لە ڕێگای سەرنجدانی بەربەستەکانی هاتنەژوورەو کاریگەریەکانیانەوە دێت.

کاتەک بەمە هەڵدەستن بە خێرایی ئاراستەیەکی زەق و تێبینیکراومان بۆ ڕووندەبێتەوە: لە هەموو بوارەکان ئەبینین ئەو بەربەستە تەقلیدیانەی هاتنەژوورەوە کە پێکهاتەی پیشەسازیان دەرشتووە بە درێژایی بەشێکی گەورەی سەدەی بیستەم ئێستا تێپەڕاندنی ئاسان بووە یان بەتەواوی ڕووخاوە.

ڕێکخستنی کۆمپانیاکان گۆڕاوە؛ لە ئەنجامدا، هێزی بازار وەک پێشتر نەماوە. ڤاکسینی دژ بە نەمانی ئاسایش و سەقامگیری لە بواری بازرگانی دەستی کردووە بە لەدەست دانی کاریگەریەکەی، و ئەو تایبەتمەندیەی کە تا ماوەیەکی زۆر باوەڕوابوو پەیوەندی بە قەبارە و مەودا و ڕێژبەندی هەرەمی کۆمپانیاوە هەیە لاوازبووە، یان تەنانەت گۆڕاوە بۆ بەربەست.

کەوتنی بەربەستەکان و بەرزبوونەوەی ڕکابەری

بەربەستە تەقلیدیەکانی چوونەژوورەوە لە بوارەکانی بازرگان زۆر ناسراوە. چونکە، بۆ نموونە، قەبارە ڕێگری لە کۆمپانیا بچووکەکان دەکات لە لابردنی کۆمپانیا گەورەکان، هەروەک ئابووریە بە قەبارەکان وادەکات بەرهەمهێنانی بڕێکی زۆری کاڵا بە کەمترین خەرجی بێت، ئەو شتەی کە پاساوی داهێنانەکانە، وەک کارگە مۆدێرنە مەودا فراوانەکان و هێڵەکانی کۆکردنەوە. وە کاتێک کارگە زەبەلاحەکان توانای دەستبەسەرداگرتنی بەشێکی گەورەی بازاریان دەبێت ئەوا دەتوانێت تێکڕای خەرجیە جێگیرەکانی ( خەرجیە ئیداریەکان بۆ نموونە) دابەش بکات بەسەر زۆرترین ژمارەی یەکەکان، لە ئەنجامدا خەرجی ماملناوەند لە هەر یەکەیەک کەمدەبێتەوە.

وە کۆمەڵێک بەربەستی پەیوەندیداریش هەن کە لە ئابووریەکانی مەودای بەرهەم هێنانەوە سەرچاوەیان گرتووە؛ چونکە ئەزموون لە بازرگانیە پەیوەندیدارەکان بەڵام جیاوازەکان لەوانەیە تایبەتمەندیەک بە کۆمپانیا بدات ڕکابەرەکانی نەیان بێت. بۆ نموونە، ئەگەر کۆمپانیایەک گرێبەستی گەورەی دەستکەوتبێت بۆ دابینکردنی فڕۆکە بۆ هێزی ئاسمانی، ئەوا خاوەنی تایبەتمەندیەکی گەورە دەبێت کاتێک لە بازار ڕکابەری دەکات لەسەر دابینکردنی فڕۆکە سەرنشینەکان. لە کاتێکدا کە ئابووریەکانی قەبارە پشت بە قەبارەی بەرهەمهێنانەوە دەبەستێت، ئەوا ئابوورەیەکانی مەودا بەدەردەکەوێت کاتێک کۆمپانیا توانای بەکارهێنانی زانیاریە بێهاوتا و چووستیە سەرەکیەکانی هەیە لە بازارەکانی تردا. وە گەیشتن بە سەرچاوە دەگمەنەکان، وەک کانزاکان یان خاکە بە پیتەکان یان ڕاوکردنی ماسیە زۆرەکان، ئەبێتە بەربەست کاتێک ڕکابەرەکان ناتوانن دەستیان بگات بە سەرچاوە هاوشێوەکان. هەرچۆنێک بێت، سەرمایەش بەربەستێکی ترە؛ چونکە دامەزراندنی کۆمپانیایەکی نوێی هێڵی ئاسمانی یان مۆبایل یان کانزا پێویستی بە خەرجی گەورەی سەرمایە هەیە کە تەنها ژمارەیەکی کەم لە هاتووە نوێیەکان دەتوانن

دابینی بکەن. تەکنەلۆجیا بەربەستێکی ترە بۆ پێشبڕکێ، چونکە هاوکێشەی پیشەسازی، پرۆسەی بەرهەمهێنان یان هەر جۆرە سەرمایەیەکی فکری بەردەست نییە بۆ ڕکابەرە شاراوەکان کە دەبێتە هۆی لاوازبوونی ڕکابەری. هەمان شت لەسەر ناوی براندەکان جێبەجێ دەکرێت، پێشبڕکێ لەگەڵ کۆکا کۆلا و پیپسیکۆ قورسە، نەک تەنها لەبەر قەبارەی دوو کۆمپانیاکە، بەڵکو بەهۆی سەرنج ڕاکێشیەکی زۆر لە بەرهەمەکانیان.

پاشان یاساکان دێن: یاساکان، ڕێساکان، یاسای موڵک، سیاسەتی باج، و هەموو پێداویستیەکانی تر بۆ کارکردن لە شوێنێک یان پیشەسازیەکی دیاریکراو. هەموو ئەمانە پێگەی کۆمپانیا زاڵەکان لە هەر پیشەسازییەکی دیاری کراودا جێگیر دەکات و ڕێگە لە چوونەژوورەوەی کۆمپانیا نوێکان دەگرن.

ئەمەش دەمانباتە بەردەم پرسیارێکی بنچینەیی دەربارەی گۆڕانی دەسەڵات لە جیهانی بازرگانیدا: چ شتێک دەتوانێت ببێتە هۆکاری لەناکاوی ڕووخاندنی بەربەستەکان بۆ چوونە ژوورەوە، وە پاشان وادەکات کۆمپانیا دامەزراوەکان زیاتر دووچاری لەدەستدانی دەسەڵات بن؟ یەکێک لە وەڵامە ئاشکراکان ئینتەرنێتە. نموونەگەلێکی زۆر هەن کە ئینتەرنێت یارمەتی داوە بۆ ئاوارەکردنی مۆنۆپۆلە دامەزراوەکان. لە ڕاستیدا تەنیا چەند کەرتێکی کەم هەن کە شۆڕشی زانیاری و پەیوەندیەکان دەستکاریان نەکردووە.

بەڵام، هەروەک بوارەکانی تر کە لێرە گفتوگۆی لەسەر دەکرێت ( سیاسەت و جەنگ، .... هتد)، ئەو هێزانەش هەن جگە لەشۆڕشی زانیاری کە شێوازی نووسین و بەکارهێنان یان ونبوونی دەسەڵاتیان لەجیهانی بازرگانیدا گۆڕیوە.

لە سێ دەیەی ڕابردوودا، بۆ نمونە، کردارەکانی حکومەت بەشێوەیەکی ڕیشەیی پێکهاتەی ئەو بازرگانیانەیان گۆڕیوە کە تا ماوەیەکی درێژ جێگیربوونە. مارگرێت تاچەر و ڕۆناڵد ڕیگان شەپۆلێکی گۆڕانکاریی لە سیاسەتی گشتیان

# کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

دەستپێکرد کە ڕکابەرییان ورووژاند و شێوازی بەڕێوەچوونی بازرگانی لە زۆربەی کەرتەکاندا گۆڕی، لە تەلەفۆن و هێڵی ئاسمانەوە بۆ کانزایی خەڵوز و خزمەتگوزاری بانکەکان. لە کۆتاییەکانی ١٩٨٠ەوە وڵاتانی گەشەسەندوو، لە تایلەندەوە بۆ پۆڵەندا بۆ چیلی، چاکسازی ئابووری شۆڕشگێڕانەی خۆیان جێبەجێ کرد، وەک تایبەتکردن، لادانی چاودێری، کرانەوەی بازرگانی، لابردنی بەربەستەکان بەرامبەر وەبەرهێنانی بیانی، ئازادی زیاتر لە ئاڵوگۆڕی دراوەکان، و سەربەخۆیی دارایی، کۆمەڵێکی تر لە گۆڕانکاریەکانی تر کە هانی ڕکابەری دەدات. پەرەسەندنی یەکێتی ئەوروپا لەگەڵ سنورە کراوەکانی ناوەوەی و دەزگای ڕێکخستنی نوێ و ناساندنی دراوی یۆرۆ کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دیمەنی پێشبڕکێکاری هەبوو، هەروەک کاریگەریەکانی فراوانبوونی ڕێککەوتننامە بازرگانیە جیهانیەکان و هەرێمیەکان.

ئەم هەنگاوانەی سیاسەتی گشتی ڕۆڵیان هەبووە لە گۆڕینی ژینگەی بازرگانی جیهانی کە کاریگەریەکەی کەمتر نیە لە هاتنە کایەی ئینتەرنێت. لە ڕاستیدا، هەندێک لە شیکەرەوەکان بەلانی کەم ٢٥%ی گەشەی بازرگانی دەگێڕنەوە بۆ چاکسازی سیاسەتی، بە تایبەت بڕینی گومرگ، کە ئابووریە پێشکەوتوەکان ئەزموونیان کردووە لە ماوەی دوای جەنگدا. یەکخستنی چین و هیندستان و بازاڕە گەورەکانی تر کە بە هۆی سیاسەتی تاکڕەوی و ئابووری تا رادەیەک داخراوبوون، ملیارەها بەکاربەر و بەرهەمهێنەری نوێی هێناوەتە بازاڕە جیهانییەکان. ئەم گۆڕانکاریە گەورانە لە سیاسەتەکان تەوژمێکی زیاتری دا بە شۆڕشەکانی تر لە بواری تەکنەلۆجیا، کە بووە هۆی هێنانەکانەوەی جیهانێک چیتر بەربەستە کۆنەکان توانای پاراستنی ئەکتەرە زاڵەکانیان نەماوە لە هێرشەکانی ڕکابەرە تازەکان.

تەکنەلۆجیای شۆڕشگێڕی (ئەو تەکنەلۆجیایەی کە بە شێوەیەکی ڕیشەیی

بازاڕەکان دەگۆڕن و بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو جێگەی مۆدێلی بازرگانی نەریتی دەگرنەوە) بە نزیکەیی لە هەموو پیشەسازییەکدا دەردەکەون. چونکە ئەو وێستگە بچووکانەی کە ووزەی خۆر و ووزەی با بەرهەم دەهێنن دەستیان کردووە بە دابینکردنی توانای کارەبایی بۆ ژمارەیەکی بێوێنە لەو دانیشتوانانەی کە پێشتر چێژیان لێ نەبینیوە، و ئاستی بژێویان بەرز دەکاتەوە، و گەشە بە پیشەسازیە بچووکەکان دەدات و ڕکابەرەی هەژموونە تەقلیدیەکان دەکات. کەمبوونەوەی قەبارەکان و لێهاتووییان بۆ گۆران لە بواری پیشەسازی گۆڕانکاریەکی بەرچاویان دروست کردووە، لە میانەی ئەوەوە، بەربەستەکانی چوونەژوورەوەشیان لاوازکردووە کە پێشتر وادەردەکەوت کە مایەی گۆڕان نەبێت. لە هەندێک پیشەسازیدا، چیتر پێویست ناکات ئاسانکاری گەورە دروست بکرێت بۆ بەدەستهێنانی پشکی بازاڕی بەرچاو. هەرچەندە چەند کارگەیەکی بیرەی بچووک ناتوانن کۆمپانیاکانی وەک هاینکین ئاوارە بکەن، و کارگەی پۆڵای بچووکیش ناتوانێت کۆمپانیایەکی زەبەلاحی وەک ئارسێلۆرمیتال ببەزێنێت، بەڵام کۆمپانیا بچووکەکانی وەک ئەمانە ئێستا دەتوانن بەشی بازاری پێویست لە ناوچە جوگرافیەکانیان بەدەستبهێنن کە توانای دروستکردنی پێشبڕکێی زیاتریان پێدەدات لەو بازاڕانەی کە بژاردەکان سنوردار بوون. وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا، دارایی بیرۆکە باشەکانی بازرگانی لە هەموو کاتێکی تر بەردەستترە، بە سوپاس بۆ گۆڕانکاری بنەڕەتی لە کەرتی خزمەتگوزارییە داراییەکان، لە زۆربەی ووڵاتان، دەستگەیشتن بە سەرمایە چیتر بەربەستێکی ئەستەم نییە بۆ دامەزران یان فراوانکردنی کۆمپانیایەکی نوێ، وەک جاران.

ئەنجامەکانی ئەم پێشکەوتنانە بە نزیکەیی بێ سنوورن، لە داواکاریەکانی دامەزراندنی ستافەوە بۆ تێچوونی دڵنیایی، بۆ توانای گواستنەوەی کردارەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە خێرایی. بەکارهێنانی دەفرەکان پرۆسەی

گواستنەوەی ئاسانتر کرد، و ڕێگە بە گواستنەوەی هەموو جۆرەکانی کاڵاکان دەدات لە ناوەندێکی کاریگەر، باوەڕپێکراو و هەمەجۆر. لە ساڵی ۲۰۱۰، قەبارەی بارکردنی دەفرەکان گەیشتە زیاتر لە دە ئەوەندەی قەبارەی ساڵی ۱۹۸۰.

بە نزیکەیی هەموو ئەو تەکنەلۆجیایەی کە ئێمە دمبینین لە مۆزەخانەکانی (بزوێنەری هەڵم) یان دواتر لە (ڕادیۆ) لە کاتی خۆی نوێنەرایەتی وەرچەرخانێکی شۆڕشگێڕانەیان دەکرد، بەڵام شۆڕشی تەکنەلۆجیای ئەمڕۆ هاوشانی نیە لە ڕووی مەوداکەی، چونکە کاریگەری لە هەموو چالاکیەکی مرۆیی کردووە لە جیهان، وە بە خێراییەکی سەرسورهێنەر.

ئەگەر سەیری لەمە دوورتر بکەین، بە نزیکەیی ئەبینین هەموو گۆڕانێکی گرنگ لەو شێوازەی کە ئەمڕۆ پێی دەژین، بە بەراورد لەگەڵ نەوەیەک پێش ئێستا، پێشبینی داخورانی بەربەستەکانی بازاڕ دەکات. بێگومان شۆڕشەکانی زۆربوون و جووڵەیی و عەقڵییەتەکان و کاریگەرییە سلبییەکانیان لەسەر هێزی ئەکتەرە زاڵەکانی ئێستا لەجیهانی بازرگانیدا دیارە و نموونەکانیش لەسەر ئەمە زۆرن؛ یەکخستنی بازاڕەکانی سەرمایەی جیهانی لەڕێگەی گواستنەوەی دارایی وایەر و خزمەتگوزاریەکانی بانکی ئەلکترۆنی گۆڕانێکیان بەرپاکرد لە شێوازی دابەشکردنی سەرمایە و گواستنەوەی لە سەرانسەری جیهان. کەلتوری وەبەرهێنانی نوێ لوتەکی سەرمایەی وەبەرهێنان و سەرمایەدارانی پرۆژە نوێیەکانی بەتەواوی بەستووە بە پێدانی قەرزی بچووکتر - هەروەها بەستنەوەی پارە و بەکارهێنەرەکان - لە هەموو شوێنێکی جیهاندا. لە هەمان کات کۆچکردن زانیاری و ئەزموونی بازرگانی گواستۆتەوە بە شێوازێک کە گۆڕانکاریەکانی ڕێکخستن و هاندەرەکانی وەبەرهێنان ناتوانێت هاوشانی بێت. زیاتر لەمەش، کۆچکردن تۆڕەکانی سەرمایەی جیهانی دروست کردووە لە هەموو ئەو وولاتانەی کە کۆچیان لێ کردووە، وە بازاڕی بۆ ئەو خاوەن پرۆژانە دروست کردووە کە تایبەتن

بە چارەسەرکردنی پێداویستیەکانی کۆمەڵگەی کۆچبەران.

وە ئەم هێزانە بەیەکەوە وادەکەن کە لەرزینەکانی سیستەمی سەرمایەداری ئەمرۆ بەتەواوی جیاوازبێت لەوانەی پێشووی. چونکە زۆری لە هەموو شتێک هەیە، هەموو شتێک خێراتر و فراوانتر دەڕوات، و چاوەڕوانییەکانی خەڵک بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕاوە. وە بازاڕێکی جیهانی هەیە، کە ئازادییەکی زۆر و بێ سنوور هەیە لە جوڵەی بڕێکی زۆر پارە و کاڵا و براند و تەکنەلۆجیا و بەهرە لە سنوورەکان و بەکارهێنانەکان، و بەهای بەرزی زانیاری و بازرگانی هەیە بە بەراورد بە سامانە سروشتیەکان و کەرەستە ماددیەکان، و دەرکەوتنی خزمەتگوزاری دڵنیایی لەو شوێنانەی کە پێشتر دەگمەن بوو یان بوونی هەر نەبوو؛ و هەموو ئەو هۆکارانە دەکەونە چوارچێوەی هێزە ناسراوەکانی ئەمرۆ، کە دووبارە ئابوورەیە نەتەوەییەکانی داڕشتەوە. ئەم فاکتەرانە تەنیا ئەو گۆڕەپانەی نەگۆڕیوە کە کۆمپانیاکان پێشبرکێی تێدا دەکەن، بەڵکو بووە هۆی کرانەوەی ڕکابەری بۆ یاریزانە نوێەکان، و ڕێگە بە پێشبڕکێکارانی باوەڕپێکراو و زیرەکیش دەدات کە ماوەیەکی زۆرە بەربەستەکانی ڕێنماییەکان، و سەرچاوەکان، و زانیاری، وسەرمایە یان ناوبانگ لە دەرەوەی ئەو گۆڕەپانەیان هێشتبووەوە. وە لەبەرئەوەی ئەم بەربەستانە تێپەڕاندیان ئاسان بووە، بارودۆخی ڕەخساو بەدەرکەوت بۆ پارچەبوون و ئاوارەبوونی یاریزانانی تەقلیدیەکان بۆ ماوەیەکی درێژ، هەرچەندە ڕەوتە کورتخایەنەکان لە هەندێک پیشەسازی و وڵاتاندا وادەردەکەون کە ئاماژە بە تەرکیزێکی پیشەسازیی بدەن.

ئەم ڕەوتە گشتیە بوارێک جێدەهێڵێت بۆ جیاکاری، بەڵام هەر سەیرکردنێکی خێرا بۆ هەندێک لە قورسترین بەربەستەکانی پێشوو بۆ چوونەژوورەوەی پێشبڕکێ، داپۆشینی ئەو گۆڕانە بنەڕەتییە دەردەخات کە ڕووی داوە.

بە چارەسەرکردنی پێداویستیەکانی کۆمەڵگەی کۆچبەران.

وە ئەم هێزانە بەیەکەوە وادەکەن کە لەرزینەکانی سیستەمی سەرمایەداری ئەمڕۆ بەتەواوی جیاوازبێت لەوانەی پێشووی. چونکە زۆری لە هەموو شتێک هەیە، هەموو شتێک خێراتر و فراوانتر دەڕوات، و چاوەڕوانییەکانی خەڵک بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕاوە. وە بازاڕێکی جیهانی هەیە، کە ئازادییەکی زۆر و بێ سنوور هەیە لە جوڵەی بڕێکی زۆر پارە و کاڵا و براند و تەکنەلۆجیا و بەهرە لە سنوورەکان و بەکارهێنانەکان، و بەهای بەرزی زانیاری و بازرگانی هەیە بە بەراورد بە سامانە سروشتیەکان و کەرەستە ماددیەکان، و دەرکەوتنی خزمەتگوزاری دڵنیایی لەو شوێنانەی کە پێشتر دەگمەن بوو یان بوونی هەر نەبوو؛ و هەموو ئەو هۆکارانە دەکەوێتە چوارچێوەی هێزە ناسراوەکانی ئەمڕۆ، کە دووبارە ئابوورەیە نەتەوەییەکانی داڕشتەوە. ئەم فاکتەرانە تەنیا ئەو گۆڕەپانەی نەگۆڕیوە کە کۆمپانیاکان پێشبرکێی تێدا دەکەن، بەڵکو بووە هۆی کرانەوەی ڕکابەری بۆ یاریزانە نوێەکان، و ڕێگە بە پێشبڕکێکارانی باوەڕپێکراو و زیرەکیش دەدات کە ماوەیەکی زۆرە بەربەستەکانی ڕێنماییەکان، و سەرچاوەکان، و زانیاری، وسەرمایە یان ناوبانگ لە دەرەوەی ئەو گۆڕەپانەیان هێشتبووەوە. وە لەبەرئەوەی ئەم بەربەستانە تێپەڕاندیان ئاسان بووە، بارودۆخی ڕەخساو بەدەرکەوت بۆ پارچەبوون و ئاوارەبوونی یاریزانانی تەقلیدیەکان بۆ ماوەیەکی درێژ، هەرچەندە ڕەوتە کورتخایەنەکان لە هەندێک پیشەسازی و وڵاتاندا وادەردەکەون کە ئاماژە بە تەرکیزێکی پیشەسازیی بدەن.

ئەم ڕەوتە گشتیە بوارێک جێدەهێڵێت بۆ جیاکاری، بەڵام هەر سەیرکردنێکی خێرا بۆ هەندێک لە قورسترین بەربەستەکانی پێشوو بۆ چوونەژوورەوەی پێشبڕکێ، داپۆشینی ئەو گۆڕانە بنەڕەتییە دەردەخات کە ڕووی داوە.

### سەرمایەی ماددی

کۆمپانیای " نیوز کۆرپۆرەیشن"، کە لە ساڵی ۲۰۰۷ لەلایەن ڕوبەرت موردۆخەوە کۆنترۆڵ کرا، ئامانجێکی پێکا کە بۆ ماوەیەکی درێژ هەوڵی بۆ ئەدا، ئەویش کاتێک ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵی بە ٦.٥ ملیار دۆلار کڕی. وە چەند هەفتەی پێش ئێستا کۆمپانیای گووگڵ کۆمپانیای دەبڵ کلاکی کڕی کە ڕێکلامەکان بڵاودەکاتەوە لەسەر ئەنتەرنێت ( لە ساڵی ۱۹۹٦ دامەزراوە) بە بڕی ۱.۳ ملیار دۆلار، و کۆمپانیای مایکرۆسۆفت کۆمپانیای ئەکوانێتیڤ کەمتر بەناوبانگ لە جیهانی ڕێکلام کردن لەسەر ئەنتەرنێتی (لە ساڵ ۱۹۹۷ دامەزراوە) کڕی بە بڕی ۳.٦ ملیار دۆلار. لە کاتێکدا ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵ، لەگەڵ ڕۆژنامەوانە بەئەزموونەکان و ئۆفیس و چاپەمەنی و بینا و کەشتییە بارهەڵگرەکانی (هەموو سەرمایەکان کە خاوەنەکەی داو جۆنسە) بە بڕێکی زۆر فرۆشران، بەڵام هەردوو کۆمپانیاکانی ڕیکلامی سەر ئەنتەرنێت کە مێژووی دامەزراندیان کورتترە و هیچ سەرمایەیەکی جەستەییان نییە بەیەکەوە بە نرخێک فرۆشران بە نزیکەیی دەکاتە دووهێندەی نرخی ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵ.

ئایا ئەمە بەرهەمێکی دەستکردی بازاڕێکی بلقاوی تایبەتە بۆ کۆمپانیاکانی ئینتەرنێت؟ بێگومان، چونکە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت دابەزینی نرخی کڕینی کۆمپانیای ئەکوانیتڤی لە ساڵی ۲۰۱۲ ڕاگەیاند بە بڕی ٦.۲ ملیار دۆلار، بەڵام ئەوە تەنها بەشێک بوو لە چیرۆکی بەردەوامی بەشی ئەم دواییەی ۲۰۱۲ کاتێک فەیسبووک (خۆی بەرهەمێکی نوێی ئینتەرنێتە و نرخە داراییەکەشی سەرنجراکێشە) هەڵسا بە کڕینی ئینستاگرام ( ئەو کۆمپانیایەی کە نزیکەی ۱۰ کەس کاری تێدا دەکات و داهاتیشی نیە) بە ملیارێک دۆلار. بەم بڕە،

فەیسبووک دەیتوانی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز، یان کۆمپانیای پیت پسپۆر لە قاوە، یان کۆمپانیای ئۆفیس دیبۆ، یان کۆمپانیای کوپەر بۆ تایەری لاستیکی بکڕێت، ئەمانە نمونەی هەندێک لەو کۆمپانیایانەن کە نرخێکی داراییان هەیە.

پشکی سەرمایەی ماددی لە بەهای کۆمپانیاکان لە هەموو پیشەسازییەکان کەم بووەتەوە. چونکە ئەو سامانە ماددیانەی کە کۆمپانیا و کارگەکان و فەرمانگەکان و هەموو سەرمایە فیزیکیەکانی تر خاوەندارێتیان دەکات پێچەوانەی ئەو نرخەیە کە ڕاپۆرت دەکرێت کاتێک پشکەکانیان لە بازاڕدا پێشکەش دەکرێت، یان لەلایەن کۆمپانیایەکی ترەوە بەدەست دەهێنرێن. ئەمڕۆ توێژەران مەزەندە دەکەن کە لە نێوان ٤٠٪ بۆ ٥٠٪ ی بەهای بازاری کۆمپانیاکە لە سامانە 'دەستکاری نەکاروەکان"ەوە دێت کە هەموو شتێک لە داهێنان و تایبەتمەندیی فکریەوە دەگرێتەوە بۆ شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکە، وە ئەو براند و ناوبانگەی کۆمپانیا کە هەیەتی لە نێوان کڕیارەکانی. ئەم سامانە دەستکاری نەکراوەنە بە ئاسانی ناتوانرێت بپێورێت، بەڵام ئەمە ڕێگری لە ئابووریناسان نەکردووە کە هەوڵ بدەن.

بەهەر حاڵ هەندێک لەکۆمپانیاکان هێشتا لەسەر کار و پرۆسە گرانبەهاکان کاردەکەن، وەک گەڕانی نەوت یان دروستکردنی فڕۆکەی سەرنشین. هەندێک لە کۆمپانیاکان هێشتا خاوەن تایبەتمەندیەکی گەورەن بەهۆی دەستکەوتنی سەرمایە پێویستەکان، بۆ نمونە، کۆمپانیای نۆریلسکی زەبەلاحی کانزایی ڕووسی ٣٠٪ ی یەدەگی نیکلی ناسراوی جیهان و٤٥% ی یەدەگی پلاتینی جیهانی لە سیبریا کۆنترۆڵ دەکات. بەڵام تەنانەت لە ناوەوەی ئەم پیشەسازیانە سامانە دەستکاری نەکراوەکان گرینگیەکی زیاتری داگیرکردووە. لۆرینزو زامبرانو، بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیای سیمیکسی مەکسیکی پسپۆر لە پیشەسازی چیمەنتۆ کە سەرکەوت بۆ پلە یەکەمەکان لەم بوارەدا و بوو بە یاریزانێکی

جیهانی، پێی ووتم " ئەو ئیدارەیەی کە لەسەر بنچینەی زانیاریەوە دامەزراوە فاکتەرێکی یەکلاکەرەوە بوو لە پشت توانای کۆمپانیاکەی بۆ ڕکابەریە نێودەوڵەتیەکان لەگەڵ کۆمپانیا قەبارە گەورەتر و جێگیرترەکان. وە زامبرانو گووتیشی کە ئیدارەی دامەزراو لەسەر بنچینەی زانیاری و سیستەمی زانیاریەکان و مۆدێلەکانی کارکردن و سامانەکانی تری دەستکارینەکراوی پەیوەندیدار بە زانیاری زیاتر لە پەیوەندی بە چیمەنتۆ، هۆکاری سەرکەوتنی کۆمپانیاکە بوو. گومانی تێدانیە کە سیمێکس وەک نموونەیەکی تری یاریزانێکی نوێ و داهێنەر دێت، کە لە مەکسیکەوە هاتووە، نەئەزانرا کە ئەمە ڕێخۆشکەرێکە بۆ ئەو کۆمپانیایانەی کە توانای ڕکابەری جیهانیان دەبێت، توانی پێکهاتەی هێزی تەقلیدی سەراوژێر بکات لە پیشەسازیێکی کۆن کە تایبەتمەندی تەرکیزی پیشەسازی جیهانی تێدایە.

### قەبارەی بەرهەمهێنان و مەودای پیشەسازی

لۆژیکی ئابووریەکانی قەبارە بۆ ماوەیەکی درێژ وە بنەمایەک مایەوە کە کۆمپانیا نوێیەکانی لەسەر دائەمەزرا: هەرچەند بەرهەم هێنان زیاتر بێت خەرجی دروستکردنی یەکەیەک کەمتر دەبێت، و قورس بووە لە سەر ڕکابەرە بچووکەکان شان لە شانی پێکهاتەی خەرجی و نرخ بدەن کە کۆمپانیا زاڵەکەنی تر پەیڕەوەی دەکەن.

ئەم لۆژیکە درێژبۆتەوە بۆ پشت بەستن بە ئابووریەکانی مەودای دەستکەوتوو لە پیشەسازیەکی دیاریکراو، بۆ هەمەجۆرکردنی پیشەسازی تر، بە جۆرێک کارامەیی و لێهاتوویی سەرەتایی وەک سوودێکی پێشبڕکێکار بەکار بهێنرێت دژی پێشبڕکێکارە بەردەستەکان یان شاراوەکان لە پیشەسازی نوێ. نموونە لەسەر ئەمە کۆمپانیای پیپسی کۆلا کە خاوەنی براندی خواردنەوەی وەرزشی گاتورید

بوو، بەکارهێنانی بەهرەکانی لە بازارِکردن و دابەشکردنی بۆ ئەم خواردنەوە وەرزشییە وایکرد یەکێک لە گەورەترین سەرچاوەی داهاتەکەی بێت.

لەڕووی ئیدارییەوە لۆجیکی قەبارە و مەودا درێژکراوەتەوە بۆ پاراستنی هەر ژمارەیەک لەپۆستەکانی کارگێڕی و یارمەتی لەناو کۆمپانیاکەدا، چونکە خەرجی ئەوانی تر بۆی لەوانەیە زیان بە کاریگەری یان ووردی یان نهێنی پیشەسازیەکەی بگەیەنێت.

ئەمڕۆ، هێشتا لە پیشەسازیە گەورەکان ئەو خەرجیانەی کە ناتوانرێت بەدەست بهێنرێنەوە و هۆکارەکانی تریش دەبنە هۆی سەرهەڵدانی کۆمپانیای تری زەبەلاح کە مەیلی شێوازی کۆنترۆڵکردنی ناوەندی تەسکیان هەیە. (سەیری وزەی ناوەکی بکە، بۆ نمونە، وە ئەوەی کە پەیوەندی پێوە هەیە لە تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو، کێشەی سەلامەتی و ئاسایش، و ئەو خەرجیانەی پێویستە بۆ دانانی هەموو شتێک لە سەرەتاوە). بەڵام جیاکاری هەیە، زۆرێک لە چیرۆکەکانی سەرکەوتنی کۆمپانیا ئەمڕۆ نەک تەنها لەو کۆمپانیایانەوە دێن کە ئابووریەکانی قەبارەیان کەمتر پێوە دیارە، بەڵکو لەو کۆمپانیایانەوەیە کە بە گشتی یاخی بوونە دژی ئەم بنەمایە.

لە ئەنجامدا، بنەماکانی ئابووریەکانی قەبارە، و ئابووریەکانی مەودا و رێکخستنی کۆمپانیاکان بە چەند شێوازێک پێشێل دەکرێن بۆ بەرژەوەندی شارەزایانی بازرگانی. نمونەی ئەم شێوازە بەرهەمهێنانی کەلوپەلە بە بڕێکی بچووک کە لە بازاڕە گەورەکاندا دەفرۆشرێت (وەک پەنسیلین و سابوون،..... هتد). فرۆشتنی کۆمپانیای جلوبەرگی ئیسپانی زارا کە تەنیا لە ساڵی ۱۹۸۸ لە ئیسپانیاوە دەستی پێکرد، لە سالی ۲۰۰۷ لە فرۆشتنی کۆمپانیای "گاپ"ی تێپەڕی و تا ساڵی ۲۰۱۲ لە ناوەڕاستی سستی ئابووری جیهانیدا، فروشەکەی

نزیکەی ١٨ ملیار دۆلاربوو، بەمانای بەرزتر لە فروشی گاپ بە ڕێژەی ٢٥%، و زارا بە بەرهەمهێنانی جل و بەرگ بە بڕی کەم بەناوبانگە لە جیاتی گەیاندنی داواکاری بڕی گەورەی بەرهەمهێنان وەک ڕکابەرەکانی. هەروەها ستراتیجی فرۆشتنی تاکفرۆشی خۆی بە پێی داتاکانی بازاڕەکانی دەرەوەی وڵات دیزاین دەکات. (زیاتر لە ٥٥٠٠ کۆگا لە نزیکەی ٨٠ وڵات) و زارا تەنیا پێویستی بە دوو هەفتە هەیە بۆ دیزاینکردن و دروستکردن و ناردنی بەرهەمێکی نوێ بۆ کۆگاکانی، لەکاتێکدا تێکڕای ماوەی پێویست لەم پیشەسازیەدا شەش مانگە، جگە لەوەش زارا ساڵانە نزیکەی ١٠ هەزار دیزاینی نوێ دەردەکات. لە حاڵەتی زارا لانی کەم، تایبەتمەندی خێرای - خێرا وەڵامدانەوە بۆ گۆڕینی تامی کڕیارەکان و دابینکردنی ڕاستەوخۆ- زۆر زیاترە لە سوودەکانی پەیوەست بە بارگە گەورەکانی کاڵاکان کە بە شێوازی بەرهەمهێنانی فراوان بەرهەم دەهێنرێت. زارا تەنیا نمونەیەکی ترە لە زیادبوونی ژمارەی زۆری ئەو کۆمپانیایانەی کە سەرکەوتنیان لەسەر بنەمای خێرایی زیاترە لە قەبارەی بەرهەمهێنان، لە زۆر پیشەسازی قەبارەی گەورەی بەرهەمهێنان فاکتەری یەکلاکەرەوەیە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن.

یەکێکی تر لە پێشێلکارییەکانی بنەماکانی ئابووریەکانی قەبارە و ئابووریەکانی مەودا خۆی لە توانای دامەزراندنی وەبەرهێنانێکی لەدوورەوە ئەبینێتەوە بۆ بەدەستهێنانی. خزمەتگوزاریەکان کە پێشتر نەسپێردرابوو بە هیچ لایەنێکی سێیەمی ڕەها، ئەمە جگە لە جێبەجێکردنی لە دوورەوە . چالاکیەکانی لەژێر ناوی "دەرکردن" ( پشت بەستن بە سەرچاوەکانی دەرەوەی کۆمپانیا بۆ بەجێهێنانی چالاکی بەرهەمهێنان کە پێشتر لە ناوەوە جێبەجێ دەکرا) وەک نموونە وەربگرە. لە سەرەتادا، ئەمە بە سادەیی مانای ڕێککەوتن لەگەڵ دابینکەری دەرەکی بوو بۆ بەدەست هێنانی کەرەستەکان، یان ناردنی شتومەک بۆ ئەوەی

کۆبکرێتەوە یان بخرێتە قۆناغێک لە زنجیرەی دروستکردندا. پاشان دەرکردن درێژبۆوە بۆ خزمەتگوزاریەکان، لە سەرەتادا دەرکردنە بەو خزمەتگوزاریانە دەستی پێکرد کە کارامەیی کەمتریان پێویست بوو وەک کردارە سەرەکیەکانی ژمێریاری یان سەنتەرەکانی پەیوەندیکردن بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە سەرەکیەکانی کڕیاران. بەڵام ئێستا دەرکردن درێژبۆتەوە بۆ کاری پزیشکی لە دوورەوە؛ ئەو پزیشکانەی کە پشکنین دەکەن یان شارەزایانی تاقیگە کە تاقیکردنەوەی پزیشکی دەکەن یان ژمێریاریان لە هیندستان کە هەڵدەستن بە ئامادەکردنی باج بۆ کۆمپانیا ئەمریکیەکان.

کۆمپانیا زەبەلاحە دێرینەکان پشت بە کۆمەڵێک لە کۆمپانیا بچووکەکان دەبەستن، کە شوێنی جوگرافیان چیتر فاکتەرێکی وا گرینگ نەماوە، و دەرکەوتووە کە توانای بەجێهێنانی خزمەتگوزاریە تایبەتەکان و زانیاریە چڕەکانی هەیە بە خەرجیەکای کەمتر بەڵام بە هەمان کوالیتی ئەو کاڵایانەی کە لە ناوەوەی کۆمپانیا زەبەلاحەکان بەرهەم دێن. هیچ وڵاتێک ڕێگری لەم جۆرە خزمەتگوزاریانە ناکات. کۆمپانیای ئای بی ئێم سەنتەرێکی کردەوە بۆ توێژینەوەکان لە هیند لەساڵی ١٩٩٨، و لە ساڵی ٢٠١٠ سەنتەرێکی تری کردەوە لە ساوپاولۆ لە بەرازیل زۆربەی پڕۆگرامسازانی زمانی جاڤا لە جیهان کاریان تێدا دەکرد، وە دووەم گەورەترین ژمارەی پڕۆگرامسازانی کۆمپیوتەرە گەورە هەرە خێراکان. لە ساڵی ٢٠١١دا، کۆمپانیاکان لە ئەمریکای لاتین و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا ٥٤ دامەزراوەی دەرکردەیان کردەوە، بە بەراورد بە ٤٩ لە هیندستان.

ئەو ڕاستییەی کە هۆکارەکانی دەرکردن ئاشنان وای لێناکات کەمتر بەهێز بێت، بۆ نمونە، ئەو فراوانیە زۆرەی لە سیستمەکانی پەیوەندی ڕاستەوخۆی کاریگەر، ئیمەیڵ، پەیامەکانی دەقی خێرا و پەیوەندی تەلەفۆنی ئۆنلاین نەک تەنها ژیانمان ئاسوودەتر دەکات، بەڵکو سوودە تەقلیدییەکانی ئەو بازرگانیەی کە

لە باڵەخانە ئۆفیسیەکان داهەیە کەم دەکاتەوە، ئەو شوێنەی کە هاوڕێیەکان چاویان بەیەک دەکەوێت، یان ئەو کۆبوونەوانەی کە ڕێکدەخرێن لە ڕێگای بریکارەکانی گەشت لە ناو کۆمپانیاکان، و پۆستی ئاڵوگۆڕ لە نێوان ئۆفیسەکان، و تۆڕەکانی تەلەفۆنە ناوەندیەکانی ناوەوە، و تۆڕە ناوەخۆییەکان و لۆکاڵیەکان.... هتد؛ چونکە هەریەک لەم نێوەندگیرانە پێویستی بە وەبەرهێنانێکی زەبەلاح هەیە کە زۆربەی ئەو بەربەستانە پێک دێنێت لە بەرامبەر کۆمپانیا تازەکان یان هاتووە نوێیەکان، وە پرۆسەی دەرکردن لە پۆستە گرینگەکان پەکدەخات. ئەو تایبەتمەندیەی کە لەلایەن کۆمپانیا زاڵەکانەوە چێژی لێ وەردەگیرا بە شێوەیەکی پراکتیکی تەواو بوو.

چەمکی "مۆنۆپۆلی سروشتی" لە فەرهەنگی ئابووریدا وون بوو، چەمکێکە ئاماژە بەو کۆمپانیایانە دەکات کە قەبارەیەکی ئابووری زۆر بەهێزیان هەیە، و وادەکات بوونی زیاتر لە یەک سەرچاوە هیچ مانایەک نەبەخشێت. نموونەی سەرەکی ئەم کۆمپانیایانە بریتین لەکۆمپانیاکانی کارەبایی و کۆمپانیاکانی تەلەفۆنی جێگیر و کۆمپانیاکانی ئاودێری. تاکە پرسیار ئەوە بوو: ئایا ئەو قۆرخکارییانە دەبێت دەوڵەت خاوەنی بێت، یان دەبێت بە تایبەتی خاوەنداری بکرێن و بەپێی ئەوە ڕێکبخرێن؟ هەرچۆنێک بێت، ئەم پیشەسازیانە ئێستا بە شێوەیەکی زۆر پێشبڕکێ دەکەن، ئابووریناسان دەڵێن: تەکنەلۆجیا ڕێگە دەدات ئەم قۆرخکاریانە ڕێکبخرێت بەو ڕێگایانەی کە بتوانن چەندین دابینکەر پێشبڕکێ بکەن لەسەر کڕیارەکان. ئەنجامەکە فراوانبوونێکی سەرسوڕهێنەرە لە بژاردەکانی بەکاربەر: لە ئەفریقا، بهارتی ئێرتێل، پێشەنگ لە خزمەتگوزاریەکانی مۆبایل لە کیشوەرەکە، هەڵسا بە ئەنجامدانی گرێبەستێک لەگەڵ کۆمپانیای شێردسۆلار پسپۆر لە دابین کردنی ووزەی خۆر بە سیستەمی پارەدانی پێشوەختە، بۆ دابینکردنی کارەبا بۆ ٥٠

ملیۆن کڕیاری بەهارتی لە کیشوەری ئەفریقی. لە شاری مێلبۆرن لە ئوسترالیا، بەکارهێنەران دەتوانن لە نێوان ١٥ دابینکەری ووزە یەکێکیان هەڵبژێرن، ئەوەیەک لەمەوپێش ئەمە شتێکی بێهودەیی بوو، ئێستا کارێکی ئاساییە.

پاش ئەوەی ئابووریەکانی قەبارە و مەودا تایبەتمەندیە ڕکابەریەکەی لەدەستدا،تایبەتمەندی تر بەدەرکەوت بۆ پێشەوە؛ خێرایی یەکێک بووە لە سوودەکانی قەبارەی گەورە، وە ئێستا خێرایی لە قەبارە گرنگترە، هەروەها یەکسانی ئازادی پێشبڕکێکارە بچووک و نوێکان بۆ پەیداکردنی ئامرازەکان کە توانایان پێ دەدات لە دیاریکردنی کڕیارەکان و پێشخستنی بەرمەهەکان و خزمەتگوزاریەکان و دڵسۆزری لە خێرا دابینکردن و ڕادەستکردن، بەشدارە لە گواستنەوەی قەبارەی گەورە لە تایبەتمەندی بۆ باڵگرانی.

## براند

یەکێک لە ڕێگا کلاسیکیەکان بۆ بەدەستهێنانی پێگەیەکی ئاسوودە لە بازاڕدا بەکارهێنان و بەرگری کردن لە براندێکە. براند - ئەوەی کە ناو و لۆگۆی تێدایە و لە هەموو هەڵمەتەکانی ڕیکلام و یاوەریدا بەکاردێت کە هەر ناوێکی بەناوبانگ و سەرنج ڕاکێش ڕێگەی پێ دەدات - یارمەتی پاراستنی هەر بەرهەمێک دەدات لە بوون بە کاڵایەک کە لە هاوتاکانی جیا نەبێتەوە، بۆ ئەوەی گرنگ نەبێت کێ دروستی کردووە یان وەریگرتووە، و ئەگەری ئەوە دابین دەکات کە خاوەنداری کردنی ببێتە جۆرێک لە پەیوەندی سۆزداری و ئەزموونی ڕاستی. لە ساڵی ١٩٤٧ لە جیهانی براندەکان شۆڕشێکی زوو ڕوویدا، کاتێک کۆمپانیای یونایتد میوتس ناوی "چیکویتا" ی وەک مارکێک بۆ بەرهەمە مۆزەکانی داهێنا. پێشتر، مۆز هەر مۆز بوو، بێ گوێدانە ئەوەی کێ بەرهەمی هێناوە یان لە کوێ بەرهەمی هێنراوە. وە هەموو ئەو شتانەی کە مۆزێک و لە دانەیەکی تر

جیا دەکاتەوە قەبارە و پێگەیشتوویی و تام و ئەو فاکتەرانە بوو کە سەربەخۆ دیار بوون لە بەرهەمەکە. بەڵام داهێنانی ناو و لۆگۆیەکی خۆڕایی ڕێی بۆ دروستکردنی چیرۆکە ڕیکلامیەکان دەربارەی مۆز کردەوە. براندەکە زۆر سەرکەوتوو بوو بە پلەیەک بوو بە ناوی نوێی کۆمپانیاکە لە ساڵی ١٩٩٠.

وەک ئەم نموونەیە پیشانی دەدات، یەکەم و کۆتا ئامانجی براندەکە ڕێگرتنە لە پێشبڕکێ. تا ئەو براندە کاریگەرتر بێت، بەشداریەکەی زیاتر دەبێت لە هێزی بازاری کۆمپانیاکە. ئەمڕۆ، شێوازەکانی جیاکردنەوەی بەرهەمێک لە ئەوانی تر لە هەموو کاتێکی تر بەردەستترن، لە ئامرازە تەقلیدییەکانەوە، وەک لۆگۆ و پاکەت و ڕیکلامی تەلەڤزیۆن، بۆ پرۆسەکانی سپۆنسەری ئامرازی نوێ، وەک کڕینی مافی ناولێنانی کۆمپانیا، دڵنیابوون لە دانانی ڕیکلامی بەرهەم لە شوێنێکی بینراو، و ڕێکلام کردن لە هەموو پلاتفۆرمە ڕێکلامیەکان، و ڕێکخستنی هەڵمەتە فراوانەکانی بە بازاڕکردن. ڕێگاکان زیاتر بوون کە مرۆڤ دەتوانێت چیرۆکێک دەربارەی بەرهەمێک بگێڕێتەوە، و چیتر پێویستی بە بودجەی ڕیکلامی گەورە نییە کە بە ئاژانسە گەورەکانی ڕیکلام لە نیویۆرک یان لەندەن سپێردراوە. وەک نموونەیەکی تر لە ڕوونکردنەوەی ڕادەی سەرکەوتنی ڕکابەر نوێیەکان و چاوەڕوان نەکراوەکان لە لاوازکردنی زاڵبوونی یاریزانە دامەزراوەکان، نمونەی کۆمپانیایەک وەربگرە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر بوونی نەبوو - لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە وەک فەیسبووک و تویتەر و یوتوب - و ئێستا ئامادەکاری دەکات بۆ دەستگرتن بەسەر پشکێکی گەورە و خێرا زیادبوو لە سەرمایەکانی ڕێکلام کردن، کە چەندین ساڵە تەنیا ئەچوو بۆ ئاژانسە تەقلیدیەکانی ڕێکلام کردن وەک تەلەفزیۆن و رادیۆ و ڕۆژنامەکان. بازاڕکردنی ئاراستەکراوی کاریگەر بە مانای بازارکردنی ئاراستەکراو بۆ هاندەرانی تۆپی پێ و قسەکەرانی ڕووسی و خۆشەویستانی یاری ڤیدیۆیی و جووتیارانی گەنم و

ڕووەکخۆران و ئەوانی تر بە نرخێکی نزم بەردەستن و لە ڕێگەی کەسە تازەکان ناوەستنەوە. هەر وێبسایتێکی زیرەک دەتوانێت وێبگەڕەکان ڕابکێشێت بۆ ناو و بەرهەمەکانی کۆمپانیا کە پێشتر گوێیان لێ نەبووە.

بوارێکی نوێی لە زانستی ئابووری دەرکەوت پەیوەندی هەیە بە پێوانەکردنی پێکهاتەی بەهای بازاڕ بۆ کۆمپانیایەک کە دەتوانرێت بە براندەکەی ببەسترێتەوە. لە ساڵی ٢٠١١دا، ئینتەربراند، کە کۆمپانیایەکی ڕاوێژکاری پێشەنگە، توێژینەوەیەکی ئەنجامدا ئاشکرای کرد کە مارکی مەکدۆناڵد - ناوی کۆمپانیاکە و ناوی بەرهەمەکان و دیزاینی چێشتخانەکان و کەوانە زێڕینەکان - زیاتر لە ٧٠٪ی بەهای کۆمپانیاکەیە. هەروەها براندەکەی کۆکا کۆلا ٥١٪ ی بەهای کۆمپانیاکە؛ دیزنی، ئای بی ئێم و ئینتێل بە ٦٨٪ و ٣٩٪ و ٢٢٪ ی بەهای بازاڕەکەیانن یەک لە دوای یەک.

لە ساڵی ٢٠١١، کۆمپانیاکان بەپێی بەهای دراوی مارکەکانیان پلەبەندی کرابوون کە تێکەڵەیەک بوو لە کۆمپانیا پشتگیرەکان بۆ ئابووریە پیشەییەکان و یاریزانە نوێیە پشت بەستووەکان بە تەکنەلۆجیا: کۆکا کۆلا لووتکەی لیستەکەی گرتبوو، دواتر ئای بی ئێم و مایکرۆسۆفت و گووگڵ و پاشان جێنەڕاڵ ئیلیکتریک و پاشان ماکدۆناڵد و پاشان ئینتل و نۆکیا و دیزنی هیولیت باکارد لە پلەکانی دەیەم.

بە گوێرەی ئەمەس شتێکی سروشتیە کە کۆمپانیاکان بە بڕێکی زەبەلاح وەبەرهێنان بکات لە داهێنانی برادنەکانی. کۆمپانیا زیرەکەکان بەردەوام لە پەرەسەندندان، و بۆ نمونە ئای بی ئێم خۆی لە دروستکەرێکی کۆمپیوتەر و درایف و ئامێرەکانی تری کۆمپیوتەرەوە گۆڕیوە بۆ کۆمپانیایەکی تەکنەلۆجیای بینراو کە ڕاوێژکارە زیرەکەکان و سۆفتوێری شیکردنەوەی بیرکاری بەکاردەهێنێت بۆ چارەسەرکردنی کێشە جیهانیە ئاڵۆزەکان، ئەمەش توانایێکە لە هەڵمەتەکانی

ڕێکلامیەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە لە ساڵی ٢٠١٢ لە ژێر ناوی " هەسارە زیرەکەکان". بەڵام تەنانەت سودی براندەکانیش ئێستا نادیار بووە، هەندێک لە چالاکترین براندەکان، کە بەشداریان زیادی کردووە لە کۆی بەهای کۆمپانیاکان لە ساڵانی ڕابردوودا بە خێراییەکی زۆرتر، کۆمپانیای تازە دەرکەوتەکانن، وەک سکایپ (ئێستا لەلایەن مایکرۆسۆفتەوە خاوەندارێتی دەکرێت). هەروەک کە براندەکان بەسەر سەرمایەی ماددی سەرکەوتن وەک پێکهاتەیەک لە بەهای کۆمپانیاکە، ئەوا پاراستنی خودی تایبەتمەندی براندەکە قورستر دەبێت، لەگەڵ سەرکەوتنی یاریزانە نوێیەکان لە دامەزراندنی ناوەکانیان.

### دەستکەوتنی سەرمایە

چەند بەربەستێکی کەم هەیە بۆ جوڵانەوەی کۆمپانیا پەکدەخات، وەک نەبوونی دەستگەیشتنی ئازاد بۆ سەرچاوەکانی سەرمایە. ئێمە زۆر بە دەگمەن ئەو بازرگانانە دەدۆزینەوە کە پارەی پێویستیان هەبێت بۆپارەدانی بیرۆکە یان تاقیکردنەوەی بەرهەمێک. لایەنە بەتواناکان ئەو کۆمپانیا گەورانەن کە پارەیان هەیە بۆ وەبەرهێنان لە توێژینەوە و گەشەسەندنی بەرهەمەکاندا، یان پارەی پێویست بۆ خەرجکردنی لەو بەرهەمەی کە بە کەمتر لە تێچووەکەی دەفرۆشرێت بۆ ئەوەی کڕیارەکان ڕابکێشن. هەر چەندە کەناڵەکانی کۆکردنەوەی سەرمایە سنوردارتر و بە کۆتێکی زۆر دەورەدرابێت، بازاڕەکە زیاتر داخراو دەبێت بۆ پێشبڕکێکارانی نوێ. لە هەموو جیهاندا، دەستگەیشتن بە سەرمایە هەر بە سنوورداری ماوەتەوە و پێویستی بە داواکاریە کەڵەکەبووەکان هەیە بۆ بانکە ڕەزیلەکان بۆ بەدەستهێنانی قەرز بە ڕێژەیەکی بەرزی نرخەکانی سوودوەرگرتن. لە ڕووی مێژووییەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەورەترین جیاکاری ئەم شێوازە بووە؛ کە بەشداری لە ڕۆڵی سەرکردایەتی خۆی کردووە وەک ناوەندی

داهێنان لە جیهاندا.

ئەمرۆش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک یەکێک لە ئاسانترین شوێنەکانی جیهان دەمێنێتەوە بۆ بەدەستهێنانی قەرز، بەڵام لە ڕووی ئاسانییەوە لە پلەی دەیەمدایە. بە پێی بانکی جیهانی، پێنج وڵاتی یەکەم لە ڕووی دەستگەیشتنی ئاسان بە قەرزەوە بریتین لە مالیزیا، ئەفریقای باشوور، شانشینی یەکگرتوو، ئوستralیا و بولگاریا. ئەم نمونە سەرسوڕهێنەرەی دەوڵەتەکان ئاماژە بە گۆڕانکارییە گرنگەکان دەکات نەک هەر لە شوێنی سەرچاوەکانی سەرمایە، بەڵکو لە سروشتی ئەو سەرچاوانەشدا، چونکە سەرچاوەی تەواو نوێ کراوەتەوە بۆ قەرزەکان، و ئەو سەرچاوانەش کە پێشتر داخراوو تەقلیدی بوون ئێستا بە شێوەیەکی فراوانتر بەردەست بوونە.

وە ئەو ڕەوتە سەرەکیەکەی لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا هەبوو بریتی بوو لە زۆربوونی سەرمایەی وەبەرهێنان و سەرمایەدارانی پارەدارە تاکەکان، ئەمانەش چەند جۆرێکی وەبەرهێنەربوون کە پێشتر بە ڕادەیەکی زۆر لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دا بوون - بە بازاڕە نوێیە گەورەکان لە ئەوروپا و ڕووسیا و ئاسیا و ئەمریکای لاتینندا. هەروەک پێشتر لە چوارچێوەی شۆڕشی جوڵانەوە ئاماژەمان پێدا، یەکێک لەهێزەکانی پشت بڵاوبوونەوەی جیهانی سەرمایەی سەرەڕۆیی (وەبەرهێنان) و پشکە تایبەتەکان جووڵەی خاوەن بانکەکان و وەبەرهێنەران و ئەندازیارەکان بوو کە ئەزموونیان لە ویلایەتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا وەرگرت، و پاشان گەڕانەوە وولاتەکانیان بۆ ئەوەی هەمان شێوازی وەبەرهێنانی ئەمریکی جێبەجێ بکەن. لە تایوان، سندوقەکانی وەبەرهێنان لەسەر مۆدێلی ئەمریکی بۆ یەکەم جار لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٦-١٩٨٧ دامەزرا، لەلایەن ئەو بەڕێوەبەرانە بەڕێوە ئەبرا کە دوای تەواوکردنی خوێندنی ئەندازیاری یان هەڵگرتنی پلەی پیشەیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەڕانەوە وولاتەکەیان. لەم

## کۆتایی سەردەمی هێز

دواییەدا کۆمپانیا سەرمایەدارەکانی وەبەرهێنان لە هیندستان زیاتربوون، تەنانەت لە چینیش کە تا ڕادەیەک ڕووبەڕووی چەندین سنوور دەبنەوە، و گەڕاوەکان و سەرمایەدارانی پەیوەندیدار بە هەردوو جیهانەوە، بەنگالۆر و دۆڵی سلیکۆن، نوێنەری هێزی جولانەوە بوون لەم گەشەکردنە. "ناوچەکانی تەکنەلۆژیای سەرکەوتوو" وەک شانگهای و بانگالۆر چیتر کۆپی دۆڵی سیلیکۆن نین بەڵکو درێژکراوەی ئەوە، بە ووتەی ئانالی ساکسینیان، پرۆفیسۆر لە قوتابخانەی پێرکلی زانکۆی کالیفۆرنیا، کە شارەزایەکی ئەم بوارەیە. ئەو دەڵێت کە لێکچونی گونجاو بۆ بزووتنەوەی بەهرەکان، و بیرۆکە پیشەنگەکان و پارەدان چیتر "ئاوەڕۆی مێشک" نییە، بەڵکو "هەڵگەڕانەوەی مێشک"ە، وەک لە بەشی چوارەمدا باسمان کرد.

### داهێنان

جۆن ماراگانۆر بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیایەکی بچووکی دەرمانسازی لە کامبریج ماساچوستس گوتی: "نازانم چۆن دەتوانیت ژینگەیەکی باش بۆ داهێنان لە کۆمپانیا گەورەکانی دەرمانسازیدا هەبێت، زەحمەتە وێنای ئەوە بکەیت کە چۆن دەتوانیت ژینگەیەک دروست بکەیت بۆ داهێنان و ڕیسک و دروستکردنی پاڵەوانەکان". لەڕوانگەی ئەوەوە ئەم لێدوانە هیچ نەبوو جگە لە دەربرینێک بۆ ئەوەی کە ڕوونە. بەڵام بە بەراورد بە دەیان ساڵ لە ڕاهێنانی ستانداردی کۆمپانیاکان، ئەوەی ڕوویدا هیچی کەمتر نییە لە گۆڕانکاریەکی ڕادیکاڵی (ڕیشەیی ).

بەڵێ ڕادیکاڵە، بەڵام ڕاستە. لەوانەیە کۆمپانیا زەبەلاحەکانی دەرمانسازی وەک فایزەر و مێرک بتوانن هەندێک دەرمانی تازەی نوێ و داهێنەرانە و زۆرتر

کاریگەر لە گۆڕانی ئەم پیشەسازیە بە بازاڕ بکەن، بەڵام زۆرجار خۆیان پەرمیان پێنادەن. بەڵکو ئەم دەرمانانە لەلایەن کۆمپانیا پسپۆڕە بچووکەکانەوە پەرمیان پێ دەدرێت، کە هەندێکیان لە بەشەکانی توێژینەوەی بایۆلۆجی لە زانکۆکان و هەندێکیان لە ناوچە ناسراوەکان بە نوێگەریی وەک حەیدەر ئاباد لە هیندستان هاتوون، کە بە "دۆڵی جینۆم" ناسراوە. پاشان دەرمانەکان - و لە هەندێک حاڵەتدا خودی کۆمپانیاکەش- بە کۆمپانیایەکی زەبەلاح دەفرۆشرێت. لە راستیدا لەوانەیە ئەرکی دروستکردنی دەرمانەکان بە کۆمپانیایەکی دەرکردە بسپێردرێت. نموونەیەکیش بۆ ئەمە کۆمپانیای زانستە بایۆلۆجییەکانی فێروینە کە حەوت کارمەندی هەیە لە ماڵەوە کار دەکەن، و نزیکەی ٦٠ دابینکار و بەڵێندەر هەموو ئەو تێکردنانە دابین دەکەن کە پێویستن بۆ پرۆسەی گەشەپێدانی دەرمان. کۆمپانیاکە لە ساڵی ٢٠٠٧ دەستی بە کارکردن کرد و ٢٧ بلیۆن دۆلاری لە سەرمایەی سەرەڕۆیی ڕاکێشا، دەرمانەکانی لە قۆناغی پەرەسەندنەوە بۆ قۆناغی دووەم لە تاقیکردنەوەی سەرسیەمی پزیشکیدا گواستەوە لە نۆرینگەکان، لە ساڵی ٢٠١٢ لەلایەن کۆمپانیای شایری بەریتانی پسپۆر لە دەرمانە بایۆلۆجیەکان کڕاوە.

بە پێچەوانەی کۆمپانیا لۆکاڵیەکان، کۆمپانیا جیهانیەکانی وەک شایەر و کۆمپانیا سەرەکیەکانی تری دەرمان تایبەتمەندیەکی ڕوونیان هەیە لە بواری ڕێکلام کردن و دابەشکردن. چونکە ئاسایی نیە کۆمپانیایێکی دەرمانی لۆکاڵی بچووک لە حەیدەر ئاباد یان شینزین هەڵسێت بە ئامادەکردنی ستافێکی تایبەت لە مەندوبەکانی فرۆشتن بۆ هەڵگرتنی نموونەی دەرمانەکان ( و پێنووس و جەنتا و خواردن) بۆ پزیشکان و بەرپرسی نەخۆشخانەکان لە فلۆریدا یان بێرث یان دورسیت.

ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە شوێنی داهێنانە سەرەکیەکان ڕوویدا هیچ کەمتر نیە لەوەی شۆڕشگێڕی بێت. چەندین ساڵە کۆمپانیا گەورەکان لە هەموو بوارێکدا، لە دەرمانسازییەوە تا پیشەسازییەکانی ئۆتۆمۆبیل و کیمیایی و کۆمپیوتەر،

هەڵدەستان بە چالاکیە تایبەتەکانیان لە بواری توێژینەوە و پێشخستن لە یەکە تەواو پارێزراو و باش پشتگیرکراوەکان، ئەم یەکانە پێویست بوون بۆ پێگە و هەیبەتی کۆمپانیاکە. بەڵام، هەر لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم، کۆمپانیاکانی وەک سیسکۆ و جینزایم ئەم ناوبانگیان پەیدا کرد سەرەڕای نەبوونی ئەم توانا توێژینەوە و گەشەسەندنە. هەروەک توێژەر لە بوارەکانی بازرگانی ناوی لێنا، هنری چەیسبرۆ، "سەردەمی داهێنانی کراوە" فەراهام بوو. چەیسبرۆ ئاماژە بەوە دەکات کە داهێنانی کراوە لە هەندێک پیشەسازیدا یاسا بووە بە درێژایی کات: هۆلیوود، بۆ نمونە. ئێستا بەرهەمهێنەرانی بواری کیمیایی و تەلەفۆن و فڕۆکە لە مۆدێلی هۆلیوود نزیک دەبنەوە، و دانایی ئەو کۆمپانیا زەبەلاحە کۆنانەی سەراوژێر کرد کە لەم بوارانەدا کار دەکەن. ئەمەش چونکە کۆمپانیا نوێیەکان لە بواری پیشەسازییەکانیان، وەک ئیسەر، و ئێچ تی سی، لە تاقیگەیەکی داهێنانی دەرەکی کە ناوی لەسەر هیچ لە بەرهەمەکانی دەرنەدەکەوت، خۆی گۆڕی بۆ کۆمەڵێک لە کۆمپانیای ڕکابەر کە هەڵگری براندی تایبەت بە خۆیەتی.

بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیای دروستکردنی مۆبایلە زیرەکەکان ئێچ تی سی تایوانی وتی: "زانینی ئێمە بۆ ئەم جۆرە بەرهەمانە زۆر باشترە لە زانینی کڕیارەکانمان بۆی". گروپێکی تر لە کۆمپانیاکان هێشتا ژێردەستەن و لە ئامادەکاریدان بۆ شوێنکەوتنی پێشەنگی ئێچ تی سی. لە پیشەسازی دەرمانسازیدا، دەرکردنی دەرمان لە مێژە بوونی هەیە، بەڵام دۆزینەوەی دەرمانەکان سنووردار کراوە بە کۆمپانیا سنوردارەکانەوە. لە لایەکی ترەوە، بازاڕی دۆزینەوەی دەرمان لە ڕێگەی دەرکردنەوە گەشەسەندنێکی زۆرخێراتری بەخۆوە بینیوە لە زۆربەی توێژینەوەکان و پێشخستنی دەرمانەکان لە ساڵی ٢٠٠١ەوە، کاتێک لە ٢ ملیار دۆلار لە ساڵی ٢٠٠٣ بۆ ٤.٥ بلیۆن دۆلار لە ساڵی ٢٠٠٧ پەرەی پێدرا، و ڕێژەی گەشەی ئێستای ساڵانە بە نزیکەی ١٦٪ دەخەمڵێنرێت.

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەم پێشکەوتنانە باش نین بۆ کۆمپانیا گەورەکان، وەک توێژەر لە بوارەکانی بازرگانی، کلایتۆن کریستنسن، لە کتێبی بەناوبانگی خۆیدا "دایلمای نوێساز" دەڵێت، تەنانەت باشترین کۆمپانیا گەورەکانیش بە پێی چەند ڕێنماییەک کاردەکەن کە وادەکات لێهاتوو بن لە فەراهامکردنی " تەکنەلۆجیا پشتگیرەکات " ( تەکنەلۆجیا نوێیەکان کە یارمەتی باشتربوونی کوالیتی بەرهەمە بەردەستەکان دەدات)، بەڵام خراپە لە ناسینەوەی تەکنەلۆجیا شۆڕشگێرەکان و سوود وەرگرتن لێیان ( تەکنەلۆجیا نوێیەکان کە عادەتەن لە پەراوێزی بازاڕەکان دەردەکەون بەڵام لە کۆتاییدا دووبارە دارِشتنی بۆ دەکرێتەوە). لە نێو تەکنەلۆجیا شۆڕشگێڕە کلاسیکیەکان، کریستنسن لیستێک باس دەکات کە هەر یەک لە تەلەفۆنی مۆبایل، تۆربینە بچووکەکان، تەکنەلۆجیای ڤاسۆدیلشن، پلەی ستەیشن، فێربوونی دووری، پرۆتۆکۆلەکانی ئینتەرنێت، فرۆشتنی ئۆنلاین و چاودێری ماڵەوە بۆ نەخۆشەکان لەخۆدەگرێت. ئەم جۆرە پێشکەوتنە نوێیانە، کە لە سەرەتادا بە بەراورد بە پرۆسە ستانداردەکان نائابووری بوون، لە کۆتاییدا هەمان کۆمپانیا گەورەکانیان سەرلێشێواو کرد کە هەمیشە پێشەنگی کەموکورِیەکانی بوارەکەیان بوون، ئەمەش بووە هۆی نەمان یان کەمبوونەوەی ئەو کۆمپانیایانەی کە جارانێک نمونەی کامڵی بوون، وەک کۆمپانیای ئامێری دیجیتاڵی دی ئەی سی و کۆمپانیای سیرز روبیک.

کرستنسن ڕونی دەکاتەوە کە قەبارە و ڕێکارە کردارییەکانی یاوەری، بە شێوەیەکی بەرچاو بەشداریان لەم پێشکەوتنانە کردووە. بۆ نمونە، کۆمپانیا گەورەکان پێویستیان بە شیکردنەوەی هەلی بازاڕ هەیە، بەپێی هەڵسەنگاندنە چەسپاو و دامەزراوەکان کە ڕێگریان لێکردوون لە تێگەیشتن لە داتای بازاڕە تازەکان کە لە دەوروبەری تەکنەلۆجیای نوێوە سەرچاوە دەگرن. قازانجە کەمە کورتخایەنەکانی کە لەم بازاڕانە بەدەستهاتوون، بەرهەڵستن لەگەڵ کەلتوری

گەورەکردنی نرخی پشکەکانی چارەگی ساڵانە. هەمان ئەو کەموکوورییە دووبارە دەبێتەوە لەگەڵ هەر شەپۆلێک لە داهێنانە نوێکان؛ هەرچەند سودمەندانی یەکەم زیاتر سوود لەو تەکنەلۆجیایە شۆڕشگێڕانە وەربگرن و گەشە بکەن، " زیاتر و قورستر دەبێت بۆیان بۆ چوونە ناو بازارە نوێیە بچووکەکان کە چارەنووسیان هەیە لە داهاتوودا ببنە بازارێکی گەورە".

کریسنتسن پرەنسیپێک پێشکەش دەکات بۆ سەرکردە بازرگانییەکان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی "دیلیمی داهێنان"، بەڵام لەگەڵ زیادبوونی ئازادی لێشاوی سەرمایەی تایبەت بۆ توێژینەوە و پێشکەوتن بۆ پێگەی زیاتر و کەمبوونەوەی قەبارەی وەبەرهێنانە سەرەتاییەکان کە پێویستە بۆ دروستکردنی کارگەکان، و کڕینی تێکردنێکی دەگمەن، و پەیوەندی و بازاڕکردن، چاوەڕوان دەکرێت ئەم دیلیمیە ئاڵۆزتر بکات لە جیاتی پێچەوانەکردنی.

### سنوردارکردنەکانی حکومەت

هەر لە مێژوودا ئەو سنورانەی کە حکومەت دیسەپێنێت هێڵێکی بۆ ڕکابەری داناوە وەک چاکەیەک بۆ ئامانجەکی بەرزرتر: ئەمیش بۆ پاراستنی کۆمپانیا خۆماڵییە دروستبووەکان لە هاوردە هەرزانەکان، یان بەدەستهێنانی ئەجێندایەکی کۆمەڵایەتی تایبەت لە ڕێگای کۆنترۆڵکردنی سروشت و شوێنی وەبەرهێنانەکان.

بەڵام ئەم ڕەوتە ٣٠ ساڵ لەمەوپێش گەیشتە لوتکە، و هاتە خوارەوە بەهۆی ئەنجامە لاوازەکانی کە بەدەستی هێنا و گۆڕانی تەواو لە بیرکردنەوەی سیاسەتی جیهانیدا. ئێستا حکومەتەکان لەسەرتاسەری جیهاندا خۆیان لەکۆمپانیاکانی سەر بە دەوڵەت ڕزگارکرد و قۆرخکارییان هەڵوەشاندەوە، و سیستەمی بازرگانی و وەبەرهێنانیان ئازادکرد و ژینگەی بازرگانییان بۆ خاوەن پرۆژەکان باشتر کرد.

یەکێک لەو نیشاندەرە دەربڕەکان تێکڕای مامناوەندی گومرگ بوو لە ساڵی ١٩٩٠ کە گەیشتە ٩.٢٣% لەسەر ئاستی جیهانیدا ( ٦.٣٨% لە ئابووریە کەم داهاتەکان و ٣.٩% لە وولاتانی ڕێکراوی هاریکاری ئابووری و گەشەسەندن). وە تا ساڵی ٢٠٠٧، دابەزی بۆ ٨.٨% لە مەودای جیهانی، کە ئەگەیشتە نێوان ١٢% لە وولاتە داهات نزمەکان و ٩.٢% لە وولاتانی ڕێکخراوی هاریکاری ئابووری و گەشەسەندن. تەنانەت ڕووخانی ئابووری ساڵی ٢٠٠٨ شکستی هێنا لە وەستاندنی ئەم ڕەوت. وە کاتێک ئابووریە پێشکەوتووەکان دەستیان بە دارمان کرد، بۆ چاودێران ئاشنا بوو کە پێشبینی ئەوە بکەن کاردانەوەی سروشتی ئەم حکومەتانە پاراستنی کارو کۆمپانیاکانە بە سەپاندنی بەربەستی بەرز. بۆ هاوردەکردن. وە ئەوەش ڕووی نەدا. هەمان شت جێبەجێ دەکرێت بۆ ئەگەری پەنابردنی وولاتەکان بۆ سنووردارکردنی چوونە ژوورەوەی وەبەرهێنەرە بیانیەکان، بەڵام ئەمەش هەر ڕووی نەدا.

گۆڕانی جیهانی بۆ ئابووریە ئازادە تا ڕادەیەک کراوەکان، کە بە بازارە گەورەکانی سەرمایەداریە فراوانەکان و خاوەندارێتی حکومەتی سنووردار دیاری دەکرێت، یەکێکە لە کێشە هاوبەشەکانی نێوان نەوەی پێشوو. ئەم گۆڕانەش زۆرجار لەگەڵ ئاگادارکردنەوەیەکی لەگەڵدا دێت بەوەی لە هەندێک خاڵدا، ڕێگاکە لەوانەیە بە ڕادەیەکی زۆر بگەڕێتە دواوە، ئەوە ئەگەر گەڕانەوەیەکی تەواو نەبێت. لە ڕاستیدا، لەوانەیە لە یەکەم سەرنج دەربکەوێت کە پاشەکشەی جیهانی لە ساڵی ٢٠٠٨-٢٠٠٩ بووە هۆی گەڕانەوە بۆ کۆنترۆڵ و چاودێری زیاتری حکومەت لە پیشەسازییە سەرەکیەکاندا.

هەرچۆنێک بێت، ئەو ڕێوشوێنانەی لەلایەن حکومەتەکانەوە گیراون، وەک: ڕزگارکردنی بانکەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بە نیشتیمانیکردنی کاتی لە شانشینی یەکگرتوو، و هەوڵدان بۆ نوێکردنەوەی ڕێنماییەکان لە کەرتی

داراییدا بە ڕوانگەیەک بۆ تواناداران لە چارەسەرکردنی لێکەوتە داراییەکان، دەبێت بە هەڵە وەری نەگرین کە بە پێچەوانەی ئاراستەی فراوانبوونی جیهانیە. لە ڕاستیدا، بە پێی بانکی جیهانی، خێرایی چاکسازیە بازرگانییە پیشەگەرەکان لە جیهاندا گەیشتە ئاستێکی پێوانەیی لە ساڵی ٢٠٠٨-٢٠٠٩، لە نێو خاوبوونەوەی جیهانیدا. چونکە لەو ساڵەدا بەنک ٢٨٧ چاکسازی کرد، وە لە ١٣١ وولات جێبەجێ کرا، وایکردن کە ئەزموونکردنی بازرگانی لە جاران ئاسانتر بێت. لە ساڵی ٢٠٠٤ەوە، چاکسازی چۆتە نێو سێ چارەکی ئابووری جیهان کە کاری بازرگانی لە جاران ئاسانتر کردووە. نزیکەی دوو لەسەر سێی ئابووری جیهان ئاسانکاریان کردووە بۆ گەیشتن بە قەرزەکان. و زیاتر لە نیوەی جیهان تۆمارکردنی موڵک و باج و بازرگانی کردن لە سنوورەکان ئاسانتر کردووە. ئەگەر ئەو ژمارە زۆرەی دەوڵەتەکان زیاد بکەین کە ئاسانکارییان کردووە بۆ ڕاگەیاندنی مایەپووچبوون و جێبەجێکردنی گرێبەستەکان و بەدەستهێنانی مۆڵەتی بیناسازی و هتد، ئەوە ئاشکرا دەبێت کە بەربەستەکانی حکومەت بۆ چالاکیەکانی کۆمپانیاکان زۆر سووک بووە، بەمەش کۆمپانیا پارێزراوەکانی پێشوو دووچاری ڕکابەری بوونەتەوە. جێی تێبینیە کە هەموو جۆرە بەربەستێک کە ڕێگرن لە هاتنەژوورەوەی پێشبڕکێکارە نوێکان خەریکە دەڕووخێت، و بە پێچەوانەی بیرۆکە باوەکە، ئەبینین بەربەستەکانی حکومەت لەڕیزی بەربەستە هەرە دواکەوتووەکانە. وە ناتوانیت خۆی ڕاگرێت.

### بەشداربووانی نوێ و هەڵە نوێیەکان

ئایا ئەمە شوێنی ڕاگەیاندنی مردنی هەموو پیشەسازی و کۆمپانیا و ناوە کۆنەکان نییە، چونکە بەڵگەی زۆر هەیە کە پێچەوانەوەی ئەمەیە. زۆربەی کۆمپانیا کۆنەکانی تەمەن ١٠٠ ساڵ یان زیاتر لە بوارەکانیان کارێکی باشیان

ئەنجام داوە. هەندێک کۆمپانیای گەورەی دامەزراوی وەک کۆکاکۆلا، نسلیە، ئێکسۆن مۆبیل و تۆیۆتا بۆ ماوەیەکی درێژتر دەمێننەوە، لەوانەیە هەندێکی تر کورتتر بمێننەوە، بەڵام لە کاتێکدا خەمی داهاتووی کۆمپانیا گەورەکان وەک ڕاهێنانێکی بەسوودە بۆ خاوەن پشکەکان، بەڵام بێئاگامان دەکات لەو پێشکەوتنە گرنگەی کە لە دەوروبەری ئێمە ڕوودەدات، بە تایبەتی دەرکەوتنی سوپایەکی تەواو لە ڕکابەرە نوێیەکان، لەمانەی خوارەوە باسی هەندێکیان دەکەین.

## کۆمپانیا نوێیە فرە نەتەوەکانی باشور

ئەلیخاندرۆ ڕامیرز بناسە، کە بازرگانێکی گەنجی مەکسیکیە و یاریزانێکی پایەبەرزە لە بواری پیشەسازی سینەما لە هیندستان.

هیندستان بەناوبانگە بە هەبوونی گەورەترین پیشەسازی فیلم لە جیهاندا، بەلایەنی کەمەوە لە ڕووی ژمارەی فیلمە بازرگانییەکانی کە ساڵانە بەرهەم دەهێنرێت. بەڵام هندستان لە بواری شانۆی سینەمای فرە شاشەی مۆدێرن کە فیلمە ناوخۆیی و بیانیەکان لەسەر شاشەی کوالێتی بەرز نمایش دەکەن زۆر دواکەوتوە. تەنها نزیکەی ۱۰۰۰ شاشەی پیشاندانی مۆدێرن لەم وڵاتە هەیە کە دانیشتوانەکەی زیاتر لە ۲.۱ بلیۆن کەسن. ئەم بۆشاییە لە لایەن کۆمپانیای ڕامیرێزەوە پڕدەکرێتەوە کە ناوی (سینەپۆلیس)ە، بە زیادکردنی ۵۰۰ شاشەی تر لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمی داهاتوودا. سینەپۆلیس لە ساڵی ۱۹٤۰ دەستی بە بازرگانی کرد لە ویلایەتی متشواکان لە مەکسیک بە وەکماڵێک بۆ نیشاندانی فیلمەکان بە یەک شاشە، و گەشەی کرد بۆ گەورەترین کۆمپانیای نمایشکردنی فیلمی فرە شاشە لە مەکسیک و لە سەرتاسەری ئەمریکای ناوەڕاست.

## کۆتایی سەردەمی هێز

سینیپۆلیس تەنیا بەهێزترین یاریزانی نوێ نییە لەسینەماکانی هیندستاندا، یەکەم وەبەرهێنەری بیانییە کە لەهیندستان هاتۆتە ناو ئەو کەرتەوە. من پرسیارم لە ڕامیرێز کرد: "چۆن هاتە بیرت بە چوونە ناو بازاڕی هیندی سایتە بازرگانیەکانت هەمەجۆر بکەیت؟" ئەو وەڵامی دایەوە: "ئەوە بیرۆکەی من نییە... دوو قوتابی لە قوتابخانەی بازرگانی ستانفۆرد داواکراو بوون کە پلانی بازرگانی لەخولێکدا ئامادە بکەن، ئەوان ئەم بیرۆکەیەیان بۆ هات و پێشکەشیان کردم. ئێمە پێکەوە کارمان کرد و پێداچوونەوەمان کرد و سەرمایەمان وەرگرت و دەستمان کرد بە جێبەجێکردنی. یەکسەر بۆمان دەرکەوت کە دەرفەتە شاراوەکە لەوە گەورەترە کە چاوەڕێمان دەکرد.

سینەپۆلیس تەنیا یەکێکە لەو ژمارە زیادبووەی یاریزانە تازەکان لە وولاتانی وەک مەکسیک و هیندستان و بەرازیل و ئەفریقای باشوور و تورکیا بۆ ئابووریە گەشەسەندووەکانی تر، واتە بۆ ئەو کەرتانەی کە پێشتر گەشەسەندوو نەبوون و قۆرخکرابوو بۆ وەبەرهێنانی ناوخۆیی، یان بۆ ئەوانەی لە ژێر کۆنتڕۆڵی کۆمپانیا ڕۆژئاواییە گەورە فرە نەتەوەکان بوون. هاوکاری باشوور- باشوور خەونێک بوو لە خەنەکانی بزووتنەوەی جیهانی سێیەم لە ساڵانی ١٩٧٠دا، بۆ ئەوەی ئابووریەکانی جیهانی گەشەسەندوو هاوکار بن لە بەهێزکردنی یەکتر لە ڕێگەی بازرگانی ڕاستەوخۆ و وەبەرهێنان و یارمەتیەکان کە خۆی لائەدا لە تێپەڕبوون لە ڕێگای کەناڵەکانی " باکور". خەونێکی هاوبەش بوو وولاتەکان بەڕێوەیان دەبرد، وە ئێستا وەبەرهێنانی گەورە زۆر جیاوازە لەو شتەی کە پێشبینی دەکرا. لەگەڵ ئەوە، ئەمڕۆ وەبەرهێنانی باشوور-باشور یەکێکە لە ئاراستەکانی بواری بازرگانی جیهانی. داتاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە قەبارەی وەبەرهەنانی بیانیە ڕاستەوخۆکان کە لە ئابووریە پێشکەوتوەکان و ئینتیقالییەوە هەڵدەقوڵێت دەستی کردووە بە تێپەڕاندنی قەبارەی وەبەرهێنانی بیانیە ڕاستەوخۆکان

کە لە وڵاتانی دەوڵەمەندەوە هەڵدەقوڵێت لە ساڵی ٢٠٠٣.

لە ساڵی ٢٠١٠دا ٥٤ پەیمانی هاوبەشی وریاکردنەوە ئیمزاکران، کە ٢٠ پەیماننامەیان لەنێوان وڵاتانی پێشکەوتودا بوو، و ئەم پەیماننامانە بە هەمان ئاست گرنگیەکی زیاتریان پێدرا لەلایەن ووڵاتە وەرگرەکان بۆ وەبەرهێنانی بیانی ڕاستەوخۆ و ووڵاتانی وەبەرهێن. قەبارەی وەبەرهێنانی بیانی ڕاستەوخۆی هەڵقوڵاو لە وڵاتانی گەشەسەندوودا گەیشتە ٢٩٪ ی تێکڕای وەبەرهێنانی بیانی ڕاستەوخۆ لە ساڵی ٢٠١٠دا، کە ئەمەش ڕێژەیەکی بێوێنەیە، و ئەم گەشە بەهێزە لە ماوەی ٢٠١١ و ٢٠١٢ سەرەڕای کێشە قورسەکانی ئابووری جیهانی بەردەوام بوو.

ئەمڕۆ ژمارەیەک لە کۆمپانیا هاتووەکان لە ووڵاتە گەشەکردووەکان ڕێژەیەکی زیادە لە ژمارەی کۆمپانیا گەورەکانی جیهان پێک دێنن. توەژەرەوان لە بانکی نەودەولەتی و ڕێکخراوی هەماهەنگی ئابووری و گەشەکردن دەڵێتن کە ئامارە فەرمیەکان لە قەبارەی وەبەرهێنانە بیانیە ڕاستەوخۆکانی هەڵقوڵاو لە ووڵاتە گەشەسەندووەکان کەم دەکەنەوە، ئەمەش بەهۆی تازەیی ئەم جۆرە لە وەبەرهێنان و چاوەڕواننەکردنیان لە زۆربەی کاتدا، وە هەروەها بەهۆی قەبارەی ڕۆیشتنی سەرمایەدارە پەراوێزەکان.

لە نێوان ئەوانەی کە سوودمەندن لەم ڕەوتە کۆمەڵێک لە کۆمپانیاکانن کە لە کەرتە جیاوازەکان کاردەکەن لە بیناسازی و پەیوەندیەکان درێژ دەبێتەوە تا کانزاکان و نەوت، ئەمانەش تا ڕادەیەکی زۆر کۆمپانیای نەناسراون لە ئەوروپا یان ئەمریکای باکور، بەلام بۆتە براندێکی بازرگانی زیاتروزیاتر باوەڕپێکراو لە سەرانسەری جیهاندا. لە بواری مۆبایلەکان، بۆ نموونە، ئەبینین کە هەردوو کۆمپانیای بهارتی ئێرتل و ریلاینسی هیندی، و کۆمپانیای ئێم تی ئەفریقای باشور، و کۆمپانیای ئۆوراسکۆمی میسری، و کۆمپانیای پەیوەندیەکانی ئیمارات، هەموویان لەنێو پازدە کۆمپانیا یەکەمەکانی جیهان پۆلێن دەکرێن.

وەکۆمپانیای تریش هەن کە کەمتر ناسراون بەڵام گرنگن لە بواری پیشەسازیەکەیان؛ بۆ نموونە کۆمپانیاکانی پیشەسازی ڕستن و چنینی سریلانکی کە کردارەکانی لە ناوچەکانی تریش لە باشوری ئاسیا و زەریای هێمن فراوان کردووە، وە کوتلەکانی کۆمپانیا فرە چالاکیە تورکیەکان کە بوونە بە یاریزانی گەورە لە ڕووسیا و بەلقان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ( لە ڕاستیدا، کۆمپانیا تورکیەکان گەورەترین سوودمەند بوون لە هەوڵە نێودەوڵەتیەکان بۆ دووبارە بنیادنانی ژێرخان و پێشخستنی لە ئەفغانستان، لەوانیش بنیادنانی کونسوڵخانەی ئەمریکی لە کابۆل). بە ڕێژەیکی زیاتر ئەم کۆمپانیایانە دەستیان بە فراوانکردنی کارەکانیان کرد بۆ دەرەوەی گۆڕەپانە هەرێمیەکان، ئەو شوێنەی کە هەمان زمان و کەلتوریان هەیە، بۆ ئەوەی وەبەرهێنان بکات ( وەک کۆمپانیای سینیپۆلیس) لە شوێنە دوورەکان هەرکاتێک هەلێکی ڕەخساو بدۆزێتەوە. ئەنتوان ڤان ئەگتایل، خاوەنی دەستەواژەی بازارە تازە پێگەیشتووەکان، پێی گوتم کە ئەو هەست بە متمانە دەکات لەوەی ژمارەی کۆمپانیا بەردەستەکان لە بازارە تازە پێگەیشتووەکان تا ساڵی ٢٠٣٠ ژمارەی کۆمپانیا بەردەستەکانی ئەمڕۆ لە ئابووریە پێشکەوتووەکان تێدەپەڕێنێت.

### باشور بەرەو باکور دەڕوات

دیاردەیەکی پەیوەندیدار هەیە کە خۆی دەنوێنێت لە بەرزبوونەوەی دەستبەسەرداگرتنی کۆمپانیا بەردەستەکان بۆ ئابووریە گەشەسەندووەکان و ئینتیقالیەکان لەسەر کۆمپانیاکانی ئەمریکای باکور و ئەوروپیەکانی تر، کە پۆلێکی نوێی لە کۆمپانیا جیهانیە فرە نەتەوەکانی دروست کردووە کە سەنتەری سەرەکیان یان ڕەگیان لە سیستەمی ئابوریە کە تا ماوەیەکی نزیک داخراو بوو و دەوڵەت کۆنترۆڵی کردبوو. وە لە نێوان دەوڵەتە دامەزرێنەرە سەرەکیەکانی ئەم

کۆمپانیایانە وولاتانی هیند و مەکسیک و بەرازیل و باشوری ئەفریقا و چین ئەدۆزینەوە. باشترین نموونە لەسەر ئەوە کۆمپانیای چیمەنتۆی مەکسیکی زەبەلاحە " سیمیکس"، پێشتر باسکراوە، کە لە زیاتر لە ٤٠ وولات کاردەکات. ئەم بڵاوبوونەوە نێودەوڵەتیەی کە کۆمپانیای سیمیکس بەدەستی هێناوە بازێکی پێدا بە نزیکەیی بۆ پلەی یەکەم لە بازاڕە جیهانیەکان بۆ کەرەستەکانی بیناسازی ( لە ڕکابەریەکی توند لەگەڵ کۆمپانیای لاڤارجی فەرەنسی ) و بەرزکردنەوەی پشکی ئەرمریکی لە بازرگانەکانی بۆ ٥٤١%، بەراورد بە ڕێژەی ٢٤% لە مەکسیک. لەگەڵ ئەوەی کۆمپانیای سیمیکس ناچاربوو کە خەرجیەکانی کەمبکاتەوە لەگەڵ هێوربوونی ئابوری جیهانی، بەڵام هێشتا وەک یاریزانەکی سەرەکی ماوەتەوە لە زۆربەی وولاتە گەشەسەندووەکان لە بوارێک لەڕابردوو قۆرخکرابوو لەلایەن کۆمپانیا دەوڵەمەندەکانی دەوڵەت. نموونەکان کۆمپانیا دایکەکانیش دەگرێتەوە بۆ گەورەترین یاریزانان لە پیشەسازی بیرەی ئەمریکی. کۆمپانیای ئەنهیسر-بوش بۆ پیشەسازی بیرە لە لایەن کۆمپانیای بەلجیکی ئنبیف کۆنترۆڵ کراوە ( و ئەم کۆمپانیا بەلجیکیە خودی خۆی دروست بوو کاتێک کۆمپانیای بەلجیکی ئنبیف هەوڵی فراوانبوونیدا بۆ دەرەوە)، وە بە ڕێژەیەکی زۆر ئیدارەیەکی بەلجیکی بەڕێوەی دەبات. لە هەمان کاتدا، ئەبینین کە کۆمپانیای ڕکابەر بۆ کۆمپانیای ئەنهیسر-بوش لە بواری پیشەسازی بیرە لەلایەن کۆمپانیای سابمیلر کۆنترۆڵ کراوە، ئەوەی لە کاتی کڕینی کۆمپانیای میلرلە ساڵی ٢٠٠٢ لەلایەن کۆمپانیای باشوری ئەفریقی بۆ پیشەسازی بیرە دروست بوو، لە میانەی پرۆسە سەرکەوتووەکانی بۆ دەست بەسەرداگرتنی بازارەکان، وەک کۆماری چیک و ڕۆمانیا و سلڤادۆر و هندۆراس و زامبیا. هەروەها کۆمپانیای کانزای بەڕازیلی ڤالی ( کە پێشتر بە ناوی کۆمپانیای ڤالی دی ریو دوسی ناسرابوو) بوو بە دووەم گەورەترین کۆمپانیاکانی کانزا لە جیهان لە ساڵی ٢٠٠٧ پاش ئەوەی

دەستی گرت بەسەر کۆمپانیای ئینکۆی کەنەدی کە ڕکابەری بوو. وە کۆمپانیای ئەرسیلور-میتال، گەورەترین کۆمپانیای کانزا لە جیهان، لە ئەنجامی ئەو کردارانەی دەست بەسەرداگرتن دروستبوو کە ملیاردێری هیندی لاکشمی میتال پێی هەڵسا. وە کۆمپانیای میتال نەچووە لیستی فۆرتشن گلۆباڵ ٥٠٠ تەنها دوای ساڵی ٢٠٠٥ نەبێت.

ناوە زەبەلاحە تێکەڵەکانی وەک ئەرسیلور-میتاڵ یان ئەنهیسر-بوش-ئنبیف ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە ئەم چیرۆکانە پەیوەندیان بە پرۆسەکانی یەکگرتن و دەست بەسەرداگرتن هەیە، بە ڕادەی ئەوەی پەیوەندی بە دینامیکی یاریزانە نوێیە هاتووەکان هەیە لە شوێنە چاوەڕواننەکراوەکان. لەگەڵ ئەوەی کە ئەم یەکگرتنانە چڕیەکی پیشەسازی و قۆرخکاریەکی کەم دەردەدەن کە خاوەن هێزێکی بازاری گەورەیە، بەڵام پێویستە ئەوەمان لە بیر بێت کە زۆرجار ئەو کۆمپانیایانە لەخۆ دەگیرێت پێش دەیەیەک لە کات تەنها بەشێکی زۆر بچووک بوون لە قەبارەی ئەو کۆمپانیایانەی کە دەستیان بەسەردا دەگرێت. هەمان شتیش دەتوانرێت بەسەریدا ڕوویدات؛ چونکە کۆمپانیایێک کە سەنتەرەکەی لە شوێنێکی دووری چاوەڕواننەکراوە و کەس تێبینی ناکات هەڵدەستێت بە دەست بەسەرداگرتنی ئەم کۆمپانیا زەبەلاحە نوێیانە. ئەمە ئەو پێشکەوتانەی دەیەی ڕابردوو بوو، وهێزی پاڵنەر بۆ ئەم ئاراستەیە هیچی زیاد نەکردووە جگە لە هێز نەبێت.

کۆمپانیا بچووکەکان ئەوانەی لە بازاڕە ئاساییە پارێزراوەکان کاریان دەکرد نەیاندەتوانی دەست بەسەر کۆمپانیا گەورەکاندا بگرن لە پیشەسازیە سەرەکیە جیهانیەکان ئەگەر ئەو داڕووخانە توندەی بەربەستەکانی چوونەژوورەوە نەبووایە کە بووە هۆی خێرا کرانەوەی بازاڕە داراییەکان، و بڵاوبوونەوەی خوێندن و کلتور لە بواری بازرگانی، و ئازادی بۆ گەیشت بە سەرمایە، و شەفافیەت لە داتاکانی کۆمپانیاکان و ئاسانی دەست گەیشتن پێیان، و لابردنی کۆتەکان، و کرانەوەی

بازرگانی و وەبەرهێنان، و گەشەسەندن، و ئاسانی جولانەوە، و جیهانگیری و تەکنەلۆجیا نوێیەکان و هۆکارە کاریگەرەکانی تر کە لێرە گفتوگۆی لەبارەیەوە کرا. کاراکتەری نێودەوڵەتی کۆمپانیاکان لە وڵاتە هەژارەکان وەک شایەتێکی بەهێز وەستاوە لەسەر کاریگەری شۆڕشەکانی زۆربوون و جوولانەوە و عەقڵییەتەکان.

### پەرتەوازەبوونی بۆرسەکان

لە نێو قوربانییەکانی پێشبرکێیە زیادەڕۆیەکان لە دیمەنی بازرگانی جیهانیدا خودی بازاڕەکانن، واتە بۆرسەکان، کە سەرمایەکان بازرگانیان تێدا دەکرێت و لەلایەن میدیا و سیاسەتمەداران و خەڵک چاودێریان دەکەن بۆ گەڕان بەدوای ئەو نیشاندەرانەی کە ڕاستی هەموو دۆخی ئابووری دەردەخەن. بازاڕە گرنگەکانی، وەک بۆرسەی نیویۆرک و بۆرسەی لەندەن، بە خێرایی پاشەکشەیان کرد بەرامبەر بازاڕە جێگرەوەکان. لە بازاڕی ئەمریکا، بۆرسەی نیویۆرک (لە ساڵی ١٧٩٢ دامەزراوە) و ناسداک (لە ساڵی ١٩٧١ دامەزراوە) بە زەحمەت نیوەی قەبارەی ئاڵوگۆڕەکان لە بۆرسە گشتییەکان کۆنترۆڵ دەکەن. لە ساڵی ٢٠١٢، هەردوو بۆرسەی دایرکت ئێدج (لە ساڵی ١٩٩٨ دامەزراوە) و بورسەی باتس ( لەساڵی ٢٠٠٥ دامەزراوە)، کە دوو بۆرسەی ئەلیکترۆنین، ٩٪ و ١٠٪ ی ئاڵوگۆڕیان کۆنترۆڵ کرد یەک لە دوای یەک، لە کاتێکدا دەیان بۆرسەی دیکە باقی ئاڵوگۆڕەکانیا هاوبەشیان کرد. زۆر بوونی بۆرسەکان و ئاڵوگۆڕە بەردەوامەکان لە ڕێگای بەرنامە کۆمپیتەریە ئۆتۆماتیکیەکان بەشداربووە لە ئاڵۆزیەکانی بازاڕەکان، کە بۆتە هۆی حالەتە دابەزینە توندەکان و چاکبوونە ساتیەکان لە نرخی پشکەکانی هەندێک لە کۆمپانیاکان.

بۆرسەی نیویۆرک تەنها بۆرسەی سەرەکی نیە بۆ پاشەکشە لە دژی

ڕکابەرە نوێکان؛ هەمان شت بۆ بۆرسەی لەندەن، بۆرسەی ئاڵمانیا و بۆرسە پێشکەوتوەکانی تر جێبەجێ دەکرێت. قەبارەی ئاڵوگۆڕی لە بۆرسەی باتسی تازە دامەزراو، کە شوێنەکەی لە کانساسە

(ناوی بریتییە لە ووشەکانی سەرەتای دەستەواژەی: باشترین سیستەمی ئاڵتەرناتیڤی بازرگانی)، گەورەترە لە هەر بۆرسەیەکی تری هاوشێوەی، جگە لە بۆرسەکانی نیویۆرک و ناسداک، بەمەش لە بۆرسەکانی تۆکیۆ، لەندەن، شەنگهای، پاریس و باقی بۆرسەکانی تر سەرکەوتووترە. یەکێک لە نیشاندەرەکانی ئەو ئاستەنگیانەی کە ڕووبەڕووی ئاڵوگۆڕە پێشکەوتوەکان بۆتەوە، لەدەستدانی بەهای پشکەکانیانە. بەهای پشکەکان لە بۆرسەی نیویۆرک یۆرۆنکست لە ١٠٨ دۆلارەوە دابەزی لە ساڵی ٢٠٠٦ بۆ نزیکەی ٢٢ دۆلار لە ٢٠١٢. هەروەها داهاتەکانیش کەم بۆوە، لە ساڵی ٢٠٠٩دا، داهاتی کردارە ئاڵوگۆڕیەکان کە کۆمەڵەی بۆرسەی لەندەن بەدەستی دەهێنا بۆ زیاتر لە سێیەکی دابەزی.

بۆرسە ڕکابەرەکان تەنها یەک لایەنی بازاڕە داراییە نوێیە پەرشوبڵاوەکان نیشان دەدات. وە لایەنەکەی تر دەرکەوتنی بۆرسەی تایبەتییە کە بەشێوەیەکی نافەرمی دەستی پێکردووە لە نێوان ئەو دەزگایانەی کە بەدوای بازرگانیدا دەگەڕێن بەبێ ئاشکراکردنی خۆیان (بەبێ ڕاگەیاندنی فەرمانەکان، نرخ یان قەبارەی بازرگانی بۆ ڕای گشتی) بۆ خۆلادان لە خستنەڕووی ستراتژییەکانیان، کە پێچەوانەی ئەو بنەمایەیە کە بازارەکان دەبێت شەفاف بن بۆ ئەوەی ئەنجامە کاریگەرەکان بەدەست بهێنن، هەروەها تۆمەتبار دەکرێن بە بوون بە هۆکارێکی سەرەکی لە نوسان و شێواندنی نرخەکانی سەرمایە، ئەمە جگە لەو تایبەتمەندیە نایەکسانانەی کە هەموو بەشداربووانی چێژی لێ وەردەگرن. ڕێکخەرەکان لەسەرتاسەری جیهاندا باس لەچۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئاڵوگۆڕە تایبەتەکان

دەکەن، و بۆچوونەکان دابەشکراون سەبارەت بەوەی کە چەندە مەترسیدارن بۆ سیستەمی دارایی جیهانی. ئەوەی ڕوونە ئەوەیە کە ئەوان ڕوو لە زیادبوونن. کۆمسیۆنی دراو و بۆرسەکان مەزەندەی کرد کە ژمارەی ئاڵوگۆڕە تایبەتەکانی چالاک لە بازاڕی ئەمریکا لە ١٠ لە ساڵی ٢٠٠٢ بەرزبۆتەوە بۆ زیاتر لە ٣٠ لە ساڵی ٢٠١٢. لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ڕابردوو ئاژانسی هەواڵی بلومبێرگ بڵاویکردەوە کە پشکی ئاڵوگۆڕە تایبەتەکان لە ئاڵوگۆڕەکانی پشکەکانی ئەمریکا گەیشتە نزیکەی ١٤٪. وە خەمڵاندنێکی پێشتری کۆمسیۆنی دراوە داراییەکان و بۆرسەکان دەڵێت ئاڵوگۆڕە تایبەتەکان زیاتر لە ٥٧% تێکڕای ئاڵوگۆڕەکان لە بۆرسەکانی ئەمریکا بەڕێوە دەبات، ئەمەش بەشێکە لەوانەیە بە شێوەیەکی ڕێژەیی بچووک بێت بەڵام بەسە بۆ ڕوودانی کاریگەرییە دوورەکان.

## سەرکەوتنی سندوقەکانی پشکە تایبەتەکان و سندوقەکانی دەرماڵە

زۆرێک پێیان وابوو کە قەیرانی دارایی و شکستەکانی بازاڕی جیهانی لە ساڵی ٢٠٠٨ و ٢٠٠٩ کۆتاییان هێنا بە زاڵبوونی سندوقەکانی پشکە تایبەتەکان و سندوقەکانی دەرماڵە لە بازاڕەکاندا. ئەم سندوقە نەناسراوانە، کە زۆرجار قەبارەیان کەمە، لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا سەرکەوتوو بوون لە کۆنترۆڵکردنی کۆمپانیا گەورەکان، بە کڕینی زۆرینەی پشکەکان، ق بازرگانی توند و چالاکی خاوەن پشکەکان. دوای چاکبوونەوە لە تەقینەوەی بڵقی ئینتەرنێت لە سەرەتای دەیە، کۆمپانیاکانی پشکە تایبەتەکان دەستیان کرد بە پرۆسەی دەست بەسەرداگتنە یەک لەدوای یەکەکان بۆ ماوەی دە ساڵ، وسەرکەوتوو بوو لە کڕینی کولبێرگ کرافیس ڕۆبێرتس بۆ کۆمپانیای وزە تی ئێکس یو بە بڕی ٤٥ ملیار دۆلار لە

ساڵی ٢٠٠٧ و گروپی تەکساس پاسیفیک.

لە هەمان کاتدا، ژمارەی سندوقاکانی دەرماڵە لە ٣٠٠٠ بۆ ١٠٠٠٠ زیادی کردووە لە ماوەی ١٩٩٨-٢٠٠٨دا، وە تا ساڵی ٢٠١١، ١٠٠ گەورەترین سندوقەکان لە سەرەوەی ٢.١ تریلیۆن دۆلار لە سەرمایەکان بەڕێوەدەبەن. لە ساڵی ٢٠١٢، سندوقەکانی دەرماڵە بەشداری لە نیوەی بازرگانی بۆندەکانی ئەمریکادا کرد، ٤٠٪ ی بازرگانی پشکەکان و ٨٠٪ ی بازرگانی قەرزی جێبەجێ نەکراو. لە ساڵی ٢٠١١دا، لووتکەی ٢٠ لە گەورەترین سندوقەکانی دەرماڵە لە بازاڕەکانی بلومبێرگ لەلایەن کۆمپانیای بریج جوتەرەوە داگیرکرابوو، کە ٦.٧٧ ملیار دۆلار سەرمایە بەڕێوەدەبات، کە خاوەنی سەرمایەیێکە نرخەکەی ناگات بە ٦٠٠ ملیار دۆلار بە نزیکەیی. لە ساڵی ٢٠١١دا، لووتکەی ٢٠ لە گەورەترین سندوقەکانی دەرماڵە لە بازاڕەکانی بلومبێرگ لەلایەن کۆمپانیای بریج جوتەرەوە داگیرکرابوو، کە ٦.٧٧ ملیار دۆلار سەرمایە بەڕێوەدەبات، کە خاوەنی سەرمایەیێکە نرخەکەی دەگاتە ٦٠٠ ملیار دۆلار بە نزیکەیی.

لەگەڵ هەڵسانی سندوقەکانی دەرماڵە بە کڕینی بەشە موڵکداریەکان لە کۆمپانیای زیاتر، هێڵەکان دەستیان کرد بە تاریکبوون، چونکە ئەم سندوقانە وەک کۆمپانیای پشکە تایبەتەکان هەڵسوکەوتیان دەکرد، هاوکات هەڵدەستا بە لادانی بانکە تەقلیدیەکانیش. تا ساڵی ٢٠٠٧، پشکی بانکە تەقلیدیەکان لە بازرگانی قەرزدا دابەزی بۆ کەمتر لە ٥٠٪ بۆ یەکەم جار پاش ئەوەی ئەگەیشتە ٩٠٪ لە ساڵی ٢٠٠٠. لە وەڵامی ئەمەش، بانکەکان دەستیان کرد بە کڕینی پشکەکان لە خودی سندوقەکای دەرماڵە، ئەو شتەی کە بووە هۆی خێرا تاریکبووی ڕووکاری ڕۆڵەکان.

وە سندوقەکانی دەرماڵە بوون بە کاریگەرێکی سەرەکی لە ڕووی چالاکی بازاڕ و فشار لەسەر ئەنجومەنەکانی بازاڕکردن و بەڕێوەبردن. لە ویلایەتە

یەکگرتوەکانی ئەمەریکا کاتێک ئەم سندوقانە خاوەنی ٥٪ ی سەرمایەکانی ژێر ئیدارەیان بوون، هەروەها لە ٣٠٪ ی چالاکیە بازرگانیەکانیش بەشدار بوون. وە فشارێکی زۆر گەورەی خستۆتە سەر کۆمپانیاکان بەبێ گوێدانە براندەکان و مێژوو، وەک ئەوەی ڕوویدا کاتێک سندوقێکی دەرماڵە بەناوی سندوقی وەبەرهێنانی منداڵان هەڵسا بە پیادەکردنی فشارێکی بەهێز لە پێناو فرۆشتنی یان شکاندنی بانکی ئەی بی ئێن، ئەم فشارە کۆتایی هات بە فرۆشتنی بانکی بارکلایس لە بەریتانیا. بڕێکی زۆر پارە دەهاتن و دەچوون لە شێوەی گرەوی گەورە، هاوشێوەی بەناوبانگترین گرەوەکان، کاتێک جۆرج سۆرۆس گرەوی لەسەر جونەی ئیستەرلینی کرد بە ١٠ ملیار دۆلار لە ساڵی ١٩٩٢ و ١ ملیار دۆلاری لەو گرەوە بردەوە. لە ساڵی ٢٠٠٦دا، بازرگانێکی تەمەن ٣٠ ساڵ هەبوو کە کاری دەکرد بۆ سندوقێک بەناوی ئەمارانث ٦ ملیار دۆلاری لەدەست دا لە گرەوکردن لەسەر گازی سروشتی. براوەکانی ئەم بوارە کرێی گەورەیان وەرگرت، لە ساڵی ٢٠٠٦، بەڕێوەبەرەکانی ٢٥ سندوقە دەرماڵە یەکەمەکان بەیەکەوە بەقەدەر تێکڕای داهاتی ناوەخۆی ئوردنیان دەست کەوت. لەگەڵ ئەوەش، لەوانەیە ئەم خەڵکانە تەنانەت بۆ دراوسێکانیشیان ناسراو نەبن لە قەراغە جوانەکانی گرینویچ و وێستپۆل لە کۆنیتیکت، ئەو شوێنەی کە بەناوبانگە لە نیشتەجێ بوونی بەڕێوەبەرەکانی سندوقەکانی دەرماڵە.

لە ساڵی ٢٠٠٨دا، سندوقەکانی دەرمالە بە ڕێژەی ١٨٪ ی بەهایان لە دەست دا. بەڵام جیاکارییەکی زۆر هەبوو، لەوانە جۆرج سۆرۆس، لەگەڵ سندوقێکی دەرماڵە کە لەلایەن جۆن پاوڵسۆنەوە بەڕێوەدەبرا، کە بلیۆنان دۆلاری لە گرەوەکانی ئامرازە داراییە تایبەتەکان بۆ خانووبەرە پەرتەوازەکان بەدەست هێنا، وە گروپێک لە کەسایەتیە نادیارەکانی تر کە سەدان ملیۆن دۆلاریان لە میانەی کەوتنە خوارەوەی بازارەکان بەدەست هێنا. لەوانەیە سەیر نەبێت کە چاکبوونەوەی بازاڕەکە لە ماوەی

۲۰۰۹ بەسوود بوو بۆ سندوقی دەرماڵەکان، هەرچەندە چاودێران تێبینی ئەوەیان کرد کە لەرزینێک لە کەرتەکەدا ڕوو دەدات. لە ڕاستیدا یەکێک لە مشتومڕەکان کە داکۆکی لەم کەرتە کەم ڕێکوپێکە دەکات ئەوەیە کە براوە و دۆڕاوەکان بە یەکلاکەرەوە و کاریگەرانە بەرهەم دەهێنێت تا ئەو ڕادەیەی کە وەک میکانیزمێکی ڕاستکەرەوە کاردەکات کە یارمەتی جێگیرکردنی بازاڕەکان دەدات، و بە وتەی سباستیان مالابی نووسەری کتێبی " پارەیەکی زیاتر لە پەرستراوەکان " ( پڕفرۆشترین لە نێو کتێبە نووسراوەکان لەسەر سندوقەکانی دەرماڵە)، ئەم سندوقانە " نابنە هۆی مەترسیەکی زۆر بەقەدەر ئەوەی هەڵیدەمژێت".

بەڵام سندوقەکانی دەرماڵەش کەوتوونەتە ژێر شمشێری کۆنترۆڵەوە و ئێستا ڕووبەڕووی کۆت و بەندی زیاتر دەبنەوە. لە ساڵی ۲۰۱۱، جۆرج سۆرۆس بە پێی ڕاپۆرتەکان بڕیاری دا سندوقەکنی دابخات بەرمابەر وەبەرهێنەکان و دواتر بە تەواوی تیشک دەخاتە سەر بەڕێوەبردنی سامانە تایبەتەکەی خۆی، ئەمەش بەهۆی ڕێنمایی و ڕێسایە داراییە نوێیەکان. هەروەها بازاڕە ناجێگیریەکانیش دەتوانن زیانی قورس بەسەر ئەم بوارەی وەبەرهێنانە مەترسیدارە بگەیەنن. سندوقی جۆن پاوڵسۆن تووشی شکستێکی گەورە بوو کاتێک گرەوەکانی لە بازاڕ شکستی هێنا. (لە ساڵی ۲۰۱۱دا ٦.۹ بلیۆن دۆلاری لەدەست دا، گەورەترین لەدەستدانی هەر سندوقێکی پارە). بەڵام لە هەمان کاتیشدا، سندوقەکانی تری دەرماڵەی خاوەن ناو، شێواز، شوێن و تەکنەلۆجیای سەرسوڕهێنەر، بە قەدەر ئەوەی نوێخوازبوو، شوێنی خۆیشی کردەوە بە سیفەتی گەورەترین میکانیزمی قازانج بەخش لە جیهاندا. بۆ نمونە، سندوقی دەرماڵەی جووتر ۸.۱۳ بلیۆن دۆلاری بۆ وەبەرهێنەرەکانی بەدەست هێنا لەو ساڵەدا.

ئەو وانەیە کە دیارە ڕوونە ئەوەیە لەوانەیە سندوقەکانی دەرماڵە بێن و بڕۆن، و

لەوانەشە پاداشتی بەڕێوەبەرەکانیان لە پاداشتێکی زۆرەوە بگۆڕێت بۆ پاداشتێکی زەبەلاح و بەپێچەوانەشەوە، بەڵام هیچ گومانێک نیە لە بڵاوبوونەوەی ئەم کۆگا بچووکە نادیارانە بە توانای زۆرەوە بۆ کاریگەریکردن لەسەر بازاڕەکان و نرخەکان . لەم جیهانە داراییە نوێیەدا، کەسانی زۆر زیرەک کە بە تەکنەلۆجیای سۆفتوێرەوە چەکدارن، زۆربەی کات بەسەر بانکە گەورەکاندا زاڵ دەبن کە دەستیان بەستراوە بە یاسا کەڵەکەبووەکان، و ڕاهێنانە ناوەخۆییە ئاڵۆزەکان و پێکهاتەی ڕێکخەری هێواش.

سندوقەکانی دەرماڵە نوێنەرایەتی دەسەڵاتی نەریتی بازاڕە داراییەکان دەکەن وەک چەتە سۆماڵیەکان نوێنەرایەتی هێزی پێشکەوتووترین سوپای دەریایی جیهان دەکەن.

بە کورتی، یاریزانە نوێیەکان، وەک سندوقەکانی دەرماڵە، بۆرسە نوێیەکان، ئاڵوگۆڕی تایبەت و کۆمپانیا دەستپێکە نەناسراوەکان لە پێشتر، کە لەناکاو تەواوی کەرتی دارایی سەروژێر کرد، نیشاندەری فشارێکن لەسەر پێشکەوتنەکانی داهاتوو: هەڵگەڕانەوەی زیاتر، پارچەبوون، ڕکابەری زیاتر، و هێزی بچووکتری زیاتر کە توانای کەمکردنەوەی دەرفەتەکانی زلهێزەکانی هەیە.

لە ڕاستیدا بۆڵەبۆڵی گشتی سەبارەت بەو ئاڵۆزیانەی کە بەهۆی جیهانگیری ئابووری یان ئەو شۆکە گەورەیەی کە بەهۆی قەیرانی دارایی ساڵی ٢٠٠٨ەوە دروست بووە و ئەو پاشەکشەی گەورەیەیە لە دەرەنجامی ئەوە هاتەکایەوە نەبوونە ئاستەنگ بۆ پرۆسەی تێکەڵبوونی ئابووری نێودەوڵەتی. ئەوان تا ڕادەیەکی زۆر بەردەوام دەبن بەبێ پچڕان، وە سەلمێندرا کە پێشبینیەکانی زیاد بوونی ڕێکارەکانی تاوان هەڵەبوون کە ئەوروژێندران لە هەوڵی دەوڵەتان بۆ داخستنی

ئابوورییەکانیان لە پێناو پاراستنی کارەکان. لێشاوی بازرگانی نێودەوڵەتی، وەبەرهێنان بەردەوام بووە لە گەشە کردن و خۆراکدانی فاکتەرەکان کە هێزی دەزگا تەقلیدیەکان سنوردار دەکات.

**ئەمە هەموو مانای چیە؟**

یەکێک لە پارادۆکسەکانی سەردەمی ئێمە ئەوەیە کە کۆمپانیاکان گەورەتر و بەربڵاوتر و کاریگەرتر بوونە لە بواری سیاسیەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا لاوازترن بۆ ئەو مەترسیانەی کە دەتوانن زیان بە فرۆشتن و قازانج و ناوبانگیان بگەیەنێت، و لە هەندێک حاڵەتدا ببێتە هۆی داخستنیان. لیستی ئەو کۆمپانیایانەی کە لە پێشبڕکێکارەکان یان حکومەتەکان سەلامەت دیار بوون، وە مانەوەیان لە شتە ئاساییەکان بوو، بەڵام چیدی بوونی نەما، لیستێکی درێژە و بەردەوامە لە زیادبوون. هەمان شت بۆ کۆمپانیای کەرتی بانکی و کەرتە پیشەسازیە زەبەلاحەکان کە سەلمێندرا لەناوچوونی هێز و پارێزبەندییان خێراترە لە هەر کەسێک پێشبینی دەبکات، تەنانەت خۆشیان.

تەنانەت کۆمپانیا گەورەکانیش کە بەردەوام بوون لە گەشانەوە و پێناچێت لەلایەن هێزەکانی بازاڕەوە بەرەو مایەپووچی پاڵ پێوەبنرێن، بە ڕادیەکی زۆر دووچاری کۆمەڵێک بژاردەی سنووردار بوونەتەوە. بۆ نمونە، ئێکسۆن مۆبیل، سۆنی، کارێفۆر و جەی پیمۆرگان چەیس هێشتا دەسەڵاتی زۆر گەورەیان هەیە و پلەیەکی بەرزی سەربەخۆییان هەیە، بەڵام سەرکردەکانیان ئەمرۆ لەچاو سەردەمی پێشوو لە ژێر کۆت و بەندی زیاتردان. ناتوانن هێزی زەبەلاحی خۆیان بەهەمان ئازادی باوباپیرانیان بەکاربێنن و دەرئەنجامەکانی خراپ بەکارهێنانی ئەو هێزە لەڕابردوو خێراتر و توندترە.

## کۆتایی سەردەمی هێز

وەک لەم بەشەدا بینیمان، هێزی کۆمپانیاکان چیتر ئەو شتە نییە کە پێشتر بوو.

## بەشی نۆیەم

## ڕکابەری زیادەڕۆ لە پێناو ڕۆح و دڵ و مێشکت

بێگومان ئێمە بە دوای بەڵگەی گۆڕانی هێزدا دەگەڕێین لەو بوارانەی کە کاریگەری گۆڕانەکان زیاتر بەدەردەکەون و دڵڕەقانەن: لە ژیان و مردن، و جەنگ و ئاشتی، و کۆنترۆڵی حکومەتەکان، و سەرهەڵدان و ڕووخانی کۆمپانیاکان. لەهەریەک لەو بوارانە، تێبینی ئەوەمان کردووە کە لاوازبوونی هێزی یاریزانە گەورەکان دەستیکردووە بەکردنەوەی ڕێڕەوی نوێ بۆ ئەو یاریزانە گەنجانەی کە تا ئێستا هەر پەراوێزن، و ڕەنگە هەندێکیش توانا بەدەستبهێنن کە بتوانن هەڵبژاردنی ئەو کەسانە سنوردار بکەن کە لەڕابردوودا بەهێز بوون.

بەڵام ئەو هێزە لە کەنیسەکان یان گرووپە ئاینییەکانیش دەدۆزرێتەوە کە عشور (باجی کڵێسا) کۆدەکەنەوە و هەڵبژاردنی ژیان بۆ شوێنکەوتوانیان ڕێک دەخەن، لە سەندیکاکانی کرێکاراندا کە قازانجی کرێکاران کۆدەکەنەوە و لە جیاتی ئەوان دانوستان دەکەن بۆ باشترکردنی کرێ و مەرجەکانی کارکردن؛ و دامەزراوە خێرخوازیەکان کە پارەی تایبەت دابین دەکەن بۆ خەرجکردنی لە کارە کۆمەڵایەتیکان لە ناوەخۆ و بەرەنگاربوونەوەی هەژاری لە دەرەوە. هەروەها لە زانکۆکانیش هێز هەیە ئەوانەی کە تاقیگەکانی لێکۆڵینەوەیان گرنگترین ئەنجام و داهێنانی زانستی بەرهەم دەهێنن، یان دەرچووەکانیان بەرزترین پلە بەرێوەدەبەن؛ و هەروەها لە مۆزەخانە و گەلەری هونەری و ناوی تۆماری مۆسیقا و ئۆرکێسترای سیمفۆنی و چاپخانەی کتێب و خانووی بەرهەمهێنانی فیلمەکاندا. بێگومان هێز هەیە لە میدیاکان و ئەو کەناڵانەی کە ئێمە بەکاری دەهێنین بۆ بەدەستهێنانی زانیاری، کە ئێمە باوەڕمان پێیەتی ڕاستگۆ و بەسوودە، یان بۆ قایلکردنی ئەوانی تر بە تێڕوانینی خۆمان.

مەترسیەکان جیاوازن؛ خۆشبەختانە، زۆربەیان کەم دەبن لە ژیان و مردن. هارڤارد دژی یێل هاوشێوەی مانچستەر یونایتدە بەرامبەر بە چێڵسی زیاتر لەوەی هاوشێوەی سوپای ئەمەریکا دژی سوپای چین یان ئەلقاعیدە بێت. چارەنووسی بی بی سی یان ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز و ئێلبایس یان ڕۆژنامە باوەڕپێکراوەکانی تر کاریگەری لەسەر ژمارەیەک لە کرێکاران و بژێوی ژیان زۆر کەمترە لە، بۆ نموونە، لەدەستدانی کۆمپانیای مۆنسانتۆ یان والْمارت، تەنانەت ئەگەر کاریگەریان لەسەر گفتوگۆ و سیاسەت زۆر گرینگ بێت بۆ دەزگا ڕایگەیاندنەکان و یارمەتیدەر بێت لە پارێزگاریکردن لەسەر سەلامەتی سیستەمە دیموکراسیەکان. لەلایەکی ترەوە، دابەشکردنی دەسەڵات لە بوارەکانی کارە خێرخوایەکانی نێوان دامودەزگاکان و بەخشەرەکان کاریگەریەکی بەهێز و ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ملیارەها کەس لە جیهاندا، و چونکە ئەم پارە بەخشینە ( و چۆنیەتی دابەشکردنی ) پرۆژانەکان و حالەتەکانی زۆر گرینگەکانی فریاکەوتن دیاری دەکات. گرنگی توانای کرێکاران لە ڕێکخستنی خۆیان بۆ باشترکردنی باری ئابووریان پێویستی بە ڕوونکردنەوە نیە. هەروەک هێزی ئایینی "ڕێکخراو" و کاریگەری لەسەر بوارەکانی تری ژیان و توندی کێبڕکێی لە نێوان ئاینزاکان، بە ئاشکرا دیارە.

کەواتە دیمەنی گۆڕانی گەورە لە شێوازی کارکردنی دەسەڵات پێویستە زیاتر درێژبێتەوە لە دنیای بازرگانی و سیاسی و جەنگ. هەرچۆنێک بێت، ئێمە هەڵدەستین بە خوێندنەوەی ئەوەی کە ماوەیەکی زۆرە بەسەر ڕێکخراوە زاڵەکاندا هاتووە، لە چوار بواردا کە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ڕێژەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان هەیە: ئایین و کار و خێرخوازی و دەزگاکانی ڕاگەیاندن (میدیاکان) هەیە.

### ئایین: نۆ ملیاریارەکان ناوێک بۆ خودا

یەکێک لە مەسیحیەکان ئەو لیشاوەی گۆڕانی بەوە وەسف کرد کە مەسیحیەت لە ئەمریکای لاتینی داگیردەکات، کە هەر لە دێر زەمانەوە پێگەیەکی کاثۆلیکی بووە، گووتی " ئەوان مەڕەکانمان دەدزن". مەبەستی کێ یە لە "ئەوان"؟ کەنیسە نوێیەکانی ئیڤانجلی و پەنجا و پرۆتستانتەکان کە لە ماوەی ٣٠ ساڵی ڕابردوودا لە سەرانسەری ناوچەکە بڵاوبوونەوە هەروەک لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئەفریقا و شوێنەکانی تریش بڵاوبونەوە - دەستیان کردووە بە داگیرکردنی کڵێسا کاسۆلیکەکان و بە خێرایی کورسیەکانیان چۆڵ دەکەن. توێژینەوەیەکی ساڵی ٢٠٠٥ دەریخست کە ڕێژەی ئەمریکییە لاتینیەکان کە خۆیان بە کاسۆلیک دەزانن لە نێوان ساڵانی ١٩٩٥ و ٢٠٠٥ لە ٨٠٪ بۆ ٧١% دابەزیوە. لەمەش خراپتر بۆ کەنیسەکان، تەنیا ٤٠٪ ووتیان کە ئایینی خۆیان پراکتیزە کردووە، ئەمەش دابەزینێکی تیژە لە کیشوەرێک کە کەنیسەی کاسۆلیک بۆ چەندین سەدە زاڵ بووە. بۆ نمونە، لە بەڕازیل ساڵانە نیو ملیۆن کاسۆلیک کەنیسە جێدەهێڵن. لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتوانی کاسۆلیکی ساڵی ٢٠٠ ٦.٧٣٪ ی دانیشتوانی بەڕازیل بوو، بەڵام تا ساڵی ٢٠١٠ دابەزیوە بۆ ٦.٦٤٪. وە تەنها دوو لە سێی کۆلۆمبیەکان ئەمڕۆ خۆیان بە کاسۆلیک وەسف دەکەن، سێیەکی دانیشتوانی گواتیمالا لە ساڵانی هەشتاکانەوە کەنیسەی کاسۆلیکیان چۆڵ کردووە و ئامارەکان بەردەوامن لەو بارەوە.

لە لاپاز، پایتەختی بۆلیڤیا، هەندێک کاسۆلیکی پێشوو بە پەیامنێرانیان گوت کە هەستیان کردووە کەنیسەکە "وازیانی لێ هێناوە"، یەکێک لەوان دەڵێت کە "کەنیسەکە بەڕاستی بۆ من بوونی نەبووە". ئێستاش ئەوان سەر بە کەنیسەی دەستووری نوێی هێزی یەزدانن، کە خزمەتێکی قەشەیی کاریزماییین، کە ١٠ هەزار کەس لە هەموو یەکشەمەیەکدا بە چەندین شیفت نوێژ دەکەن. ئەم دیمەنانە

بڵاو دەبنەوە لە سەرانسەری ئەمریکای لاتین. بەڵام مەڕەکان نەدزراون. مەڕەکان چیتر مەڕ نین: ئەوان بەکار دەهێندرێن و بەرهەمێکی سەرنجڕاکێشتریان لە بازاڕی ڕزگاریدا دۆزیوەتەوە.

بزووتنەوەی ئیڤانجیلی هاوچەرخ ڕەگی خۆی هەیە لە کڵێسایەکی ئەفریقی-ئەمریکی بە ناوی ئازوسا کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دامەزراوە، لەسەر بنەمای دەرهاوێشتەکانی پێنتێکستاڵ یان ٥٠ هەمینساڵیادی چیرۆکی ئینجیل. وە بزووتنەوەی پێنتاکۆست یان بزووتنەوەی پەنجایی کە سەری هەڵداوە کۆمەڵێکی فراوانی کۆمەڵگە و کڵێسای ناوخۆیی سەربەخۆ کۆدەکاتەوە کە هاوبەشن لە هەندێک چەمکی بنەڕەتی دەربارەی ڕزگاری تاک (لە ڕێگەی دووبارە لەدایک بوونی کەسێکەوە)، و توخمەکانی پەرستن، وەک قسەکردن بە زمانێکی خەیاڵی یان نەناسراو. بەڵام کڵێسا سەربەخۆیەکان کە ملیۆنان شوێنکەوتوویان وەرگرتووە بۆ ئەوەی ببن بە هێزێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەرازیل و نایجیریا و زۆر وڵاتی تر کە هەموویان پەنجاکان نین و جۆرەکانی تری گروپی ئیڤانجیلی "کاریزمی" لەخۆ دەگرن کە هەریەکەیان پێغەمبەرێک یان نێردراوێکی هەیە کە بانگەشەی ئەو تایبەتمەندیەی بۆ دەکات، و بەڵام بە خێرایی هەڵسا بە پێهێنانی کاهینەکان و سیستەمە هەرەمەکیەکانی تایبەت بە خۆیان. زۆرێکیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێی دەڵێن ئینجیلی خۆشگوزەرانی، کە دەڵێت یەزدان زەردەخەنە دەکات بۆ کەڵەکەبوونی سامان لەم ژیانەدا، و پاداشتی ئەو کەسانە دەداتەوە کە بەخشینی مادی بۆ کڵێسا دەکەن بە خۆشگوزەرانی و موعجیزە. لە ڕاپرسیەکی ئەم دواییەی دامەزراوەی پیو لە بارەی هەڵوێستە ئاینیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە ٥٠ کڵێسا هەیە لەسەر بنەمای ئینجیلی خۆشگوزەرانی لە نێوان گەورەترین ٢٦٠ کڵێسا، ٧٣%ی لەهەموو ئاینزا لاتینییەکان کۆک بوون لەسەر ئەوەی کە " خودا سەرکەوتنێکی

دارایی دەدات بە هەموو ئیمانداران ئەوانەی بڕێکی پێویستیان هەیە لە باوەڕ".

بەرزبونەوەی کەنیسەکانی پێنتاکۆستاڵ و کاریزماتیک - نەک تەنها لەو وڵاتانەی کە کاسۆلیک یان پرۆتستانتەکان زاڵن - سەرسامکەر بوو. هەرچەندە خەملاندنەکان جیاوازن، بەڵام بەشێکیان بەهۆی شلیی مەرجەکان و سنووری نێوان کۆمەڵگە ئاینییەکان، بەڵام کاریگەریەکە ڕوونە و چاو هەڵەی لێ ناکات. بەپێی ڕاپرسییەکی ساڵی ٢٠٠٦ی پیۆ، ڕێژەی کریستیانە "دووبارە دروستکەرەکان" -- پێنتێکستال و کاریزماتیکەکان -- بە ڕێژەی ١١٪ لە کۆریای باشوور و ٢٣٪ لە ئەمریکا و ٢٦٪ لە نایجیریا و ٣٠٪ لە شیلی و ٣٤٪ لە باشووری ئەفریقا و ٤٤٪ لە فلیپین و ٤٩٪ لە برازیل و ٥٦٪ لە کینیا و ٦٠٪ لە گواتمالا خەملێنراوە. تەنانەت لە هیندی "نا مەسیحی" دا مەسیحییە دووبارە دروستکەرەکان ٥٪ ی دانیشتوان پێکدێنن واتە زیاتر لە ٥٠ ملیۆن پێنتێکستەل و کاریزمیان لە هیندستان هەیە، و هەندێک لە خەملاندنەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە چین بەلایەنی کەمەوە دوو ئەوەندەی ئەو ژمارەیە هەیە. زۆربەی کڵێساکانی دووبارە دروستکراوەکان بە تەواوی کەنیسەی ناوخۆیین، زۆربەی کات تەنها شوێنێکن بۆ کۆکردنەوەی نوێژکەران لە جۆری ئاسایی لە گەڕەکە ڕەش پێستەکان و کۆچبەرەکان لە شارەکانی ئەمریکای باکوور. هەندێکیان ڕێکخراوی سەرەکیان بە سەدان لق و ئامادەبوونی نێودەوڵەتی دامەزراندووە.

هەرچەندە بزووتنەوەکەی پێنتیکۆستال سەرەتا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەری هەڵدا، بەڵام ئەرکە تەبشیریە مێژووییەکانی ئەمریکا، وەک کۆمەڵەکانی لۆرد، چیتر خێراترین بڵاوبوونەوە نییە لە جیهاندا. گەورەترین هەناردەکاری چالاکی ڕزگاری ئەمڕۆ بەرازیل و نایجیریان. لە بەڕازیل، کەنیسەی جیهانی شانشینی خودا فراوانتر بوو، کە لە ساڵی ١٩٧٧ لە ڕیۆ دی جانیرۆ لەلایەن پاستۆر ئایر ماکیدۆ دامەزراوە و ئەمڕۆ ٥٠٠٠ لقی هەیە. لە ساڵی

## کۆتایی سەردەمی هێز

١٩٨٦ بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا درێژبۆوە، و لە هەموو وولاتێکی نزیکەکاندا بوونی هەیە. تازەترین پلان کە ئەم کەنیسەیە دایناوە و لەلایەن حکومەتی بەرازیلەوە پەسەندکراوە، دروستکردنی کلێسایەکی زۆر گەورەیە لە ساپۆ پاولۆ بۆ ١٠ هەزار کەس، کە بەرزیەکەی یەکسانە بە بەرزی ١٨ نهۆم، و بە دیزاینێک لەسەر شێوازی پێکهاتەی سلێمان. پاستۆر ماسیدۆ گوتی " چەندەها تەن لە پارە لێی خەرج دەکەین، هیچ گوومان لەوەدا نیە".

کۆمەڵگەیەکی دیکەی گەورەی بەرازیلی هەیە بە ناوی "دووبارە لەدایکبوونەوە بە باوەڕ بە مەسیح"، کە لەلایەن گروپێکی دووقۆلی ژن و مێردێکەوە دامەزراوە، ئەم گروپە بە ئیستیڤام و بیشۆپ سۆنیا ناسراوە، کە خاوەنی ڕۆژنامە و وێستگەی ڕادیۆ و کەناڵێکی تەلەڤزیۆنی تایبەت بە خۆیەتی. لە ساڵی ٢٠٠٥، پارتێکی سیاسی نوێ بە ناو پارتی کۆماری بەرازیل، لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٦دا لەگەڵ پارتی کرێکارانی سەرۆک لولا دا سیلڤا هاوپەیمانی کرد. هەروەها کەنیسەیەکی تری بەرازیلی بە ناوی بۆلا دی نیڤا لە لایەن هۆگری مادده هۆشبەرەکانی پێشوو ڕینالدۆ بیریرا دامەزرا. لە ماوەی دە ساڵان، کەنیسەکەی زیاتر لە ١٠٠ لقی دامەزراند کە هەریەکیان هەزارەها ئەندامی هەبوو. ناوی کەنیسەکەش بە مانای " تۆپەڵی بەفر" دێت، ئەمەش ناوێکی گونجاوە لەم ڕۆژگارە بۆ چالاکیەکانی ئینجیلی جەماوەری.

لە نایجیریاش، کەنیسەی یەزدانی مەسیحییە دڵسۆزەکان، لە ساڵی ١٩٥٢ لە لاگۆس دامەزراوە، لە سەرەتای هەشتاکانەوە دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد، لە ١٠٠ وڵات چالاکە. نوێژە ساڵانەکانی، کە لە کامپێکی نوێ کراوە لەسەر ڕێگای گشتی ئاگوس- ئیبادان، نزیکەی یەک ملیۆن کەسی تێدا کۆدەبێتەوە . لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نزیکەی ٣٠٠ قەشەیی بە ١٥ هەزار ئەندامەوە هەیە و ئەو ژمارەیەش لە زیادبووندایە.

## کۆتایی سەردەمی هێز

لە دوای دەرکەوتنی ئەم سەرکردە نوێیانە لە بازاڕی ڕۆحیانیەتە سنوور بەزێنەکان، چەندین کەنیسەی دیکە دەستیان بە بڵاوبوونەوە کرد، ئەوانە بەرهەمە ئاسمانیەکانی شۆڕشەکانی زۆربوون و گواستنەوە و عەقڵیەتن. لە ڕاستیدا، مەسیحیەکانی جیهان، کە ژمارەیان نزیکەی ۲.۲ ملیار مەسیحیە، ئەوەندە پەرتەوازە و سەرگەردانن کە مەحاڵە هەر کیشوەرێک یان هەرێمێک " بانگەشەی ئەوە بکات کە ناوەندی مەسیحیەتی جیهانیە". بە پێی ڕاپۆرتێکی تازەی پیو، ڕێژەی مەسیحیەکان لە نێوان ئەفریقیە سەحرییە لاوەکیەکان، بۆ نمونە، لە ۹٪ لە ساڵی ۱۹۱۰ بۆ ٦۳٪ سەدەیەک دواتر بەرزبووەتەوە. سەبارەت بەشۆڕشی جولانەوە، لەساڵی ۲۰۱۰دا مەسیحییەکان نزیکەی نیوەی ۲۱٤ ملیۆن پەنابەری جیهانیان پێکهێناوە، دەرفەتێکی نوێیان بۆ مەسیحیەت کردەوە بۆ ئەوەی لەدەوروبەری پێگەی هەر دەسەڵاتێکی ناوەندی ئاینی بڵاوبێتەوە.

وەک گوتم کاتێک ئاماژەم بە بەرزبوونەوەی هێزە لاوەکیەکان کرد لە بەشەکانی پێشوودا، بیرۆکەی بنەڕەتی ئەوە نییە کە ئەم پێشبڕکێکارە نوێیانە یاریزانە گەورەکان ئاوارە بکەن، بیرۆکەکە ئەوەیە کە ئەوان یاریزانە گەورەکانی لەو بژاردانە بێبەش دەکەن کە پێشتر لە شتە ئاساییەکان بوو لە لایان. بۆ نمونە کەنیسە نوێیەکانی کاریزماتیک، کەنیسەی ڤاتیکان یان کەنیسەی ئەنجلیکەکان ئاوارە ناکەن، بەڵکو دەرفەتەکانیان تەسک دەکەنەوە و هێزیان سنوردار دەکەن.

بە دڵنیاییەوە سەرکەوتنی ڕەوتە تازەکان لە سەر حسابی گروپە سەرەکیە پرۆتستانتییەکان دێت، وەک ئەنجلیکان و لوثیریەکان، و لەوەش گرنگتر لەسەر حسابی کڵێسای کاسۆلیک. تەنانەت چەند دەیەیەک لەمەوپێش، کێشە سەرەکیەکانی ڤاتیکان بریتی بوون لە عەلمانی بوونی وردە وردەی ئەورووپا و تەمەنی قەشەکان. ئەمانە حاڵەتی مەترسیدار بوون، و کڵێسا هەوڵیدا لە وەڵامی ئەمەدا خۆی نوێ بکاتەوە، بەتایبەتی لە ڕێگەی بڕیارەکانی ئەنجومەنی دووەمی

ڤاتیکان، بۆ نموونە، لە ڕێگای داواکردن بۆ جێبەجێکردنی قوداسەکان بە زمانە لۆکاڵییەکان نەک لاتینی. بەڵام هیچ شتێک نەبوو بۆ ئەوەی ڤاتیکان ئامادە بکات بۆ ئەو بەرەنگارییە پێشبڕکێیەی کە لەلایەن کەنیسەکانی پێنتێکۆستاڵ و پەنجاکان کراوە، نەک هەر لەو ناوچە دوورانەی کە پێیگەیشتوون، بەڵکو لە شوێنەکانی وەک ئەمریکای لاتین کە لە مێژە باخچەی دواوەی کاسۆلیکی بوون. لە ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەم، کەنیسە ڕووبەڕووی دژایەتی ناوەخۆ بۆوە لەگەڵ سەرهەڵدانی تیۆلۆژیای ڕزگاریخواز لە بەرازیل و وڵاتانی تری کیشوەرەکە. هەڕەشەی تیۆلۆژیای ڕزگاری کەم بۆوە، بەتایبەتی لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دیموکراسی لە ناوچەکەدا. بەڵام ئەو پێشکەوتنانەی کە کۆمەڵگا نوێیەکان و هێزی پراکتیکی ئایینی نوێ دروستیان کردووە (خەڵکی زیاتر ئەچن بۆ قوداسەکان و خزمەتگوزاریە ئایینیە دووروودرێژەکان و چەندین لایەنی ژیانیان لەگەڵ مەرجەکانی کەنیسە و پێداویستیەکانی ئەگونجێنن) دەستیان کردووە بە لاوازکردنی دەسەڵاتی کاسۆلیکی کە پێشتر هەژموونی زاڵ و ستەمکاری هەبوو. ئێلیۆ ماسفیر، سەرۆکی کۆمەڵەی توێژینەوە ئایینیەکان لە ئەمریکای لاتین، گوتی: "ئەگەر کلێسا گۆڕانکاری لە پێکهاتە ناوەندی و گوتارە دەسەڵاتخوازەکانی خۆیدا نەکات، ئەوا بە نزیکەیی لە ماوەی ١٥ ساڵ تووشی هەرەسێکی ڕاستەقینە دەبێت لە ئەمریکای لاتیندا".

توێژەرەکان و شیکەرەوەکان هێواش بوون بۆ تێگەیشتن لەم ڕەوتە، ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە وایانزانیەوە شتێکی ئاسانە نەریتی قوداسی پێنتاکۆستاڵ پشتگوێ بخرێت و بە شتێکی نائاسایی و نامۆیەیان داناوە. بەڵام ئەمڕۆ ناتوانرێت لێی ڕابکەیت، چونکە گرووپە ئیڤانجیلیە تەبشیریەکان لە ژیانی سیاسیدا بە دەسەڵاتتر و کاریگەرتر بوونە ( بە پێشکەشکردنی کاندیدەکان بۆ پۆستەکان لە وڵاتانی وەک بەرازیل) و لە میدیاکاندا بە دەست پێکردنی تۆڕەکانی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنی

لە زۆرێک لە وولاتەکان. کلێسای کاسۆلیک یان کۆمەڵگە سەرەکیە پرۆتستانتەکان هیچ ڕێگایەکیان نەدۆزیەوە بۆ وەستاندنی بڵاوبوونەوەی ڕەوتە بچوکە خێرا گەشەسەندووەکان یان وەستاندنی ناکۆکیەکان لە نێوان شوێنکەوتوانیاندا، هەموو ئەمانە دەرهاوێشتەیان هەیە بۆ داهاتەکان و گرنگی ئایینی.

بۆچی؟ ئەو شکستە بەشێکە لە مەزهەبی ئایینی و توانای کلێساکانی ئیڤانجیلی بۆ گەیاندنی گوتارێک لەسەر بنەمای سامان و خزمەتگوزارییە سەرسوڕهێنەرەکان —— چاککردنەوە و خزمەتگوزاری ڕزگاری لە ڕێگەی باوەڕ- کە جیاوازە لە نەریتە کاثۆلیکیە دووبارەکان. بەڵام سوودی سەرەکی، ئەوەی کە وادەکات ئەوەی ماوە بکرێت، تایبەتمەندی ڕێکخراوەییە. لەبەر ئەوەی گۆڕانکارییەکان لەپێکهێنان و پراکتیزەکردنی مەسیحییەتدا گوزارشت لەحاڵەتێکی بەهێزی هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵات و گواستنەوەی دەکات لەدەزگا گەورەکانی بەڕێوەبردنی ناوەند بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵێک یاریزانی سەربەخۆ و گەنج.

جەوهەری سوودوەرگرتن لە کەنیسەکانی پێنتێکۆستاڵ و ئیڤانجیلی لە توانای دەرکەوتن و گەشەکردن دایە بەبێ گوێدانە هەر پلەیەکی پێش ئێستا. چونکە هیچ وانەیەک نییە کە وەربگیردرێت یان فەرمانێک کە چاوەڕێی دەرچوونی بکرێت یان پەسەندکردنێک کە پێویستە لەلایەن ڤاتیکان یان سەرۆک قەشەی کانتەربێری یان هیچ سەرکردایەتیەکی تری ناوەندەوە بەدەست بهێنرێت. لە باری تەقلیدی، هەر کاهینێک (پیاو یان ئافرەت) بە سادەیی خۆی دیاری دەکات (لە کاتێکدا کاثۆلیکیزم بەردەوام دەبێت لە ڕێگەگرتن لە ژنان لە بەدەستهێنانی پێگەی کاهین) وە ژمارەیەک ئافرەت هەن کە پێگەی کاهین و قەش و پلەکانی دیکەیان وەرگرتووە. لەم بارەیەوە کلێسا وەک کۆمپانیایەکی بچووک وایە کە لە بازاڕێکی پێشبڕکێکاردا دەستی پێکردووە بەبێ پشتگیری دارایی لە سەرچاوەیەکی

سەرمایەوە، بۆیە دەبێت سەرکەوتن بەدەست بێنێت لەسەر بنەمای ئەو ئەندامانەی کە سەرنجیان ڕادەکێشێت، ئەو خزمەتانەی کە بۆیان دابین دەکات، ئەو بەخشش و بەخشینەی کە دەتوانێت بەهۆیانەوە قایلیان بکات. جۆن ئالێن، پەیامنێری ڕووماڵکردنی هەواڵی ڤاتیکان و نووسەری "کەنیسەی داهاتوو" دەڵێت: "بەربەستەکانی چوونە ناو بازاڕی مەزهەبی پەنجاکان زۆر کەمە. هەر پەیرەوێکی ئەم مەزهەبە کە ناڕازییە لە پێشکەوتنی کەنیسەی ناوخۆیی دەتوانێت بە ئازادی بجوڵێت بۆ کڵێسایەکی تر، و تەنانەت دەتوانێت کڵێساکە بۆ خۆی دابمەزرێنێت، دەشتوانێت لە گەراجێک یان ژێرزەمینێک لە بینایەکدا کڵێساکەی خۆی دابمەزرێنێت".

ئەو کڵێسایانەی کە سەردەکەون ئەوانەن کە لەگەڵ هەلومەرجی ناوخۆدا دەگونجێن بەو شێوەیەی کە کۆمپانیایەکی باش دەیگونجێنێت، لە هەموو ڕووێکەوە لە مەهەباکانی وانە وتنەوەکانیانەوە بۆ شوێنی چاوپێکەوتنەکانی پەرستن و ئامرازەکانی ئاسوودەیی و خزمەتگوزارییەکانی کۆمەڵگا، وەک چاودێری منداڵ یان یارمەتی لە دۆزینەوەی کار یان پشتگیریکردنی جۆرەها گروپ و کارە بازرگانیەکان و دەستپێشخەریە میدیاییەکان. کۆچبەران یان دانیشتوانە ڕەسەنەکان وەک خەڵکی مایا لە گواتیمالا، یان هەر کۆمەڵگایەکی دیکە کە پێویستییەکانیان لەلایەن سەرکردە سیاسییەکان و کەنیسە گەورەکانەوە پشتگوێ خراون، ئامانجی نموونەیین بۆ ئەم کڵێسا نوێیانە. وە پەیوەندی مێژوویی قەشەکانی کاسۆلیک لەگەڵ نوخبەی سیاسی لە زۆرێک لە وڵاتانی ئەمریکای لاتیندا وایکردووە کەمتر هەستیاربن لەبارەی بارودۆخی هەژاران، بەتایبەتی خەڵکە ڕەسەنەکان. پلەبەندە توندەکەی کڵێسا و پێویستی بە پەسندکردنی ڤاتیکان بوونە هۆی ڕێگری لە کڵێسا سەرەکیەکانی کاسۆلیک کرد لە خۆگونجاندن، و ڕێگایان کردەوە بۆ ئەوەی کەنیسەکانی ئیڤانجیلی بەسەریاندا زاڵ بن. گوتاری

ڕاشکاوانە لەسەر سامان و خۆشگوزەرانی و چەسپاندنی ڕەفتاری تاکەکەسی و ڕزگاری تاک لەگەڵ هەلومەرجی هەژاری و دوورخستنەوەدا دەگونجێت. بەڵام کڵێساکانی ئیڤانجیلی دەتوانن گرنگی بە پێویستیەکانی ئەو کۆمەڵگایانە بدەن کە تێیدا کار دەکەن و بۆشیان دابین بکەن، و مامەڵە لەگەڵ ڕووداوە ئابووری و سیاسییەکاندا بکەن لە چرکەساتی ڕوودانی، و شێواز و پێکهاتەکانی کەلتووری ناوخۆیی بگرنەبەر. وەک قەشەیەکی ئیڤانجیلی لە پۆتۆسی، بۆلیڤیا، گووتی: "کەنیسەکانمان کراوەترن، گۆرانیەکان ڕیتمی ناوخۆیی بەکاردێنن، هەموو ڕۆژێک سەردانی شوێنکەوتوانم دەکەم".

لە هەمان کاتدا هەموو ئەو بەربەستانە بە تەواوی لەناوچوون کە پێشتر ڕێگرییان لە کڵێساکانی دەستپێکەری بچووک کردبوو بۆ ئەوەی هیچ کاریگەرییەک لە سەرووی ئەو گەڕەک و کۆمەڵگە ڕەگەزیانە دروست بکەن کە تێیدا بوونیان هەبوو. شۆڕشی پەیوەندییەکان و سەرهەڵدانی میدیای ئەهلی ئەو سوودەی کۆتایی پێ هێنا کە کەنیسە ڕێکخراوە گەورەکان لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکەدا هەیانبوو، و دەرفەتی دا بە هەر کەسێک کە خۆی بە قەشەکە ڕاگەیاندووە بگات بە بینەرانی تەلەڤزیۆن و گوێگرانی ڕادیۆ یان بەکارهێنەرانی ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت، و ناردنی بەرەکاتەکانی خۆی بۆ دەرەوەی سنور و کۆکردنەوەی پارەش لە بەرامبەردا. لەگەڵ زیادبوونی دەستگەیشتن بە پلاتفۆرمی میدیای جیهانی، ئەو مۆدێلە بڵاویۆوە کە بۆ یەکەم جار لە لایەن ئیڤانجیلی ئەمریکییەوە دامەزرا، ئەوانەی پیادەکردنی تەبشیر لەسەر تەلەفزیۆن بڵاو دەکەنەوە. هەروەها زۆربوونی کۆچ و سەفەر، بووە هۆی زیاد بوونی بڵاوبونەوەی کڵێسا دووبارە درووستبوەکان کە زیاتر نەرمترن و لە زۆربەی وولاتان جێپێیانی پێ دا. تا شوێنکەوتووانی ئەم مەزهەبانە زیاتر بن، شەرمی ئەخلاقی پێگەی کەمتردەبێت لە دوورخستنەوە یان دەرکردن لە کڵێسای کاسۆلیک، چونکە تێچووی بێهودەیی

کەوتە خوارەوە.

ئایینە سەرەکیەکانی تر وەک ئیسلام و هیندۆسی پێدەچێت کەمتر کاریگەر بووبن بە بەرزبونەوەی مەسیحییەتی کاریزماتیکی، ڕەنگە لەبەر هۆکاری قووڵی کەلتووری بێت. بەڵام ئیسلام و هیندویزم و یەهودیزم و تاویزم و شینتۆیزم و ئاینەکانی تر بە پلە یان پلەیەکی تر، زۆر کەمتر مەرکەزی و پلەبەندین لە کلێسا سەرەکیەکانی کاسۆلیک یان پرۆتستانت. چونکە گەورەترین حاخامی ئیسرائیل، و موفتی میسر، و قەشەی باڵای هەر پەرستگایەکی گەورەی هیندوسی، سەنگی ئەخلاقیان هەیە و لەوانەیە دەسەڵاتی بڕیاردانیان هەبێت لە وڵاتەکانیان یان لە ناوچەکانی خۆیاندا، بەڵام لە ناو ئاینەکانیانەوە سەرکردەیەکی ڕکابەریان هەیە کە دەتوانن حوکمی جیاواز لەسەر هەر کێشەیەک دەربکەن. لە ناو ئیسلامدا، بۆ نموونە، فاکتەرە سیاسیەکان دەبنە هۆی زاڵبوونی چەند ڕەوتێکی دیاریکراو لە وڵاتانی جیاوازی موسڵماندا (سوننە بەرامبەر بە شیعە، یان وەهابیزم بەرامبەر لێکدانەوەی لیبراڵی زیاتر)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، زانایانی کاریگەر زۆرجاران بیروبۆچوونە ئایینیە جیاوازەکانی خۆیان پێشکەشی شوێنکەوتووانیان دەکەن لە سەرانسەری جیهان لە ڕێگای ئامرازەکانی میدیاوە. بۆ نموونە، شێخ قەرەزاوی، لەدایکبووی میسری و دانیشتووی وڵاتی قەتەر، لەڕێگەی بەرنامەی تەلەفزیۆنی جەزیرەوە نزیکەی ٦٠ ملیۆن بینەر سەیری دەکات. هیندوسیش هەمیشە بە شێوەیەکی زۆر لامەرکەزی بووە، چەندین نەریتی لاوەکی و تائیفی و مەزهەبی تێدایە و هیچ دەسەڵاتی حوکمڕانی یەکگرتووی تێدانیە. بە پێوەرێکی بچووکتر ئەبینین هەناردەی ئایینی هیندی - لە کۆمەڵگای ڤیدانتادوە بۆ هاری کریشنا و ئەما و سای بابا و ئۆشۆ و ماهاریشی - هەندێک لە بەرژەوەندییە ڕێکخراوەییەکانیان لەگەڵ گرووپەکانی پێنتاکۆستاڵ هاوبەش دەکەن، وە بەسەرکەوتوویی بەکاریان هێناون.

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

### کار: سەندیکا نوێیەکان و دڵسۆزی نەبوون بۆ سەندیکاکان

هەروەک کڵێسای کاسۆلیک ڕووبەڕووی بەرەنگارییەکی زۆر دەبێتەوە بۆ بەهێزی خۆی لە کۆمەڵگە نوێیەکان کە سەلماندویانە کاراتر و نەرمترن لە وەڵامدانەوەی پێویستیەکانی ئەوانەی کە ئەمڕۆ بەدوای ڕزگاریدا دەگەڕێن، سەندیکا دامەزراوەکانیش بەردەوام هەوڵیان داوە بۆ پاراستنی دەسەڵاتیان بەرووی هەوڵەکانی سەندیکا نوێیەکان کە ئامانجیان دابینکردنی ئەو پێویستیەکانەی کرێکارانە کە شۆڕشەکانی زۆربوون و جوڵانەوە و عەقلییاتەکان دەریان کردووە. لە پەڕەکانی بیرورِا لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست لە ساڵی ٢٠١٢، هارۆڵد میرسۆن وتارێکی نووسی بە ناونیشانی "ئایا سەندیکاکانی ئەمریکا بوون بە بەشێک لە مێژوو؟". هارۆڵد میرسۆن کە خۆی بە ڕۆژنامەنووسێکی سۆسیالیستی دیموکراسیی پشتگیر لە کارێکاران وەسف دەکات، بەردەوام بەبیر خوێنەرانی دەهێنێتەوە کە "لە کەرتی تایبەتی ئەمریکادا، ئەندامێتی سەندیکایەکان لە بەرزترین ئاستەوە دابەزیوە دوای جەنگی جیهانی دووەم، لە نزیکەی ٤.٧٪ بۆ کەمتر لە ٧%". ئاشکرایە کە هێزی بزووتنەوەی کرێکاری ئەمریکا لە کەمبوونەوەدایە، و بە دڵنیاییەوە کەمبوونەوەی ئەندامێتی یەکێکە لە بزوێنەراکانی ئەم کەمبوونەوەیە؛ بەڵام کەمبوونەوەی ئەندامێتی تەنها هۆکار نیە؛ چونکە هێزی ڕێکخراوە تەقلیدیە باڵاکانیش لاواز بوو لە ئەنجامی ئەو هۆکارانەی کە کاریگەری لەسەر هەموو لایەنە کاریگەرە بەهێزە تەقلیدەکان هەیە. لە ڕاستیدا، لە کاتێکدا هێزی جوڵانەوە بە گشتی لە کەمبوونەوەدایە، ئەوا یاریزانە گەورەکانی، وەک فیدراسیۆنی کاری ئەمەریکا و کۆنفرانسی ڕێکخراوە پیشەسازییەکان زیاتر کاریگەر بوون لەچاو هەندێک لە پێشبڕکێکارە نا نەریتییە نوێیەکان کە لەم بوارەدا دەرکەوتن، وەک فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی کارمەندانی خزمەتگوزاری. لێرەش دووبارە، تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەو بەربەستانەی کە ئەکتەرە

## کۆتایی سەردەمی هێز

دەسەڵاتدارەکانی بەردەستیان پاراستووە لە پێشبڕکێکردن لەگەڵ ڕکابەرەکانیان دارمان یان خەتەنەکردن یان سوڕانەوە بە دەوریان ئاسان بووە.

مێژووی سەندیکاکان هاوتەریبە لەگەڵ دامەزراوە مۆدێرنەکان. دەکرێت بوترێت کە سەندیکاکانی کرێکاران لە ئەوروپا ڕەگی قووڵتری هەیە لە یەکێتی و سەندیکا پیشەییەکان کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست. بەڵام دەرکەوتنی پیشەسایە فراوانەکان لە سەدەی نۆزدەهەم بە نزیکەیی ڕاستەوخۆ دەرکەوتنی ڕێکخراوەکانی لەگەڵ خۆی هێنا کە ئامانجیان باشکردنی بارودۆخی کارکردن و بەهێزکردنی مافەکانی کرێکارە پیشەسازیەکان بوو. سەرباری ئەوەی کە سەندیکایەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم لە بەریتانیا و فەڕەنسا سەریان هەڵدا، بەڵام زۆربەری سەندیکا پێشەنگەکانی کۆنترین وڵاتانی پیشەسازی لە نیوەی دووەمی دامەزران. لەگەڵ ئەوەی کە پێکهاتە بزوتنەوەکانی سەندیکاکان جیاوازە لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکی تر- بۆ نموونە سەندیکای تایبەتە بە هەندێک کۆمپانیای دیاریکراو هەیە و سەندیکای تریش هەیە کە کەرتە پیشەسازیەکان بە تەواوی دەگرێتەوە یان چەند کەرتێک - بەلام ئەو سەندیکایانەی کە ئامانجیان کۆکردنەوەی هەموو ئەم بەشە جۆراوجۆرانە و پێدانی دەنگێکی بەهێزی ناوەندی یەکگرتووە هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم بوونیان هەبووە. ئەو ڕێکخراوەی کە بوو بە کۆنگرەی سەندیکایەکانی کرێکاران لە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٦٦ دامەزرا. وە فەرەنساش ڕێگای دا بە دامەزراندنی سەندیکایەکان لە ساڵی ١٨٨٤، و پاش ١١ ساڵ سەندیکای گشتی کار دامەزرا، گەورەترین سەندیکای کرێکاران لە فەرەنسا. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕێکخراوێک هەیە بەناوی شاسوارەکانی کارکردن، کە لە پێگەی سەندیکای نەتەوەیی سەرەتایی بوو لە ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم، وە لە ساڵی ١٨٨٦ سەندیکای ئەمریکی بۆ کارکردنی لێ دروست بوو کە جوڵەی سەندیکا لە ژێر

سەرکردایەتیەکی ناوەدنی کۆکردەوە بۆ چەندین دمیە.

تەنانەت لە نێوان ئەم سێ وولاتە ( بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمریکا) پێشکەوتنەکان جیاوازبوون لە سەدەی بیستەم، سەرباری ئەوەی کە کۆنگرەی سەندیکاکانی کرێکاران لە بەریتانیا وەک چەترێک مایەوە کە هەموو سەندیکایەکانی کرێکارانی لەخۆ گرتبوو تا ڕۆژی ئەمرۆشمان، بەڵام سەندیکای گشتی کار لە فەرەنسا بەرزبوونەوەی یەکێتیە نەتەوەییە ڕکابەرەکانی بەخۆیەوە بینی کە ڕەوتی سیاسیان کەمتر ڕادیکاڵ بوو ( وەک یەکێتی فەرەنسای دیموکراسی بۆ کار، هێزی کرێکاران)؛ لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش یەکێتی ڕێکخراوەکانی پیشەسازی هەڵەیەکی زیاتر ڕادیکاڵی کرد تاوەکو یەکیگرت لەگەڵ سەندیکای ئەمریکی بۆ کار لە ساڵی ١٩٥٥ بۆ ئەوەی سەندیکای ئەمریکی بۆ کار و کۆنگرەی ڕێکخراوە پیشەسازیەکان پێک بێنن کە بووە چەترێک بۆ ئەندامانی سەندیکایەکان لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە درێژایی نیو سەدە. لە ماوەی چەند دمیەیەکی ڕابردوو لە جیهانی پیشەسازی - ئەو کاتەی کە سەندیکایەکان چێژیان لە بەهێزترین دەسەڵات و ڕێز و مێژوو وەردەگرت - پێکهاتەی نموونەیی لە یەکێتی نەتەوەیی یان چەند یەکێتیەکی نەتەوەیی پێک دەهات ( لە دوو تا چوار) لە ژێرەوەی چەندەها لقی سەرەکەی ( یان چەند بەشێک لە ڕێکخراوی نەتەوەیی یانیش سەندیکا سەربەخۆکان بەڵام سەر بە ڕێکخراوێکی نەتەوەیی ) ڕێکخراو هەبوون بە پێی ئەو بوارە پیشەسازیەی کە کاری تێدا دەکرد. بۆ نموونە، ئەڵمانیا تەنها یەک یەکێتی نەتەوەیی سەرەکی هەبوو؛ وە ئیسپانیا دووانی هەبوو: ئیتاڵیا سێ دانە؛ و رووسیا کە سەندیکایەکان لە پێکهاتە کۆنترۆڵکراوەکانی ڕژێمی شیوعی سۆڤیەتی جاران پێکهاتبوو، چوار دانە بوو.

بە قەدەر ئەوەی کە چاکەکان دەگێڕدرێنەوە بۆ سەندیکایەکان لە

پێشکەشکردنێکی زۆر بۆ ژیانی کرێکاران، بە لایەنی کەم لە دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان ( هەروەک دروشمی ئەمریکی دەڵێت، " ئەو کۆمەڵەی کە پشووی کۆتایی هەفتەی بۆتان هێنا")، بەڵام ژیاننامەی سەندیکا کرێکارە گەورەکان لە ماوەی چەندەها دەیە ئێستا لە حاڵەتی پاشەکشەدایە. ژمارەکان جیاوازن، وە ناکرێت هەموویان بەراورد بکرێن، بەهۆی جیاوازیەکان لە پێکهاتەکان لە وڵاتێک بۆ وڵاتێکی تر. لەگەڵ ئەمەش، چڕی سەندیکایەکان ( ڕێژەی کرێکارە ئەندامەکان لە سەندیکایەکان) و چەترە دانوستانکاریەکان ( ڕێژەی ئەو کرێکارانەی کە ڕێککەوتنی دانوستانی بە کۆمەڵ دەیانگرێتەوە، چ خۆیان ئەندام بن لە سەندیکایەکان یان نا) بەردەوام بوون لە پاشەکشە لە زۆربەی وڵاتانی ڕێکخراوی هاوکاری ئابوری و گەشەکردن، وە بە شێوەیەکی زۆر لە هەندێک حالەتدا. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چڕی سەندیکایەکان لە ٣٦% کەمبۆوە لە پاش جەنگی جیهانی دووەم بۆ تەنها ١٢% تا ئەمڕۆ. وە لە کەرتی تایبەت کەمبوونەوەکە توندتر بوو، لە ڕێژەی ٣٣% پێش نیو سەدە بۆ کەمتر لە٨% تا ئەمڕۆ. هەرچی چڕی سەندیکایەکانە لە وڵاتانی ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و گەشەکردنە، ئەوا لە نێوان ٨.٥% لە تورکیا و ٦٨.٣% لە سوید ( بە پێی داتاکانی ساڵی ٢٠٠٨)، بەڵام لە هەر حالەتێک بە نزیکەیی ژمارەکان بە جێگیری مانەوە لە باشترین بار، و پاشەکشەی کرد لە زۆربەی بارەکانی تر، بۆ ئاراستەیەک زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای گرتەوە بۆ چەندین دەیە.

ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستەم کۆتا ماوە بوو کە گەشەی بەهێزی لە ئەندامێتی سەندیکایەکانی بەخۆوە بینی لە زۆربەی وڵاتە پیشەسازیەکان. تەنانەت ساڵی ١٩٨١، یەکێتی ئەمریکی بۆ کار و کۆنگرەی ڕێکخراوەکانی پیشەسازی نەیانتوانی ٢٥٠ هەزار کرێکار کۆکەنەوە بۆ ئەوەی ئامادەبن لە واشنتۆن بۆ ناڕازەیی دەربڕین دژی بڕیاری سەرۆک ڕۆناڵد ڕیگن تایبەت بە

دەرکردنی چاودێرانی جوڵەی ئاسمانی، لە ڕۆژێک بۆ پشتگیری کە لە ئەیلولی ئەو ساڵە ڕێکخرا. پاش سێ دەیە لەم ڕووداوە، لە ناڕەزایی دەربڕینێک لە گۆڕەپانی ناشیۆناڵ مۆڵ لە ساڵی ۲۰۱۰، سەندیکایەکانی کرێکاران نەیانتوانی ئەم ژمارەیە کۆبکەنەوە جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت، بەڵکو پێشوازی کردن کەمتر بوو لەو کۆبوونەوەی کە گلین بیک بۆ پارتی چای ڕێکیخستبوو پێش پێنج هەفتە. وە لە ساڵ ۲۰۱۲، بەزاندنێکی گرینگی تر ڕوویدا کە پاشەکشەی هێزی بزوتنەوەی کرێکارانی ئەمریکی پشت ڕاست کردەوە، کاتێک سەندیکایەکان شکستیان هێنا لە باوەڕپێکردنی دەنگدەران بۆ دەنگدان لەسەر دەست لەکارکێشانەوەی حاکمی ویسکنسن، سکۆت وۆکر.

هۆکارەکانی ئەم پاشەکشە گشتیە فاکتەرە گشتیەکان دەگرێتەوە، وەک جیهانگیری و داهێنانە تەکنەلۆجیایەکان وایانکردن ئاسان بێت بۆ خاوەن کارەکان کارەکان بۆ وولاتێکی تر بگوازنەوە یان بە تەواوی هەڵیبوەشێننەوە، ئەو شتەی کە هاوسەنگی هێزی گۆڕی لە بەرژەوەندی خاوەن کارەکان. لەگەڵ ئەوەی کە ئامانجی دانوستانی بە کۆمەڵ لەوانەیە بە دیاریکراوی بۆ پاراستنی کرێکاران بێت لەم بارودۆخە، بەڵام ئەو هۆکارانەی کە بازیاندا بۆ بەرژەوەندی بازاڕەکانی کارە جیهانیەکان- کە زۆرجار بە پشتگیری حکومەتە پابەندبووەکان بە چاکسازی ئاراستەکراو بۆ ئازادکردنی بازاڕەکان - دەرچوو زۆر بە هێزن. زیاتر لەمەش، چالاکی سەندیکای مێژوویی گەشەی کرد لەو پشەسازی و پیشانەی کە پشت بە کرێکارە ناکارامەکان دەبستن کە ڕێکخستنیان ئاسان دەکات. پاش ئەوەی ئامێرەکان جێگای کرێکارە نا کارامەکانیان گرتەوە لە زۆربەی پیشەسازیە قورسەکان یان پاش ئەوەی ئەم کارانە گواسترانەوە بۆ دەرەوە، کە خەرجی کرێکارە نا کارامەکان کەمترە، پێویست بوو سەندیکایەکان بگوازرێنەوە بۆ کەرتە نوێیەکان کە پێویستی بە ڕێکخستنی نوێ هەیە، وەک کەرتی خزمەتگوزاریەکان.

هەندێک لە سەندیکایەکان وایان کرد؛ بەڵام لە زۆربەی شوێنەکان، چیرۆکەکانی گەندەڵی و ڕازیبوون بە دۆخی ئێستا لە نێوان سەندیکایەکان بەشێک بوو لە دیمەنەکە.

ولکن التغييرات التي اعترت جاذبية النقابات وفاعليتها تتضمن جانب تنظيمية أيضا. چونکە پێکهاتەی سەندیکایەکان، هەر لە بواری پسپۆری سەندیکا تاکەکان بەپێی کۆمپانیاکان یان کەرتە پیشەسازیەکانەوە بۆ سەندیکایە نەتەوەییەکان کە خاوەن سەرکردایەتیەکی ناوەندین، ڕەنگدانەوەی پێکهاتەی کۆمپانیا زاڵەکانە کە دەیەوێت کرێکارەکانی ڕێکبخرێنەوە لە سەندیکایەکان یان لەوێ نوێنەرایەتی بکرێن. سەندیکاکانی بازرگانی گەشەیان کرد بۆ ئەوەی کۆمپانیا گەورەکان و مۆدێرن و پلە بەرزەکان لەخۆ بگرێت کە کۆڵەکەی کاری سەرمایە بوون لە زۆربەی ماوەکانی سەدەی بیستەم، پێش ئەوەی جیهانگیری و نەرمی وای لێبکات دەست بکەن بە بچوککردنەوەی قەبارەکەیان و پێدانی هەندێک لە چالاکیەکانیان بۆ لایەنە دەرەکیەکان، و جووڵانەوە بۆ بەکارهێنانی کرێکاری کاتی و کرێکار لە ڕێگای گرێبەست.

یەکێک لەبوارە سەرەکییەکانی داهێنان بۆ سەندیکاکانی کرێکاران لەسەدەی بیست و یەکەمدا دۆزینەوەی ڕێگاکانە بۆ فشارخستنەسەر ئەو کۆمپانیایانەی کە چالاکییەکانیان لەچەندین وولاتدا درێژ دەبێتەوە، هەروەها پاراستنی کرێی کرێکاران لە ناوەوە بەداواکردنی ستانداردی کاری توندتر لە لە وولاتانی تر. بەڵام سەرکەوتنە ناوبەناوەکان لەم بوارانە هیچ شتێک ناکات جگە لە کەمکردنەوەی شێوازی گشتی. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەو بوارەی کە سەندیکاکانی کرێکاران لە ماوەی چەند دەیەی ڕابردوودا سەرکەوتوو بوون، کەرتی گشتی بووە (وەک یەکێتی مامۆستایان، یان سەندیکاکانی شارەوانی و پارێزگاکان) بە تایبەتی، کە بازاڕی کار کەمتر گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و

خاوەنکارەکان بەردەوام پشتیان بەستوە بە ناوەندی و پلەبەندی هەرەمی.

لەو بوارانەی کە لەم ساڵانەی دواییدا کرێکاران سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە ئەو ڕێکخراوانەن کە بەکاریان هێناوە بۆ بەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنانە، ئەو ڕێکخراوانە سەندیکای تەقلیدی کرێکاران بوون کە بەشێوەیەکی ڕیشەیی پێکهاتە و شێوازەکانیان گۆڕیوە و سەندیکایەکی نوێ لەودیو پێکهاتە کۆنەکانەوە پێکهاتووە و هەندێک جار نێوەندگیری ترن کە بە هیچ شێوەیەک سەندیکا نیە.

لە نێوان ساڵانی ١٩٩٦ و ٢٠١٠دا، یەکێتی نێودەوڵەتی بۆ ستافی خزمەتگوزاری زیاتر لە دوو هێندە ئەندامێتی خۆی زیاد کردووە کە دەگاتە ١.٢ ملیۆن ئەندام. ئەم شتەی کرد لە ڕێگای بەکارهێنانی شەپۆلی شۆڕشەکانی زۆربوون و جووڵەیی و عەقڵییەت؛ چونکە زۆرێک لە ئەندامەکانی، بۆ نموونە، لە بواری چاودێری تەندروستی گەشەسەندوو کار دەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی زیاتر چالاک بکەن بۆ زیاتر ژیانکردن و گوزەرانی تەندروستتر. هەروەها زۆرێک لە ئەندامەکانی پەنابەری نوێن کە سوودمەندبوون لە جووڵەی جیهانی کە بازاڕ و شوێنی کاریان دووبارە دروست کردووە. وەک پێشینەکانیان لە کارگە و عەمبارەکاندا، هەموو ئەو کۆچبەرانە بە ئاواتێک ڕاپێچ کراوون بۆ باشترکردنی بارودۆخیان و ئەو دەستکەوتانەی کە لە بنەرەتیدا سەرنجی ڕاکێشاون بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بە پێشڕەوی ئاندی ستێرن، کە بە داهێنەر ناسراوە نەک تەنها لە بازاری کاری ئەمریکا بەڵکو لەسیاسەت و حەشدی کۆمەڵایەتیشدا، سەندیکا چەند سەرکەوتنێکی سەرەکی بەدەست هێناوە، کاتێک بە دانوستانە بە کۆمەڵەکان گەیشت بۆ چەند ڕێککەوتنێک بۆ بەرژەوەنندی لاوازترین چینیە جیهانیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وەک پاککەرەوە و کارگوزاری منداڵ، کە زۆربەیان لە چەندین کاری کاتی کاردەکەن و نازانن بە زمانی ئینگلیزی قسە بکەن. هەر لە ڕووی مێژووەوە ئەو گروپانە پشتگوێ خرابوون لە

لایەن بزوتنەوە سەندیکایەکان کە زیاتر تیشکیان خستبووە سەر کارگەکان و پیشەسازیە تەقلیدیەکان. وە دان پێ دانانیان تەنها پێویستی بە بیرۆکەیەکی زۆر داهێنەرانە نەبوو لەلایەن ستێرن و تیمەکەی، بەڵکو پێویستی بە ئامرازی نوێش هەبوو کە هاوپەیمانیەتەکانی دەرەوەی بزووتنەوە سەندیکایەکان مسۆگەر بکات؛ هاوپەیمانیەتی لەگەڵ کۆمەڵگا و گروپە کۆچبەرەکان، و بەشداری قوڵتر لە هەڵبژاردنەکان کە تەنیا بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک و کۆکردنەوەی دەنگدەران بۆ بەرژەوەندی کاندیدی پارتی دیموکراسی ناوەخۆ نیە. تاکتیکی دانوستانکاری ستێرن دوور بوو لە شێوازە تەقلیدیەکان. بۆ نمونە، ئەو هەندێ ئامادەکاری داهێنا بە جۆرێک دانوستانی بە کۆمەڵی لە هیچ شوێنێک دەست پێ نەدەکرد تەنها دوای ئەوەی زۆربەی بازاڕەکانی ناوبراو ڕێکخراوبوون لە ناو یەکێتیەکان، بۆ ئەوەی خاوەنکارەکان ئەو پێشبڕکێیە لە دەست بدەن کە دروست دەبوو لەوەی ئەوان یەکەم کەس بوون بۆ ئیمزاکردنی گرێبەست لەگەڵ یەکێتی، یان تاکە کەس بوون بۆ ئیمزاکردنی.

فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی فەرمانبەرانی خزمەتگوزاری تا ڕادەیەکی زۆر وەک یەکێتیەکی بازرگانی دەمێنێتەوە نەک جۆرێک لە گۆڕانی نوێ، وە خۆیشی لە ئەنجامدا تووشی بارگرانی گەورەیی لە قەبارە و هێواش لە جوڵە بووە. ڕەخنەگرانی دەڵێن، لە نێو داهێنانەکانی ستێرن ئەوەیە کە سەندیکاکانی کرێکارانی کۆکردنەوە لە یەکێتیەکی گەورەی بازرگانی یەک ملیۆن یان زیاتر کرێکاری لەخۆ دەگرت، بە هیوایەک بۆ مسۆگەرکردنی دەسەڵاتی دانوستانی زیاتر، بەڵام لەسەر حسابی نەرمی و دیموکراسی ناوخۆیی و ئەنجامە ڕاستەقینەکان. ڕکابەرەکەی، یەکێتی گۆڕان بۆ سەرکەوتن، لە ساڵی ٢٠٠٥ دامەزراوە و تا ئێستا نەیتوانیوە لەگەڵ سەرکەوتنەکانی فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی فەرمانبەرانی خزمەتگوزاری بگونجێت، ئەوە پێزانینە، نەک ڕەتکردنەوە، لە مۆدێلی کارمەندانی فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی

خزمەتگوزاری. هەرچۆنێک بێت تێوەگلانی فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی فەرمانبەرانی خزمەتگوزاری لەگەڵ کۆمەڵگە و گرووپە کۆچبەرەکان و کەنیسەکان و هاوپەیمانە نا نەریتییەکان مانای ئەوەیە کە یەکێتیە پیشەسازییە کۆنەکان دەبێت شێوازی نوێ و زمانی نوێ بگرنە بەر و دەسەڵات لەگەڵ پارتە دەرەکیە بچووکەکان دابەش بکەن، لە پێناو پاراستنی گرینگی خۆی و گونجاندنی بەگوێرەی پێویستیە هەنووکەییەکان.

هیچ وڵاتێک زۆرترین ژمارەی کرێکارەکانی لە مەترسیدا نییە، وەک چین، گەورەترین ئابووری پیشەسازی لە ڕووی دانیشتوانەوە. چین گەشەی ئابووری بەهێزی خۆی بەرزکردۆتەوە بە پەرەپێدانی ژێرخانی گەورە بۆ کارگەکان کە زۆربەیان سەر بە کۆمپانیا بیانیەکانن یان لقە ناوخۆییەکانیان، کە هەزاران کرێکار - زۆربەیان کۆچبەری لادێی گەنجن - بۆ ماوەیەکی درێژ کار دەکەن لە خانووبەرە هاوبەشەکانی سەر بە کۆمپانیاکان دەژین و دەخۆن و تێکەڵی کۆمەڵایەتی دەبن لە نێو خۆیان. ئەم خانوبەرانەی سەر بە کۆمپانیاکان دەتوانن سەدان هەزار کرێکار لەخۆبگرێت. داواکارییەکی زۆر بۆ کرێکاران مانای ئەوە بوو کە کۆمپانیاکان دەبێت وردە وردە بارودۆخی کارکردن باشتر بکەن، بەڵام ڕێکخستنی کرێکاران لە یەکێتیەکاندا تابۆ بوو. وەک زۆرێک لەدەوڵەتە دەسەڵاتخوازەکان چین خاوەنی سیستمێکی سەندیکای ڕەسمییە کە بەشێک لەپێکهاتەی گشتیی حیزبی شیوعی پێکدێنێت، کە وایان لێدەکات تەنها ئامێرێک بن کە بەشداری لە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتیدا بکات زیاتر لەوەی کە ئامرازێک بن بۆ بەدەستهێنانی خواست و بەرژەوەندییەکانی کرێکاران. لەبەر ئەوە، لە وەڵامی خراپی بارودۆخی کارکردندا، کرێکارە تاکەکان پەنایان بۆ گواستنەوە لە نێوان کارەکاندا برد، نەک هەوڵدان بۆ دانوستانی بە کۆمەڵ. بە شێوەیەکی سروشتی، هێزی کاری گەنج بەزۆری بۆ چەند ساڵێک لە کارگەکاندا کاردەکات بۆ ئەوەی

بە سادەیی ئامادەکاری بکەن بۆ هاوسەرگیری یان ناردنی پارە بۆ خێزانەکانیان لە دەشت.

بەڵام کرێکارانی کارگەی چینی ڕێوشوێنی بوێرانەتر و کاریگەرتریان گرتووەتە بەر بۆ داواکردنی چارەسەری باشتر لە خاوەنکارەکانیان و بەلاڕێداگرتنی ئەو یەکێتیە ڕەسمیەی کە گرنگی بە بارودۆخیان نادات. جیهان لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٢ ئەو هەموو مانگرتنانەی بینی لە کارگەکانی هۆندا و کارگەکانی تر، کە شارازایان دەڵێن لێشاوێکی هێمنانەی بەدەست هێنا لە شارە پیشەسازیەکانی باشوری چین. کرێکاران داوای مافی خۆیانیان کرد بە پێکهێنانی یەکێتیەکی سەربەخۆ، کە گفتوگۆی ڕاستەقینە لەنێوان بەڕێوەبردن و کرێکاراندا ئەنجام بدات، و یەکێتیە سەربەخۆکان بکەنە واقیعێکی ڕاستی، و تەنانەت داکۆکیکارانی مافی کرێکارانی چینیش سەرسامبوون بە پەرەسەندنی ڕێکخراوەکەیان و هەڵبژاردنی نوێنەرەکانیان. هەروەها ئەو کرێکارە گەنجانە چاودێرەکانیان سەرسام کرد بە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا بۆ ڕێکخستنی مانگرتنەکان و خۆدزینەوە لە پێویستیی چاوپێکەوتنی سەرکردەکانیان بۆ ئەوەی دەستگیر نەکرێن. ئەوان دەیانزانی کە دەبێ خۆیان لە خزمەتگوزاری سەرەکی پەیامی چینی (QQ.com) بەدوور بگرن چونکە ژمارەیەکی زۆر لە سیخوڕی حکومەتی لێبوو. هۆندا، تۆیۆتا، فۆکسۆنی تایوان (کە ئایفۆن دروست دەکات) و خاوەنکارەکانی تر ڕازی بوون کە کرێ و خۆراک و کرێی خانووبەرە زیاد بکەن، هەرچەندە زیادکردنەکان کەمترن لەوەی کە کرێکاران داوای دەکەن. ئەم سەرکەوتنە لەوانەیە نەتوانرا بەدەست بهێنرێت ئەگەر ئەو کەمبوونەوەیەی کار نەبوایە کە لەو کاتەدا لە ئابووری هەڵئاوساوی چیندا گەشەی دەکرد. لەگەڵ ئەوەش ئەوەی لە چین ڕوویدا ئەوە دەردەخات کە شتەکان چەند ئاسانتر بووە بۆ کرێکارەکان بۆ ئەوەی خۆیان ڕێکبخەن لە ناو سەندیکاکان لە ئاستی کارگەکانی ناوخۆ کاتێک یەکێتیە

فەرمیەکان کاردانەوەیان بەرامبەر داواکارییەکانیان نییە یان حەزیان لە خزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانیان نییە.

هەندێک مۆدێلی دەرکەوتنی چالاکی کرێکاران لە ڕێگەی ڕێکخراوەکانەوە هاتوون نەوەک سەندیکایەکان بەهیچ شێوەیەک، لە ڕاستیدا لە ڕێگەی ئەو ڕێکخراوانەوە هاتوون کە ڕەگیان لە پیشەسازی و بوارەکاندا هەیە، لەو کاتەی سەندیکاکانی کرێکاران پرۆسەی ڕێکخراوی سەندیکایەتیان ئاڵۆز و زۆر گرانە. نموونەیەک لەمانە دەکەوێتە لۆس ئەنجلۆسەوە، ئەو شوێنەی ک ئۆفیسی کرێکارانی پیشەسازی جلوبەرگی تێدایە- تیمێکی بچووک و چالاک لە پارێزەرە پێشکەوتووخوازەکان، و گرووپەکانی مافی پەنابەری و نوێنەرانی کۆمەڵگە نەژادییەکان - توانیان سەرکەوتنێکی گەورە لە دژی ئەو کۆمپانیایانە بەدەست بێنن کە پشت بە کاری هەرزان دەبەستن. چونکە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کارگە بچووکەکان کە زۆرجار کرێکارە نایاساییەکان کاری تێدا دەکان کە بە ئینگلیزی قسە ناکەن، ڕۆژانە تا ١٢ کاتژمێر کار دەکەن لە دۆخێکدا کە زۆرجار یاساکانی تەندروستی و سەلامەتی پێشێل دەکەن، کەرتەکە پێویستی بە دەستێوەردانێکی زۆر سەخت بوو، بەڵام جوڵانەوە زۆر ئەستەم بوو بۆ سەندیکا تەقلیدیەکان. کەچی ئۆفیسی کرێکارانی پیشەسازی جلوبەرگ بایکۆتی سەرکەوتوویان بەڕێوەبرد کە بووە هۆی ڕێککەوتن لەگەڵ چەندین فرۆشگای جلوبەرگ کە بەرهەمەکانیان بەکاردەهێنان. ناوەندەکانی کرێکاران، قەبارەیان بچووکە، کە پشت بە سەرچاوەکان دەبەستن لە زۆربەی ئەو ڕێکخراوانەی کە لە پسپۆری جیاوازدا کار دەکەن، تەواوکەری سەندیکاکانی کرێکارانن، بەڵام بە پێی مۆدێلێکی نزیک دژی کار دەکەن. هەروەها لە هەڵکشاندایە: لە ساڵی ٢٠٠٧دا ژمارەیان لە تەنیا ٥ ناوەند لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ١٦٠ بەرزبووەوە.

## کاری خێرخواز: گۆڕینی خزمەتی بەرژەوەندی گشتی بۆ کلتورێکی جەماوەری

دوو دەیەی ڕابردوو شۆڕشی خێرخوازی جیهانیان بەخۆوە بینیوە، سەرەڕای کاریگەری پاشەکشەی جیهانی، داتا بەردەستەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ژمارەی بەخشەرەکان و بڕی ئەو پارەیەی کە دەیبەخشن و ژمارەی وەرگرەکان لە هەموو کاتێکی پێشووتر زیاترە. بۆ نمونە، لە ساڵی ٢٠٠٣ بۆ ٢٠١٠ کۆی گشتی یارمەتیە فەرمی و تایبەتەکانی گەشەسەندن لە هەموو جیهانەوە لە ١٣٦ ملیار دۆلارەوە بۆ ٥٠٩ ملیار دۆلار بەرزبۆتەوە. لە ساڵی ٢٠١٠ ئەمریکییەکان ٢٩١ ملیار دۆلاریان داوە بۆ پشتگیریکردنی هۆکاری جۆراوجۆر، وە ژمارەی دامەزراوە کۆمەککەرەکانی ئەمەریکا لە ٢١٨٧٧ لە ساڵی ١٩٧٥ بۆ ٦١٨١٠ لە ساڵی ٢٠٠١ و پاشان بۆ ٧٦٥٤٥ لە ساڵی ٢٠٠٩ زیادیکردووە. هەوڵەکانی بەخشەرە تاکەکەسیەکان و دامەزراوەکان بەیەکەوە دەستیان کرد بەوەی شان لە شانی هەوڵەکانی حکومەتی فەرمی بدات لە دەرەوەی وڵات، وە لە هەندێ حالەت بەسەریشی دا زاڵ بێت، بۆ نمونە، لە ماوەی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم، بەشداری وولاتە پێشکەوتووەکان لە تاک و دامەزراوە ئەمریکییەکان چوار ئەوەندە بووە. لە نێوان ساڵانی ١٩٩٨ و ٢٠٠٧، دووبارە دوو ئەوەندە بووە بۆ ٦.٣٩ ملیار دۆلار، ئەمەش بڕێکە لە تێکڕای پابەندیەکانی ساڵانەی بانکی نێودەوڵەتی زیاترە بە ڕێژەی ٥٠%. هەروەها کاری خێرخوازی دەستی بە ئاراستەیەکی نوێ کردووە، چ لە ڕێگەی هەشتاویەک ملیاردێرە ئەمریکیەکان کە پەیمانێکیان ئیمزا کرد لە ساڵی ٢٠١٢ بۆ بەخشینی زۆربەی سامانەکانیان، یان لە ڕێگای سەدان هەزار بەکارهێنەری مۆبایل کە ملیۆنان دۆلاریان بۆ کۆمەکی بوومەلەرزە نارد لە هایتی، یان چیایەک خێرخوازانی بەخشەر کە لە سمینارەکاندا کۆدەبنەوە و سەردانی مەیدانی دەکەن بۆ قوتابخانەکان لە ناو شارەکان یان پڕۆژە لادێییەکان لە

دەرەوە بۆ پشتگیری ئەو پرۆژانەی کە پارەی پێدەدەن، و گۆڕینەوەی بیرۆکەکان و باشترین ئەزمونکردن لە ماڵپەڕەکانی ئەنتەرنێت.

دامەزراوە گەورەکان (وەک ڕۆکفیلەر، کارنگی، ماک ئارثۆر و فۆرد)، و دەزگا گەورەکانی بەهانەوەچوون (وەک خاچی سوور، ئۆکسفام، دکتۆرە بێ سنوورەکان)، و دەزگا گەورەکانی حکومەت (وەک ئاژانسی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ گەشەپێدانی نێودەوڵەت، و وەزارەتی گەشەپێدانی نێودەوڵەتی بەریتانی، و دامەزراوە فرە لایەنەکانی وەک بانکی نێودەوڵەتی)، هەموویان هێشتا بەردەوامن لە گێڕانی ڕۆڵی سەرەکی لە ئارەستەکردنی سەرمایەکان و پشتگیری هونەری بۆ لێقەوماوان و هەژارەکان لە جیهان. لە ڕاستیدا، بە چەند پێوانەیەک، بە کۆی خەرجییەکان، ئەم دەزگایانە لە بواری یارمەتیداندا هەر بە زاڵی دەمێننەوە. بەڵام با بەقازانجی یاریزانانی نوێیەکان هەڵی کرد: ئەو دەزگا زەبەلاحانەی کە بەرەو پێشەوە بازیاندا، وەک دامەزراوەی بیل و ملیندا گیتس، کە تەنیا لە ماوەی یەک دەیەدا بووەتە گەورەترین دامەزراوەی خێرخوازی لە جیهان، و دەزگا تاکەکەسی و بچووکەکان، کە لە ١٥ ساڵی ڕابردوودا زیادیان کردووە، و کۆمەڵێک پلاتفۆرمی یارمەتی تایبەت، بازار و ئەو راوێژکارانەی کە مۆدێلی نوێیان دروستکردوە، لە مایکرۆکریدیتەوە تا کڕینی مەکینەی دورمان بۆ دایکێکی هیندی تا دەستپێشخەرییە هاوبەشەکانی کەرتی گشتی و تایبەتەکان لەسەر دابینکردنی پاسە نوێکان لە شارەکان.

ئەو شۆڕشەی کە کاری خێرخوازی ئەمڕۆ بەخۆیەوە دەبینێت لە دوو خەسڵەتی سەرەکی لەگەڵ شۆڕشی پێشوودا، کە یەک سەدەی پێش ئێستا ڕوویدا، هاوبەشی دەکات کاتێک زەبەلاحەکانی پیشەسازی دامەزراوەی کارنگی (ساڵی ١٩١١)، و دامەزراوەی ڕۆکفێلەر (ساڵی ١٩١٣) و دواتر دامەزراوەی فۆرد (١٩٣٦) دامەزران؛ ئەمانەش دامەزراوەی زەبەلاح و کاریگەرین بۆ چەندین دەیە

وەک مۆدێلی جیهانی مایەوە. ئەمڕۆ وەک ڕابردوو، ئەبینین کە گۆڕانی بەردەوامی کاری خێرخوازی دوای ماوەیەک دێت کە ئاستێکی سەرسوڕهێنەر لە دەوڵەمەندی هاتە دی کە سەرچاوەی گرتوە لە زانستەکانی ژیان و تەنەلۆجیاکانی زانیاری و پەیوەندیەکان، نەوەک لە هێڵی شەمەندەفەر و پۆڵا و نەوتەوە. جارێکی تر، ئەبینین کە سەنتەری داهێنان لە بواری چاکەخوازی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە: وولاتێک کە خێرخوازی لە کلتوری بازرگانی جیاناکرێتەوە.

ئاندرو کارنگی لایەنگری "کاری خێرخوازی زانستی" بوو و باوەڕی بە دابینکردنی خێرخوازی هەبوو بەپێی ئەو بنەمایانەی کە لە پیشەسازی مۆدێرندا سەرکەوتوو بوون، هەمان ئەو بنەمایانەی کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا زەبەلاحی نوێیان دامەزراند. ئەو هانی دەوڵەمەندانی سەردەمی خۆی دا کە "لە کاری خێرخوازی خۆیاندا هەمان لێهاتوویی ڕێکخراوی و هەست جێبەجێ بکەن بۆ بەدەستهێنانی ئەو کاراییەی کە بۆ بەرزکردنەوەی سامانەکانیان بەکاریان دەهێنا"، کە ئەنجامە لۆژیکییەکەی دامەزراندنی کۆمپانیا گەورەکان بوو بە چالاکیەکی فراوانەوە. ئەنجومەنی ئیدارەکان و بەرپرسای بەرنامەکان لە دامەزراوە گەورەکاندا بوونەتە یاریزانێکی سەرەکی: پارەدانیان بۆ پرۆژەکان ڕێنوێنێک بووە بۆ بەخشەرەکانی تر، وە هەڵبژاردنی پرۆژەکەیان مۆدێل بووە بۆ وەرگرە شاراوەکان.

لە هەمان کاتدا، بەخشەرە تاکە بچوکەکان چەند بژاردەیەکی کەمیان هەبوو بۆ تێکەڵاوبوونی راستەوخۆ لە پرۆژەکان کە پارەکانیان پشتگیریان دەکردن. کەناڵی کاری خێرخوازیی هەمەجۆر هەبوو، وەک ڕێکخراوەکانی، دامەزراوەی ڕێگای یەکگرتوو، دەزگای مارش ئۆف دیمس، خاچی سوور، سوپای ڕزگاریخواز و چەندین گروپی ئایینی کە بەخشینیان لە کەنیسە و دوکان و شوێنی کاردا کۆدەکردەوە و ئاراستەیان دەکرد بۆ پشتگیریکردنی ئەو کێشانەی کە زیاتر پێویستیان پێیەتی و زیاتر لەگەڵ فەلسەفەیان دەگونجێت. لە ئابووریە دەوڵەمەند و

سەرکەوتووەکانی تر، گرووپێکی دیاری ڕێکخراوی بەهاناوەچوون بە درێژایی کات گەشەیان کردووە. رلە سالآنی حەفتاکان و هەشتاکاندا، خەڵکی وڵاتانی دەوڵەمەند داوای فریاگوزارییان لە سنووقی پۆستەکانیان پێدەگەیشت بۆ قوربانیانی کارەساتەکان ( لە پزیشکانی بیێ سنور، و دامەزراوەی ئۆکسفام)، و ئەو جۆرانەی کە هەڕەشەی لەناچوونیان لەسەرە (لە سندوقی جیهانی بۆ سروشت) و زیندانیانی سیاسی (لە ڕێکخراوی لێبوردەیی نێودەوڵەتی)... هتد. هەموو ئەم کێشانە جێی بایەخن، بەڵام تەنیا چەند دانەیەکی کەم دەرفەتێکیان داوە بە بەخشەری بچووک بۆ چوونە ناو پابەندی هەمیشەیی بۆ پرۆژە یان نموونەیەکی دیاریکراو، ئەمە جگە لە گەیشتن بە وەرگرەکان یان ناردنی بیرۆکەکان و هاوبەشکردنی ئەزموونەکان شانبەشانی ئەو سامانەی کە دەیبەخشن، ئەم هەڵەیە پێشتر بۆ دەوڵەمەندەکان بەردەست نەبوو.

نەوەی نوێی ئەمڕۆی خێرخواز بینینێکی جیاواز پێشکەش دەکات کە بە باکگراوند و پێداویستی و ئەزموونی تایبەتی خۆیان لە بازاڕدا پێناسە دەکرێن. دامەزراوەی بیل و مێلیندا گەیتس کە لەساڵی ١٩٩٤ لە سیاتڵ دامەزراوە، لەوانەیە گەورەترین دامەزراوەی خێرخوازی هاوچەرخ بێت، بەڵام ئەوە تاکە دامەزراوە نییە کە لەو سامانەی ئابووری نوێ بەرهەمی هێناوە لە دایک بووە. بۆ نمونە، لە کالیفۆرنیا ژمارەی دامەزراوەکان لە نێوان ساڵانی ١٩٩٩ و ٢٠٠٩دا بە ڕێژەی ٧١٪ زیادی کردووە، و بەخشینەکانیان زیاتر لە دوو ئەوەندە بووە، لە ٨.٢ملیار دۆلارەوە بۆ ٦ ملیار دۆلار. ئەم گەشەکردنە یارمەتیدەرە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گۆڕانەی کە لە ناوەندی خێرخوازیدا ڕوویداوە لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا، لە ساڵی ٢٠٠٣، ڕۆژئاوای ئەمەریکا بۆ یەکەم جار لە تێکڕای کاری خێرخوازی ڕۆژئاوای ناوەڕاستی تێپەڕاند و لە ساڵی ٢٠٠٦ باکووری ڕۆژهەڵاتی ویلایەتەیە یەکگرتووەکانی ئەمریکای تێپەڕاند کە بە قەلای کاری خێرخوازی ئەمریکی

دادەنرێت. لە کاتێکدا زۆربەی ئەم خێرخوازە تازانە بە شێوەیەک لە شێوەکان جەمسەری تەکنەلۆجیان، هەندێکیشیان ناودارن: بۆنۆ دامەزراوەیەکی خێرخوازیی هەیە، و مات دامۆن ڕەواج بۆ ئازادی دەستگەیشتن بۆ ئاوی پاک دەکات، و براد بت هەڵساوە بە پەرپێدانی خانووی سەوز بۆ بنیاتنانەوەی نیو ئۆرلیانز. هەروەها ئەستێرەکانی وەرزشی گەورە، وەک تایگەر وودس یان ئاندرێ ئەگاسی، دامەزراوەیان هەیە کە سەرمایەیان بە دەیان یان سەدان بلیۆن دۆلارە. بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە دامەزراوە بچوکە کەسییەکان هەن کە لەوانەیە ناویان ببیسترێت تەنها لەلایەن ئەوانەی کە لێیان نزیکن.

بۆ زۆرێک لەم خێرخوازانە نوێیە، ڕەفتاری خێرخوازانە و میتۆدە تەقلیدییەکان زۆر ناسۆرن. لەجیاتی ئەوەی بەخشینەکان ڕادەستی دامەزراوە گەورەکان بکەن، بۆ نمونە، دەیانەوێت دامەزراوە تایبەتەکانی خۆیان دابمەزرێنن. سوودە شاراوەکەی دامەزراوەیەکی تاکەکەسی بۆ بەخشەرەکە لە توانای هەڵبژاردنی "کێ پارەکە وەردەگرێت" دەردەکەوێت، وە لە هەر مەرجێکدا بێت، بەبێ ئەوەی ڕێگە بە هیچ دەزگایەکی تر بدات کە ئەم کارانە ئەنجام بدات. ئەوە یارمەتیدەرە بۆ دامەزراندنی ڕێگایەکی کورت بۆ چاکەکاری، بەمەش ئەو نێوەندانە لادەبات کە ئامادەبوونیان دەبێتە هۆی تێچوونی کارگێڕی، ئەمە جگە لە لاوازکردنی مەبەستی بەخشەر یان لادانی بۆ ئاراستەیەکی تر.

ئەم خێرخوازە نوێیانە زۆرجار بەرەنگاری کێشە کۆنکرێتەکان دەبنەوە لە ڕێگای ئەزموون و شێوازی خۆیان بۆ چارەسەرکردنیان، نەوەک لە ڕێگای پارەدان بە ماڵی ئۆپێرا، کتێبخانە یان مۆزەخانەکان. لە کاتێکدا ئەم کارە خێرخوازەیەی کە ئاراستەکراوە بۆ بەدیهێنانی ئەنجامە ڕاستیەکان زیاتر لە سەدەیەکە بوونی هەیە و لەو هەڵمەتانەدا بەرهەمەکەی خوراوە کە بووە هۆی شۆڕشی سەوز، بەڵام ڕێبازەکەی کە لەسەر بەڵگە و ئامانجەکان بنامە دەگرێت لە ماوەی دوو دەیەی

ڕابردوودا لە لایەن شارەزایانی تەکنەلۆجیاوە پێشەنگی گیراوە، ئەو کەسانەی بیرۆکەی ڕێکخستن و کارامەییە ئەندازیاریەکانی خۆیان جێبەجێ کردووە بۆ چارەسەرکردنی زەحمەترین کێشەکان لە جیهان.

لە ڕاستیدا، بۆ زۆرێک لەم یاریزانە نوێیانە، خێرخوازی هیچ جیاوازیەکی نییە لە وەبەرهێنانی بازرگانی. "کاری خێرخوازی پیشەگەرانە" ڕەنگدانەوەی بەکارهێنانی شێوازی وەبەرهێنانی چالاکە لە چاکەکاریدا. چاکەکارە پیشەگەرەکان - جیاواز لە خاوەن سەرمایە دەست پێشخەرەکان - خاوەنی تامی دیاریکراو و شێوازی وەبەرهێنانی خوازراوی خۆیانن. بۆ نمونە، ڕێکخراوێک بەناوی "هاوبەشەکانی کاری خێرخوازی دەسپێشخەر" یارمەتی بۆ ئەو گروپانە پێشکەش دەکات کە خزمەتی کێشەی منداڵ دەکەن لە ناوچەی واشینگتۆنی پایتەخت. ئەم ڕێکخراوە نەک هەر پارە دەبەخشێت، بەڵکو پشتیوانی تەکنیکیش دابین دەکات و بەشداری لە ژیانی ڕۆژانەی ئەو گروپانەدا دەکات کە سەرمایەی بۆ دابین دەکات و لە نزیکەوە چاودێری پێشکەوتنەکەی دەکات. گروپێک بەناوی "سندوقی ئەکویمین" هەیە پشتگیری بۆ بازرگانانی وولاتانی پێشکەوتوو دابین دەکات کە پێوەری دیاریکراویان هەیە: پرۆژەی وەبەرهێنانیان دەبێت بەرهەمێک یان خزمەتێک بێت کە ڕاستەوخۆ خزمەتی هەژاران بکات و پرۆژەکەش دەبێت توانای فراوان بوونی هەبێت بەشێوەیەک و بگات بە ١ ملیۆن کەس لە دانیشتوان بەلایەنی کەم. بۆ نمونە، یەکێک لە پرۆژەکانی وەرگری پارە پرۆژەیەکی نوێ بوو بۆ دابینکردنی کۆشک بۆ فرۆشتنی تاکفرۆشی و زانیاری (بۆ نموونە نەخشەکان، کتێب و نامیلکەکانی تر) لە لادێییەکانی هیندستان. سندوقی ئاکویمن پشتگیری بەشی دابین دەکات لە شێوەی بەخشین، بەڵام زیاتر لە شێوەی قەرز و ڕاوێژکردن لە پشکەکان، ئەو شتەی کە تا ڕادەیەکی هێڵی نێوان کاری بازرگانی و خێرخوازی کاڵ دەکاتەوە، و ئەو بڕەی کە لە لایەن سندوقەکەوە دابین کراوە هێشتا

کەمە، لە ساڵی ۲۰۰۷، ۲۷ ملیۆن دۆلاری قەرزی دابین کرد. بەڵام کاتێک مرۆڤ ئەوە لەبەرچاو دەگرێت کە ئەم سندوقە لە ساڵی ۲۰۰۱ دامەزراوە بە سەرمایەیەک کە تەنها دەگەیشتە ٤۰۰ هەزار دۆلار، و تەنها یەکێکە لە چەندەها دامەزراوە خێرخوازیە دەستپێشخەرە نوێیەکان، ئەوا دەزانێت کە خێرایی سەرکەوتنی دووباپاتی بوونی دەکاتەوە بۆ ئاراستەیەکی فراوانتر.

بەڵام ڕادیکالترین گۆڕین لە چاکەکاریدا ئەمڕۆ دەرکەوتنی ئەو دەزگا و ئامرازانەیە کە ڕێگە بە بەخشەری بچووک یان خاوەن قەرزی تاکەکەسی دەدات، کە توانایان لە چەند سەدێک یان تەنانەت دەیان دۆلار تێناپەڕێت، بۆ ئەوەی بەشدارییەکی دیاریکراو بۆ پڕۆژە یان نموونەیەکی دیاریکراو بکەن کە ئەستەم بوو هاوشێوەیەکی وایان پێشکەشبکردبووایە لەدەرەوەی گەڕەکەکانیان یان بازنەی ناسیاوەتیان.

زۆربەی ئەم گۆڕانانە لە ئینتەرنێتدا ڕووی داوە، ڕێکخراوی کیفای نا قازانج بەخش کە لە ساڵی ۲۰۰٥ دامەزراوە، بەشداری بچووک کۆ دەکاتەوە لە شێوەی قەرزە بچووکەکان بۆ وەرگران لە سەرانسەری جیهان ئەوانەی کە بە ناو ناسێنراون، وە دەتوانن سەرمایەدارە تاکەکانی خۆیان لە هەموو زانیاریەکان ئاگادار بکەنەوە، هەروەها ڕێکخراوی گلۆبال گیڤینگ، کە دوو لە فەرمانبەرانی بانکی نێودەوڵەتی پێشوو لە ساڵی ۲۰۰۲ دایانمەزراند، مۆدێلێکی هاوشێوە پەیڕەو دەکات کە خێرخوازان هەڵدەستن بە پشتگیری کردنی ئەو پڕۆژە دیاریکراوانەی کە خۆیان هەڵی دەبژێرن. وە بە بەکارهێنانی تۆڕی جیهانی پەی پاڵ PayPal، کە ڕێگە بە گواستنەوەی دەرماڵە دەدات لەسەر ئینتەرنێت، ئەم جۆرە پڕۆژانە دەتوانن بە نرخێکی کەم ڕێگایەکی کورت لەنێوان بەخشەرەکان و وەرگرەکان دروست بکەن. بە دڵنیاییەوە، ئەم ڕێگایە دەتوانێت زۆر کورت بێت، چونکە پڕۆژەی کفا و گلۆبال گیڤینگ پشت دەبەستن بە دامەزراوە بچووکە ناوخۆییەکان و ڕێکخراوە

ناحکومیەکان لە پرۆسەی هەڵبژاردنی پرۆژەکان و ئاراستەکردنی دەرماڵە بۆیان. پشتگیری دامەزراوەیی بەهێز بۆ ئەم نێوەندانە گرنگە بۆ سەرکەوتنی شێوازەکە. هەرچۆنێک بێت، ئەم مۆدێلە ڕێگە بە هەر کەسێک دەدات کە دەستگەیشتنی ئینتەرنێت و چەند دۆلارێکی زیادەی هەبێت بۆ پشتگیریکردنی، بۆ نموونە، گۆڕینی تەکسی لە بۆلیڤیا بۆ گازی سروشتی، یان پشتگیری قەرزی خوێندکاران لە پاراگوای، یان پرۆژەی پیشەسازی جل و بەرگ لە کۆلۆمبیا ( ئەمانە هەندێک لە نموونەی نوێن لە ڕێکخراوی کفا).

چاکەکاری ڕێگای کورت هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو بڕە پارەیەی کە دەزگا گەورەکان و دەزگا حکومییەکان دابینیان کردووە، بەڵکو بووەتە مۆدێلێکی نوێ بۆ بەخشین و دەست پێشخەریەکان. کۆکردنەوەی کۆمەکی تاکەکەسی بۆ هەر جۆرە پرۆژەیەک لە ڕێگەی پلاتفۆرمەکانەوە دەکرێت، وەک ویک ستارتەر، کە وا لە وەرگرەکان دەکات کە خوازیارن پرۆژەکانیان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو پێشبخەن و پارە وەربگرن بە مەرجێک کە پابەند بن بە بڕی ئامانجەکە لەو ماوەیەدا. پێوانەی سەرنج ڕاکێشی ئەم ڕێبازە لە دەست پێوەگرتنی و بەکارهێنانیەتی وەک ئامرازێکی بازارکردن - لەو کۆمپانیایانەی کە هەڵدەستێت بە کاری خێرخوازی، کاتێک کۆمپانیایەکانی وەک ئەمێریکان ئێکسپرێس، و تاگێت، و جی پی مۆرگان، بیبسی کۆلا هەڵدەستن بە ئەنجامدانی پێشبڕکێکان کە دەنگدەران لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە بڕیار لەسەر هەر پرۆژەیەک دەدەن کە کۆمپانیا پشتگیری بکات لە نێوان پرۆژە ڕکابەرەکان.

وە لە جیهانی کاری خێرخوازی نوێ، دامەزراوە کۆنەکان لایەنێکن لە پێکهاتە فراوانەکە، و بەخشینە تاکە فراوان و پێشکەوتووەکان لە ئەنتەرنێت لایانەکەی ترن، بۆشایی نێوان ئەم دوو لایەنە بەو سندوق و خزمەتگوزاری و ڕاوێژانە پڕکراونەتەوە

کە وایان کردووە کاری خێرخوازی زیاتر ئاڵۆز و هەمەجۆرو نامەرکەزی بێت. وە زۆر لایەنی تریش هەن، وەک کۆڕی سامان و بەخشین، و ڕێکخراوی نێودەوڵەتی هاوبەشەکانی کۆمپانیای کۆمەڵایەتی، کۆڕی خێرخوازی ڕۆژئاوا و ئەوانی تر کە هەموو کارێک دەکەن لە یارمەتیدانی بازرگانیە بچووکەکان بۆ ئەوەی کاراتر بن، فێرکاری کەسانی تازە دەوڵەمەند کە چۆن ببنە خێرخواز بە ڕێگایەکی پراکتیکیەوە بۆ پێشکەشکردنی ڕاوێژەکان دەربارەی دیزاینکردنی پڕۆژەکان و چاودێری کردن و دانانی کۆڕەکان بۆ بەخشەرەکان تاوەکو ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی خۆیان ئاڵوگۆڕ بکەن.

ئەم خێرخوازیە تایبەتە سنووردارە نوێیە جێگەی دامەزراوە گەورەکان ناگرێتەوە. ئەو پارە زۆرەی کە لە لایەن دامەزراوەی بیل و میلیندا گەیتسەوە دابین کراوە بازدانێکی بەهێزی بەخشی بۆ توێژینەوەکان لە بواری چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان، وەک مالاریا، لە هەموو جیهاندا. هەروەها بەخشینی ۱۰۰ ملیۆن دۆلاری دەزگای دۆریس دیوک لە ساڵی ۲۰۰۷دا ۲۰٪ ی زیاد کرد بۆ پارەی بەردەست بۆ توێژینەوەکان لە بوارەکانی گۆڕانی ئاووهەوا بۆ ماوەی پێنج ساڵ. جوان کرۆک، میراتگری سامانی ماکدۆناڵد، ۱۰۰ ملیۆن دۆلاری بەخشی بۆ پاڵپشتی ڕادیۆی گشتی نەتەوەیی ئەمەریکا. کاری خێرخوازی دەست پێشخەری مامناوەند و بچووک، جگە لە دیاری لە بەخشەرە بچووکەکان لە ڕێگەی ڕێکخراوی یفا و پلاتفۆرمی سەرهێڵی هاوشێوە، خزمەت بە بەشێکی جیاواز لە کۆمەڵگەی وەرگر دەکەن. سەرەڕای ئەوەش، ئەم ئامرازە نوێیانە ئەگەری ئەوەی نییە کە جێگای یارمەتی فەرمیەکانی دەزگاکانی حکومەت بگرێتەوە. لە ڕاستیدا توێژەرەوەکان ڕاج دیسای و هومی خاراس بۆیان دەرکەوت کە دەفەرموونەکانی یفا و گلۆبال گیفێنگ بژاردەکانی خۆیان لەسەر ئەو پێوەرانە دروست دەکەن جیاوازە لەو پێوەرانەی کە بەرپرسانی هاوکاریە فەرمیەکان بەکاری

دەهێنن. چونکە بەخشەرەکانی ڕێکخراوی کفا، بۆ نموونە، زۆر دڵگران نابن دەربارەی بارودۆخی سیاسی یان ئابووری گشتی لە وولات کە هەر وەرگرێکی یارمەتیەکان تێیدا دەژیت، تا ئەو ساتەی ئەوان سەرسامن بە پرۆژەی ئەو وەرگرە. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە کاری خێرخوازی نوێی سنووردار ڕێبازە کۆنەکە تەواو دەکات، لە جیاتی جێگرتنەوەی.

ەڵام کاری خێرخوازی نوێ ئەو بیرۆکەیەی ڕووخاند کە دامەزراوە گەورەکان و ئاژانسە حکومیەکان تەنیان کە خاوەن ئەزموونن لە دیزانکردینی پرۆژە خێرخوازیەکان و چوستی لە بەڕێوەبردنی. وە ئەو ئاستەنگە یاسایی بیرۆکراتیانەی کە ڕێگرن لە یارمەتیە فەرمیەکان زۆر ناسراون؛ چونکە بەردەوامبوونی دەستبڵاوبوون و دواکەوتن و گەندەڵی ئەو ڕەخنە کۆنەی بۆی یارمەتیە ئابووریەکانی نوێکردەوە کە لەلایەن بی تی باوەر، لە زانکۆی لەندەن بۆ ئابووری، ئاراستە کرابوو، وە ئێستا ئابووری زامبی دامبیسا مویو دنگێکی تری بۆ زیاد کرد. ڕێکخراوەکانی هاریکاری تایبەتی سەرەکی، وەک خاچی سوری ئەمریکی، ئابڕوچوونەکان لێڵی کردوون و گوومانە گشتیەکان دەوریداون لە میانەی کارەساتەکانی تسونامی لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسا ساڵی ٢٠٠٤، و گەردەلولی کاترینا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٥. ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە کۆمەڵە خێرخوازیە بچووە نوێیەکان لە گەندەڵی و دەست بڵاووی پارێزراون. چونکە لە میانەی بومەلەرزەی ساڵی ٢٠١٠ لە هایتی، بەخشەرە بچووکەکان پاڵیان بەیەکەوە ئەنا بۆ بەخشینی پێنج دۆلار کە لە ڕێگای نامە ئەنێردرا بۆ ییلی هایتی - ڕێکخراوی بەهانەوەچوون کە لەلایەن گۆرانیبێژ وایکلیف جانەوە دامەزرێنرابوو - دوای چەند هەفتەیەک دەرکەوت کە ئەم ڕێکخراوە تۆمەتبارە بە ڕێژەیەکی گەورە لە خراپ بەڕێوەبردن.

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەڵام ئەو بیرۆکەی کە کاری خێرخوازی دەستپێشخەر و ئامرازەکان و پلاتفۆرمی یارمەتی کورتخایەنی نوێ بنەمای لەسەر گرتووە ئەوەیە کە ئەزموونی کۆکراوەی بەخشەر و وەرگران -هەردوو لایەنی هاوکێشەکە - دەتوانرێت کۆبکرێتەوە بە جۆرێک ببێتە هۆی باشتر کردنی ئەوەی کە دامەزراوە و دەزگا حکومییەکان تا ئێستا بە پێکهاتە کۆنەکانی خۆیان بەدەستیان هێناوە. هەرهەروەک تۆم مونیکی، سەرۆکی ئەکادیمیای ئابلفت و پێشەنگ لە کاری خێرخوازی نوێ، بۆ یەکێک لە ڕۆژنامە بەریتانیەکان دەڵێت " لە جیاتی ناچاربوون بۆ چوون بۆ دامەزراوەیەکی بیرۆکراتی زەبەلاحی خاوەن ئیدارەیەکی ناوەندی، وەک خاچی سور یان ئۆکسفام، ئێستا ئێمە دەتوانین بچین بۆ لایەن تەرەفی ڕاستەوخۆ و کۆنترۆڵی ئەوە بکەین کە دەیمانەوێت بیکەین". لە لایەنی تەرەفی ڕاستەوخۆ، بەخشەرەکان کۆمەڵەیەکی فراوان لە ئامرازە وەرگیراوەکانی سەرمایەداری لەناوچوو بەکار دەهێنن لە پرۆژە خێرخوازیەکان جێبەجێی دەکەن، لە کاتێکدا وەرگرە ئارەزوومەندەکان پرۆژەکانیان پێشکەش دەکەن و دەشزانن کە ڕکابەری هاوشێوەکانیان دەکەن لە سەرانسەری جیهان. دەسەڵاتی ئەنجومەنەکانی ئیدارەی دامەزراوە گەورەکان و بەرپرسی بەرنامەکانی و بیرۆکراتی ئاژانسە هاریکاریە گەورەکان کەمبۆتەوە - چ بەهۆی ئامرازە نوێیەکان کە ئامانجی لە دورخستنەوەیانە بە سیفاتیان وەک نێوەندگیرێک، یان بەهۆی چالاکوانە بەناوبانگەکان - وەک بونو، گۆرانیبێژ لە گروپی یو تو، و گۆرانیبێژی سینیگالی یوسو ندور، ئەوانەی کە پلاتفۆرمی ڕاگەیاندن و پەیوەندیەکانیە جیهانیەکانیان بەکارهێنا بۆ خستنەڕووی تێڕوانین و ئەولەویاتە تایبەتەکانیان.

هەرچۆنێک بێت، جیاکەرەوەکان بەتەواوی ڕەق نین، وە یاریزانانی نەریتی دەتوانن بگونجێن، یان بەلایەنی کەمەوە هەوڵ بدەن بگونجێن. بۆ نمونە دامەزراوەی ڕۆکفیلەر یەکێکە لە وەبەرهێنەرە ڕەسەنەکانی سندوقی خێرخوازی ئەکویمەن.

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

دیسای و خاراس ئاماژە بەوە دەکەن کە زۆرێک لە دەزگا فەرمییە سەرەکیەکان لە پێناو باشترکردنی تەرکیز و کەمکردنەوەی دەستبڵاوی سەرچاوەکان دەست دەکەن بە دابەشبوون بۆی یەکەی تایبەت. ئەم جۆرە هەنگاوانە دووپاتی دەکەنەوە کە داهاتووی چاکەخوازی لە ڕابردوو زیاتر پارچەپارچەتر دەبێت، ئایا ڕۆکفێلەر و کارنگی ڕێگری لە گرووپەکەیان دەکەن ؟ مەرج نییە. جاکلین نۆڤگراتز ڕایگەیاند، دامەزرێنەرەی سندوقی ئاکیومین، بۆ ڕۆژنامەی فۆربس کە " رۆکفیلەر لە ڕێگای دوربینی کارەکانی سەیری کارە خێرخوازیەکانی دەکرد... کە بە شێوەیەکی زۆر بە مەرکەزیەت بەڕێوەدەبرا، و بڕیارەکانی لە لووتکە دەهات بۆ بنکە، و پشتی بە شارەزایانی دەبەست، و دیمەنێکی فراوان بوو". هەرچی تاکەکانی چینە نوێیەکان لە بازرگان و پارە و تەکنەلۆجیانە ئەوان بە سادەیی تێڕوانینی جیهانی خۆیان لە بواری کاری خێرخوازی جێبەجێ دەکەن، هەروک نوفوگراترز ووتی " لە خوارەوەی بازار بۆ سەرەوە ". وە ئاندرۆ کارنیگی " کاری خێرخوازی زانستی " لەلای پەسەند بوو. بە شێوەیەکی پێویست شتێکی لۆژیکە کە لەگەڵ دوورکەوتنەوەی زانستەکانی بازرگانی لە کۆمپانیا زەبەلاحەکان کە خاوەن ئیدارەی ناوەندین و ئاراستەکردنیان بۆ بەرژەوەندی یاریزانە نوێیە بچووکە بەیەکەوەبەستراوەکان و خێراکان لە جوڵە، کاری خێرخوازی هەر بە هەمان ئاراستەی خۆی دەڕوات.

دەزگاکانی ڕاگەیاندن: هەموو ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانی دەنووسێت و هەموو بڕیار دەدات

لە سەرانسەری جیهان، بە تایبەت لە بازاڕە زیاتر بەکارهێنانەکان بۆ ئینتەرنێت، سەرچاوەکانی هەواڵ - تا ئێستاش - لە باری گۆڕانی خێرای بەردەوامدایە. ئەو خێراییەی کە زانیاری و پەیوەندیەکان پێی دەگۆڕدرێنەوە، بە شێوەیەکی دیجیتاڵی، وایکردووە کە تەنها پلاتفۆرمێکی ئۆنلاین جۆرەها بابەتی

هەواڵ و شیکردنەوە و بۆچوون و بازرگانی و ڕیکلامی تێدابێت، کە لەلایەن قەوارە جۆراوجۆرەکانەوە دەرچووە (ئاژانسەکانی هەواڵ، ئاژانسەکانی ڕیکلام، داکۆکیکاران لە مافەکان، و تاکەکان). ئاژانسەکانی ڕاگەیاندن، کە پێشتر جودابوون و پێداویستی تەکنەلۆجی و کەلتوری پراکتیکی تایبەتی هەبوو، ئێستا دەستی بە نزیکبوونەوە کردووە: ڕادیۆکان و ڕۆژنامەکان ئێستا کار لە سەر ئەنتەرنێت دەکەت زیاتر لەوە کە لە بنەڕەتەوە کاری دەکرد، و ڕێژەیەکی زیاتری لە داهات دەستدەکەوێت بەم شێوەیە.

ەکارهێنەرانی هەواڵەکان هەوڵەکانی ڕۆژنامە خوازراوەکانیان بینیوە بۆ پارێزگاریکردن لە ڕێکلامەکان و پێشخستنی سەرچاوەی نوێ بۆ داهات، و دۆزینەوەی دیزاینی ڕاست، و بەدیهێنانی هاوسەنگی لە نێوان ئەو ناوەڕۆکەی کە لە سەر ئەنتەرنێت دەخرێتەڕوو بێ بەرامبەر و ئەوەی کە بەرامبەر پارە دەخرێتەڕوو، و دامەزراندنی فەرمانبەران بۆ نووسینگەکانی لە شارەکان و وولاتانی تر، و دابەشکردنی فەرمانبەران لە نێوان کارەکانی وەشانی چاپکراو و وەشانی بڵاوکراوە لەسەر ئەنتەرنێت، و بەم شێوەیە. وە زۆریان شکستیان هێنا لەمە. لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆ نموونە، ١٥ ڕۆژنامە یان ١% لە پیشەسازی ڕۆژنامە لە ماوەی هەموو ساڵێک وون دەبن لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٦ تا ٢٠١٠دا. وە لە ڕووی دابەشکردن و داهاتەکانی ڕیکلامکردن، پیشەسازی ڕۆژنامەی ئەمریکی بە ڕێژەی ٣٤% کەمی کردووە لەوەتەی ساڵی ٢٠٠٠ ەوە. وە بینەرانی تەلەفزیۆن بەرنامە خوازراوەکانیان زیاتر بەدەستە لە کاتی داواکردن لەسەر ئەنتەرنێت لە ڕێگای هاوبەشیکردن لەگەڵ هەندێک لە کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی ڤیدیۆکان. وە گوێگرانی ڕادیۆ ئێستا دەتوانن ئەو مۆسیقایەی ئارەزوویان پێیەتی بەدەستی بێنن لە کەناڵە ئاسمانیەکان، یان لە ڕێگای خزمەتگوزاریە نوێیە پسپۆڕەکانی وەک سپۆتیفای و باندۆرا. وە ئاڵودەبووانی

هەواڵەکان دەتوانن لە سەرچاوەیەک یان یەکێکی تر لە سەر ئەنتەرنێت وەریگرن.

دەرهاوێکانی ئەم پێشکەوتنانە بە تەواوی ڕوون نین، سەرەڕای مشتومڕە فراوانەکان. وە لەبەر هۆکاری زانراو، ڕۆژنامەنووسان کاتێکی زۆر بەسەر دەبەن و نیگەرانی خۆیان دەردەبڕن سەبارەت بەئاییندەی پیشەکەیان، بەڵام هێزی ئاژانسەکانی ڕاگەیاندن خۆی لە کوێ دەدۆزێتەوە، و بە کام ئاراستە دەستی کردووە بە گۆڕان؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بە ڕادەیەکی زۆر پشت دەبەستێت بەو شوێنەی کە مرۆڤ بە دوای بەڵگەکان و نیشانەن دەگەڕێت.

لە لایەکەوە بەڵگەیەکی زۆر هەیە بۆ پشتگیری کردن لەو مشتومڕەی کە ژمارەیەکی کەم لە کۆمپانیا گەورەکان کۆنترۆڵی بەشێکی زۆر لە میدیای جیهانی دەکەن. یەکێک لە خەمڵاندنەکان ئەوە دەردەخات کە ژمارەی کۆمپانیا باڵادەستەکان لە بازاڕی میدیایی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٨٣ دا ٥٠ کۆمپانیا بووە، پاشان لە ساڵی ١٩٩٠دا بۆ ٢٣ کۆمپانیا دابەزی و لە ساڵی ٢٠٠ بۆ ٦ و پاشان بۆ ٥ کۆمپانیا. خێرای یەکگرتنی ڕێکخراوە میدیاییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای ساڵی ١٩٩٠، و ئەو گۆڕانکاریە ڕێکوپێوانەی کە قەدەغەی هەڵگرتنی لابرد لەسەر خاوەندارێتیەکانی هەندێک لە میدیای فرەئامرازەکان، هەموو ئەمانە یارمەتیدەر بوون بۆ هاندانی ئەم ڕەوتە. کۆمپانیای نیوز کۆرپ، کە خاوەنی ڕوپەرت موردۆکە، بەم دواییانە کۆمپانیای داو جۆنسی خاوەنی ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت کری، کە سەنگی زیاتری بەخشی بە یەکێک لە حەوت کۆمپانیا یەکەمە فرە ئامرازەکانی ڕێکلامی نێودەوڵەتی، کە لەلایەن زانای کۆمەڵناسی و توێژەوەی بەناوبانگ لە بواری ئاژانسەکانی ڕاگەیاندن، مانویل کاستیلز، دیاریکراوە، کە ئەوانیش : تایم وۆرنەر، و دیزنی، و نیوزکۆرپ، و بیرتیلسان، و ئێن بی سی، و سی بی ئێس، و فیاکۆم.

## کۆتایی سەردەمی هێز

دەستەبەرکردن و تێکەڵبوون لە نێو پیشەسازی میدیادا، وەک ستراتیژی بازرگانی، ئەنجامی تێکەڵی بەرهەم هێناوە، هەرچۆنێک بێت کاریگەری لەسەر دیموکراسی هەیە. چونکە کاتێک تایم وارنەر بڕیاریدا کە ئەمریکا ئۆنلاین (AOL) وەک کۆمپانیایەکی سەربەخۆ ڕەچاویکات دوای نزیکەی دە ساڵ لە یەکگرتنەکەی، ئەمریکا ئۆنلاین تەنها بەشێک بوو لە نرخی بنەڕەتی یەکگرتنەکە کە گەیشتە ١٧٥ بلیۆن دۆلار. ئەو ئەنجامە بەدەر نییە، بە پێی یەکێک لە شیکاریەکان، لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٠ و ٢٠٠٩، کۆمپانیا سەرەکیە میدیاییەکان بەیەکەوە بە بڕی زیاتر لە ٢٠٠ ملیار دۆلار نرخی سەرمایەکانیان کەم بۆوە. ئەدای خراپی پشکەکانیان بە بەراورد لەگەڵ نیشاندەرەکان، وەک ستاندەرد ئاند بورەز، پێشخەرێک بوو بۆ لەناوبردنی پیشەسازی میدیا کە بە ئینتەرنێت خێراتر بوو. کۆمپانیاکانی میدیا مێژوویان هەیە لە بەدەستهێنانی گەشەکردن بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕێگەی دەستکەوتەکانەوە، بەڵام گەشەی داهات مەرج نییە بۆ باشترکردنی ئاستی پشکەکان بەکار هێنرابێت، و جۆرێک لە هێزی بازاڕی.

لە لایەکی دیکەوە هێز لە بواری ڕاگەیاندن لەم ڕۆژانەدا بە شێوەیەکی زۆر لە لایەن کۆمپانیا تەکنەلۆجیاکان و دابینکارانی میدیاوە بە هەموو جۆرەکانییەوە پیادە دەکرێت. زانای کۆمەڵایەتی کاستیلز، بۆ نموونە، گوگڵ و مایکرۆسۆفت و یاهو و ئەپڵ زیاد دەکات بۆ لیستی کۆمپانیا میدیاییە گەورەکان؛ ئەمانەش هەموویان کۆمپانیای تەکنەلۆجین بە جۆرێک لە جۆرەکان هەنگاوێی گەورەیان بڕیوە لە چالاکی میدیایی. هەروەها فەیسبووکیش دەبێت زیاد بکرێت بۆ لیستەکە، بەتایبەتی دوای ئەوەی نرخی یەکەم ساڵی پشکەکانی گەیشتە زیاتر لە ١٠٠ ملیار دۆلار. لە ڕاستیدا، چاوەڕواندەکرێت پشکی فەیسبوک لە ڕێکلامە دیجیتاڵیە فرۆشراوەکان بگاتە ٢٠% لە ساڵی ٢٠١٥. تەنانەت لە ساڵی ٢٠١١

پێنج کۆمپانیای تەکنەلۆجیا (ئەپڵ و ئەمازۆن نایانگرێتەوە) ٦٨٪ ی کۆی داهاتی ڕیکلامی ئۆنلاینیان ژماردووە. پەیوەندیەکانی نێوان ئەم زەبەلاحانە هەمووی ڕکابەری و پێشبڕکێ نین، چونکە حاڵەتی هاوکاریش دەگرێتەوە بەپێی هەر حالەتێک، لە ڕێگەی پرۆژە ناوخۆییە هاوبەشەکانەوە لە زۆر وولات و ناوچەدا، و لە ڕێگەی پەرەپێدانی ناوەرۆک یان پلاتفۆرمی میدیا، و مامەڵەکانی دابەشکردن و ڕیکلامەکان، و هەندێ جار لە ڕێگەی گۆڕینەوەی ئەندامەکان لە ئەنجومەنی بەڕێوەبردنیان.

بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە هێز لە پیشەسازی میدیا چڕ بۆتەوە، یان لە پێشتر چڕتر بووە؟ یەکەم، ئەستەمە بەراوردێکی وا بکرێت؛ چونکە تەکنەلۆجیا گۆڕاوەکان بەردەوام جوڵەیان بە سنوری پیشەسازای میدیایان کردووە و گۆڕیویانە. دووەم، تەنانەت ئەگەر چالاکی یەکگرتن بۆتە هۆی پشتگیری کردنی کۆمپانیاکان لە هەندێ وولات، و هەندێک لە ئیمپراتۆرە میدیاییە نێودەوڵەتیە سەرەکیەکانی لێ دروست بووە، بەڵام بژاردە میدیاییەکان لە هەر دەوڵەتێک ئەمڕۆ زیاتر بەردەستا لە چەند دەیەیەکی پێشوو. تەنانەت لە ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەمیش دەوڵەتەکان کۆنترۆڵی زۆربەی یان هەموو کەناڵە تەلەفزیۆن و ڕادیۆیەکانیان کردبوو، نەک تەنها لە وولاتە پێشکەوتووەکان و ڕۆژهەڵاتیەکان، بەڵکو لە زۆربەی ئەورووپای ڕۆژئاواش. سێیەم، ئەزموونی بەکارهێنەرەکان لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە بووە هۆی فراوانبوونی کۆمەڵێک بژاردەی بەردەست. بۆ نموونە، ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمس ڕووماڵی هەواڵی ناوەخۆ بۆ شاری شیکاگۆ پێشکەش دەکات، و ڕۆژنامەی گاردیانی بەریتانی، کە دەکەوێتە شاری لەندەن، بۆتە پێگەیەکی هەواڵی بەناوبانگ بۆ وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؛ و ڕۆژنامەی ئەناشیونال، کە سەرچاوەکەی لە ئەبوزەبیە، ناسراوە بە

## کۆتایی سەردەمی هێز

ڕووماڵکردنی ڕۆشنبیری ئاست بەرز کە نووسەر و خوێنەری لە دەرەوەی بازاری ناوەخۆ ڕادەکێشێت. هەروەک ڕۆژنامەنووس ماکیل کینزلی لە ساڵی ٢٠١٠ گووتی " هەر ڕۆژنامەیەک کە بە زمانی ئینگلیزی بڵاودەبێتەوە لە هەر شوێنێکی جیهان ئێستا ڕکابەری دەکات لەگەڵ هەموو ڕۆژنامەکانی تر". لە کۆتاییدا، هەر بەڵگەیەک کە دەڵێت ڕاگەیاندن ئێستا لە جاران زیاتر تیشکیان لەسەرە ئەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگرن کە هەرسێ تۆڕە گەورەکانی تەلەفزیۆنی ئەمریکی، و ئاژانسی ئەسوشیتد پرێس و زۆرێک لە دامەزراوە میدیاییەکانی تر پێشتر پێگەی زاڵیان هەبوو لە بوارەکانیان، کەچی ئێستا وا نەماونەتەوە.

بەهەر حاڵ، ئاژانسەکانی ڕاگەیاندن، بە سەرنج ڕاکێشیەکەی بۆ ئارەزووەکان و ڕێکخەری بیروباوەڕەکانمان، وا دەکات کە هێزەکەی خۆی بدۆزێتەوە لە نووسینەکان و سەرچاوەکان و کاریگەریەکانی لە تێڕوانین و بڕیارەکانمان بەقەدەر ئەوەی کە لە پێکهاتەی ڕێکخستنی بازرگانی و داهاتەکانی کۆمپانیادا هەیە. چونکە ئەو ڕۆژنامەی کە بە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو دادەنرێت لە بازاڕی نەتەوەیی - وەک نیویۆرک تایمز و لوموند و ئەلبایس - بەدەگمەن زۆرترین بڵاوکراوە یان داهات دەبن. و ڕۆژنامە جەماوەریەکان - تابلوید - عادەتەن زۆرترین خوێنەری هەیە. پلەبەندیەکی هەرەمی وورد هەیە کە وادەکات هەندێک لە دەزگا میدیاییەکان بەسەر ئەویتریان سەرکەوێت لە ڕووی ڕاستگۆیی و پێگە. ئێستا شتە تەنیا پشت نابەستێت بەو پلەبەندیە هەرەمیە کە کەوتۆتە ژێر هەڕەشەوە، بەڵکو سنوری ڕۆژنامەوانی وەک پیشەیەک داڕماوە؛ چونکە هەر کۆمپانیایەکی سەرەتایی یەک لە دوای یەک توانایان لە ڕکابەری کردنی دەزگا میدیاییە دامەزراوەکان سەلماندووە، ئەوا ئەگەر توانای زاڵبوونی بەسەریشیاندا نەبێت. ڕۆژنامەی هاڤینگتۆن پۆست، بۆ نموونە، کە پێشتر دەزگاکانی ڕاگەیاندنە سەرەکیەکان گاڵتەیان پێدەکرد و بەوە وەسفیان دەکرد کە دەزگایەکە بۆ

کۆکردنەوەی هەواڵەکان لەسەر هەوڵ و کۆششی ئەوانی تر، پەرەی بە ئاستی نووسینی دا و بووە براوەی خەڵاتی بولیتزر لە بواری ڕۆژنامەوانی نەتەوەیی لە ساڵی ٢٠١٢. بڵاوبوونەوەی کامیرا دیجیتاڵیەکان و کامیرای مۆبایلەکان و ئامێرەکانی تۆمارکردنی ڤیدیۆ "ڕۆژنامەی هاووڵاتیان"ی هێنایە پێشەوە، کاتێک خەڵکە ئاساییەکە ڕکابەریان دەکرد لەگەڵ وێنەگرەکانی " باباراتزی" لە گرتنی وێنەی ناودارەکان ( ئەوانەی کە دواتر لە لایەن دەلالەکانی ئەنتەرنێت بۆ ڕۆژنامەکانی تابلوید دەفرۆشرێنەوە)، یان دابینکردنی بەڵگەی خام لەسەر دڕندایەتی پۆلیس، یان وێنی زوو لەسەر هەر کارەساتێکی سروشتی. ( لەگەڵ ئەمەش پێویستە ئەوە بێنینەوە یاد کە دیڤید وود، براوەی خەڵاتی بولیتزر لە ڕۆژنامەی هافینگتۆن پۆست، چەندین دەیەی لە ئەزموونی ڕۆژنامەوانی هەیە). لە هەمان کاتیشدا ئاسانی لە بڵاوکردنەوە لەسەر ئەنتەرنێت بلۆگە تایبەتەکانی هەموو شتێکی گۆڕی - لە سیاسەتی هەڵبژاردنەوە بۆ سیاسەتی دارایی و میوزیکی ڕۆک، .... هتد - بۆ سەرچاوەی باوەڕپێکراو و پڕداهات، کە زۆرجار لە ڕۆڵەکەی سەرکەوتووتر بێت لە ڕۆژنامەوانان و شیکەرەوەکان ئەوانەی کە لە ڕۆژنامەکان کاردەکەن.

حەلەتی نیت سیلڤەر وەربگرە، کە کەسێکە هۆگری زانستی ئامارەکانە، ئەوەی شارەزاییەکەی بەکارهێنا بۆ پێشبینیکردنی پێشبینیەکی زۆر وورد لە ئەنجامەکانی یاری بیسبۆل لە ساڵی ٢٠٠٨، و لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە ئەمریکا لە ساڵی ٢٠١٢، لە پێگەی ئەنتەرنێت Fivethirtyeight.com. وە بە بەکارهێنانی مۆدێلی ئامارە تایبەتەکەی بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکانی دەنگدان سیلڤەر توانی پێشبینی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنە پێشوەختەی نێوان باراک ئۆباما و هیلاری کلینتۆن بکات؛ پاشان پێشبینی بردنەوەی ئۆبامای کرد بەسەر جۆن ماکین لە کاتێکی زوو لە ساڵی

۲۰۰۸، وە هەروەها پێشبینیەکانی ڕاست دەرچوون لە ڕۆژی هەڵبژاردنەکان لە ٤٩ ویلایەتە لە نێو ٥٠ ویلایەت، و لە هەڵبژاردنەکانی ۲۰۱۲شدا زۆر بە ووردی پێشبینی ئەنجامەکانی کرد. لە ڕابردوو نموونەی وەک سیلڤەر لەوانەیە دووچاری ئاستەنگی زۆر قورس ببایەوە بۆ ئەوەی خەڵکی گوێی بۆ گرن، ئەمەش بەهۆی نەبوونی هیچ دەزگایەک بوو. ماڵپەری fivethirtyeight.com پێگەیەکی بەرزی گرت لە میانەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن؛ کە وایکرد کەناڵە تەلەفزیۆنەکان ناچاری بانگهێشتی سیلڤەر بکات بۆ بەشداریکردن لە هەندێک بەرنامە مشتومڕکانی، و لە ساڵی ۲۰۱۰ ماڵپەڕەکە ڕێگەپێدانی بەدەست هێنا بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز.

لەگەڵ لێکنزیکبوونەوەی پلاتفۆڕمە میدیاییە جیاوازەکان بلۆگەرەکان ( کە گۆڕان بۆ شرۆڤەکار) بوونە بە تەنیا گۆڕنێک لە گۆڕانە جۆراوجۆرەکان کە ئاژاوەیان خستە نێو پێکهاتەی هەرەمی تەقلیدی کاری ڕاگەیاندن؛ لە ساڵی ۲۰۱۱ ڕۆژنامەی هافینگتۆن پۆست کەناڵی هەواڵی تایبەتی کردەوە لە سەر ئەنتەرنێت کە بە درێژایی ۲٤ کاتژمێر کاری دەکات - ئەمە جگە لە دامەزراندنی ڕۆژنامەوانی زیاتر - و لە حوزەیرانی ساڵی ۲۰۱۲ ڕایگەیاند کە دەست دەکات بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەکی جودا لەسەر ئەنتەرنێت کە دەتوانرێت تەنیا لە ڕێگای ئەپل ستۆرەوە تەماشابکرێت. هەروەها لەسەر ئاستی جیهانیش فراوانتر بوو لە ئیسپانیا و ئیتاليا و فەرەنسا.

هاوکات ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بلۆگی خۆیان دەست پێ کرد، و بلۆگەرە گەورە سەربەخۆکانیان بۆخۆیان ڕاکێشا، لە بەریتانیا، بۆ نموونە، ڕۆژنامە سەرەکیەکان ( گاردیان و تایمز و دەیلی تێلێگراف) سەرنجی دەیان نووسەری ڕاوبۆچوونی ئۆنلاینیان بۆخۆیان ڕاکێشا. هەندێک تایبەتمەندی و کار کەم هەیە کە تایبەتە بە جۆرێکی دیاریکراو لە ڕێخراوە میدیاییەکان. هەرچی هەواڵەکان و

بیروبۆچووەکان و خۆشیەکانە ئەوا هەموویان بواری ڕێگەپێدراون؛ چونکە دەزگا میدیاییە چاپکراو و بیستراو و بینراوەکان هەریەکیان لە ڕێگەی نێوەندگیرەکانی تر دەستیان بە گەشەی زیاتر کردووە؛ هەروەها ئاسانی لە بەدەستهێنانی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی کەرستە میدیاییەکان و بڵاوکردنەوەیان هەموو ئەو بەربەستانی ڕووخاندووە کە بە پیشەی ڕۆژنامەوانی و مەودا و پسپۆری هەر دامەزراوەیەکی هەواڵ دەورەدراوە.

ئایا دەزگاکانی هەواڵە تەقلیدیەکان کەمتر دەبێت لەگەڵ زیادبوونی کەراکتەری بازرگانی و ململانێی خۆشیەکان بۆ پیشەسازی ڕاگەیاندن؟ مەرج نیە؛ لە ساڵی ٢٠١٠، بۆ نموونە، تاقیگەی نیمان بۆ ڕۆژنامەوانی ڕایگەیاند کە سێ دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی ئەوروپی سەرکەوتووبوون لە پیادەکردنی ئیستراتیجی جیاواز بۆ ئەوەی گەشەبکات و پێشبکەوێت لە سەردەمی دیجیتاڵی: دامەزراوەی سانوما، گەورەترین دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی لە فنلەندا، ڕێگای نوێی و براوەی داهێنا بۆ گواستنەوەی بەشداربووانی ڕۆژنامەی پەڕی بۆ بەشداربووان لە ڕۆژنامەیەکی دیجیتاڵی؛ وە دامەزراوەی شیبستیدی نەرویجی- هەشتەم لە گەورەترین دامەزراوە ڕۆژنامەوانیەکان لە جیهان، لە ٢٨ وڵات کار دەکات - زیاتر لە نیوەی داهاتی بەدەست هێنا لەو کەرەستانەی کە لە ئەنتەرنێت پێشکەشی کردوون، یان نزیکەی سێ هێندەی ئەوەی هەر ڕۆژنمەیەکی تر بەدەستی دەهێنا؛ هەروەها ڕۆژنامەی زایتونگی ئەلکترۆنی سویدی هەموو تیشکی خۆی خستە سەر کێشە ناوەخۆییەکان، بۆیە خوێنەری بە دەست هێنا لە ڕێگەی گوێندان بە هەواڵەکانی پەیوەندار بە سەرۆک ئۆباما و کێشە نێودەوڵەتیەکان بۆ بەرژەوەندی هەواڵەکانی پەیوەندار بە پارێزگاری شار و ژیانی سیاسی لە ناوچەکانی سویسرا.

ڕەنگە بەرزبوونەوەی ڕۆژنامەگەریی هاووڵاتی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە فەزای میدیادا توخمێکی تەواوکەری هەندێک لە یاریزانە بەردەستەکان بێت. لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

نێو توخمە نوێیەکاندا گرووپە ڕۆژنامەوانییە قازانج نەویستە سەربەخۆکانن، وەک دامەزراوەی پرۆپێلکا کە " ژوورنێکی هەواڵی سەربەخۆی قازانج نەویستە" (وەک خۆی وەسفی دەکات)، کە هاوبەشیی لەگەڵ ڕۆژنامە دامەزراوەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرکەوتوو بوو، و براوەی هەندێک خەڵات بوو ( لە حالەتی پرۆپێلکا، براوە لە خەڵاتی بولیتزر لە ساڵی ٢٠١١). نموونەیەکی تری بەکارهێنانی زیرەکانەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە لایەن ڕۆژنامەیەکی سەرەکیەوە لە مانگی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٩ ڕوویدا، کاتێک گاردیان بەسەر فەرمانی دادگادا زاڵ بوو کە ڕێگریی دەکرد لە بڵاوکردنەوەی پرسیارێک کە لە ئەنجومەنی کۆمۆنەکانی بەریتانیا خرابووە ڕوو، ئەمەش لە ڕێگای تویتێک کە سەرنووسەرەکەیان، ئالان روسبریدجر، نووسیبووی لە کاتێکی گونجاو. کێشە پەیوەندی هەبوو بە کۆمپانیای ترافیگۆرا کە لە بازرگانی نەوت کاردەکات، و تێوەگلابوو لە ئابڕوچوونی فڕێدانی پاشماوە ژەهراویەکان لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا، پارێزەرانی توانیان فەرمانێکی دادگایی بەدەست بێنن [ ڕێگری بکات لە باسکردنی ڕووداوەکە لەلایەن ڕۆژنامەوانیەوە]. روسبریدجر لە توویتەکەی نووسی:" ڕێگری لە ڕۆژنامەی گاردیان کرد لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی پەرلەمان بەهۆی ئەو هۆکارانەی کە ناتوانرێت بڵاوبکرێتەوە"، کەوای کرد شەپۆلێک لە دەمەقاڵی لەسەر ئەنتەرنێت دروست بێت ببێتە هۆی کردنەوەی بابەتەکە و ئاشکراکردنی بۆ ڕای گشتی. لە پیشەسازیەک کە حالەتی گشتی لە گۆڕانی بەردەوام و شۆڕشی تەکنەلۆجی بەخۆیەوە دەبینێت وەک پیشەسازی میدیا ناکرێت سەرکەوتنی هەموو جۆرە بەشداربووە بچووکە نامەرکەزیەکان و گرینگیان رەتبکرێتەوە، بەڵام لەوانەیە یاریزانە تەقلیدیەکان - لەگەڵ ئەوەش - ئەوان خاوەنی ووشەی کۆتایی بن. هەروەها گەشەکردنی جەماوەری ئامێرە هەڵگرەکان، بۆ نموونە، نەبۆتە هۆی بەرزبوونەوەی بەکاربەرانی هەواڵەکان بەتەنیا،

بەڵکو بووە هۆی گۆڕانێک بەرەو کوالیتیش، کە بەکاربەرەکان ئەو ئەپلیکەشن و ماڵپەڕە ئەلکترۆنیانە پەسەند دەکەن کە تایبەتن بە دامەزراوە میدیاییە ڕەسەنەکان کە بە بابەتیانە بەناوبانگن.

ئەم بەشە تیشکی خستە سەر کڵێساکان و سەندیکایەکان و دامەزراوە خێرخوازیەکان و میدیاکان. بەڵام دەکرا تەرخان بکرێت بۆ گۆڕانکاریەکانی هێز لە دامەزراوە ئەکادیمیەکانیش، کە بووە هۆی خوێندن لە ڕێگەی ئەنتەرنێت و قوتابخانە قازانجویستەکان و ڕکابەری جیهانی زیاتر بۆ چڕکردنەوەی هەوڵەکان بۆ ڕاکێشانی قوتابیان و سەرمایەدان بۆ توێژینەوەکان و مانەوە لە لووتکەی دامەزراوە ئەکادیمیەکان لە پێناو پێگە و هەیبەت. وە دەشکرا ئەم بەشە هەڵوەشانەوەی هێز شیبکاتەوە لە بواری داهێنانی زانستی، کە بۆتە چالاکیەکی جیهانی زیاتر لەوەی کە نەتەوەیی بێت، کە تێیدا هاوکاری دەکرێت لە نێوانن داهێنەران و هەندێ نەریت و بنەما هەیە بۆ گۆڕینەوەی زانست و زانیاری زیاتر. یان دەیتوانی سەرنج بخاتە سەر مۆزەخانەکان، کە نەک هەر دەبێت مامەڵە لەگەڵ پێشبڕکێکارە نوێیەکان بکات، وەک دروستکردنی مۆزەخانەی جیهانی لە شوێنە دوورەکانی وەک تاسمانیا و قەتەر- و شێوازی کارلێککردنی کلتوری نوێ - بەڵکو دەبێت مامەڵە بکات لەگەڵ دووپاتکردنەوەی زیاتری وڵاتە گەشەسەندووە بەتواناکان کە هەوڵی گێڕانەوەی کلتوری ڕۆشنبیری خۆشی دەدات. یان دەتوانرا تیشک بخرێتە سەر وەرزش، ئەو بوارە کۆنەی کە ژیانی تازەی بەخشی بە شێوازە نوێیەکان و دەوڵەمەندە تازەکان، یان زلهێزە نوێیە نەتەوەییەکان کە بەدوای وەرگێڕانی تێکڕای زیادەی بەرهەمن بۆ بردنەوە بە زۆرترین مەدالیای زێڕ، یان بۆ پیشەسازی خۆشی گەشەکردوو.

هیچ بوارێک نییە کە شۆڕشەکانی زۆربوون و جووڵەیی و عەقڵییەتی کاری لێ نەکردبێت، و هیچ بوارێک نییە بۆ گۆڕانکاریەکان کە پەیداکردن و

## کۆتایی سەردەمی هێز

بەکارهێنان و هێشتنەوەی دەسەڵات ئاسانتر بکات. چونکە لە بواری ئایینەکان، و دامەزراوە خێرخوازیەکان - گۆڕەپانەکانی ململانێ و ڕکابەرەی لە پێناو گیان و دڵ و مێشکمان - نەک تەنیا هیچ کارلێکێک نابینین لە نێوان هۆکارە تازەکان، بەڵکو پرۆسەکانی پارچەبوون و جەمسەرگیریش دەبینین کە دووبارە کۆمەڵگایەکانمان دادەڕێژتەوە لە سەر هەموو ئاستەکان. ئەمڕۆ لەم بوارانە بژاردە بەدەستەکان لە بەرامبەرمان زیاترە لە هەرکاتێکی پێشووتر.

بەڵام ئەمە جێگای پرسیارکردنە: چی ڕوودەدات کاتێک ئایین دابەش دەبێت بۆ هەزار یان ملیۆن چین یان ڕەوت، یان کاتێک هەوڵدان لە پێناو بەرژەوەندی گشتی دەگۆڕێت بۆ ڕیزێکی دیزینکراو بە گوێرەی یارمەتیدانی کێشەیەک یان کەسێکی دیاریکراو، یان کاتێک هاوولاتیان دەست لە هەموو هەواڵە چاکەکان هەڵدەگرن بۆ بڵاوکردنەوە و ڕوودەکەنە ئەو هەواڵانەی کە تەنیا دەیانەوێت گوێبیستی بن. هەموو ئەم بابەتانە ئاڵنگاریەک دەنوێنن بۆ هەوڵەکانی کاری بە کۆمەڵ. وە ئەو ئاڵنگاری گەورانەی کە دووچاری دەبینەوە، لە دیاردەی گۆڕانی کەشوهەواوە بۆ زیادبوونی نایەکسانی، کارێکی بە کۆمەڵ و ڕێگایەکی هاوبەشی نوێی پێویستە بۆ بیرکردنەوە دەربارەی کەڵەکەبوونی هێز و بەکارهێنانی. دواتر باسی هەردوو بابەتی کەڵەکەبوونی هێز و بەکارهێنانی دەکەین - پاش کەمێکی تر، پاش ئەوەی لە بەشی دواتر ئەوە دەپشکنین کەوا ئایا ئەم جیهانە نوێیە بەڕاستی هاتووە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە و ئایا هەڵوەشانەوەی هێز بە ڕاستی سوودی زیاتری بۆ کۆمەڵگە هێناوە یان بارگرانی زیاتر.

## بەشی دەیەم

## هەڵوەشانەوەی هێز: ئایا جاماکە نیوەی پڕە یان نیوەی بەتاڵە

دەزانم کەوا من دەڵێم هێز لە هەڵوەشانەوەدایە لەگەڵ ئەوەی سەردێڕی ڕۆژنامەکان بە ڕێکخراوی ئاماژە بە پێچەوانەی ئەوەوە دەکەن؛ چونکە هەندێک لە حکومەتەکان لە ئێستادا لە جاران گەورەترن؛ وە لە ناوەخۆی وولاتانیش، سامان و داهات لە ڕاستی دا زیاتر چڕبۆتەوە. چینی مامناوەند لە وولاتە دەوڵەمەندەکان دەستیان بە کەمبوونەوە کردووە، و کۆمەڵێکی بچووک لە خەڵک دەستیان بە کۆکردنەوەی سامانەکان کردووە کە پێشبینی ناکرێت. و ئەو کۆمەڵە و کەسایەتیانەی کە خاوەنی سامانێکی زەبەلاحن و دەستیا بە بەکارهێنانی کردووە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتێکی سیاسی تا ڕادەیەکی ماقول. لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خاوەن گازینۆ دەوڵەمەندەکان و بەڕێوەبەرەکانی سندوقی دەرماڵە و گەورەکانی خانوبەرە هەڵدەستن بە بەکارهێنانی سامانەکەیان بە شێوەیەکی ئاشکرا بۆ پشتگیری کردنی دارایی " لیژنەکانی کارە سیاسیە گەورەکان کە لە بەرژەوەندی ئەژێندا تەسکەکان کار دەکەن، یان ڕەواج دەدەن بۆ ئەو بەربژێرانەی کە بەرگری دەکەن لە بەرژەوەندی کار و کۆمپانیاکانیان. لە ڕووسیا و چین و زۆرێک شوێنەکانی جیهان، ئەبینین کە کەمینە زەنگینەکان، بە تێوەگلان لەگەڵ بەرپرسە حکومیەکان، ئەوانن ئەزموونی دەسەڵات دەکەن؛ بە کورتی و بە ڕاستی. هەروەها گەورەکانی میدیا دەسەڵاتیان بەکاردەهێنن بۆ فراوانکردنی هێزی ڕۆژنامەوانیان و گەیاندنی مەودایەکی بۆ کۆشکە سەرۆکایەتیەکان. وە ئەو زۆرینەی کە ٩٩% پێک دێنێت هەست دەکات کە

دووچاری قۆڵبڕی و هەژاری و بەکارهێنان دەبێتەوە لەلایەن دەوڵەمەندە بەهێزەکان کە تەنها ١% پێک دێنن.

کەواتە، چۆن دەکرێت ڕاست بێت کە هێز دەستی بە هەڵوەشانەوە و پەرتەوازە کردووە، و وای لێهاتووە خێراتر لەناو بچێت؟ یان کە بەهێزەکان کەتوونەتە ژێر ئابلۆقە؟ چونکە بەهێزەکان ئەمڕۆ زیاتر لە جاران سنوردارکراون، هەروەک پەڕەکانی ئەم کتێبە ڕوونی کردەوە، بەدەستەوەگرتنیان بۆ هێز ئێستا لاوازترە لەوەی کە باوانیان دەستیان پێوە دەگرت، وە ماوەی مانەوەیان لە لووتکە لە جاران کورتترە.

گومان نیە کە فلادیمیر پوتین، بۆ نموونە، خاوەنی هێزێکی بێ وێنەیە، بەڵام بەدەست ئاستەنگی زیاترەوە دەناڵێنێت، و مەودای بژاردەکانی لە یەکەم خولی سەرۆک کۆماری ڕوسیا و پاشان وەک سەرۆک وەزیران تەسک بۆتەوە. بەهەمان شێوە پێدەچوو ئەو بانکە نوێیانەی لەدوای قەیرانی دارایی ساڵی ٢٠٠٨ەوە هاتنە لوتکە بۆ ماوەیەکی زۆر سیستمی دارایی جیهانی بەڕێوەببەن، بەڵام دوای کەمتر لەچوار ساڵ زۆرێک لەکارەکانیان لەدەستدا، لەکاتێکدا ئەوانی تر ئابلۆقەدران لە ئەنجامی ئاشکرابوونی ساختەکاریان بۆ نرخەکانی قازانج (بانکی بارکلیز)، و لەدەستانە بازرگانیە شاراوەکان ( جی پی مۆرگان تشیس)، سپی کردنەوەی سەرمایە ( ئێچ ئێس بی سی)، مامەڵە نایاساییەکان لەگەڵ ئێران (ستاندەرد تشار ترز)، و ئاڵوگۆڕکردن لە ناوەوە لە لایەن یەکێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن (گۆڵدمان ساکس) و زیاتر لەمانەش. ئەم ڕووداوانە دەسەڵاتی ئابووری بانکە گەورەکانیان لە ناو نەبرد، و گرووپە بەرژەوەندیە بانکیەکان بەردەوام بوون لە کاریگەری سیاسی زۆر گەورە. لەگەڵ ئەوەش هەندێک لە گەورە بەرپرسانی جێبەجێکار هێزیان لەدەست دا، وە بێ گومان کە بانکەکان کەوتنە ژێر کۆتی زیاتر دەربارەی ئەوەی کە دەتوانێت بیکات. لە نێوان بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکان نەک تەنها بانکەوانەکان – هیچ کەسێک هەست بەوە ناکات کە پۆستەکەی

پارێزراوە جگە لە هەندێکی بێ ئاگا یان لووت بەرزی کوێر نەبێت. نەبوونی یەکسانی ئابووری — کە بۆ ماوەیەکی زۆر ئاسانکاری بۆ کراوە، و تەنانەت لە هەندێک وولات شانازیشی پێوەکراوە — بۆتە بابەتێکی سەرەکی بۆ گفتوگۆکردن لە زۆر وولاتان. پێکەوە ژیانی ئاشتیانە یان بەلایەنی کەم هێمنانە لەگەڵ نایەکسانی دەستی بە کۆتایی کردووە؛ لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەورووپا، تا شەقامەکانی جیهانی عەرەبی و تەنانەت چینیش.

هەروەوک بینیمان لە بەشەکانی ڕابردوو، زۆربەی بوارەکانی تری چالاکی مرۆیی کە خاوەن هێزە تەقلیدیەکان زاڵبوون بەسەری ئێستا گۆڕاوە بۆ گۆڕەپانەکان بۆ ململانێیەکی یەکلاکەرەوە، کە خاوەن هێزە دامەزراوەکان دووچاری ئاڵنگاریەکی ڕێکخراو دەبنەوە، و بە شێوەیەکی زیاتر دەڕووخێن، ئەمەش هەواڵێکی دڵخۆشکەرە.

### ئاهەنگ گێڕان بە هەڵوەشانەوەی دەسەڵات

ئەنجامە ئەرێنی و سەلمێنراوەکانی کەوتنی دەسەڵات بریتین لە بنیاتنانی کۆمەڵگا ئازادەکان و هەڵبژاردن و بژاردەی زیاتر بۆ دەنگدەران، و پلاتفۆرمی نوێ بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگاکان، و بیرۆکە و دەرفەتی زیاتر، و وەبەرهێنان و بازرگانی زیاتر، و کێبڕکێی زیاتر لە نێوان کۆمپانیاکان، و پاشان هەڵبژاردنی زیاتر بۆ بەکاربەران. هیچکام لەم ئەنجامانە دەرەنجامێکی گشتگیری جیهانی نییە، وە دەتوانین لە هەر حاڵەتێکدا جیاکاریی نائومێدکەر بدۆزینەوە، بەڵام ڕەوتە گەورەکە بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر ڕوونە.

بۆ نموونە لە سیاسەتدا سەقفی بەرز لەسەر ئازادییە سیاسییەکان بە ڕوونی دیارە،و ستەمکاری لە حاڵەتی داڕماندایە. بەڵام پێشکەوتنی دیموکراسی زۆر دوورە لە تەواوبوون، بێگومان. هەندێک وڵات (وەک چین، کۆریای باکوور، کوبا

و بیلاڕووس) هێشتا دیموکراسییان ئەزموون نەکردووە، یان وەک ڕووسیا بە ڕژێمیەکی نائومێدکەر پراکتیزەی دیموکراسی دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هێزانەی کۆڵەکەکانی ستەمکاری لاواز دەکەن بەردەوامن لە کارکردن لە گۆڕەپانە گشتیەکاندا کە بوونەتە سیمبولی بەهاری عەرەبی، تەنانەت لە شەقامەکانی تاران و لە لاپەڕەکانی ئینتەرنێتی چین، و بە شێوەیەکی زۆر لە شەقامەکانی شارەکانیان، و لە کۆمەڵگاکانی تر کە ڕژێمە سەرکوتکەرەکان فەرمانڕەواییان دەکەن کە سورن لەسەر کۆنترۆڵکردنی گەلەکەیان. ئێمە ئێستا زیاتر و زیاتر بابەتی زانستی دەبینین بە ناونیشانی وەک: "بۆچی چین دەبێتە سیستەمێکی دیموکراسی؟" گوایە ڕۆژانی ستەمکاری لەم وڵاتە زەبەلاحەدا ژمارەیان کۆتایی پێ هاتووە، و پێشبینییەکان زیادی کردووە لەسەر کۆتایی دەستگرتنی پارتی کۆمۆنیستی چینی لەسەر دەسەڵات.

بۆ چی نا؟ بۆچی چین دەبێت جیاکەرەوە بێت؟ بۆ بەشە گەورە ماوەکەی جیهان دەسەڵاتی سیاسی کەمتر لەنگەر بووە. لەم چەند دەیەی دواییدا ژمارەیەکی بێوێنەی پارت و لایەنە سیاسییەکان کێبڕکێیان بۆ دەسەڵاتی هەڵبژاردن کردووە، و حکومەتەکانی ئێستا زیاتر لە جاران دووچاری کەوتن یان گۆڕان بوونەتەوە. وە پێشبینی دەکرێت هەندێک لە زانایانی سیاسی کاریگەر، هەروەک هەندێکیان لە ئاسیا لە ساڵانی نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم کردیان، پێدەچێت مشتومڕ لەسەر ئیستحقاقاتی سیستەمێکی سیاسی و گواستنەوەی ڕێکوپێک بکەن، یان هۆشداری بدەن کە هەندێک وڵات بەهێز و هاوپێچ نین بۆ بەرگەگرتن لە کرانەوەی دیموکراسی لەناکاو. لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی بیستەم پرۆفیسۆری هارڤارد سامویل هانتینگتۆن نەیتوانی ئاماژە بە زۆرێک لە دەوڵەتەکان بکات کە لە حوکمی داگیرکاری دەردەچن یان گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی خێرایان بەسەردا هاتووە، و خێرایی و مەودای ئەم گۆڕانکارییانە بە شێوازی توندوتیژی و ئاژاوە و

یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەکان ببەستێتەوە. هانتینگتۆن، گووتی:"پێویستە دەسەڵات هەبێت پێش ئەوەی کەمبکرێتەوە، چونکە دەسەڵات لەو دەوڵەتە مۆدێرنانەدا دەگمەنە، کە حکومەت لە ژێر ڕەحمەتی ڕۆشنبیرانی دوورخراوەن لە کۆمەڵگا، و خاوەن عەقیدە و توانایەکی بەهێز ناتوانرێت فەرمانڕەوایەتیان بکرێت، و خوێندکاری ئاژاوەگێڕن". ئەستەمە ئەمڕۆ شوێنێک بۆ ئەم بۆچوونانە بدۆزرێتەوە، ڕەنگە جگە لە باوەڕ و ڕۆژنامەی فەرمی حیزبی کۆمۆنیستی چینی، یان لە نێو ئەوانەی دەترسن نەمانی دیکتاتۆرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ببێتە هۆی سەرهەڵدانی دیکتاتۆرییەتی سەرکوتکەرانەتر و تاریکتر. ئێمە دەزانین کە لە ماوەی گواستنەوە بۆ دیموکراسیدا زۆر جار دەوڵەتەکان بەدەست هەڵچوونێکی سیاسیەوە دەناڵێنن کە حوکمڕانێتییەکەیان قورس دەکات، و بەو هۆیەوە هەستەکان دەچێتەوە بۆ ڕژێمی دەسەڵاتداری ستەمکاری کۆن.

جیهانگیری ئابووری هۆکاری زیاتر زیاد دەکات بۆ ئاهەنگ گێڕانی هەڵوەشانەوەی دەسەڵات لە نێوان یاریزانە گەورەکانی کۆندا، ئەمڕۆ کۆمپانیا بچووکە دوورە دەستەکان پشکی کۆمپانیا بەناوبانگەکان وەردەگرن، وە کۆمپانیا دەستپێکەکان مۆدێلی بازرگانی نوێ دروست دەکەن کە تەختی کۆمپانیا زەبەلاحەکان دەهەژێنێت و وایان لێدەکات بەلادا بێن و بچن. وەک بینیمان لە بەشی هەشتەمدا، لە نموونەیەکی سەرسوڕهێنەری کاریگەری شۆڕشەکانی زۆربوون و جووڵەیی و عەقڵییەتی لە دەسەڵاتدا، مۆدێلەکانی وەبەرهێنانی سەرمایەداری دەستپێشخەر لە دۆڵی سیلیکۆنەوە بۆ زۆرێک لە وڵاتانی تر بڵاوبووەتەوە، ئەو شتەی کە کارامەیی و توانای تەواوی بەرپاکرد بۆ ڕێکخستنی بازرگانی و پرۆژەکان لە ناوەندەکانی داهێنان کە پێشتر دەست پێ گەیشتنیان ئەستەم بوو، کۆمپانیای نوێی فرە نەتەوە دەرکەوتن کە لەو وڵاتانە هاتبوون هەموو کۆمپانیا جیهانیەکان بەدووریان دەگرت لەوەی کە زەویەکی بەپیت بێت بۆ بەرهەم هێنانی

ڕکابەرە شاراوەکان.

ئێمەش دەزانین کە گۆڕینەکان لە ڕێکخستنی هاوبەشدا هێندەی ئابووری بازاڕی مۆدێرن کۆنن، و پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لە نێوان داهێنان و "تێکشکانی داهێناندا" لە دڵی زیندوویی سیستەمی سەرمایەداریدا، بەڵام ئەو گۆڕانکارییە جیهانییە گەورەیەی کە ئێستا دەیبینین زیاتر لەمە دەڕوات. وە ئەوە دەتوانرا ڕوویدات بەبێ هەڵوەشانەوەی هێز.

لە ناوەڕۆکی ئەم گۆڕانانەدا، شتێک هەیە کە بۆ مرۆڤ نەستەمە قبوڵی بکات: هەروەک چۆن هەڵوەشانەوەی دەسەڵات لەسیاسەتدا ڕژێمەکانی دەسەڵاتخوازی لاواز کردووە، ئەمەش وای لە بواری بازرگانی کردووە کە قۆرخکاری و پاوانخوازی کەم بکاتەوە لە کاتێکدا هەڵبژاردنی زیاتر و نرخی کەمتر و کوالێتی باشتری بۆ بەکاربەران فەراهام کردووە. ئابووری کلاسیکی و بیری سیاسی لیبراڵی لەسەر ئەو بیرۆکەیە سەرچاوەی گرتووە کە هەمیشە قۆرخکارییەکان لە زۆربەی حاڵەتەکاندا نەخوازراون. تەنانەت لەو بوارانەی کە پێشتر قۆرخکارییەکان بە حەتمی دەزانرا، وەک دابینکردنی ئاو و کارەبا، ئێستا دەتوانرێت بکرێنەوە بۆ پێشبڕکێ. ئەوانەی ئەمڕۆ گەنجن ڕەنگە وێناکردنی بارودۆخێک بە زەحمەت بزانن کە هەموو کۆمپانیاکانی تەلەفۆن لە جیهاندا قۆرخکاری بوون، زۆربەی کات کۆمپانیای حکومەت بوون، و زۆرجار توانای پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری پەسەندکراوی نەبوو. بەڵام ئەو حالەتە زۆر لەمەو پێش نیە. ئەمڕۆ، پێشبڕکێ لە خزمەتگوزاری تەلەفۆنیدا چڕە، وە هیچ کۆمپانیایەک هەست بە پارێزراوی ناکات، یان بە بەردەوامبوونی درێژخایەن بە بێ لەبەرچاوگرتنی قەبارە و سەرچاوەکانی. ڕقی ئێمە لە قۆرخکردن درێژ دەبێتەوە بۆ قۆرخکاری کەمینەکان (ئۆلیگۆپۆلی) و کارتێلەکان، بۆیە ئەوەندەی تر هەڵوەشانەوە هێز ڕێگری لە گرووپە بچووکەکانی کۆمپانیا گەورەکان بکات لە

ڕاهێنانی هێزی بازاری هەرەمەکی، ئێمە زیاتر مەیلی ئاهەنگ گێڕانمان دەبێت.

چ شتێک نابێت ئارەزووی بکەین؟ مەترسییەکانی هەڵوەشانەوە

بەڵام ئاهەنگ گێڕان بە سوودەکانی هەڵوەشانەوەی دەسەڵات نابێت وامان لێبکات کە ئەو ڕاستییە فەرامۆش بکەین کە جامی نیوە پڕیش نیوەی بەتاڵە؛ چونکە هەڵوەشانەوەی هێز مەترسیش لەخۆدەگرێت.

هەڵوەشانەوەی دەسەڵات یەکێکە لەو هۆکارە بنەڕەتیانەی کە حکومەتەکان بە شێوەیەکی زۆر ناتوانن بڕیارە پێویستەکان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانی وڵاتەکانیان دەربکەن، یان کە وادەکات گروپەکانی دەوڵەتە پێشەنگەکان خاوتر و کەمتر کاریگەر بن لە چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتییەکاندا.

هەڵوەشانەوەی هێز یەکێکە لە فاکتەرە بزوێنەرەکانی پشت ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوە تاوانبار و تیرۆریستەکان یان ئەکتەرە کاریگەرە ناحکومییە ڕق لە دڵەکان. چونکە بۆ ئەم ڕێکخراوانە یان ئەکتەرە کاریگەرەکان، سنووری جوگرافی هیچ مانایەکی نییەوە حکومەتەکان تەنیا ڕێگرێکی ناکاریگەرن بۆ هێرشبردن و ژێرپێدانان یان پشتگوێ خستنیان.

سەرەڕای ئەوەش لاوازی هێز ئاسانکاری کردووە بۆ سەرهەڵدانی سیاسەتی توندڕەوی چ جوداخواز و زینۆفۆبی بێت یان تایفەگەری لە دیموکراسیە چەسپاوەکان و سیستەمە سیاسیە نەزۆکەکاندا.

وە هەموو جۆرە گروپ و کۆمپانیا، و دەزگاکانی ڕاگەیاندن کە خۆیان لە پشکنین و وردەکاریە تەقلیدییەکان بەدوور دەگرن و سپۆنسەرەکانیان لە ترافیکی ئینتەرنێتدا خۆیان دەشارنەوە، بەرهەم هێناوە. هەروەها دەرفەتی زیاتری بۆ

ساختەکاری و فێڵی بازرگانی ڕەخساندووە.

ئێمە زۆر جار پێویستمان بە کێشە و مانشێتە ڕۆژنامەوانییە دیارەکان هەیە دەربارەی خەڵک یان ڕێکخراوەکان بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی خێرامان لە کێشە گەورەکە بدەنێ، بەڵام هەرکام لەم یاریزانە تاکەکەسیانە مەترسی کەمبوونەوەی هێزیان هەیە. بێگومان ئەمە بەو مانایە نییە کە ئێمە دڵنیا بین لێیان و نیگەرانیان نەبین، چونکە کێبەرکێ بۆ تاوانکاریی لێخۆشبوونی بۆ نیە. بەڵام دەبێت لەبیرمان بێت کە تاڵیبان و ئەلقاعیدە و کارتێلی دەرمانی مەکسیکی زێتاس هەموویان لق و لایەنیان هەیە، وە هەڕەشەی چینێکی یەکگرتوو جیاوازترە لەو هەڕەشەیەی چین کە شایەتحاڵی هێزێکی خێرایە لە نێوان پارێزگاکان و گرووپە بەرژەوەندیەکان و ڕکابەرەکان لە ناوەوەی پارتی کۆمۆنیستی چینی، و بەم شێوەیە.

لە کۆتایدا، یاریزانەکان دەگۆڕێن، یان بە زاڵبوون لەلایەن پێشبڕکێکارەکانیان، یان بە گۆڕانێک لە ناوەوە. لە زۆر حاڵەتدا ئەو ئامرازانەی بەکاری دەهێنن بۆ ڕاهێنانی هێزیان دەمێنێتەوە، لە هەندێکی تر یاریزانانی نوێ بەهێز دەبن بە دروستکردنی ئامرازی نوێ بۆ بەدەستهێنانی هێز. هێزی فەیسبووک یان گووگڵ لە تەکنەلۆجیای نوێیەکەی دایە کە ئەوانی دیکە نیانە، و قاعیدەش هێزی لە ڕێگای شێوازە نوێیە کوشندەکەی بە دەستهێناوە بۆ "ئەنجامدانی کارەکەی".

سەرەڕای ئەوەش، گەورەیی شۆڕشەکانی زۆربوون و جووڵانەوە و عەقڵییەتەکان لە هەمان کاتدا کێشەکانی ئێمەی گەورەتر و ئاڵۆزترکردوە، و لاوازترین شتی ئێمەش نەبوونی میکانیزمە بۆ چارەسەرکردنیان. هەڕەشەی گۆڕانی کەش و هەوا بێنە بەرچاو، هەرچەندە دەرچوونی چین و هیندستان لە هەژاری ستانداردی ژیانی ملیارەها کەسی بەرزکردۆتەوە، بەڵام هەروەها بڵاوبوونەوەی گازی خانووبەرەیی لە

## کۆتایی سەردەمی هێز

هەردوو وڵاتدا بە شێوەیەکی بەرچاو خێراتر کردووە. چین لە ساڵی ٢٠٠٦ سەرکەوت بەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وەک گەورەترین هەناردەکەری گازی خانووبەرە، و هندستان لەو ساڵەدا پلەی چوارەمی بەدەست هێنا. لەبەر ئەوە هەر هەوڵێک بۆ کەمکردنەوەی دەرچوونی کاربۆن لە وڵاتێکدا پێویستە ڕەچاوی کردارەکانی دەوڵەتی دیکە بکات، نەک هەر لەبەر ئەوەی کۆمپانیاکان بەرهەمی چڕی کاربۆنی خۆیان گواستووەتەوە بۆ دەرەوە لە بەرامبەر سیاسەتی ژینگەیی و میکانیزمەکانی نرخدانانی کاربۆن کە لەلایەن وڵاتانی پێشکەوتووەوە پیادە کراوە، بەڵکو لە بەرامبەر هەناردەی چەک، و ڕێککەوتنەکانی مەودای ئینتەرنێتەوە بۆ ڕاوگەکانی ماسی و بازرگانی کشتوکاڵییش، و هەموو ئەوانەی بابەتێکن بۆ دانوستانی نێودەوڵەتی کە ئەمڕۆ داواکاری زۆر لەخۆ دەگرێت لەلایەن ژمارەی زیاتری خاوەن بەرژەوەندییەکان، لە ئەنجامی ئەمە وامان لێهاتووە زیاتر و زیاتر دەست بەستراوبین لە جێبەجێکردنی ڕێکارەکان کە کەمترین دابەشکردنی هاوبەش تێپەڕێنێت و پێشکەوتنێکی ڕاستی بەخۆوە ببینێت لە کێشە پێشکەشکراوەکە. بوونی ئەکتەرەکان (پێشتر "لاواز" بوون) لەگروپێکی هەمەجۆرتر و گشتگیرتر، و کەمکردنەوەی یاسای ستەمکاری کە لەلایەن چەند یاریزانێکی بەتواناوە بەسەر جیهاندا سەپێنراوە، شتێکە کە شایەنی پێداهەڵگوتن و خێرخوازیە، بەڵام گرانتربوونی چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکان، شتێکی خوازراو نیە.

### ئیفلیجی سیاسی وەک زیانێکی لاوەکی بۆ هەڵوەشانەوەی دەسەڵات

ئەم ئیفلیج بوونە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر ڕوون بووە، چونکە پاش ئەوەی سیاسەت زیاتر جەمسەردار بووە، کەموکوڕییەکانی ئەو سیستەمەی کە بە میکانیزمەکانی ڕێکخستن بارگرانبووە، زیاتر دەرکەوتوە. فرانسیس فوکۆیاما ئەم سیستمە بە "ڤیتۆکراسی" ناودەبات و دەڵێت" ئەمریکییەکان زۆر شانازی بە دەستورێک دەکەن کە دەسەڵاتەکانی هێزی جێبەجێکار لە ڕێگەی

کۆمەڵێک پابەندبوون و هاوسەنگییەوە سنوردار دەکات". بەڵام ئەو پابەندبوون و هاوسەنگیانە ڕاوێژیان پێکراوە. ئێستا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەوڵەتێکی ڤیتۆکراتییە. کاتێک ئەم ڕژێمە ڤیتۆکراتیە لەگەڵ لایەنە خاوەن بیروباوەڕەکان کۆدەبێتەوە.... ئەنجامەکە ئیفلیجیە... ئەگەر بمانەوێت لەم ئیفلیجییەی ئێستا دەربچین، تەنیا پێویستمان بە سەرکردایەتییەکی بەهێز نییە، بەڵکو پێویستمان بە گۆڕانکاری لە یاسا دامەزراوەییەکانیشدا هەیە".

ئابووریناس پیتەر ئۆرسزاغ ڕێگای کارکردنی رژێمی ڤیتۆکراتی پیشان دا لەگەڵ ئەنجامە ترسناکەکانی. لە ساڵی ٢٠١١دا، لە نووسینێکی وەک کەسێکی گەورە لە دروستکردنی سیاسەتی ئابووری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، گووتی " لە ڕێگای کۆتا کارم وەک بەڕێوەبەری فەرمانگەی بەڕێوەبردن و بودجە لە ئیدارەی ئۆباما، بۆم دەرکەوت کە جەمسەرگیری سیاسی بەرەو خراپتر دەڕوات لە وڵات، کە زیانی گەیاندووە بە توانای واشنتۆنی بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە بنەڕەتییە پێویستەکانی فەرمانڕەوایی ". ئێمە دەبێ بەرەنگاری خنکانی دامودەزگا سیاسییەکانی خۆمان ببینەوە بە تا ڕادەیەک کەمتر دیموکراسیکردنی، گرنگ نییە کە ئەمە چەندە ڕادیکاڵ بێت. من دەزانم کە ئەم جۆرە بیرۆکانە مەترسیان هەیە. من بە دڵنەواییەوە بەم پێشنیارانە گەیشتووم: ئەوانە دەرەنجامی نائومێدین زیاتر لەوەی لە ئیلهامەوە هاتبێت، بەڵام دەبێت ڕووبەڕووی ئەو ڕاستییەش ببینەوە کە حکومەتێکی نوقمبوو لە جەمسەرگیری و سستی وڵاتەکەمان تووشی زیانێکی ڕاستەقینە دەکات. بۆیە پێویستە لەسەرمان ڕێگایەک بدۆزینەوە بۆ دەرچوون لەم بارودۆخە".

پیتەر ئۆرسزاغ کەسێکی ڕادیکاڵ نییە کە مەیلی دەسەڵاتخوازی هەبێت. لە ڕاستیدا پێشنیارەکانی لە بنەرەتدا بانگی چاکسازی بنەڕەتی تەکنۆکراتی دەکەن، چونکە ئەو زیاتر پەسەندی بەهێزکردنی ئامرازەکانی جێگیری دارایی خودکاری (

ئەو باج و خەرجییانەی کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی فراوان دەبێت کاتێک ئابووری خاو دەبێتەوە، و دەچەتەوە یەک لەگەڵ گەشەسەندنی ئابووریدا) دەکات، وە هەروەها نوێکردنەوەی یاساکانی پشتگیری ( بۆ چارەسەرکردنی ئەو حالەتانەی کە دەردەکەون کاتێک کۆنگرێش هیچ جوڵەیەک ناکات، کە جۆخەکە لە تەمەڵی دەگۆڕێت بۆ کارکردن و بەدەست هێنان)، و زیاتر پشت بەستن بە لیژنەی پسپۆرە نوێنەرەکان بۆ کارکردن لە چوارچێوەی ئەو یاسا و بنەمایانەی کە لە فشارە حیزبیەکان دەپارێزێت.

لەکاتێکدا نموونەکانی پێشوو لەسەر بنەمای ئەزموونی ئەم دواییەی ئەمریکا بوون، بەڵام زۆربەی دیموکراسییەکان بەدەست ئەم تێکەڵەیەی جەمسەرگیری سیاسی تیژ و پێکهاتەی دامەزراوەییە دەناڵێنن کە وادەکات زۆر قورس بێت بۆ حکومەتەکان بڕیاری خێراو کاریگەریش بدەن. وەک لە بەشی پێنجەمدا تێبینیمان کرد، دەبێت ئەوەمان لەبیر بێت کە لە ٣٤ دەوڵەمەندترین دەوڵەتە دیموکراسییەکانی جیهان لە ساڵی ٢٠١٢، تەنیا چواریان سەرۆک یان سەرۆک وەزیرانێکیان هەبوو کە پارتەکەی زۆرینەیان لە پەرلەماندا هەبوو. وەک وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وڵاتانی تر بێ بیرۆکەی داهێنەرانە نین بۆ ئەوەی سیستەمەکانیان بە پابەندبوون و هاوسەنگی چاک بکەن و دەسەڵات لە ئیفلیجی سیاسی دەربکات و کوالیتی سیاسەتەکانی باشتر بکات. بەڵام ئەم پێشکەوتنە ئیجابیانە نە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نە لە شوێنەکانی تر ڕوونادات. تەنانەت فشارە خێراکانی قەیرانی ئابووری ئەورووپاش وایان لە سەرکردەکان نەکردووە کە ئەو هێزەی کە پێویستیانە دابین بکەن بۆ وەڵامدانەوەیەکی خێرا و کاریگەری ڕووداوەکان. لە ڕاستیدا پێچەوانەکەی ڕووی داوە: لەبەرئەوەی قەیرانی ئابووری جەمسەرگیریی و پارچەپارچەیی زیاترکردووە، ئەوا لاوازبونی ئەوانەی دەسەڵاتدارن و هەموو ئەوانەشی کە دژایەتیان دەکەن وەک یەک زیادی کردووە. هیچ

## کۆتایی سەردەمی هێز

کەسێک توانای ئەوەی نەبوو کە گۆڕانکاری پێویست و بەپەلە ئەنجام بدات، بەڕاستی ئەمە کۆتایی سەردەمی دەسەڵاتە.

کێبەرکێی وێرانکار

لە زانیستی ئابووریدا چەمکێک هەیە بە ناوی کێبەرکێی وێرانکار، ئاماژە بە بارودۆخێک دەکات کە نرخەکان لەلایەن کۆمپانیاکانەوە لە پیشەسازییەکی تایبەتدا تا ئاستێک نزمن کە نرخی بەرهەمهێنان ناپۆشێت. کۆمپانیاکان ئەو کارە دەکەن کاتێک دەیانەوێت بە خێرایی لە سەرمایەکانیان ڕزگار بن، یان کاتێک ئامانجیان ئەوەیە کە ببێتە هۆی ئەوەی کە پێشبڕکێکارێک مایەپووچ بێت، نەوەک قازانجی کورتخایەن زیاتر بکات. پاشان بە هەمان شەوە لەلایەن ڕکابەرەکانیەوە وەڵام دەدرێتەوە. کاتێک ئەم دۆخە زیاتر دەبێت لە شەپۆلێکی کاتی تاکتیکی بازرگانی شەڕانگێزی، ئەوا هەڕەشەی لەناوبردنی هەموو پیشەسازییەکە دەکات. وە بارودۆخی دیاریکراو هەیە کە کێبەرکێی تێکدەرانە زیاتر دەکات. ئەو شتە ڕوودەدات، بۆ نمونە، کاتێک کە زۆر لە توانای بەرهەمهێنانی زیادە هەیە - کارگە و کەلوپەلە بەکارنەهاتووەکان، یان ئەو عەمبارانەی کە پڕن لە کەلوپەلی زیادە - و کۆمپانیاکان بەردەوامن لە نزمکردنەوەی نرخەکان بۆ ئەوەی تەنها بەردەوام بن لە کارکردن. پێشبرکێی تێکدەرانە نیشاندەری گۆڕینێکی نا ئاساییە لە پێشبڕکێی نمونەیی کە ئابووریناسان زۆر لێی بێ ئاگان.

وە کێبەرکێی تێکدەرانە میتافۆڕێکی باشە بۆ دەرخستنی ئەو هەڵانەی کە دەکرێت کە لەگەڵ پەرتەوازەبوون و کەوتنی هێز ڕوو دەدات، چونکە کاتێک بەکارهێنان و هێشتنەوەی هێز قورسترە، و کاتێک بەسەر کۆمەڵێک گەورەتر و هەمەجۆرتری یاریزانانی گەنج دابەش دەکرێت، ئەوا شێوەکانی پێشبڕکێ و

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

کارلێکە زیانبەخشەکانی بە بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی لێ چاوەڕوان دەکرێت، ئەو شتەی کە هەڕەشە لە سەلامەتی ئابووریەکان و چالاکی کلتورەکان و سەقامگیری دەوڵەتەکان دەکات، تەنانەت ئاشتی جیهانیش.

لەفەلسەفەی سیاسیشدا بیرۆکەیەکی هاوشێوە بەرجەستە دەبێت لەجیاوازی کلاسیکی نێوان دوو لایەندا، ستەمکاری و ئاژاوەگێڕی. کاتێک هێز زۆر چڕ بێتەوە، ستەمکاری دروست دەبێت. لە بەرامبەردا هەرچەندە هێز پارچەپارچەتر و درەوشاوەتر بێت، مەترسی ئاژاوەی زیاتر دەبێت، ئەو دۆخەی کە ڕژێم تێیدا نامێنێت. هەردووک لەو حاڵەتانە دەگمەنن، تەنانەت ڕژێمەکانی دەسەڵاتخوازیش تووشی درزی زیاتر دەبن، و لە هەرە شڵەژاوترین حاڵەتەکاندا لە کۆتاییدا ڕادەیەک لە سیستەم و پێکهاتەیەکی دەسەڵات دەردەکەوێت، و ئاژاوە گیردەخوات. پەیامی ناوەندیەکە لێرەدا ئەوەیە کە لاوازبوونی زۆری هێز و بێ توانایی سەرکردەکان بۆ ڕابەریکردن مەترسیان کەمتر نیە لە چڕکردنەوەی زۆر لە ڕادەبەدەری هێز لە دەستی کەمینەیەکی خەڵکدا.

هەڵوەشانەوەی لەڕادەبەدەرەوەی دەسەڵات، بە جۆرێک هەر ئەکتەرێکی گرنگ بتوانێت دەستپێشخەرییەکانی ئەوانی تر پێچەوانە بکاتەوە، بەڵام هیچیان توانای سەپاندنی ئیرادەی خۆیانیان نییە، مەترسی هەیە بۆسەر هەر کۆمەڵگایەک یان تەنانەت خێزانەکانیش بەقەدەر ئەوەی کە مەترسی هەیە بۆ سەر سیستەمی دەوڵەت. چونکە کاتێک هێز زۆر کۆت دەبێت، ئیفلیج سەرهەڵدەدات و کاریگەری دەبێت لەسەر سەقامگیری و سەلامەتی و خۆشگوزەرانیی ماددی.

ئاگاداربە لەوەی کە دەتەوێت: زیادەڕەوی لە ڕێنمایی و هاوسەنگیەکان

چەند ڕێگەیەک هەیە بۆ هێشتنەوەی سیستەم لە ژینگەیەکدا کە دەسەڵات تێیدا پارچەپارچە دەبێت و بەخێرایی ون دەبێت و لەناودەبرێت، ئەم ڕێگایانە فیدرالی و هاوپەیمانی سیاسی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و پرەنسیپ و پێوەرە ناسراوە

(وسەپێندراوە) نێودەوڵەتیەکان، و ڕێنمایی و هاوسەگیەکانی نێوان لقەکانی حکومەت، و پەیوەندیە ئەخلاقیەکان یان ئایدۆلۆجیە بەردەستەکان لە ژێر دروشمەکانی وەک مەسیحیەت یان ئیسلام یان دیموکراسی کۆمەڵایەتی یان هاوبەشی، لەخۆ دەگرێت. هەموو ئەم شێوازانە چارەسەر پێشکەش دەکەن بۆ کێشەیەکی کۆن کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی وولاتەکانی شارە یۆنانیەکان. بەڵام نەمانی ئەمڕۆی دەسەڵات هێشتا کاردانەوەی دامەزراوەیی خۆی بەرهەم نەهێناوە: داهێنانەکان لە ڕێکخستنی ژیانی گشتیدا کە دەتوانێت ڕێگەمان پێ بدات چێژ لە دەستکەوت و سەربەخۆیی تاکەکەسی ببینین کە دەبێتە هۆی دابەشکردنی دەسەڵات و لە هەمان کاتیشدا بەربەرچدانەوەی هەڕەشەی زۆر مەترسیدار و ڕاستەقینە.

بۆ ئەوەی مرۆڤ کاریگەریەکانی هەڵتەکاندنی دەسەڵات لەسەر بەرژەوەندی کۆمەڵایەتیدا وێنا بکات، دەبێت خەیاڵی کەوانێکی بیانی لە شێوەی پیتێکی ئینگلیزی U بکات. ئەم چەماوەیە وێنەی هەڵوەشانەوەی هێز دەکات - لە لای چەپ چڕبۆتەوە، و لەلای ڕاست لێک ترازاوە - لە دژی بەها فراوانە خوازراوەکان، وەک سەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی، و دامەزراوە گشتیە باوەڕپێکراوەکان و زیندوویی

ئابووری.

شێوەی ١٠-١

هەڵوەشانەوەی هێز: چەماوە لە شێوەی Uی سەراوژێر

تەوەری ئاسۆیی، کە تیشک دەکاتە سەر لاوازبوونی هێز، بە پێگەیەک (لە لای چەپ، نزیک سەرەتای تەوەرەکە) بە زۆرترین چڕکردنەوە و کۆنترۆلکردنی

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

هێز لە دەستی کەسانێکی کەمێکدا دەست پێدەکات. ئەمە ئەو بەشەیە کە ستەمکاری و پاوانخوازی و کۆنترۆڵی توند دەکەوێتە ناو ژیانی سیاسی و ئابوورییەوە کە ئاستی ناتەواوی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی دابین دەکات. لە لاکەی تری تەوەرەکە هێز بە شێوەیەکی زۆر پەرتەوازە و لاواز دەردەکەوێت. لێرە، لەم لایە، ڕووخانی ڕژێم دەبێتە هۆی ئاژاوەوە، و دۆخەکە بە قەدەر لایەکەی تر لە ڕووی کۆمەڵایەتی نەخوازراو دەبێت، کە چڕبوونەوەی دەسەڵات بەرزە و قۆرخکاری سیاسی و ئابووری باڵادەستە.

ناڵنگاریەکە لێرە ئەوەیە کە ڕێگاکان بدۆزرێتەوە بۆ پڕکردنەوەی ناوەڕاستی چەماوەکە لەو کاتانەی گۆڕانکاریە گەورە و خێراکان ڕوودەدەن. گومان لەوەدا نییە کە خۆڕاگری و لێبوردەیی ئێمە - ڕادەی فراوانی ئەو گروپەی کە ئێمە ئامادەین لە ناوەڕاستی چەماوەکەدا قبوڵی بکەین - جیاواز دەبێت. چونکە لەژیانی ئابووریدا هەموو هەر یەک لە قۆرخکاری و پێشبڕکێی لەڕادەبەدەری تێکدەرانە لە ئاستێکن کەمتر لە ئاستی نموونەیی، بەڵام مەترسیەکان بەزۆری ژیان و مردن لە خۆناگرێت؛ وە لە کۆتاییدا دەتوانین ڕابێین لەگەڵ کۆمەڵێکی فراوان لە حالەت و دۆخەکان، تەنانەت ئەگەر ئارەزووشمان لە چاکسازی بێت. وە کاتێک سیاسەت ئەوەندە پەرتەوازە دەبێت کە توندڕەوی و توندوتیژی پەرە پێبدات، ئەوا مەترسیەکان خێراتر دەبن. هەروەها کاتێک سیستەمی سەربازی جیهانی ئەوەندە پەرتەوازە دەبێت کە چەتەکان و تیرۆریستان و میلیشیاکان و چەتەی تاوانکار دەتوانن بەرەنگاری سوپای وڵاتە زلهێزەکان ببنەوە، مەترسییەکان لە بەرزترین ئاستدان.

ئاسۆی ئێمە قەرەباڵغە بە کێشە سەرەکیەکان، وەک بڵاوبوونەوەی ناوکی و گۆڕانی کەش و هەوا، کە ناتوانرێت چارەسەر بکرێت ئەگەر سەقامگیریی ڕیزبەندی جیهانی بە شێوەیەکی زۆر ناجێگیر بێت، پڕ بێت لە درز، و پەکی

## کۆتایی سەردەمی هێز

کەوێت بەهۆی دابەزینێکی جێگیر لە توانایدا بۆ کارکردنی بەکۆمەڵ. هەڵوەشانەوەی هێز ئەم کێشانە ئاڵۆزتر دەکات، بەتایبەتی کە وولاتانی زیاتر بە دوای بەرنامەی ناوەکیدا دەگەڕێن، یان توانای داهێنانی ڤایرۆسی سایبێری ئاڵۆز بۆ دەست پێکردنی هێرشی سایبەر و ئامانجگرتنی ناحەزان لە ناوەوە و دەرەوە. لە هەمان کاتدا لاوازی هێزی تەکتەرە زاڵەکان گەڕان بەدوای چارەسەرەکاندا ئاڵۆزتر دەکات، ئێمە چیتر یەک زلهێز یان دوو زلهێزمان نییە کە بتوانن بە سادەیی مەرجەکانیان بەسەر هەموو جیهاندا بسەپێنن.

کۆششە بە کۆمەڵەکان، وەک ئاشتی پارێزی، دەست خستنی تیرۆریزم، هاوئاهەنگی سیاسەتی ئابووری بۆ هاندانی گەشەی جیهانی، بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشیەکان، وەستاندنی گۆڕانی کەش و هەوا، تەرخانکردنی سەرچاوە دەگمەنەکان، بەرەنگاربوونەوەی پارە سپی کردنەوە و ساختەکاری و پاراستنی جۆرە هەڕەشە لەسەرەکان لە لەناوچوون، هەموویان بە بەرژەوەندی گشتی جیهانی دادەنرێن. بە واتایەکی تر، دەرئەنجامەکانی سوودی بۆ هەموانە، لەوانەس کە بە هیچ شتێک یارمەتیان نەداوە لە بەدەست هێنانی. ئەمەش لە بەرامبەر گرێیەکی کلاسیکی دامان دەنێت کە زانایانی کۆمەڵایەتی ناویان ناوە کێشەی کاری هەرەوەزی. چونکە ناکرێت یاریزانێک هەموو ئەم گۆڕانکاریانە بە تەنیا بکات، بەلام هەموو یاریزانەکان حەزدەکەن بوەستن و هیچ داهاتێک خەرج نەکەن تا کەسێکی تر لە جیاتی ئەوان بە ئەرکەکە هەڵدەستێت. لە کۆتایدا، گۆڕان هیچ کات جێبەجێ ناکرێت، تەنانەت ئەگەر سودی بۆ هەموانیش هەبێت.

هەڵوەشانەوەی هێز کێشەی کاری کۆمەلایی خراپتر دەکات، ئەمە لە ئێستاوە لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا ڕوودەدات، کە ژمارەیەکی زۆرتر لە وڵاتە "بچووک"ەکان دەتوانن هەوڵەکانی وولاتە " گەورە"کان لە هەر بوارێک پێچەوانە بکەنەوە، یان دوای بخەن، یان داوای سەرنجێکی تایبەت بکەن، یان هەوڵەکانی

دەوڵەتانی "گەورە" لە هەر ناوچەیەکدا لاواز بکەن. هاوکات دەوڵەتە گەورەکانیش خۆیان کەناڵی زیاتریان هەیە بۆ کارکردن لەو بوارەنەی کە پێچەوانەی مەبەستەکانیانە. وە وەڵامدانەوەکان بۆ داخوازی بەرژەوەندی گشتی جیهانی لە سەدەی بیستەمدا دامەزراندنی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بوو، لە نەتەوە یەکگرتووەکان و هەموو دەزگا تایبەتمەندەکانیەوە بۆ بانکی جیهانی و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و گروپە هەرێمییەکانە. بەڵام ئەم دامەزراوانە زۆر جار تێدەکۆشن بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو داخوازی و هەڕەشانەی کە لەو ناوچانەی کە وابڕیارە چاودێری بکەن، بگونجێن.

یەکێک لە وەڵامەکان بریتییە لەپێکهێنانی هاوپەیمانی دەوڵەتە زلهێزەکان ("هاوپەیمانی خوازیارەکان") بۆ تێپەڕاندنی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، و گرتنەبەری ڕێوشوێنی ڕاستەوخۆ، وەک ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی تر کردیان لە عێراق. بەڵام تەنانەت ئەم ئەگەرەش دەکەوێتە ژێر کاریگەری هەڵوەشانەوەی دەسەڵاتەوە، یەکەم، چونکە دەوڵەتانی تر بە شێوەیەکی زۆر دەتوانن بەرهەڵستی بکەن، یان ڕێگر بن لە هەر پلانێکی هاوپەیمانی لەو جۆرە، چونکە هاوپەیمانیە سیاسیەکان زیاتر مەیلی لێکترازانی هەیە، و ڕای گشتیش کەمتر مەیلی پابەندبوو و ئارامگرتنی هەیە، تەنانەت لەناو ئەم دەوڵەتە پێشکەوتووانە. بەردەوامی لاوازی دەسەڵات- نەک تەنها لە سیاسەتدا- کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات. خودی دەوڵەت کە حکومەتەکەی و سوپاکەی لەهەوڵی ئەوەدایە لەچەند شوێنێکی دووردا گۆڕانکاری دروست بکات، و سەرکردایەتی هاوپەیمانێتییەکی نێودەوڵەتی بکات بۆ ئەو مەبەستە، ڕەنگە ئەو دەزگای خێرخوازیانەی کە پارە و زانیاری بۆ ڕکابەرەکانیان کەناڵ دەکەن، و سێرڤەری کۆمپیوتەریان هەیە کە تێڕوانینەکانیان بڵاودەکاتەوە و لایەنگری نوێیان بۆ کۆ دەکاتەوە. لەگەڵ فراوانبوونی بۆشایی بۆ یاریزانە گەنجەکان بۆ دروستکردنی

## کۆتایی سەردەمی هێز

وەبەرهێنان و سەرکردایەتیکردنی هەڵمەتەکان و بەخشینی پارە و دامەزراندنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن کە هێزیان پێ دەبەخشێت، ئەوا سوودە دەرەنجامەکان - پلۆرالیزم و دیموکراسی و دەستپێشخەری و هەست بە گرنگی - ئاستەنگی نوێ دروست دەکات بەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانەکان و دۆزینەوەی ئامانجەکان و بەدی هێنانی ئەرکەکانی تر.

### پێنج مەترسیەکان

لە هەر بوارێکدا، نەمانی هێز ئەو مەترسیانە دروست دەکات کە دەتوانێت ئاستی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و کوالیتی ژیانی کورتخایەنی تاکەکان کەم بکاتەوە، و ڕوودانی کاردانەوەیەکی توندوتیژ یان تەنانەت کارەساتێک لە ساتێکی دیاری کراو لە داهاتوودا. جگە لە ئیفلیجی سیاسی و دەرئەنجامە نێگەتیڤەکانی تر کە باسمان کرد، پێنج کاریگەری راستەقینەی پوکانەوەی دەسەڵات هەن کە مەترسییەکی بەرچاویان هەیە.

### ناهاوسەنگی سیستەم

تۆماس هۆبس و سیاسەتمەدارە کلاسیکەکانی تر هەر لە سەرەتاوە وتوویانە، وە هێشتا ڕوانینیان ڕاستە - بەشی یەکەمی ئەم کتێبە ببینن. بەدەستهێنانی دەسەڵات بەرجەستەکردنی ئارەزوویەکی بەپەلەیە بۆ زۆرێک لە تاکەکان، یان هەروەک وا بەدەرئەکەوێ. بەڵام لە بنیاتنانی کۆمەڵگاکاندا، دەسەڵات چارەسەرێکە بۆ کێشەی ناهاوسەنگی سیستەم. ئێمە دەسەڵاتی دەوڵەت قبوڵ دەکەین چونکە وابڕیارە کەمترین سەقامگیری و دڵنیایی مسۆگەر بکات کە پێویستمانە بۆ دەستەبەرکردنی ژیانێکی خوازراو. چونکە یاسا و ڕێساکان، لە ڕێنماییەکانی

بازرگانی و ڕێنماییەکانی کۆمپانیا و یاسا ئابرووبەرەکان و ناوزڕاندن، و مافی دەنگدانەوە بۆ پەیماننامەکانی نێودەوڵەتی، هەموویان ئامانجیان هێورکردنەوەی ئاڵۆزیەکان و ڕووداوە کتوپڕەکانی ژیان و ڕێگرتنە لە مەترسییەکانی ناهاوسەنگی سیستەم، و تەنانەت ئاژاوەش.

ئەوەی ئێمە دەستبەرداری دەبین بۆ ئەو دامەزراوانە، و ئەو کەسانەی کە ڕابەرییان دەکەن- وە ئەوەی کە ئێمە داوای دەکەین لە بەرامبەردا پێشکەشمان بکەن، بەتێپەڕبوونی کات گۆڕاوە لە نێوان کۆمەڵگاکاندا، لەگەڵ پێشکەوتنی بەها مرۆییەکان و چاوەڕوانییەکان. شۆڕشەکانی زۆر و جووڵە و عەقڵیەت وای لە ملیارەها کەس کردووە کە چاوەڕێی زیاتر بکەن و داوای زیاتر بکەن. ئێمە ئامرازی باشترمان هەیە بۆ لێپرسینەوە و ئەژمارکردن، هەرچەندە، ئەو هیوایە بنەڕەتیە بۆ هێز ئەوەیە - کە سیستەم بەدەست دەهێنێت - هێشتا لە جێگای قبوڵکردنی ئێمەیە بۆی. ئەو هەڵوەشانەوەی هێزە کە لەم کتێبەدا باسمان کرد هەڕەشە لەو هیوایە دەکات بەجۆرێک کە هەڕەشەی ڕکابەریی سیاسی و کێبڕکێی بازرگانی و ناکۆکی نێوان نەتەوەکان و تەنانەت شەڕەکانی جیهانی سەدەی بیستەمیشی پێ نەکردووە. کاردانەوەکان ڕوونن: کاتێک هەندێک لە کۆمەڵگاکان هەراسان دەبن، و بۆ ماوەیەکی درێژ شپرزەیی دەمێننەوە، زەحمەت نیە کۆمەڵگا لە ڕێگەی هەڵوەشانەوەیەکی لە ڕادەبەدەری هێز تووشی ئیفلیج بێت. ئەم سیناریۆیە دەتوانێ تەنانەت دیمۆکراسییە پێشکەوتوو و پێگەیشتووەکانیش بگۆڕێ بۆ قەوارەی پەککەوتوو کە ناتوانێت وەڵامی بەرەنگاریەکان و داواکارییەکانی سەدەی بیست و یەکەم بداتەوە. وەک پێشتر ئاماژەمان پێداوە، نەبوونی توانای ئەوروپا لە وەڵامدانەوەیەکی خێرا و کاریگەرانە بۆ قەیرانە ئابوورییە توندەکەی نمونەیەکی بە ئازار دەدات لە کاریگەرییە نەرێنییەکانی کۆتایی هێز. کۆتایی هێز ئاگاداریەکە بۆ دەرەنجامی زۆر مەترسیدارتر، وە هەروەها بێ توانایی ئێمە لە

کرداری یەکلاکەرەوە بۆ کەمکردنەوەی دەرچوونی گازی خانووبەرە کە هەسارەکەمان گەرمتر دەکات.

## لەدەستدانی کارامەیی و زانین

هۆکارێک هەیە کە وایکرد ڕێکخراوەکانی خاوەن بەڕێوەبردنی ناوەندی پلەبەندی بەردەوام بن بۆ زیاتر لە سەدەیەک، لەبەرئەوەی پارتە سیاسییەکان، و کۆمپانیا گەورەکان، و کڵێساکان، و دامەزراوەکان، و ئۆرگانە بیرۆکراسییەکان، و سوپاکان، و زانکۆ بەناوبانگەکان و کۆمەڵەکانی کەلتووری هەموویان کەڵەکەبوونی ئەزموون و پیادەکردن و زانیارین لە ناوەوەی قەڵاکانیان؛ چونکە سەرکەوتنەکانیان ئەرشیف دەکەن، و نەریت و کلتور و ڕۆتینی کارکردنیان لە ناخی فەرمانبەرەکان یان ئەندامەکانیان ئەچەسپێنن. هیچ کام لەم دەستکەوتانە ناتوانێت بگوازرێتەوە بۆ جیهانێک کە دەسەڵات تێیدا دابەش دەکرێت بەبێ لەدەستدانی هەندێک، یان بەشێکی زۆری. ئەگەری ئەوەی کە پارتە سیاسییەکان جێگایان بگیرێتەوە لە لایەن "بزووتنەوە" پسپۆڕەکان بۆ ئەرکێکی دیاریکراو، یان هاوپەیمانیە کاتیەکانی هەڵبژاردن یان تەنانەت ڕێکخراوە ناحکومییەکان کە پشتگیری تاکە هۆکارێکن (وەک سەوزەکان، "چەتەکان"، "حکومەتی بچووک")، لە هەموو شوێنێک دەستیان کردووە بە ڕاکێشانی ملیۆنان دەنگدەر ئەوانەی بێزاربوونە لە گەندەڵی و بنبەستی ئایدیۆلۆجی و ڕۆڵی بێ ئومێدی حکومەت کە کۆمەڵێک لە پارتە سیاسیە فەرمانڕەواکان دەریان خستووە. بەڵام لە کاتێکدا کە زۆرجار هەڵەی زۆربەی لایەنەکان پشتڕاست دەکرێتەوە، ئەوا نەمانی ئەم لایەنانە مانای نەمانی کۆگای گرنگی زانیاری زۆر وردە، کە دووبارەکردنەوە یان دووبارە بەرهەم هێنانیان ئاسان نییە لەسەر دەستی تازە هاتووە سەرنجڕاکێشەکان، ئەوانەی کە زۆربەیان لەو جۆرەن کە مێژوونوسی سویسری جیکوب بورکهاردت ناوی ناون "سادەییە ترسناکەکان یان دیماگۆگسەکان". دیماگوگسەکان ئەوانەن کە

## کۆتایی سەردەمی هێز

بە دوای دەسەڵاتدا دەگەڕێن لە ڕێگای سود وەرگرتن لە تووڕەیی و ناهیوایی خەڵک و پێشکەشکردنی گەڕانەوەیەکی سەرنجڕاکێش بەڵام بە شێوەیەکی زۆر سادەکراو و ساختەکراو لە کۆتاییدا.

هەمان شت لەسەر ئەزموونی کۆمپانیا گەورەکان جێبەجێ دەکرێت، چونکە کۆمپانیا بچووکەکان، و کۆگای کاتیەکان، و سەرمایەی وەبەرهێنانی پڕ مەترسی، و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و هاوشێوەکانی تریش زۆر قورسە بۆی کە سەرمایەی فکری کەڵەکەبووی هەر کۆمپانیایەکی گەورە بەرهەم بهێنێتەوە. لامەرکەزیەتی ڕادیکاڵی زانین -- لە ویکیپیدیاوە بۆ پەرەسەندنی سۆفتوێری سەرچاوەی کراوە بۆ کەرەستەکانی خوێندن کە لە لایەن پەیمانگای تەکنەلۆجیای ماساتشوستسەوە دابین کراوە - بە یەکێک لە سەرنجڕاکێشترین ئاراستەکان دادەنرێت لە هەڵوەشانەوەی دەسەڵاتدا. لە باشترین حالەتدا، توانای ئەم سەرچاوە زانیاریە نوێیانە بۆ درێژەدان بە چالاکیەکانی توێژینەوە و گەشەسەندنی ناوەخۆیی یان پاراستنی بیرگەی دامەزراوەیی ناجێگیرە. بژاردە تاکەکانی ئێمە لەسەر پەروەردە و دامەزراندن مەرج نییە باشتر یان زیاتر بەردەوام بێت لە ژینگەیەکدا کە دەسەڵات بە شێوەیەکی زیادەڕۆ دابەش دەکرێت، هەروەها پارچەبوونی دامەزراوەیی لە ڕادەبەدەر دەتوانێت زیان بە بەرهەمهێنانی زانیاری و ژیارانە بەکارهێنانی بگەیەنێت، بە قەدەر ئەو زیانەی کە دەیگەیەنێت بەو ژینگە خنکاوانەی کە دەردەکەون کاتێت هێز بە شێوەیەکی ڕادەبەدەر چڕبۆتەوە.

### سادەیی بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان

کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان ئەمڕۆ "شوێنکەوتوو" یان هەیە کە لە میدیای دیجیتاڵدا "خۆشیان" دەوێن. چونکە لە سەکۆکانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، فەیلەقی هاوڕێیان لە فەیسبووک یان شوێنکەوتوانی تویتەر

## کۆتایی سەردەمی هێز

دەتوانن بڵێن ئەو گروپەی کە پشتگیری کێشەیەکی تایبەت دەکات بەرپستی هێزێکی زۆر گەورەیە. لەوانەشە هەندێ جار ئەمە ڕاست دەرچێت. لە هەندێ کاتیش زیادەڕۆییەکی زۆر هەبووە لە هەڵسەنگاندنی ئەو ڕۆڵەی فەیسبووک و تویتەر لە بەهاری عەرەبیدا، گومان لەوەدا نییە کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تواناکانی هێزی دژە حکومەتی بەهێز کردووە.

بەڵام ئەمە باوترین ئەزموون نییە، بۆ زۆربەی خەڵکی جیهان، چالاکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی لەسەر ئینتەرنێت جگە لە پاڵنانی دوگمەیەک هیچی تر نییە. کێشەیەکی تری واتاداریش هەیە ئەوەیە کە لەوانەیە بەخشینی بچووک بدەن- بۆ نمونە، ٥ دۆلار بۆ خاچی سوور دوای بوومەلەرزەیەک یان کارەساتێکی سروشتی تر - بە ناردنی نامەیەکی دەق بۆ ژمارە تەلەفونێکی دیاریکراو. ئەمە کارێکی گرنگە، بەڵام هیچ جۆرە چالاکییەکی مەترسیدار پێک ناهێنێت کە هێزی بزوێنەری زۆرێک لە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە مەزنەکانی ئەنواند. نووسەر ئیڤگنی مۆرۆزۆڤ ئەم جۆرە نوێیەی چالاکی ئاستی نزم لە ڕووی بەشداری و کاریگەرییەوە بە "چالاکی تەمبەڵ" ناودەبرد. ئەو پێناسەی دەکرد کە "باشترین جۆری چالاکیە بۆ نەوەی تەمبەڵ: بۆچی خۆبێزارکردن بە مانگرتنەکان و دووچاری مەترسی دەستگیرکردن و دڕندایەتی پۆلیس و ئەشکەنجدان ئەگەر مرۆڤ بتوانێت چالاکوانێکی بەهێز بێت فەزای ڕاستەقینەدا؟" بەڕای ئیڤگنی مۆرۆزۆڤ کێشەی چالاکی تەمبەڵی زۆر ناکەوێتە ئەو ڕاستییەی کە لە بەشداری بچووکی کەم مەترسی پێک هاتووە، چونکە هەریەکەیان بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕاستەقینەن، بەڵام مەترسی ئەوەی هەیە کە ئەم خولیایە بە پێشکەشکردنی سکاڵاکان لە ئۆنلاین، و بە ژمارەی شوێنکەوتووان لە تویتەر و ژمارەی ئەو کەسانەی کە پشتگیری بابەتێک دەکەن، ئاراستەی پشتگیرە شاراوەکان لاببات و سەرچاوە دوورەکان دوور بخاتەوە لەو ڕێکخراوانەی کە

هەڵدەستن بە چالاکیەک مەترسیەکانی گەورەترە و داهاتەکەشی زیاترە: " ئایا دەستکەوتەکانی ناوبانگی ..... شایەنی لەدەستدانی زیانە ڕێکخراوەکانیان هەیە؟" وەک مالکۆلم گلادوێل وتی، ئەم خولیایە گەشەسەندووە بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان مەترسی ناتەبایی بابەتی دەردەخات کە لە لایەن هەڵوەشانەوەی دەسەڵاتەوە دروست بووە. توانای پشتگیری کردنی کێشەیەکی دیاریکراو، یان پێشکەشکردنی سکاڵا، یان تەنانەت ئەنجامدانی شتێکی واقیعیانەتر، وەک ناردنی پارە بۆ وەرگرێک کە لە وڵاتێک یان گەڕەکێکی تر دەژێت، لە یەکێک لە ڕووەکانی وادەکات مرۆڤ ئازادی بەدەست بهێنێت و لە خۆی ڕازی بێت. بەڵام مەترسییەکە ئەوەیە کە زۆربوونی یاریزانە لاوەکان و دەستپێشخەرییە کورتخایەنەکان وا دەکات پێکهێنانی هاوپەیمانی ڕاستەقینە و بەهێز کە تەرخان کرابێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجە کۆمەڵایەتییە دیاریکراوەکان ئەستەم بێت.

### بێزاریی زیاتر لە چاوەڕوانی و کورتکردنەوەی ماوەی سەرنج و ئاگایی

لە کاتێکدا ملیۆنان چالاکوانی ئۆنلاین لەوانەیە هۆشیاری کۆمەڵایەتی لە زۆر مەسەلەدا بەرز بکەنەوە، بەڵام هەروەها ئاستێک لە "ژاوەژاو" و سەرلێشێوان دروست دەکەن کە زۆر زەحمەت دەبێت بۆ هەر کێشەیەک لە دەستەبەرکردنی گرینگی و پشتگیری جەماوەری بۆ ماوەیەکی درێژ کە بەس بێت بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتێکی ڕاستەقینە و بەردەوام. پێشبڕکێیەکی لەڕادەبەدەر دەکرێت زیانبەخش بێت بۆ چالاکی مەدەنی و سیاسی وەک ئەوەی زیانبەخشیشە بۆ کۆمپانیا تایبەتەکان کە ڕووبەڕووی ژمارەیەکی زۆر لە پێشبڕکێکارەکان دەبنەوە و هەردووکیان ناچار دەکات سنووردار بکرێن بە قەبارەی بچووک و هێزی سنووردار.

## کۆتایی سەردەمی هێز

سەرەڕای ئەوەش، هەرچەند چنگی سەرکردە و دامەزراوە و ڕێکخراوەکان بێ هێزتر بێت لەسەر دەسەڵات - بە واتایەکی تر، هەرچەند هێز زیاتر هەڵخەڵەتێنەر بێت، بە سروشتی خۆی - ساختەکاری زیاتر دەبێت بەوەی کە ئەم لایانەنانە دووچارەی هاندان و نیگەرانییە کورتخایەنەکان بوونەتەوە، و پاڵنەرەکانی کەمتر بوونە بۆ پلاندانانی ماوە درێژ. چونکە سەرۆک حکومەتەکان بۆ ماوەی کورتتر و کورتتر هەڵدەبژێردرێن، و سەرۆک کۆمپانیاکان سەرنجی خۆیان دەخەنە سەر ئەنجامە یەکلایی کەرەوەکانی داهاتوو، و جەنەڕاڵە سەربازییەکان دەزانن کە سەرکەوتنی دەستێوەردانە سەربازییەکان زیاتر لە هەموو کاتێک پشت دەبەستێت بە پشتگیری جەماوەرێکی بیروڕا ناجێگیر و کەمتر خۆڕاگر لە کەوتنی قوربانیان، هەموو ئەم نموونانە لە ماوەی کۆتە سەپێنردراوەکانی سەر بژاردەی بەهێزەکانە.

جیاوازی هەڵوەشاننەوەی هێز لە ئاستی تاکدا ئەوەیە کە ڕەنگە ئامرازی زیاترمان بداتێ بۆ ئەوەی ئەو ساتە بژین، تەنانەت لەو کاتەش کە فشار دەخاتە سەر ئاسۆی بژاردەکانی بەردەستمان. ئەمە لە هەمان کاتدا ڕوودەدات کە دەرکەوت زۆربەی کێشە ناوخۆییەکانمان یان نێودەوڵەتیەکانمان لە چارەسەری خێرادا پارێزراون، و چارەسەر و هێورکردنەوەیان پێویستی بە هەوڵی بەردەوام و ڕێکخراو هەیە لەگەڵ پێویستیەکانی. لەوانەشە ئارامگرتن دەگمەنترین سەرچاوە بێت لە جیهانێک کە هەڵوەشانەوەی هێزی تێدا بەردەوام دەبێت بێ وەستان.

### گۆشەگیری و دوورخستنەوە

هێز و دامەزراوەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر لە نێوانماندا ژیاون، و بەربەستەکانی دەسەڵات زۆر بەرز بوون، بۆیە ئێمە ژیانمان ڕێکخستووە - بژاردەکانی ئێمە دەربارەی ئەوەی چی بکەین، و ئەوەی کە دەبێت قبوڵی بکەین، وە ئەوەی کە دەبێت بەرەنگاری بکەین- لە چوارچێوەی ئەم داتایانە. و گۆڕانکاریە گەورە و

## کۆتایی سەردەمی هێز

نادیارەکان زۆرجار دەبێتە هۆی گۆشەگیری: دابڕان یان دوورکەوتنەوەی خەڵک لە یەکتری، یان دوورکەوتنەوەیان لەو شتانەی کە گرینگیان پێ دەدا، یان لە حاڵەتێکی زۆردا جیایان دەکاتەوە لە هەستکردنەکانیان بە خۆیان، ئەو ناسنامەیەی کە بوونەکەیان وەک کە خۆیان دەیبینن پێناسە دەکەن. ئەوە بێنە بەرچاو کە چی ڕوودەدات کاتێک کۆمپانیایەک دەفرۆشرێت، یان یەکگرتن یان دووبارە بنیات نانەوە، یان کاتێک لێکدانەوە ئاینییە ناکۆکەکان دەبێتە هۆی دابەشبوون لە کڵێسایەک، یان کاتێک گۆڕانکاری قووڵ لە سیستەمی سیاسیدا دەبێتە هۆی دووبارە دابەشکردنەوەی دەسەڵات لە دەوڵەتێک؛ گۆڕانکاریەکان لە پێکهاتەی هێز و پلەبەندی هەرەمی تەقلیدی و ڕێساکانی هەڵسوکەوتی سەقامگیر کە دەتوانرێت پێشبینی بکرێت بێ گوومان دەبێتە هۆی شلەژان و نیگەرانی زیاتر. لەوانەشە ببێتە هۆی داڕمانی پرەنسیپە ئەخلاقی و کۆمەلایەتییەکان، واتە تێکشکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی نێوان تاک و کۆمەڵگا. کۆمەڵناسی فەرەنسی ئیمیل دورکایم دۆخەکەی بە "سیستەمێکی بێ سیستەم" وەسف کردووە.

لافاوی تەکنەلۆجیا و تەقینەوەی پەیوەندیە دیجیتاڵیەکان و بڵاوکردنەوەی بیروڕاکان لەسەر ئینتەرنێت و شێواندن و ژاوەژاویی؛ و دابەزینی ئاستی قبووڵکردنی ئۆتۆماتیکی دەسەڵاتە تەقلیدییەکان (سەرۆک و دادوەر و بەڕێوەبەری کار و باوک و قەشە و ئەفسەری پۆلیس و مامۆستا)، هەموویان بوونەتە هۆکاری نەبوونی ناهاوسەنگی ئاکامە فراوانەکان و تێنەگەیەنراوەکان بە شێوەیەکی پێویست. ئاکامە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریەکانی ئەو ڕاستییە چین کە کەمتر لە ١٠٪ ی خێزانە ئەمریکییەکان لە ساڵی ١٩٥٠دا تەنیا لە یەک کەس پێک دەهات، لە کاتێکدا لە ساڵی ٢٠١٠دا ئەم ڕێژەیە بۆ نزیکەی ٢٧٪ بەرزبووەوە؟ خێزانەکانیش پێکهێنەری هێزن، و ئەم دەسەڵاتەش دەست دەکات بە کەمبوونەوە، و ئەو کەسانەی کە خاوەنیانن (عادەتەن دایک و باوک و پیاو و

ئەندامانی بەتەمەنی خێزان) لەم ڕۆژانەدا ڕووبەڕووی کۆت و بەندی زیاتر دەبنەوە. چەندین لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی دەریانخستووە کە ژمارەی ئەو کەسانەی متمانەن لە نێوان هاوڵاتیان لە وڵاتانی پێشکەوتودا کەمی کردووە، هەروەها بەرزبوونەوەی هەستی تەنیایی، ئەمە چیمان پێ دەڵێت سەبارەت بە متمانە بە کۆمەڵگا؟

وە ئەگەر لە سەدەی ٢١دا مەترسییەکی زۆر لەسەر دێموکراسی و کۆمەڵگا لیبراڵەکان هەبێت، ئەوا ئەگەری ئەوەی کە لە هەڕەشەیەکی نەریتی مۆدێرنەوە (چین) بێتە ئاراوە، یان هەڕەشەی پێش مۆدێرن (ئیسلامی ڕادیکاڵ) بێت، کەترە لە ئەگەری ئەوەی لەناو ئەو کۆمەڵگایانە بێت کە تووشی حالەتی گۆشەگیری بوونە. وەک نموونە بۆ ئەمە، بەرزبوونەوەی ئەو بزوتنەوانە بێنە بەرچاو کە گوزارشت لە توورەیی کۆمەڵایەتی دەکەن یان ئیستغلالی دەکەن، لە پارتە ڕاستڕەوە نوێیەکانی ئەوروپا و ڕووسیاوە بۆ حیزبی چایی لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. لەلایەکەوە هەرکام لەم بزووتنەوە گەشەکردووانە دیمەنێکن لە دیمەنەکانی نەمانی دەسەڵات، چونکە قەرزداری دەسەڵاتی خۆیەتی بۆ کەوتنی ئەو بەربەستانەی کە خاوەن دەسەڵاتە زاڵەکانیان دەپاراست. وە لە لایەکی تریشەوە ئەو توڕەییە سەرەتاییەی کە ئەم بزووتنەوانە دەری دەخەن بە زۆری لە دابڕانەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە تایبەتمەندییە تەقلیدییەکانی ڕێکخستن و ئاسایشی ئابووری تێکچووە. هەروەها گەڕان بۆ قیبلەنمایەک لە چەمانەوەکانی ڕابردوودا - بۆ نموونە: سۆز بۆ یەکێتی سۆڤیەت، و لێکدانەوەکانی سەدەی هەژدەیەم بۆ دەستوری ئەمریکا کە لەلایەن ئەو کەسانەوە بانگەوازی بۆ دەکرا کە وەک ئەوانەی ئەو سەردەمە جلیان لەبەر دەکرد، ووتارەکانی ئوسامە بن لادن لەسەر گێڕانەوەی خەلافەت، و ستایشی هوگو چافێز بۆ سایمۆن بولیڤار- دەریدەخات کە دەسەڵات تا چ ڕادەیەک کەم بۆتەوە، و ئەگەر لە چارەسەرکردن و

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئاراستەکردنی بەرەو بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی شکست بێنین، ئەوا ڕەنگە بە دەرەنجامی پێچەوانەوە بێتەوە، و بگۆڕێت بۆ دیاردەیەکی وێرانکەر.

## بەشی یازدەم

## هێز لە حالەتی هەڵوەشانەوە: کێشە چیە؟ وە چی بکەین؟

یەکەم، و ڕەنگە گرنگترین، نیشانەی ئەم کتێبە پێویستیەکی بەپەلەیە بۆ گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوە و قسەکردنمان لەسەر دەسەڵات.

یەکێک لە ڕێگاکان بۆ دەستپێکردن بەم کارە ئەوەیە کە دووبارە قسە لەسەر ئەوە بکەین کە چۆن هێز دەگۆڕێت، سەرچاوەکانی چین، کێ خاوەنیەتی، کێ لەدەستی دەدات، وە بۆچی. لە کاتێکدا ئێمە ناتوانین چاوەڕوانی گۆڕانکاری زۆر بکەین کە لە هەڵوەشانەوەی هێزەوە سەرچاوەی گرتووە، ئێمە دەتوانین ڕێگایەکی بیرکردنەوە بگرینە بەر کە زۆرترین نەرمی دابین بکات، و توانامان پێ بدات بەشێوەیەکی باشتر پلان بۆ داهاتوو دابڕێژین و کەمکردنەوەی شوێنەوەاری ئەو مەترسییانەی کە باسمان کرد.

وە گرنگە ئەوە بزانیت کە کاریگەرییەکانی لاوازبوونی هێز لە داهاتوو، کە بە گشتی لە لایەن توێژەرەوەکان و خاوەن ڕایەکان و سەرکردە سیاسییەکانەوە هەستی پێ دەکرێت، نزیکە لە سەرلێشێواوی و تەشویش.

مرۆڤ دەبێت ئەوە بێنێتە بەرچاو کە چۆن زۆربەی گوتارە زاڵەکان پارچەپارچە و ناتەواو بوون. بۆ نموونە سیاسەتی نێودەوڵەتی وەربگرە، بەتایبەتی ئەو گفتوگۆیانەی لەسەر ئەوە دەکرێت کە چ وڵاتێک لە سەدەی ٢١دا زاڵ دەبێت: ئەمریکا یان چین؟ یان وڵاتە پێگەیشتووەکان؟ یان هیچ کەسێک؟ وە لە جیهانی بازرگانیدا، قوتابخانەیەکی دراو ئاماژە بە پرۆسەکانی یەکگرتن، و دەوڵەمەندە تازەکان، و پتەوکردنی دەسەڵات لەلایەن نوخبەیەکی تایبەت بە کۆمپانیا جیهانیەکان دەکات بەتایبەتی نوخبەی دارایی، لە کاتێکدا بە هەمان شێوە

## کۆتایی سەردەمی هێز [redacted]

کۆمەڵێک تێڕوانینی تیژ هەیە ئاماژە بە کێبڕکێی زیادەڕۆ و شوێنەوارە تێکدەرەکان بۆ سەقامگیری ئەو بازاڕە دەکات کە دەرەنجامی تەکنەلۆجیاکان و مۆدێلە تازەکانی بازرگانیە. بە هەمان شێوە، ڕەوتەکان لە بواری ئایینی جیهانیدا یان هۆکارێکن بۆ نیگەرانییەکی قووڵ سەبارەت بە بنەڕەتی و دەمارگیری، یانیش نیشانەیەکی تەندروستن بۆ بەشداری کۆمەڵایەتی کە دەتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ بەدیهێنانی میانڕەوی و ئازادی و پێکەوەژیانی ئاشتییانە.

هەموو ئەم مشت و مڕانە -- و ئەوانەی دژیانن - ڕەفەکانی کتێبخانە و لاپەڕەی بۆچوون لە ڕۆژنامەکانی جیهانیان پڕکردۆتەوە، و بە دڵنیاییەوە زۆر بە توندتر، شاشەکانی تەلەڤزیۆن و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیش. هەمووشیان ڕاستن. یان بەواتایەکی تر، بەرگریکارانی هەر مشت و مڕێک دەتوانن کۆمەڵێک ڕاستی و بەڵگەی بۆ بێنێتەوە کە وا دەکات مشت و مڕەکەیان مەعقول و بیردۆزی بێت.

لە ڕاستیدا، سەیرە مرۆڤ ڕادەی دەگمەنی ئەو کۆدەنگییە ببینێت سەبارەت بەئاراستەی گۆڕانکاریەکان کە لەدونیای ئێمەدا هەیە و دەبێت چاوەڕێی چ هەڕەشەیەک بکەین لەئاکامدا، وە زیاتر لەمەش چۆن مامەڵە لەگەڵیاندا بکەین. سەرەڕای ئەوەی ئەمڕۆ زانیاری و بۆچوونەکان بەردەستن، ئێمە قیبلەنمایەکی باوەڕپێکراومان نییە: چوارچێوەیەکی ڕوون کە یارمەتیدەربێت بۆ تێگەیشتن لە گۆڕانکاریەکان کە لە هەموو ئەو بوارانە ڕوودەدەن کە بە شێوەیەکی زیاد لە یەک گرێدراون. هەر نەخشەڕێگایەک بۆ داهاتوو کەمتەرخەم ئەبێت بەرامبەر پێویستیەکان ئەگەر تێگەیشتنێکی باشتری نەبێت بۆ ئەو ڕێگایانەی کە دەسەڵاتیان پێ دەگۆڕدرێت و دەرئەنجامەکانی ئەمەش.

بانگەشەکانی هەڵوەشانەوەی هێز مەترسیدار و هەمەجۆرن. بەڵام ئەوە ئەستەمە کورتیان بکەینەوە و تێکەڵیان بکەین بەو ڕێگایانەی کە بڕیاردەران بیرلێدەکەنەوە و

## کۆتایی سەردەمی هێز

سەیری جیهانی پێ دەکەن- لە ماڵی خەڵکدا، یان لە کۆشکەکانی سەرۆکایەتی، یان لە هۆڵەکانی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنەکان- مەگەر گفتوگۆیەکی جیاواز هەبێت کە ڕەچاوی ئەوە بکات کە چی بەسەر دەسەڵاتدا دێت. وە یەکەم هەنگاو لە گۆڕینی دیبەیتەکە لەسەر دەسەڵات ئەوەیە کە واز لە خولیاکردن بهێنین کە کێ لە هەڵکشاندایە و کێ لە حاڵەتی داکشاندایە.

### وازهێنان لە خولیاکردنی

### کێ لە حالەتی کشان دایە و کێش لە حالەتی داکشان دایە

زۆربەی قسەکانی ئەمڕۆ لەسەر هێز هێشتا لە بنچینەدا نەریتییە، بۆیە زۆر جار بە پلەیەکی بەرز مەترسیدارە. دیارترین نموونەی ئەمە بڵاوبوونەوەی بەردەوامی خولیای بیرکردنەوەیە لەوەی کێ بەرزدەبێتەوە و کێ پاشەکشە دەکات، کام دەوڵەت، شار، پیشەسازی، کۆمپانیا، سەرکردەیەکی سیاسی، بازرگان، سەرکردەی ئایینی یان زانا دەسەڵات بەدەست دێنێت، و کامیان دەستی کردووە بە لەدەستدانی. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بە قووڵی لەو غەریزەیە ڕەگی چەقاندووە کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ گەڕان بەدوای پلەی یەکەمدا، ئایا ئەم مەیلە لە سەرنجڕاکێشی ڕێکخستنی تیپە وەرزشییەکان یان پێشبڕکێی ئەسپەوە سەرچاوەی گرتووە؟

بە دڵنیاییەوە تۆ دەتوانیت پێشبڕکێکارەکان ڕێک بخەیت لە هەر کاتێکدا بە پێی سەرمایە و هێز و دەستکەوتەکانیان. لەسەر ئاستی جیهانیش، وڵاتان پێشبڕکێ لەگەڵ یەکتر دەکەن و بەپێی توخمەکان ڕێکدەخرێن وەک: بەرهەمی ئابووری وڵات، و تۆڕی دامەزراوە سەربازیەکان و سەرچاوەکانی، و ژمارەی دانیشتوان، و ڕووبەری زەوی، و شارەزایی پیشەسازی و هاوشێوەکانی تر. بەڵام ئەو وێنەیەی ئەم پێوەرانە دابینی دەکەن زۆر درێژە نادەن، وە خراپتر لەمەش، گومڕایە. هەرکاتێک

## [redacted] کۆتایی سەردەمی هێز

سەرنج بدەینە سەر پۆلێنکردن و ڕێکخستنەکان، مەترسی دەکەین لە پشتگوێ خستنی - یان کەم کردنەوەی -- ڕادەی ئەو لاوازیەی کە هەڵوەشانەوەی هێز بەرپای دەکات لە هەموو ئەو لایانە ڕکابەرانە، نەک تەنها ئەوانەی کە کەمبوونەوەیەکی ڕوونیان هەیە، بەڵکو ئەوانەش کە لە ئاست بەرزبوونەوەدان.

زۆرێک لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی چینی متمانە و گەشبینن بە بەرزبوونەوەی چین؛ و هەروەها هیندیەکان و ڕووسیەکان و بەرازیلیەکانیش گەشبینن و باوەڕیان بە بەرزبوونەوەی وولاتەکانیان هەیە. ئەوروپیەکان سەرقاڵن بە زیادبوونی پەراوێزخستنی کیشوەرەکەیان لە گۆڕەپانی جیۆپۆلەتیکی جیهانیدا. بەڵام زۆربەی قسەکان لە بەرزبوونەوە و نزمبوونەوە لە ئەمریکاوە دێت، کە شرۆڤەکارانی ئەمریکا ماندوونابن لە گفتووگۆکردن لەسەر ئەوەی کە ئایا دابەزینی وڵاتەکەیان چاکبوونەوەی هەیە، یان مایەی چارەسەرە، یا تێپەڕیوە یان لە بنەڕەتدا گاڵتەجاڕانەیە. هەندێکی تریش بەڵگە دەخەنەڕوو دەربارەی " سەرکەوتنی باقی جیهان" و گۆڕان بۆ جیهانێکی " فرە جەمسەر".

هەروەها کتێبەکانی تریش کە کاریگەر نەرێنیەکان شیدەکاتەوە ئەوانەی کە دەسەڵات دووچاری دەبنەوە بەهۆی زیادبوونی وولاتە نوێ و بەتواناکان بۆ کاریگەری لەسەر ڕووداوەکان و ئەنجامە جیهانیەکانیش ئەمە دەکەن بەبێ دەستبەرداربوون لەسەر خولیای ئەوەی کێ لە کشانە و کێش لە داکشانە، یان کێ ئەو نیگایەی تێپەڕاندووە کە دەوڵەتی نەتەوەیی بەکاردەهێنێت وەک توخمێکی سەرەکی بۆ شیکردنەوە و یەکڕیزیە سەرەکیەکەی. پسپۆری پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان پسپۆر تشارلز کبتشان دەڵێت " سیستەمی ڕۆژئاوایی زلهێزە نوێیەکان یان مۆدێلی سیاسی زاڵ لایندادات. وە سەدەی بیست و یەکەم سەدەی

## کۆتایی سەردەمی هێز

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یان چین یان ئاسیا یان هەر یەکێکی تر نابێت. جیهان ناکەوێتە ژێر هیچ کەسێکی دیاریکراو. بۆ یەکەم جار لە مێژوو جیهان بەیەکەوە بەستراو دەبێت کە هەندێک پشت بە هەندێکی تر دەبەستێت بە شێوەیەکی ئالۆگۆڕ، بەڵام بە بێ هیچ ناوەندێکی سەرکردایەتی، یان سەرپەرشتیارێکی جیهانی". ئەمەش تێڕوانینی نوسەر و ڕاوێژکاری بازرگانی ئیان بریمەرە کە جیهانی وەسف کردووە بەوەی "جیهانێکی گروپ سفرە : سیستەمێکی جیهانی کە هیچ دەوڵەتێکی تاک بەتەنیا یان بە هاوپەیمانی گەلان ناتوانێت بەرەنگاری سەرکردایەتی جیهانی ببینێتەوە". هەریەک لەم نووسەرانە گوزارشت لە تێڕوانینی زبیگنیو برزینسکی دەکات کە جەختی کردۆتەوە "ئێمە چووینە ناو سەردەمی دوای هەژموونەوە"، واتە لە ساڵانی داهاتوودا هیچ دەوڵەتێک ناتوانێت فەرمانڕەوایی و کۆنترۆڵی سیاسەتی جیهان بکات لەو ئاستەی کە لە ڕابردوودا هەندێک دەسەڵاتی گەورە توانیویانە بیکەن.

وە زەحمەتە مرۆڤ هاوڕا نەبێت لەگەڵ هەر یەک لەم بیروڕایانە؛ و لەوانەیە لە بەشی پێنجەم باسی زۆرێک لەو هۆکارە کاریگەرانەمان کردبێت کە لە دژی هەژموونی بەردەوام کاردەکات بۆ هەر دەوڵەتێکی نەتەوەیی تاک. بەڵام تیشک خستنە سەر دەوڵەتە نەتەوەییەکان تەنانەت لەو کاتەش کە دەڵێین هیچ دەوڵەتێک لە نێوانیان نیە بتوانێت زاڵبێت بەسەر کێشە جیهانیەکان - ڕەنگە هۆکاری تر بەرچاومان بگرێت کە دووباره کاروباره جیهانیەکان و پێکهاتەکەی ڕێک دەخاتەوە : هەڵوەشانەوەی هێز لە سیاسەتی ناوەخۆ، و کەرتە بازرگانیەکان، و باقی بوارەکانی تر.

ڕەنگە مشتومڕی زاڵ لەپەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ئەوە بێت کە ئایا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەوڵەتێکی زاڵە یان هێزێکی جیانەکراوەیە یان ئیمپراتۆریەتێکە لەقۆناغی بزربوون، و ئایا چین یان وڵاتێکی تری ڕکابەر جێگەی

دەگرێتەوە. بەڵام توخمەکانی ئەم دیبەیتە لەگەڵ جیهانێکی کەمبوونەوەی دەسەڵاتدا نەگونجاوە، کە لە ناو هەر یەک لەو وڵاتانەدا جۆرە درزێکی بێوێنەی تێدا ڕوو دەدات، و لە هەموو سیستمەکانی بازرگانی و وەبەرهێنان و کۆچکردن و کەلتووردا. دیاریکردنی ئەوەی کێ لەهەڵکشاندایە و کێ لەدۆخی داڕماندایە شتێکی کەمتر گرنگە لەوەی تێبگات کە چ شتێک لەناو ئەم دەوڵەتانە و بزووتنەوە سیاسییەکان و کۆمپانیاو ئایینەکاندا دەگوزەرێت کە ئەم حاڵەتانەی هەڵچوون و داکشانی تێدا بەدی دەکرێت. زانینی ئەوەی کێ بەسەردەکەوێت و کێ پاشەکشە دەکات گرینگیەکەی زۆر کەمتر دەبێت لە جیهانێک وایلێهاتووە ئەوانەی دەگەنە لوتکە ماوەیەکی زۆر لەوێ نامێننەوە ، و ناتوانن بەو هێزەی کە هەیانە لە لووتکە هەموو شتێک بکەن تەنیا چەند شتێکی زۆر کەم نەبێت.

## سەختکردنی ژیان بۆ "سادمییە ترسناکەکان"

دووەم نیشانەی گرنگی ئەم شیکردنەوەیە ئەوەیە کە زیادبوونی خێرا کاریگەریمان بە بیرۆکە نەخۆشەکان و سەرکردە خراپەکان. بە کورتی، هەر کە وازمان لە خولیای ئەوە هێنا کە کێ سەردەکەوێت و کێ پاشەکشە دەکات، دەبێت گوماناوی بین، بە تایبەت بەرەو وەشانێکی مۆدێرنی "سادمییە ترسناکەکان"ی بورکهارت.

لاوازبوونی دەسەڵات زەمینەیەکی بەپیتە بۆ پێشبڕکێکارانی دیماگۆگسەکان کە نائومێدییەکانی خەڵک لە دەسەڵاتی زاڵدا دەقۆزنەوە، و بەڵێنی گۆڕان بە خەڵک دەدەن و ژاوەژاوەی سەرلێشێواوی بڵاوبوونەوەی ئەکتەرە کاریگەرەکان و دەنگەکان و پێشنیارەکانیش بەکاردێنن. ئەو سەرلێشێواوییەی کە بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەوە دروست دەبێت کە بە خێراییەکی گەورەوە دێت، هاوسەنگییەکان دەهەژێنێت، و جێگیرە کۆنەکان لاواز و ڕێگاکانی ئەنجامدانی کارکردن لاواز

دەکات - هەمووی دەرئەنجامە لاوەکیەکانی شۆڕشەکانی زۆربوون، جوولانەوە و عەقلییەتە - دەرفەتێکی زۆر گەورە فەراهام دەکات بۆ ئەو سەرکردانەی کە بیرۆکەی خراپیان هەیە. چونکە بانکەوانە گەورەکان ئەوانەی کە بەرگریان لە ئامرازە داراییە مەترسیدارەکان کردووە وەک چارەسەرێکی ژیرانەی داهێنەرانە، و ئەو سیاسەتمەدارە ئەمریکیانەی کە بەڵێنیان داوە بە لابردنی نەبوونی دارایی بێ زیادکردنی باج، و سەرۆکی فەرەنسا فرانسوا ئۆلاند کە بڕیارێکی دەرکرد بە سەپاندنی باج لەسەر داهاتی دەوڵەمەندەکان بە ڕێژەی ٧٥%، هەموویان تەنیا چەند نموونەیەکی کەمن. هەروەها دڵخۆشکەرانی تەکنەلۆجیای زانیاری، ئەوانەی کە باوەڕیان بەوە هەیە کە تەنیا " پڕۆسێسەرە" تەکنەلۆجیەکان چارەسەری کێشە مرۆییەکان چارەسەرنەکراوەکان دەکەن، مەیلی زیادەڕۆییان هەیە لە بانگەشە و داواکانیان و لە کۆتاییدا ئەوانیش دەگۆڕێن بۆ "سادمییە ترسناکەکان".

دیماگۆگسە مەترسیدارەکان لە هەموو ئەو بوارانەدا هەن کە لەم پەڕانەدا باسمان کرد، ئەوان ئەو بازرگان و بیرمەندانەن کە وتوویانە کۆمپانیاکانی ئینتەرنێت کە کەمترین سەرمایەیان هەیە و داهاتی زۆر کەمیان هەیە یان هیچ داهاتێکیان نیە شایستەی هەڵسەنگاندنی بالاترن لە هەڵسەنگاندنی کۆمپانیاکانی "ئابووری کۆن" کە بەردەوام لێشاوی دارایی بەدەست دەهێنن، و خاوەن سەرمایەی زۆر گەورە و ئەو شارەزا ئیستراتیجیانەیە کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد داگیرکردنی عێراق ئەرکێکی سووک دەبێت، و عێراقیەکان وەک ڕزگارەکەر پێشوازی لە داگیرکەران دەکەن، یان ئەوەی جەنگ خەرجیەکانی خۆی بە خۆی دەکات لە سایەی داهاتە نەوتیەکانی عێراق. ئوسامە بن لادن و ئەلقاعیدە و تالیبان و بزووتنەوە خوێناوییەکانی تر کە پشت بە سادمییە ترسناکەکان دەبەستن سەرکەوتوو بوون لە برەودان و بلاوکردنەوەیان. بەڵێنەکانی " شۆڕشی بولیڤاری" و بانگەشەکانی کە لە هوگۆ چاڤیسیان وەرگرتبوو، یان بەڵێنەکانی پاری چای

ئەمریکی و بانگەشەکانی، ئەمانیش لە بیرۆکە سادە ترسناکەکان ڕەگیان کردووە کە کاریگەریان لەسەر ناکرێت نە بە وانە کورتکراوەکان لە تاقیکردنەوەکان و ە بە داتاکان و بەڵگە زانستیەکان.

دیماگۆگسەکان و قۆڵبڕەکان و ساختەچیەکان شتێکی نوێ نین، بێ گوومان؛ چونکە مێژوو پڕە لە چیرۆکی ئەوانی کە هێزیان دەست کەوتووە و بۆ مانەوەیان لە لووتکە دووچاری ئاکامی زۆر خراپ بوونەتەوە. بەڵام شتە نوێیەکە فەراهام بوونی ئەو ژینگەیەیە کە دروستبوونی یاریزانە نوێیەکان - ئەوانەش کە خاوەن بیرۆکەی زۆر زیرەکانەن - دەست گەیشتنیان بە هێز زۆر ئاسانتر بووە وەک لەوەی کە جاران هەبووە.

ئاگایی لە سادەییە ترسناکەکان، و بێبەشکردنیان لەو دەسەڵاتەی کە بەدوایدا دەگەڕێن، هەمیشە شتێکی پێویست بووە. هەروەها بەهێزکردنی تواناکانمان - بە تاک و کۆمەڵ، و ڕۆشنبیر و سیاسی - لە ئاشکراکردن و چاودێریکردنیان لە نێوانمان لە ئەولەویاتەکانە لە جیهانێک گۆڕانکاریەکی خێرا و سەرلێشێواوی بەخۆوە دەبینێت. ئەم کارە بە قبوولکردنی حەقیقەتی هەڵوەشانەوەی هێز دەست پێدەکات، و دواتر دیبەیتەکەمان دەگۆڕدرێت بۆ ڕەنگدانەوەی ئەم ڕاستییە. ئەم گۆڕانە لە دیبەیتدا نابێت تەنیا لە ڕاڕەوەکانی کۆشکی سەرۆکایەتی و بارەگاکانی کۆمپانیاکان و ژوورەکانی بۆردی زانکۆکاندا بێت، بەڵکو تەنانەت لە کۆبوونەوەکانمان لەلای ساردکەرەوەکانی ئاو لە ئۆفیسشدا بێت، و لە گفتوگۆی ئاسایی نێوان هاوڕێکان و مێزی نانی ئێوارە لەماڵەوەش هەبێت.

ئەم دیالۆگانە بە بنەما سەرەکیەکان دادەنرێت بۆ بنیاتنانی کەش و هەوایەکی سیاسی کەمتر پێشواز بۆ سادەییە ترسناکەکان. بۆ نەهێشتنی فیتۆکراتی کە سیستەم پەک دەخات، هەروەک فرانسیس فوکۆیاما ڕاستی کردووە و دەڵێت: " ئەبێت یەکەم جار و پێش هەموو شتێک چاکسازی سیاسی بکرێت کە لەلایەن

کۆمەڵی جەماوەریەوە بەڕێوەببرێت". ئەمەش لە لای خۆیەوە پێویستی بە چڕی دیالۆگە دەربارەی چۆنیەتی لەخۆگرتنی لایەنە نەرێنییەکانی لاوازبوونی هێز و جووڵان بۆ بەشی ئەرێنی چەماوەکە کە لە شێوەی ۱۰-۱ پیشاندراوە. بۆ ئەوەی ئەمە ڕوویدات پێویستمان بە شتێکی زۆر قورسە: ئامادەکاریەکی گەورەتر لە کۆمەڵگا دیموکراسییەکاندا بۆ پێدانی دەسەڵاتی زیاتر بەو کەسانەی کە فەرمانڕەواییمان دەکەن، ئەوەش مەحاڵە ئەگەر زیاتر متمانەمان بەو کەسانە نەبێت کە فەرمانڕەوایەتیمان دەکەن. ئەمەش بە دڵنیاییەوە قورسترە، بەڵام پێویستیشە.

## گەڕاندنەوەی متمانە

هەرچەندە هەڵوەشانەوەی هێز کاریگەری لەسەر هەموو بوارەکانی چالاکی مرۆیی ڕێکخراو هەیە، بەڵام ئەنجامەکان لە هەندێک لەو بوارانەدا زیاتر زیان بە هەندێکی دیکە دەگەیەنن. وە کەمبوونەوەی توانای بەڕێوەرانی کۆمپانیا بۆ سەپاندنی ئیرادەی خۆیان یان پارێزگاریکردن لە دەسەڵات کەمتر مەترسیدارە لەو سەرکردە هەڵبژێردراوانەی کە جوڵانەوەیان بە فیتۆکراسی پەکی کەوتووە.

لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا ئاستی ئیفلیجبوون لە مەترسی زیاتردایە، چونکە کێشە جیهانییەکان زیاتر دەبن، لە کاتێکدا توانای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بۆ لەخۆگرتنیان جێگیرە یان گەڕاوەتە دواوە. بەواتایەکی تر، بێ توانایی هەندێک لەبەڕێوەبەرانی کۆمپانیا بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانیان تا ڕادەیەکی کەمتر هەڕەشەمان لێ دەکات لەو ئاستەی کە ڕووبەڕوویان دەبینەوە کاتێک سەرکردە نەتەوەیی و نێودەوڵەتییەکان بەهەزاران "دەسەڵاتی بچووک"ەوە بەستراون کە ڕێگرن لە جوڵانەوەیان.

متى كانت آخر مرة سمعت فيها أن عددا كبيرا من الدول أجمع على اتفاق دولي كبير بشأن قضية ملحة؟ ربما قبل أكثر من عقد من الزمان لا أقل، وبالنسبة

## کۆتایی سەردەمی هێز

إلى بعض القضايا المهمة يمتد هذا العجز والتقاعس لعقدين أو ثلاثة. کەی بوو دواین جار کە گوێت لێ بوو ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتان هاودەنگ بوونە لەسەر ڕێککەوتنێکی نێودەوڵەتی گەورە دەربارەی کێشەیەکی بەپەلە؟ لەوانەیە زیاتر بێت لە دە ساڵ نەک کەمتر، بۆ هەندێک کێشەی گرنگ ئەم کەموکوڕیە و بێ کرداریە بۆ ماوەی دوو یان سێ دەیە درێژ بێتەوە.

شێوازەکە ڕوونە، وە هەروەها پێویستی پەلەکردن: لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کاریگەرییەکانی جیهانگیری و شۆڕشەکانی زۆربوون و جووڵانەوە و عەقڵییەتەکان لە سەرتاسەری جیهاندا، پێویستیی بۆ هاوکاری هەمەلایەنە کاریگەرەکان زیاتر بووە. بەڵام توانای جیهان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پێداویستیانە نەپارێزراوە. و گفتوگۆی چەندلایەنە گرنگەکان شکستی هێنا، وە بە دوا وادە کۆتاییەکان پابەند نەبوون، وە پابەند و ڕێککەوتنە داراییەکان ڕێزیان لێ نەگیرا، و جێبەجێکردنی کارکردن ڕاگیرا. کاری کۆمەڵی نێودەوڵەتی زۆر کەم تەرخەم بوو لەوەی کە بەڵێن دراوە، و پێویستی پێکراوە. ئەم شکستانە نەبوونی درێژخایەنی کۆدەنگی نێودەوڵەتی نیشان دەدەن، ڕووداوەکە تەنیا ئێستایە، بەڵام دیمەنێکی تر نیشان دەدات لە دیمەنەکانی هەڵوەشانەوەی هێز. هەموو ئەمانە پەیوەندیان چیە بە پێویستی بۆ گەڕاندنەوەی متمانە؟

شکستهێنانی سەرکردە سیاسییەکان بۆ هاوکاری کاریگەرانە لەگەڵ وڵاتانی تر پەیوەستە بە خاڵە لاوازەکانیان لە ناوەوە، چونکە ئەو حکومەتانەی کە ڕاسپاردەیەکەی لاوازیان هەیە، یانیش هەر نیتیان، ناتوانن ڕێکەوتنی نێودەوڵەتی ئەنجام بدەن لەبەرئەوەی ئەم جۆرە ڕێککەوتنانە زۆرجار پێویستی بە پابەندبوون و سەوداکردن و داهێنان هەیە، تەنانەت هاووڵاتیەکانی ڕێگە بە قوربانیدانیش نادەن. مەبەست لێرەدا ئەوە نییە کە پێویستە دەستگەیشتنی کراوە و دەسەڵاتی ڕەها بدەین بەو کەسانەی کە فەرمانڕەوای ئێمە دەکەن، ئێمە دەزانین کە دەسەڵات بەبێ

کۆنترۆڵ و لێپرسینەوە و چاودێری مەترسیدارە و قبوڵ ناکرێت. بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە کاتێک کۆمەڵگاکەمان لە حاڵەتی داتەپیندایە، هەر سنوردارکردنێکی زیادە لەسەر دەسەڵاتی ئەو کەسانەی کە فەرمانڕەوای ئێمە دەکەن لە کۆتاییدا زیانمان پێ دەگەیەنێت. سەندنەوەی متمانە پێویستە بۆ کەمکردنەوەی ئەو کۆنترۆڵ و سنوردارکردنانە بەجۆرێک پاشەکشەی کۆمەڵگا بوەستێنێت و سوودەکانی بۆ بگەڕێنێتەوە. هەروەها زۆری ڕێنماییەکان و هاوسەنگییەکان کە هێزی ئەو کەسانە سنوردارە دەکات و ئاڵۆزی دەکات کە حکومەتی دیموکراسی بەڕێوەدەبەن، ئەنجامی ڕاستەوخۆی کەمبوونەوەی متمانەن. لە هەندێک لە وڵات، ئەم دابەزینی متمانەیە بووە بە ڕەوتێکی بەردەوام. تێبینیەکەی جێسیکا ماثیۆس، سەرۆکی دامەزراوەی کارنگی بۆ ئاشتی نێودەوڵەتی، لەبیر بێت کە لە بەشی چوارەم لەبارەی شۆڕشی هزریدا باسمان کرد، ئاماژە بەوە دەکات: "هەرکەسێکی تەمەن خوار ٤٠ ساڵ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەموو ژیانی خۆی لە وڵاتێکدا ژیاوە کە زۆرینەی هاوڵاتیان متمانەیان بەوە نییە کە حکومەتەکەیان بەوەهەڵدەستێک کە پێیان وایە ڕاستە".

بێگومان هۆکاری زۆر مەعقول هەن بۆ بێ متمانەیی بە سیاسەتمەداران و دەسەڵاتخوازان بەگشتی، نەک تەنیا درۆ و گەندەڵییەکانیان، بەڵکو دووبارە ئەدای خراپی حکومەتەکانیش بەرامبەر بە چاوەڕوانیەکانمان وەک دەنگدەر. سەرەڕای ئەوەش، ئەمڕۆ هەمووومان باشتر ئاگاداری شتەکانین، و سانسۆڕی میدیایی زیادکراو عادەتەن تیشک دەخاتە سەر هەڵسوکەتی خراپ و هەڵە و کەموکورتییەکانی حکومەت. بۆیە ئەو ئاستە نزمەی متمانە بە حکومەت ئێستا بۆتە تایبەتمەندییەکی درێژخایەن، و دەبێت ئەم دۆخە بگۆڕدرێت. ئێمە پێویستە متمانە بە حکومەت و سەرکردە سیاسییەکانمان بگێڕینەوە. ئەمەش پێویستی بەگۆڕانکارییەکی قووڵ دەبێت لەچۆنیەتی کارکردنی حزبەکان، و چۆنیەتی

هەڵبژاردنیان بۆ سەرکردەکانیان و چاودێریکردنیان و لێپرسینەوەیان و پلە بەرزکردنەوەیان، یان کەمکردنەوەی مووچەکانیان. گونجاندنی پارتەکان لەگەڵ پێداویستیەکانی سەدەی بیست و یەکەم بە یەکێک لە ئەولەویەتیە گرنگەکان دادەنرێت.

## بەهێزکردنی لایەنە سیاسییەکان: وانە بە سوودەکان لە بزوتنەوەی " وۆڵ ستریت داگیرکەن" و ڕێکخراوی قاعیدە

لە زۆربەی دیموکراسیەکاندا، حزبەکان بە ڕێکخراوە سیاسییە سەرەکیەکان دەمێننەوە، وە بەردەوام بووە لە پارێزگاری کردن لە بڕێکی بەرچاو لە هێز.[1] بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان کەمتر پەرتەوازە و لاواز و جەمسەرگیر نین لە سیستەمی سیاسی گشتی کە لە چوارچێوەیدا کار دەکەن. ئەمڕۆ، ڕاستیەکەی، زۆربەی پارتە سیاسیە تەقلیدیەکان ناتوانن ئەو هێزەی کە ڕۆژانێک لە ڕابردوودا چێژیان لێ وەردەگرت، بپارێزن. باشترین نموونەش بۆ ئەمە دەست بەسەردا گرتنی پارتی چای بۆ پارتی کۆماری و دابەشبوونە ناوخۆییەکانە کە جاران ئەم پارتە یەکێک بوو لە بەهێزترین ئۆرگانە سیاسییەکانی جیهان. بەهەمان شێوە، ناکۆکییە وێرانکەرەکانی فراکسیۆنەکان زۆر لەبەرچاو ڕوونە لە لایەنە سیاسییەکان لە سەرانسەری جیهاندا.

بە هەموو پێوەرێک، پارتە سیاسییەکان لە ساڵانی نەوەدەکانەوە بە قۆناغێکی سەختدا تێپەڕیون. چونکە لە زۆربەی وڵاتەکاندا دەنگدانی ڕای گشتی دەری دەخەن کە پێگا و هەیبەت و بەهاکانیان لەبەرچاوی ئەو کەسانەی خزمەتی بەرژەوەندیەکانیان دەکەن لە کەمبوونەوەدایە، و هەندێجار دەگاتە ئەوپەڕی نزمترین ئاستی.

کۆتایی جەنگی سارد - و بە تایبەتیتر ڕووخانی کۆمۆنیزم وەک بیرۆکەیەکی ئیلهامبەخش - سنوورە ئایدیۆلۆژییەکانی لەناوبردووە کە ناسنامەی

بێهاوتای خۆی بە زۆر لایەن داوە. وە لەبەرئەوەی بەرنامەکانی هەڵبژاردن لەیەک دەچن و لێک جیاناکرێتەوە، کەسایەتی کاندیدەکان بوونەتە سەرەکیترین هۆکاری جیاکردنەوە، و زۆرجاریش تاکە فاکتەرە. لە پێناو بردنەوەی هەڵبژاردن لایەنە سیاسییەکان پشتبەستنیان بە ڕاکێشانی جەماوەریی بۆ پرەنسیپ و بیرۆکەکانیان کەمکردۆتەوە، و زیاتر پشت بە هونەری بازارکردن دەبەستن و شارەزایی کاندیدەکانیان کە لە میدیاکاندا دەردەکەون، وە بێگومان ئەو پارەیەی کە دەتوانن کۆیبکەنەوە. ئەو ئابڕووچوونانەی کە ناوبانگی تاکە سیاسەتمەدارەکانی پیس کردووە بە شێوەیەکی سروشتی کاریگەری لەسەر ئەو ڕێکخراوە سیاسیانە هەیە کە سەر بە ئەوانن. جارێکی تر، ئەبینین کە میدیای ئازادتر و پەرلەمانەکان و ئۆرگانە دادوەرییە سەربەخۆکان گرەنتی ئەوەیان کردووە کە ئەو پیادەکردنە گەندەڵیانەی کە پێشتر بە وریاییەوە شاردرابوونەوە یان وونکرابوون ئێستا بە شێوەیەکی ئابڕوبەرانە دەرکەوتوون، و ئاشکرا بوو کە ئەمانە کرداری تاوانکارانەن؛ ئەو شتەی کە پێگەی پارتە سیاسیەکان و بەهاکەی کەم دەکاتەوە. ئەم شێواندنە گشتییەش سووتەمەنی پێدراوە لەلایەن پارتە سیاسییەکانەوە کە چیتر ناتوانن لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە خۆیان لە دژبەرەکانیان جیابکەنەوە، کە پشتیان بە تۆمەتی گەندەڵی و بڵاوکردنەوەی ئابڕووچوونەکان بەستووە بۆ دامەزراندنی وێنەیەکی دیاریکراو بۆ نەیارە سیاسیەکانی لە هزری دەنگدەران. هەروەها ئەستەمە ئەوە بسەلمێنین کە ئایا گەندەڵی سیاسی لە دەیەکانی ڕابردوودا بە ڕاستی زیادی کردووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە زیاتر لە جاران ئاشکرا بوونە.

لە کاتێکدا کە پارتە سیاسییەکان ئازاریان دەچێژێت، لە هەمان کاتیشدا گەشەشیان کردووە، بەدەست بزوتنەوە کۆمەڵایەتیەکان و ڕێکخراوە ناحکومییەکان. وە تەنانەت ڕێکخراوە تیرۆرستیە خوێناویەکانیش، وەک ڕێکخراوی قاعید ( کە ڕێکخراوێکی نا حکومی دەنوێنێت لە زۆربەی ڕووە گرینگەکان)، ئێستا لە ڕووی

جیهانییەوە بڵاوبۆتەوە، و لە نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. وە لەبەر ئەوەی پەیوەندیەکانی نێوان پارتە سیاسیەکان و بەربژێرەکانی لاواز بووە، ئەوا پەیوەندی نێوان ڕێکخراوە ناحکومیەکان و لایەنگرانی بەهێزتر بووە. وە لەگەڵ بەردەوامی پاشەکشەی پێگەی جەماوەری سیاسەتمەدارەکان و پارتە سیاسیەکان، پێگەی ڕێکخراوە ناحکومیەکان بەرزتربۆتەوە و دەسەڵاتیشیان زیادی کردووە. هەروەها متمانە بە ڕێکخراوە ناحکومیەکان زیادی کردووە بە هەمان خێرایی کەمبوونەوەی متمانە بە پارتە سیاسیەکان. وە توانای دامەزراندنی ئەو گەنج و چالاکوانانەی کە زۆرتر بە پەرۆش و ئامادەن بۆ قوربانیدان لە پێناو ڕێکخراوەکە و هۆکارەکەی بە یەکێک لە کارامەییە ڕێکخراوەییەکان دادەنرێت کە لە نێو ڕێکخراوە ناحکومیەکان زیاتر بڵاوە وەک لە نێو پارتە سیاسییەکاندا.

لە کاتێکدا ڕێکخراوە ناحکومیەکان بە پەرۆشییەوە بەردەوام بوون لە بەدواکەوتنی هۆکاری تاکەکەسی بە تەرخانکردنی چالاکیەکانیان بۆ تەنها یەک مەبەست، ئەوا پارتە سیاسییەکان بە دوای چەندین ئامانجی جیاوازە چوون، و تەنانەت ئامانجە ناکۆکەکانیش، و وادەرکەوت کە خولیای بەدەستهێنانی بەخشین بن تەنها بۆ هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن. لەو دەوڵەتانەی کە پارتە سیاسییەکان قەدەغەکراون یان سەرکوتکراون، ڕێکخراوە ناحکومییەکان بوون بە تاکە کەناڵ بۆ چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتی. لە زۆربەی وولاتەکاندا، ڕێکخراوە ناحکومیەکان بە خێرایی گەشەیان کردووە چونکە کەمتر گەندەڵن، و زۆربەی کات سەر بە تۆڕێکی نێودەوڵەتی فراوانترن، و بە گشتی پرەنسیپی ڕوونتریان هەیە، و پێکهاتەیەکی هەرەمی کەمتر و پەیوەندیەکی نزیکتر لەگەڵ ئەندامەکانیان. هەروەها ڕێکخراوە ناحکومیەکان بە ڕوونی پەیامەکەیان ناسروان، چ بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی ژینگە و کەمکردنەوەی هەژاری یان بۆ کۆنترۆڵکردنی گەشەی دانیشتوان تەرخان بکرێت، بە دەگمەن ئەو ئەندامانەی

تێدایە کە ڕێکخراوەکە لە پێناوی ئەوان وەستاوبێت. ئەم فاکتەرانە بەیەکەوە پاڵیان بە گروپێکی نوێ لە چالاکوانانە سیاسیەکان ناوە، ئەوانەی کە لەرابردوودا بەلای پارتە سیاسییەکاندا ڕادەکێشران، بۆ زیاتر مەیلکردنی ڕێکخراوە ناحکومییەکان لە جیاتی ڕێکخراوە حکومیەکان.

گەشەسەندنی ڕێکخراوە حکومییەکان، لە دەرەنجامی گشتیدا، جێگای پێشوازی لێکردنە؛ کەچی ئەو شتەی کە زۆر کەمتر قبوڵکراوە، و دەبێت بە شێوەیەکی کاریگەر بوەستێنرێت، داخورانی پێگەی جەماوەری پارتە سیاسییەکانە، کە لە زۆرێک لە وولاتەکانی وەک - ئیتالیا، ڕووسیا، ڤەنزوێلا و ئەوانی تر- بۆتە هۆی بە تەواوی وونبوونیان، و ئەوەی جێگیان بگیردرێتەوە بە دەزگا هەڵبژاردنە بێ بنەماکان کە تەنها ئامانجی بردنەوەیە لە هەڵبژاردنەکان.

فاکتەری گرنگ بۆ دووبارە هەڵسانەوەی پارتە سیاسییەکان سەر لە نوێ و زیاد بوونی کاریگەریەکەی لە گێڕانەوەی توانایانە بۆ هاندان و بوژاندنەوەی خەڵک- بە تایبەتی گەنجەکان - بۆ ئەوەی سیاسەت بە تەواوی ڕیسوا نەکرێت، یان وزەی سیاسی خۆیان بەرەو ڕێکخراوە ناحکومییە تاک دۆزەکان ئاراستە نەکەن، یانیش ڕەنگە گرووپە پەراوێزخراوەکانی تر.

بۆیە پێویستە لایەنە سیاسییەکان ئامادەبن بۆ ئەوەی پێکهاتە و شێوازەکانیان لەگەڵ ئەم جیهانە بگونجێنن کە زیاتر لێکبەستراوە. وە لەبەرئەوەی پێکهاتە سادەکانی بە شێوەیەکی ڕێژەیی کەمتر پلەبەندی هەرەمی ڕێکخراوە ناحکومیەکانی زیاتر چالاک کرد و توانای زیاتری پێدا بۆ خۆگونجان و ڕاهاتن لەگەڵ پێویستیەکانی ئەندامەکانی و پێشبینیەکانیان، ئەوا ئەم تایبەتمەندیانە لەوانەیە یارمەتی پارتە سیاسیەکان بدات بۆ گەیشتن بە ئەندامە نوێیەکان، و زیاتر نەرم و سووک بێت لە جوڵەکردن، و ئەژیندای خۆی جێبەجێ بکات، و زیاتر بە

توانا بێت لە دژایەتی کردنی سادەییە ترسناکەکان ئەوانەی هەوڵ دەدەن بۆ دەسەڵات و هێز لە ناوەوە و دەرەوەی پارتەکان.

ڕێکخراوە ناحکومییەکان متمانەی لایەنگرانیان بەدەست دەهێنن بەوەی وا لە ئەندامەکانیان بکەن هەست بکەن کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەیە، و هەوڵەکانیان دەست بەرداری لێ ناکرێ، و سەرکردەکانیان دووچاری لێپرسینەوە دەبنەوە و بە شەفافی کار دەکەن، و پەیوەندیان بە هیچ بەرژەوەندیەکی نادیار و شاراوە نیە. بۆیە پێویستە پارتەکان هەمان ئەو هەستانە لە چینە فراوانەکانی کۆمەڵگەدا دروست بکەن، و بتوانن ئەندامێتی خۆیان فراوانتر بکەن دوورتر لە بنەماکانی تەسکی حیزبی نەریتی خۆیان کە سنووردارن بە چالاکوانانی دڵسۆزەوە. تەنها ئەو کاتە دەتوانیت ئەو جۆرە هێزە بگەڕێنیتەوە کە پێویستت پێیەتی بۆ ئەوەی بە باشی کۆنترۆڵمان بکات.

### زیادکردنی بەشداری سیاسی

قسەکردن لە کارکردن ئاسانترە؛ کێ کات و ئارامی هەیە بۆ ئەوەی بەشداربێت لە هەموو کۆبوونەوەکان و چالاکی گرووپەکان کە لە ئەنجامی هەر کردەوەیەکی بەکۆمەڵەوە دێت، بەتایبەتی لایەنێکی سیاسی بێت؟ ئەم هۆکارانە و هۆکاری تریش دەگمەنی تێکەڵ بوونی زۆربەی خەڵک بە شێوەیەکی کارگەری لە پارتە سیاسیەکان و کێشە کۆمەڵایەتیەکان لێک دەداتەوە، بە ڕێگایەک تێدەپەڕێت لە پێشکەشکردنی کۆمەکی ناوبەناو و ئامادەبوون لە کۆبونەوەیەک یان گردبوونەوەک لە ماوەیەکی زۆر درێژدا. لە هەلومەرجی ئاساییدا بەشداری سیاسی و چالاکی کۆمەڵایەتی لە کارە کەمینەکان دادەنرێت. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا سەرسام بووین بەو هەڵکشانە لەناکاوەی گرینگیدان بە کاروبارە گشتیەکان، و گردبوونەوە زۆرەکانی ئەو هاووڵاتیانەی کە عادەتەن گرینگی بە شتەکە نادەن،

و تەنانەت بێ باکیشن، و تێکەڵبوونی هەزاران کەسیان لەو چالاکیە سیاسیانەی کە هەوڵ و کۆششێکی زۆر زیاتری پێویستە ( و زۆریش مەترسیدارە لە هەندێک وولات) لە ئامادەبوون لە کۆبوونەوەیەکی هەر پارتێکی سیاسی.

بۆ نموونە، لە وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، باراک ئۆباما و هەڵمەتە سەرۆکایەتیەکەی لە ساڵی ۲۰۰۸ توانی ژمارەیەکی زۆر لە سیاسیە سەرەتایی و گەنجەکان هانبدات، ئەوانەی کە عادەتەن گرینگیان بە چالاکیەکانی هەڵبژاردنی هیچ لە هەردوو پارتەکە نەدەدا یان تێکەڵی نەدەبوون. سەرەرای باکگراوندی بەربژێری و ڕەگەزە ڕەسەنەکەی لە هەڵمەتی ساڵی ۲۰۰۸ زۆر شت ڕوویاندا کە پێشتر ڕووی نەدابوو: لە داهێنانەکان لە ئاژانسەکانی ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتی کە بەکارهات بۆ ڕاکێشانی چینێکی دیاریکراو لە دەنگدەران، بۆ بەکارهێنانی خۆبەخشان و بەکارهێنانیان لە ڕێگا نوێیەکان بۆ کۆکردنەوەی کۆمەکیەکان. سوپرایزەکان لە زیادبوونی چاوەڕواننەکراوی چالاکی سیاسی گروپە ناچالاکەکان تا ئەم ساتەش نەوەستاوە لەگەڵ چوونە پاڵی چالاکوانانی سیاسی نوێ بۆ هەڵمەتەکەی ئۆباما. چونکە لە پشت ئەو خنکانەی کە قەیرانە داراییەکان دروستیان کردو و هەست بە نایەکسانی لە دابەشکردنی بارگرانی قەیرانەکە، بزوتنەوەی " وۆڵ ستریت داگیرکەن" و هەزاران لە هاوشێوەکانی لە شارەکان لە سەرانسەری جیهان بەدەرکەوتن، حکومەتەکان و پارتە سیاسیەکانی سەرسام کرد ئەوانەی هەوڵیان ئەدا بۆ تێگەیشتن لە سروشتی و ڕێگای کارکردنی ئەم بزوتنەوانە و لە هەمان کاتدا گەڕان بە دوای ڕێگا بۆ سوود وەرگرتن لەو ووزە سیاسیەی کە ئەم بزوتنەوانە هەیانبوو، بە ڕێژەیەکی زۆر خۆڕسک لە پێکهاتەکەی.

سەرسووڕهێنەرترین و کاریگەرترین دەرکەوتنی ئەم چالاکییە بەربڵاوە لە مانگی کانوونی یەکەمی ۲۰۱۰ بە ئاژاوەوە لە شارۆچکەیەکی بچووکی تونس

دەستی پێکرد. ئەو نائارامییانە بووە هۆی ڕووخاندنی حکومەت لە تونس و شەپۆلی پڕ لە ناڕەزایی و خۆپیشاندان لە سەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە بە بەهاری عەرەبی ناسراوە. ملیۆنان هاووڵاتی کە پاسیڤ و سەرکوتکراو بوون بوونە چالاکوانی سیاسی کە ئامادەن ئەوپەڕی قوربانی بدەن کە نەک هەر ژیانیان دەخاتە مەترسی بەڵکو خێزانەکانیشیان دەخاتە مەترسییەوە. پێچەوانەی بزووتنەوە "وۆڵ ستریت داگیرکەن" کە تا ئێستا نەیتوانیووە وزەی سیاسی خۆیان بگۆڕن بۆ دەسەڵاتی سیاسی، بەئاگاهاتنەوەی سیاسی بەهاری عەرەبی بووە هۆی گۆڕانی بەرچاو لە هاوسەنگی دەسەڵاتدا.

بۆیە بەشداری سیاسی لە هەلومەرجی ئاساییدا لە لایەن گرووپە بچوکەکانی چالاکوانەوە ئەنجام دەدرێت، بەڵام لە هەلومەرجی تردا وەک شۆڕش، چالاکی سیاسی دەبێتە تەرکیزێک کە سەرنجی هەموو کۆمەڵگاکان ڕادەکێشێت. لەگەڵ ئەوەش شۆڕشەکان قوربانیدانی زۆرە، و ئەنجامەکانی زۆر نادیارن، و پێشکەوتنیش ئەنجامە مسۆگەرەکەی نیە. بۆیە تەحەداکە ئەوەیە کە لە شۆڕشە گرانبەها و مەترسیدارەکان بە دوور بیت، و لە هەمان کاتدا هەڵسان بە فەراهام کردنی وزەی سیاسی لە هەموو کۆمەڵگاکان و ئاراستەکردنیان لە پێناو ڕوودانی گۆڕانە چاوەڕوانکراوەکان. وە باشترین ڕێگا بۆ ئەمە لە ڕێگای پارتە سیاسیە زۆرتر بەتواناکانە بۆ ڕکابەری.

بەکاریان دەهێنێت بۆ دامەزراندنی ئەندامە نوێیەکان، و دووبارە بنیادنانەوەی پێکهاتەکەی و پرۆسەکانی، دەکرێت سەرنج ڕاکێشانی زیاتر بکات و زیاتر جێگای متمانەی پێ ببەخشێت. و بە شێوەیەکی ناوازە، دەکرێت ببێت بە تاقیگەکان بۆ داهێنانی سیاسی بە ئاستێکی زۆر کاریگەرتریش.

وە ناتوانین بەرەنگاری ئاڵنگاریە جیهانیە بەپەلەکان بینەوە تەنها پاش ئەوەی متمانەمان بە پارتە سیاسیەکانمان لە ناوەوە ئەگەڕێنینەوە، و پاشان توانا ئەدەین بە

## کۆتایی سەردەمی هێز

سەرۆکەکانمان بۆ لەخۆگرتنی هەڵوەشانەوەی هێز، و دەرکردنی بڕیارە گرانەکان و خۆلادان لە خنکانی سیاسی. وە بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجەش پێویستیمان بە پارتە سیاسیە زیاتر بەهێز و نویێ و دیموکراسیەکانە، کە دەتوانێت هانی بەشداریکردنی سیاسی و ئاسانکردنی بدات.

### بازدانی داهاتوو بۆ داهێنانە سیاسیەکان

لەم سەردەمەی ئێستاماندا پێویستە ئامانجە سیاسیە ناوەندیەکان ئەمانە بێت: گەڕانەوەی متمانە، نوێکردنەوەی پارتە سیاسیەکان، و دۆزینەوەی ڕێگاچارەی نویێ کە هاووڵاتی ئاسایی لە ڕێگایەوە بتوانێت بە کاریگەرانە بەشداری پرۆسەی سیاسی بکات، و نوێکردنەوەی ئامرازە نوێیەکانی حوکمڕانی کاریگەر، و سنوردانان بۆ خراپترین ئاسەواری پرۆسەی ڕێکخستنەکان و هاوسەنگیەکان، و لە هەمان کاتدا خۆلادان لە چڕی هێزی زیادەڕۆ کە ناکەوێتە ژێر باری لێپرسینەوە، و بەهێزکردنی توانای دەوڵەت بە کارکردن بەیەکەوە.

بەبێ ئەم گۆڕانکاریانە ئەستەم دەبێت هیچ پێشکەوتنێکی بەردەوام لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەسە ناوەخۆیەکان و دەرەکیەکان بەرجەستە بکرێت کە زیاتر دەبن لە دژی گەلەکانمان و پێشکەوتنیان.

لەم سەردەمەی گۆڕانی شۆڕشگێڕانەدا کە هیچ شتێک نەماوە گۆڕانکاری تێدا نەکرابێت، واتە بە نزیکەی شایەتی ئەوە دەدەین، هێشتا ناوچەیەکی گرنگ هەیە کە گۆڕانکاری لێ نەکراوە: شێوازی بەڕێوەبردنە بۆ خۆمان، کۆمەڵگاکانمان، نەتەوەکانمان، سیستەمی نێودەوڵەتی، یان ئەو ڕێگایانەی کە ئێمە وەک تاکەکانی پرۆسەی سیاسی هاوبەشی دەکەین. ئایدیۆلۆژیاکان هاتن و

ڕۆیشتن، و پارتە سیاسییەکان سەرکەوتن و لەدەست دەرچوون، و هەندێک لە پراکتیزە حکومییەکان بە سوپاس بۆ چاکسازی و تەکنەلۆجیای زانیاری پەرەیان سەندووە. هەڵمەتەکانی ئەمڕۆی هەڵبژاردن پشت بەشێوازی قایلکردنی ئاڵۆزتر دەبەستن، و بێگومان ژمارەی ئەو کەسانەی لەلایەن سەرکردەیەکی نادیکاتۆرەوە بەڕێوەدەبرێن لە هەموو کاتێک زیاتر بووە. لەگەڵ ئەوەش، ئەم گۆڕانکارییانە، کە شایەنی پێشوازی لێکردنە، بە هۆی گۆڕانە سەرسوڕهێنەرەکان لە بوارە پەیوەندیەکان، و پزیشکی، و بازرگانی و جەنگ کەمتر دەبنەوە. بەکورتیی داهێنانی شۆڕشگێڕانە هێشتا نەگەیشتۆتە بوارەکانی سیاسی و حوکمڕانی و بەشداری سیاسی. بەڵام دەگات، ئێمە لە سەنگی شەپۆلێکی شۆڕشگێڕانەین لە داهێنانە ئەرێنیە سیاسی و دامەزراوەییەکان.

وەک ئەم کتێبە دەستنیشانی کردووە، هێز لە زۆر بواردا تا ڕادەیەک دەگۆڕێت کە ئەستەمە لە گۆڕینە گرنگەکان دوور بکەونەوە لەو شێوازەی کە مرۆڤ خۆی پێ ڕێک دەکخات بۆ ئەوەی ئەو بڕیارانە بدات کە پێویستیان پێیەتی بۆ مانەوە و پێشکەوتن. ئەم جۆرە زیادبوونە دراماتیکییە لە داهێنانی ڕادیکاڵ و پۆزەتیڤەکان لە حوکمڕانی پێشتر ڕووی داوە، دیموکراسی یۆنانی و شەپۆلی داهێنانە سیاسییەکان کە لە لایەن شۆڕشی فەرەنساوە بەربڵاوکراوە تەنیا دوو نموونەی ناسراون. ئەو شەپۆلەی تر کە چاوەڕێی دەکەین دواخرا، وەک مێژوونووس هێنری ستیل کۆ ماگەر دەربارەی سەدەی هەژدەیەم دەڵێت:

ئێمە بە شێوەیەکی پراکتیکی پرۆسەی هەموو ئەو دەزگا سیاسییە سەرەکییانەمان داهێناوە کە هەمانە، و لەو کاتەوە هیچ شتێکی ترمان دانەهێناوە. ئێمە حیزبی سیاسی و دێموکراسی و حکومەتی پەرلەمانیمان داهێنا، و یەکەم

## کۆتایی سەردەمی هێز

دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆمان لە مێژوودا داهێنا... وە بنەمای پێداچوونەوەی دادوەریمان داهێناوە. ئێمە پێشگری هێزی مەدەنیمان لەسەر هێزی سەربازی داهێنا. هەروەها ئازادی ئایین و ئازادی ڕادەربڕین و بەڵگەنامەی مافمان داهێناوە، باشە، دەتوانین بەردەوام بین لە ئاماژەدان بە داهێنانی زیاتر... ئەمە میراتێکی ڕاستەقینەیە. بەڵام، هیچ شتێک لە گرنگییەکی هاوشێوە ئێمە لەو کاتەوە دامانهێناوە؟

دوای جەنگی جیهانی دووەم، ئێمە شایەتی شەپۆلێکی تری داهێنانی سیاسی بووین کە بۆ لادانی جەنگێکی دیکەی جیهانی داڕێژراون. ئەمەش بووە هۆی دروستکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان، و ژمارەیەکی زۆر لە دەزگا تایبەتەکانی نێودەوڵەتی، وەک بانکی جیهانی و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی کە دیمەنی دامەزراوەیی جیهانیان گۆڕیوە.

ئێستاش شەپۆڵەکی تر لە داهێنانەکان خەریکە کەڵکە دەبێت؛ ئەو شەپۆڵە بەهێزترە لەوانەی پێشووی، وە چاوەڕوان دەکرێت جیهان بگۆڕێت بە هەمان ئەو ڕێژەیەی کە شۆڕشەکانی تەکنەلۆجیا گۆڕیان کە لەماوەی دوو دەیەی ڕابردوو تەقینەوە. ئەو شەپۆڵە لە سەرەوە بۆ خوارەوە نابێت، و ڕێکوپێک و خێراش نابێت، و یان بەرهەمی کۆنگرەی لوتکە یان کۆبوونەوەکانیش نابێت، بەڵکو ئاڵۆز و پێچاوپێچ و نا ڕێک و پێک و ناتەواو دەبێت. ئەمە حەتمی و لێی ڕزگار نابین. بە زەرورەتی گۆڕین لە پرۆسەی خاوەنداریەتی و بەکارهێنان و هێشتنەوەی هێز، مرۆڤ دەبێت ڕێگای نوێی بەڕێوەبردنی خۆی بدۆزێتەوە، وە دەشدۆزێتەوە.

# پاشکۆ

## دیموکراسی و دەسەڵاتی سیاسی:

## ئاراستە سەرەکییەکان لە ماوەی دوای جەنگ

تێبینی بۆ خوێنەران: ئەم پاشکۆیە- کە لەلایەن دکتۆر ماریۆ چاکون، زانکۆی یێل ئامادەکراوە- بە تایبەت پەیوەندی بە بەشی پێنجەمەوە هەیە.

### پێوانەکردنی پەرەسەندنی دیموکراسی و دیکتاتۆرییەت

دەست دەکەم بە سەیرکردنێک کە چۆن ژمارەی سیستەمە دیموکراسیەکان لە چوار دەیەی ڕابردوودا گۆڕاوە. وە بۆ ئەوەی دیاری بکەم دەوڵەتە دیموکراسی و نادیموکراتەکان چین، دوو پۆلێنکردنی بەکارهێنراو لەسەر ئاستێکی فراوان لە ئەدەبیاتی ئەکادیمیدا بەکار دەهێنم.

یەکەم پۆلێنکردنی سیستەمەکان ئەو پۆلێنکردنەیە کە لە ڕاپرسیی " ئازادی لە جیهان" دا هاتووە کە لەلایەن فریدوم هاوس لە ساڵی (٢٠٠٨)دا ئەنجام دراوە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا، سیستەمەکان بۆ سێ پۆلێن دابەشکراون: "نا ئازاد"، "نیمچە ئازاد"، و "ئازاد". هەر دەوڵەتێک لەسەر بنەمای پێوانەیی پێوەری مافی سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکان پۆلێن کراوە. ئەو توخمە لاوەکیانەی لەم پێوانەیەدا دەپێورێن بریتین لە: ئازادی پرۆسەی هەڵبژاردن، فرەحزبی، ئەدای حکومەت، ئازادی ڕادەربڕین و باوەڕ، ئازادی ڕێکخستن و کۆبوونەوە، سەروەری یاسا، و مافەکانی تاکەکەسی. بۆ مەبەستەکانی شیکردنەوە، دەوڵەتەکانی "ئازاد" بە دیمۆکراسی تەواو، دەوڵەتە نائازادەکان و نیمچە ئازادەکان بە نادیموکراسی پۆلێن کراون.

سەرچاوەی دووەم کە بەکارم هێنا ئەو پۆلێنکردنەی ڕێکخستن بوو کە لە

لایەن برزینسکی و ئەوانی تر لە ساڵی ٢٠٠٠ پەرەی پێدرا، کە لە سەر پێناسەیەکی کورت بۆ دێموکراسی هاوشێوەی پێناسەی پێشنیارکراوی شومپیتەر (١٩٦٤) دامەزراوە. لەم پۆلێنکردنەدا سیستەمی دێموکراسی بە سیستمێک پێناسە دەکرێت کە تێیدا حکومەت لە ڕێگەی هەڵبژاردنی پێشبڕکێکارەوە هەڵدەبژێردرێت. بۆیە لەم پۆلێنکردنەدا کێبڕکێی ئازاد و دادپەروەرانە لایەنی بنچینەیی سیستەمێکی دێموکراسییە (بڕوانە دال ١٩٧١ بۆ ڕێبازێکی هاوشێوە). بە بەکارهێنانی ئەم دوو پۆلێنکردنە، ڕێژەی هەموو سیستەمە سەربەخۆکانم لە جیهاندا ژمێریار کرد کە لە هەر ساڵێکی دیاریکراودا بە سیستەمێکی "دیمۆکراتیک" پۆلێن کراون.

شێوەی ١-١ پەرەسەندنی سیستمە دیموکراسییەکانی جیهان لە ساڵی ١٩٧٢ەوە پیشان دەدات.

وەک لە شێوەی ١-١ دا نیشان دراوە، ڕێژەی دیموکراسی لە جیهاندا لە چوار دەیەی ڕابردوودا بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە. وە بە پێی فریدۆم هاوس، ڕێژەی سیستەمە دیموکراسیەکان لە ساڵی ١٩٧٢ زیاتر نابێت لە٢٨% لە نێوان ١٤٠ سیستەمی سەربەخۆی لە جیهان. سی ساڵ دواتر، لە ساڵی ٢٠٠٢، ئەم ڕێژەیە بەرزبووەوە بۆ ٤٥٪. ئەم زیادبوونە جیهانییە لە ژمارەی دیمۆکراسیەکان بە داتاکانی برزینسکی پشتڕاست بۆتەوە. چونکە لە پۆلینەدا، لە نێوان ساڵانی ١٩٧٢ و ٢٠٠٢دا ڕێژەی دیموکراسیەکان لە ٢٧٪ لە ساڵی ١٩٧٢ بۆ ٥٩٪ لە ساڵی ٢٠٠٢ بەرزبۆتەوە. جیاوازییەکانی نێوان هەردوو پۆلێنکردنەکە شتێکی چاوەڕوانکراوە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە مەرجەکانی دێموکراسی کە لەلایەن فریدۆم هاوسەوە بەکاردێت تاڕادەیەک توندترە لەوەی کە لەلایەن برزینسکی و هاوبەشەکانی بەکارهاتووە. لەگەڵ ئەمەش، ئێمە دەتوانین لەم خەمڵاندنە نزیکەی

یەکەم لەوە بگەین کە لە ماوەی سێ دەیەی ڕابردوودا ڕەوتێکی ئەرێنی گشتی لە ژمارەی دیمکراسیەکانی جیهاندا هەبووە.

لەبەرئەوە ئایا جیاوازی ناوچەیی هەیە لە پەرەسەندنی سیستەمی دێموکراسیدا؟ ئەگەر فاکتەرەکان تێکەڵ بکەین کە دەبنە هۆی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە سیستەمەکاندا و بیانخەینە ناو ماتریکسەوە، چاوەڕێی ئەوە دەکەین کە گەشەیەکی ناوچەیی لە سیستمە دیموکراسییەکاندا بەدی بهێنین. ئەم شێوازە ناوچەییانە لە نزیکەوە پەیوەستن بە بیرۆکەی "شەپۆلەکانی گواستنەوەی دیموکراسی" کە لە لایەن هانتینگتۆن (١٩٩١) یەکەم جار وەسف کراوە. بۆ دۆزینەوەی ئەم ئەگەرە، شێوەکانی ١-٢ و ١-٣ پێشکەوتنی سیستەمی دێموکراسی نیشان دەدەن (وەک ڕێژەیێک لە کۆی سیستەمەکان) لە ئەمریکای لاتین و ئەفریقای سەحەرای باشور و بلۆکی سۆڤیەتی پێشوو و باکووری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

وەک لەم دوو شێوەدا باسکراوە، چەند وڵاتێک لە ئەمریکای لاتین و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو لە ماوەی ١٩٧٥-١٩٩٥دا وەرچەرخانێکی دیموکراسیانەیان گرتۆتە بەر. ئەم گۆڕانکارییانە زیاتر لە کۆتاییەکانی ساڵانای ١٩٧٠کان بۆ ئەمریکای لاتین و لە سەرەتای ١٩٩٠کان بۆ کوتلەی سۆڤیەتی پێشوو (دوای ڕووخانی دیواری بەرلین لە ساڵی ١٩٨٩) ڕوویداوە. وە لە ساڵی ٢٠٠٨ فریدۆم هاوس ٥٥%ی وڵاتانی ئەمریکای لاتین و ٤٨%ی وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بە وڵاتانی دیموکراسی پۆلین کردووە. هەروەها ڕەوتێکی ئەرێنی هەیە لە گۆڕانی دیموکراسی لە ئەفریقای سەحرای باشور، لەگەڵ ئەوەی ڕێژەکەی کەمترە لەو ڕەوتەی ئەمریکای لاتین. هەرچی وڵاتە عەرەبیەکان و وڵاتانی باکوری ئەفریقایە ئەوان زیاتر سەقامگیرن بە شێوەیەکی تێبینیکراو، و تەنها کەمتر لە ١٠%ی وڵاتانیان وەک سیستەمی دیموکراسی پۆلینکراون بە

درێژایی ئەم هەمووساڵانە. ئەم شێوازانە جەخت لەسەر داتاکانی برزفورسزکی دەکاتەوە کە لە شێوەی ١-٣ دیارە.

بە هەر حاڵ ئەم ڕەوتانە نابنە ڕەنگدانەوەی کاریگەری بەهاری عەرەبی لە سیستەمە سیاسیەکان لە باکوری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ئەم شێوەیە وڵاتانی هاوکاری ئابووری و گەشەسەندنی لەخۆ نەگرتووە؛ چونکە ئەم وڵاتانە هیچ گۆڕانکاریەکی ڕیشەییان بەخۆوە نەدیوە لە سیستەم لەو ماوەیەی کە ئاماژەی پەکراوە. وە بە پێی ئەوەی کە هەموو ئەم دەوڵەتانە دیموکراسی بوونە لە سەرەتای دەستپێکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بۆیە بەوە جیاکراونەتەوە کە خاوەنی دیموکراسیەکی جێگیر و پتەو بوونە.

## گۆڕانکاریە چاکسازی و لیبرالیە کەمەکان

ئەو شێوانەی کە تا ئێستا نیشاندراون تیشک دەخاتە سەر گۆڕانە سیاسیە ڕیشەییەکان کە تێیدا سیستەمە سیاسیەکان سیستەمی دیموکرسین ( یان وا نین). وە لە وانەیە ئەم ژمارانە هەندێک لەو هەنگاوە سادانە بشارێتەوە بەرەو دیموکراسی لە زۆرێک لەو دەوڵەتانەی کە گۆڕانێکی تەواویان بەخۆوە نەدیوە . وە لەوانەشە چاکسازیە کەمەکان ببێتە هۆی گۆڕانکاریە گرینگەکان لە دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی و مافەکانی مرۆڤ. بۆ نموونە زۆر سیستەمی نادیموکراسی هەڵساوە بە جێبەجێکردنی ڕکابەری هەڵبژاردن بۆ دەزگای یاسادانان و پۆستە جێبەجێکارە باڵاکان. تەنانەت ئەگەر زۆربەری هەڵبژاردنەکان لەم سیستەمەی کە بە دیموکراسی دادەنرێت بە تەواوی پاک نەبێت، بەڵام گۆڕانکاری لیبرالی کەم ڕەنگە ڕێگا بە گۆڕانی گرینگ بدات لە دابەشکردنی دەسەڵات. زیاتر لەمەش زۆر گۆڕانکاری بە شێوەیەکی پلەبەپلە ڕوودەدات، بۆیە دەست پێکردنی ڕکابەری

هەڵبژاردن لەوانەیە نیشانەیەک بێت بۆ گۆڕانەکان بەرەو دیموکراسی لە داهاتوودا.

بۆ دۆزینەوەی ئەم چاکسازیە کەمانە، پێوەری خاڵەکانی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی (Polity Score) بەکار هاتووە کە پێشخراوە لە پڕۆژەی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی ( پڕۆژەی بولتی ) کە لەلایەن مارشاڵ و جاگرز لە ساڵی ٢٠٠٤ دانراوە. ئەم پێوەرە خەملاندنێکی نزیکەیی بەردەوامە کە ڕێگەمان پێ دەدات بە دەست نیشاکردنی گۆڕانکاریە کەمەکان لە سیستەمەکاندا، چ ئەم گۆڕانکاریانە بە گۆڕانی دیموکراسی کۆتایی هاتبێت یان نا. پێوەری خاڵەکانی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی، بە شێوەیەکی دیاریکراو، پێوەرێکە لە ٢٠ خاڵ پێک هاتووە ( لە "-٢٠" بۆ سیستەمی تەواو ستەمکار بۆ "٢٠" سیستەمی تەواو دیموکراسی ) کە لایانە جیاوازەکانی فەرمانڕەوایەتی دیموکراسی و ستەمکاری دەپێوێت. وە پێکهاتەکانی ئەم پێوەرە ڕکابەری و کرانەوەی دامەزراندن لە پۆستە جێبەجێکارەکان، و کۆتە سەپێندراوەکان لەسەر فەرمانبەری جێبەجێکار، و ڕکابەری بەشداری سیاسی لەخۆ دەگرێت. شێوەی ٤-١ پێشکەوتنی مامناوەندی جیهانی بۆ خاڵەکانی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی ڕوون دەکاتەوە.

شێوەی ٤-١ و شێوەی ١-١ بە تەواوی لێک دەچن؛ چونکە لە ساڵی ١٩٧٢ مامناوەندی جیهانی دەکاتە " -٧٦.١" بە گوێرەی ١٣٠ وڵات؛ و لە ساڵی ٢٠٠٧ گەیشتۆتە ٦٩.٣ بە گوێرەی ١٥٩ وڵات. وە دەکرێت بووترێت کە بەچێژترین تایقیکردنەوە پشکنینی ئاراستەکانە لە هەر هەرێمێکی دیاریکراو بە بەکارهێنانی پێوەری خاڵەکانی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی. شێوی ٥-١ مامناوەندی جیهانی خۆی ڕوون دەکاتەوە پاش پارچەبوونی بەشەکانی بە گوێرەی هەر هەرێمێک. ( تێبینی بکە کە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ناوچەی زەریای

هێمنی لێرە دەیانگرێتەوە). شێوەی ١-٥ هاوشێوەی هەردوو شێوەی ١-٢ و ١-٣ یە، بەڵام گۆڕانکاریەکان لە خاڵەکانی دیموکراسی بە گوێرەی هەرێمەکان ڕوون دەکاتەوە، نەک چاکسازیە ڕیشەییەکان، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئاخۆ ئەم سیستەمانە بوونەتە دیموکراسی ( یان نا ).

هەروەک دیارە لە شێوەی ١-٥ ئاراستە ئەرێنیەکان لە خاڵەکانی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی لە ماوەی چوار دەیەی ڕابردوو، کە ئاماژە دەکات بەوەی دەوڵەتەکان لەگەڵ تێپەڕبوونی کات زیاتر دەستیان بە دیموکراسی بوون کردووە، ئاراستەی جیهانین. هەروەک ئەم شێوەیە ئەوە نیشان دەدات کە ڕێژەی پێشکەوتنی جیهانی جیاوازە لە هەرێمێک بۆ ئەوی تر. چونکە وولاتانی ئەمریکای لاتین و دەوڵەتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو زۆرترین چاکسازیان لە خاڵە دیموکراسیەکان بەدەست هێناوە، و وولاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و زەریای هێمن و ئەفریقای سەحرای باشور کەمتریان بەدەست هێناوە، و لە کاتێکدا وولاتانی باکوری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆر کەمتریان بەدەست هێناوە. هەموو ئەم سێ ئاراستانە لە ماوەی پێش ساڵی ١٩٩٠ زیاتر ڕوونترە وەک لە ماوەی پێش ساڵی ١٩٩٠.

پێوەرە نزیکراوەکان بۆ گۆڕانکاریە لیبرالیەکان و دیموکراسیەکان

ئەم پێوەرانەی سەرەوە پشت بەو تایبەتمەندیە جۆریانە دەبەستێت کە بە سیستەمی دەست نیشانکراو جیادەکرێنەوە، لە کاتێکدا لەم بەشە تیشکم خستۆتە سەر ئەو تایبەتمەندیانەی کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان هەیە بە گۆڕانی سیاسی لیبرالی ( یان بە گۆڕانی دیموکراسی ). یەکەم، سەیری ئاستی ڕکابەری سیاسیم کرد. چونکە بە گوێرەی زۆرێک لە چاودێرە سیاسیەکان ئاستی سیاسی ڕکابەری و جۆرەکەی بە دوو تایبەتمەندی سەرەکی دادەنرێت بۆ هەر سیستەمێکی دیموکراسی ( سەیری دال بکە، ساڵی ١٩٧١). وە پێوانەی نزیکەیی سادە بۆ

ئاستی ڕکابەری دەکرێت بەدەست بهێنرێت لە ڕێگەی توێژینەوەی پێکهاتەی حیزبی دەستەی یاسادانان لە هەموو سیستەمەکان. چونکە لە سیستەمی دروستکراو لەسەر بنەمای یەک حیزب، وەک چین یان کوبا، حیزبی فەرمانڕەوا هەموو کورسیەکانی دەستەی یاسادانان قۆرخ دەکات و ڕێگە بە بەربژێرەکانی ئۆپۆزۆسیۆن نادات بە ئەنجام دانی هەڵبژاردنەکان لەسەر ئاستەکی نەتەوەیی. ژمارەی ئەو کورسیانەی کە پارتە ئۆپۆزۆسیۆنەکان لە دەستەی یاسادانان هەیانە دەکرێت پێوەرێکی زۆر نزیکەیی بێت بۆ ڕادەی ڕکابەر پراکتیکی هەڵبژاردن و دیموکراسیەکەی. هەروەها خستنە ژوورەوەی ڕکابەری حیزبی لە هەڵبژاردنەکانی دەستەی یاسادانان ( بە پێچەوانەی دەستەی جێبەجێکردن) بە شێوەیەکی گشتی هەنگاوێکی نوێ دەنوێنێت بەرەو گۆڕانی تەواو بۆ دیموکراسی. بۆ نموونە دیموکراسی مەکسیکی لە ساڵی ٢٠٠٠ لە ساڵانی زووی هەشتاکانی سەدەی بیستەم دەستی پێکرد، کاتێک حیزبی فەرمانڕەوا، حیزبی شۆڕشی دامەزراوەیی، ڕێگەی دا بە هەڵبژاردنە جدیەکانی یاسادانان، و بۆ پارتە ئۆپۆزۆسیۆنەکان ژمارەیەکی دیاریکراوی لە کورسیەکانی ئەنجومەنی نوێنەران دەست نیشان کرد.

پاش ئەمە، وەک پێوەرێکی نزیکەیی بۆ ڕکابەری، هەڵسام بە ئەژمارکردنی ڕێژەی ئەو کورسیانەی کە هەموو پارتە کەمینەکان و سەربەخۆکان لە پەرلەمان هەیانە، هەروەک لە فانهانین ( ساڵی ٢٠٠٢). وە لەو حالەتانەی کە پێکهاتەی دەستەی یاسادانانی لێ نایەتەدی پشکی هەموو پارتە بچووکەکانیشم بەکار هێناوە لە دەنگەکان، هەروەک لە فانهانین ( ساڵی ٢٠٠٢). وەبە شێوەیەکی فەرمی ڕکابەری سیاسی دەپێورێت بە گوێرەی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە:

ڕکابەری سیاسی = ( ١٠٠ - ڕێژەی کورسیەکانی پارتی زۆرینە ) \ ١٠٠

وە بە گوێرەی ئەم هاوکێشەیە ڕێژەی ڕکابەری سیاسی لە نێوان سفر ( لەو حالەتانەی کە حیزبی فەرمانڕەوا کۆنترۆڵی هەموو کورسیەکانی دەستەی یاسادانانی کردووە)، ژمارەکانی نزیک لە یەک ( لەو حالەتانەی کە حیزبی زاڵ زۆر بچووکن). بەم شێوەیە ژمارەکانی نزمەکانی ( بەرزەکانی ) ڕکابەری سیاسی پەیوەستە بە ئاستی ڕکابەری کەمتر ( گەورەتر). بە واتایەکی سادەتر، نیشانەی سفر دەدات بەو دەوڵەتانەی کە دەستەیەکی یاسادانانی هەڵبژێردراویان نیە لە هیچ ساڵەک لێرە پێویستە تێبینی ژمارەکانی پاش جەنگ بە تەواوی بکرێت بە جۆرێک بتوانین هەموو ئەو ئاراستە مامناوەند و ماوە درێژەکان ببینین . شێوی ١-٦ مامناوەندی جیهانی نیشان دەدات، و شێوەی ٧-١ مامناوەندە هەرێمیەکان ڕوون دەکاتەوە.

هەروەها لەم دوو شێوەیە دەتوانین ئەوە ببینین کە ساڵەکانی داهاتووی ڕاستەوخۆی دوای جەنگ و ماوەی جەنگی سارد بە تەواوەتی پەیوەستە بە پاشەکشەی گشتی لە ڕکابەری سیاسی. وە ئەم ئاراستەیە بەردەوام بوو تاکو کۆتاییەکانی حەفتاکانی سەدەی بیستەم. پاشان ڕێڕەوێکی پێچەوانەی گرتەبەر لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم، و تێبینی زیادە لە مامناوەندی جیهانیمان کرد لە ڕکابەری سیاسی. ئەم ئاراستە ئەرێنیەی کە پاش حەفتاکانی سەدەی بیستەم ڕوویدا دەگونجێت لەگەڵ شێوەکانی ١-١ تا ٤-١. وە ڕوونە کە گۆڕانی دیموکراسی لەوانەیە هاندانێک بێت بۆ ڕکابەری حیزبی و دابەشبوونە سیاسیەکان ( ئەوانەی کە دروست دەبن لە کۆمەڵکانی ئۆپۆزۆسیۆن) لە دەستەی یاسادانان.

شێوەی ٧-١ تێگەیشتنێکی باشترمان پێ دەدات دەربارەی پاشەکشەی گشتی لە ڕکابەری سیاسی لە ماوەی ساڵانی ١٩٤٥-١٩٧٥. لێرە هەمان مامناوەند

تایبەتەکان نیشان دەدات کە ڕوونکراوەتەوە لە هەردوو شێوەی ۲-۱ و ۳-۱ - ئەمریکای لاتین، و ئەفریقای سەحرای باشور، و باشوری ئەفریقا، و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست - هەروەها مامناوەندی تایبەت بە وڵاتانی ڕێکخراوەی هاوکاری ئابووری و گەشەسەندن. ئەم شێوە بیانیە پاشەکشەی جیهانی ڕوون دەکاتەوە لە ڕکابەری سیاسی کە هۆیەکەی پاشەکشەیەکی توند بوو لە جیهانی گەشەکردوو. لەو کاتەی ڕکابەرەیەکە لە وڵاتانی ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری و گەشەسەندن هەر بە جێگیری مایەوە، ئەمریکای لاتینی و ئەفریقا لێشاوێکی فەرمانڕەوایی ستەمکاریان بەخۆوە بینی لە ساڵانی نێوان ١٩٤٥ و ١٩٧٥. لەگەڵ ئەمەش، ئاراستەی ئەرێنی لە ڕکابەری سیاسی لەم وڵاتانە لە ماوەی دوای حەفتاکانی سەدەی بیستەم ئەگونجێت لەگەڵ ئاراستە ئەرێنیەکان لە دیموکراسی، کە لە بەشی پێشوو ڕوون کراوەتەوە.

## سوپاس و پێزانین

پاش ساڵی ٢٠٠٦ بە ماوەیەکی کەم دەستم کرد بە نووسینی ئەم کتێبە. ئەمەش ئەو مێژووەبوو کە ستونێکی ڕۆژنامەم بڵاوکرایەوە لە ڕۆژنامەی " فورین بولیسی" بە ناونیشانی " یاریزانە گەورەکان لە ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە بچووکەکان". پەیامە بنەڕەتیەکەی ستونەکە ئەوەیە کە ئەم ڕەوتەی " کاتێک یاریزانەکان دەتوانن هێزێکی بێ پایان بە خێرایی بەدەست بێنن، و کاتێک هێزی یاریزانە گەورە تەقلیدیەکان دووچاری ئاڵنگاریەکی سەرکەوتوو دەبێت، و کاتێک هێز خێرا لەناو دەچێت و ئەزموونکردنی زەحمەتە، ڕەوتێکی ڕوونە لە هەموو ڕوویەکی لە ڕووەکانی ژیانی مرۆڤایەتی. لە راستیدا، یەکێک لە تایبەتمەندە جیاکەرەوەکان لەم سەردەمەماندا، بەڵام تا ئێستا ماناکەی ڕوون نیە". ستونەکە پێشوازیەکی باشی لێکرا، و پاشان ئەمە هانی دام بۆ فراوانکردنی بۆ ئەوەی ببێتە کتێبێک. بۆ ئەوەی ئەم نیەتەم بکەم بەم کتێبە حەوت ساڵی خایاند؛ بەڵێ، من نووسەرێکی لەسەرەخۆم.

بەڵام ئەمە تاکە هۆکار نەبوو کە وای کرد ئەم کتێبە ئەم ماوە درێژە بخایەنێت. چونکە ئیش و کاری جۆراوجۆری تریش سەرقاڵیان کردم. تەنانەت ساڵی ٢٠١٠ سەرنووسەری ڕۆژنامەی فورین بولیسی بووم، کە ئەمەش ئەرکێکی گرانە و خێراییەکەمی هێواش کردەوە لە نووسینی کتێبەکە، بەڵام چانسێکی زۆری پێبەخشیم بۆ ئەوەی بیرۆکەکانم تاقیبکەمەوە دەربارەی ئەو ڕێگایەی کە هێز پێی دەگۆڕێت و ئەو بیرۆکانە فراوان بکەم و ڕاستیشیان بکەمەوە. کارلێک کردن لەگەڵ ئەو نووسەرانەی کە بۆ ڕۆژنامەکەیان ئەنووسی و لەگەڵ فەرمانبەرە زیرەکەکانی سەرچاوەیەکی بەردەوام بوو بۆ ئیلهام و زانیاری و تەحەدی فیکری. وە منی گەیاندە ئەو شوێنەی کە نەم ئەتوانی بە تەنیا پێی بگەم، بۆیە من زۆر سوپاشگوزاریانم.

## کۆتایی سەردەمی هێز

ئەو کەسەی کە زۆرترین چاکەی هەیە بۆ یارمەتیدانم لە گەشەپێدانی بیرۆکەکان لەم کتێبەدا سیدهارتا میتەرە، پشتگیری و پێشنیار و بەشداریە گشتیەکانی لە کتێبەکەدا بێ کۆتایی بووە. هیچ شتێک لە سەرەوەی کارامەیی سیدهارتا نیە جگە لە بەخشندەییەکەی نەبێت. جەیمس گیبنی، یەکەم سەرنووسەر کە لە گۆڤاری فۆرین بۆلیسی دام مەزراند، و یەکێک لە باشترین سەرنووسەرەکان کە ناسیبێتم، ڕۆڵێکی سەرەکی گێڕا لە پاڵنانم بۆ شێوەپێدانی بیرکردنەوەکەم، و ناچاری کردم کە بە ڕوونترین شێوازی زمانەوانی بیرۆکەکانم پێشکەش بکەم. من زۆر بەبەختم کە یارمەتی ئەم دوو هاوپیشە ناوازە و هاوڕێ ئازیزانەم هەیە.

جێسیکا ماثیو، سەرۆکی دامەزراوەی کارنگی بۆ ئاشتی نێودەوڵەتی، چەندین ڕەشنووسی کتێبەکەی خوێندووەتەوە، و بە وردەکارییەکی زۆرەوە لێدوانی لەسەر داوە، و بووەتە سەرچاوەی بەردەوامی بیرۆکە و ڕەخنە و ڕێنوێنی. وتارەکەی لە ساڵی ١٩٩٧ بە ناوی "وەرچەرخانی هێز" بەردەوامە لە نوێنەرایەتی کردنی ئەو کارە داهێنەرانەی کە کاریگەری لەسەر هەموومان دەکات کە لەسەر دەسەڵات و گۆڕانکارییە هاوچەرخەکانی دەنوسین. جێسیکا کاتی پێدام بۆ تەواوکردنی کتێبەکە لە دامەزراوەی کارنگی، ماڵە پرۆفیشناڵەکەم لە سەرەتای نۆوەدەکانی سەدەی بیستەم. من زۆر قەرزداری دامەزراوەی کارنگیم.

هەروەها سوپاسی فیل پینایت، جۆزێ مانوێل کالڤۆ، مات بارۆز، یوری داداش، فرانک فوکۆیاما، پاول لودسێنا، سۆلین ئۆزیل و ستیڤن واڵت دەکەم، کە هەموو دەستنووسەکەیان خوێندەوە و تێبینی وردیان کرد کە کتێبەکەیان زۆر باشتر کرد. هەروەها سوپاسگوزارم بۆ ستڕۆب تالبۆت، هاوڕێ پیرە بەخشندەکەم کە ئێستا سەرۆکی پەیمانگای برووکینگسە، کە نەک هەر کاتی بۆ خوێندنەوەی چەندین ڕەشنووس و تەواوی دەستنووسەکەی دۆزیوەتەوە، بەڵکو چەند کاتژمێرێک

یارمەتی داوم بۆ ڕوونکردنەوە و پێداچوونەوەی نیشانەکانی هەڵوەشانەوەی هێز.

سوپاس بۆ ئەو کەسانە دەگەڕێتەوە کە لەماوەیەکی دووروودرێژدا کاتی خۆیان پێبەخشیم بۆ ئەوەی بیرۆکەی ئەم کتێبە دروست بکەن و پەرەی پێبدەن، و تێڕوانینی خۆیان هاوبەش کرد، و ڕەخنەیان لە بیرۆکەکانم گرت، و لە هەندێک حاڵەتدا خوێندنەوەیان کرد و سەرنجیان لەسەر یەکەم ڕەشنووسی هەر بەشێکدا، ئەوانیش: جاک ئەتالی، ریکاردۆ ئەڤیلا، کارلو دی بینیدیتی، پاول بالاران و اندرو پای، ئێرنست، فرناندو هێنریک کاردۆسۆ، تام کارڤەر، الکین چاپارۆ، لۆردس کایو، ویزلی کلارک، تام فریدمان، لو گودمان، ویکتور هالپرستاد، ئیوان کیر-ئیستف، ستیفان کال، ریکاردو لاگوس، سباستین مالابی و لویس ئەلبێرتۆ مۆرینۆ، ئیڤگنی مۆرۆزۆڤ، ووک ئۆنیڵ، مێنکسین بەی، میتی ریکۆ، جیانی ریوتا، کلاوس شواب، جاڤیر سۆلانا، جۆرج سۆرس، لاری سامرس، گێرڤەر تۆرێس، مارتن وۆلف، ڕۆبێرت بین، ئێرنستۆ زمیدلۆ و بۆب زیلیکە.

وە نامەیەکی تایبەت بۆ پرۆفیسۆر ماریۆ چاکۆن لە زانکۆی نیویۆرک دەنێرم، کە پاشکۆیەکەی ئامادە کردووە، کە ئەمەش شیکردنەوەیەکی وردە بۆ داتا پراکتیکیەکان کە هەڵوەشاوەی دەسەڵات لە سیاسەتی نەتەوەیی لە هەموو جیهاندا ڕوون دەکاتەوە.

بە درێژایی کاتم بۆ تەواوکردنی ئەم کتێبە، توێژەری یاریدەدەری گەورەم لەگەڵ بوو. من دەمەوێت سوپاسی جۆش کێتینگ، و بینیت ستانسل و شەمیڵس عەلی بکەم بۆ یارمەتیان بۆ ئەوەی کتێبەکە تا ئەوەندەی بکرێت پتەو بێت.

ئەوانەی وا بیردەکەنەوە کە ئینتەرنێت و بزوێنەری بەدواگەڕان کارکردی کتێبخانەیان بەلاڕێدا بردووە، نەک تەنیا ئەزموونی کارکردنیان لەگەڵ ستافی کتێبخانەی دامەزراوەی کارنگی، کاسلین هیگس و کریستۆفەر سکۆت و کیا

هامۆند نەبووە، ئەوانەی کە نەک هەر یارمەتیان دام بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەکان و داتاکان کە پێویستم پێیان بوو، بەڵکو زۆرجار ئاگاداریشیان دەکردمەوە بۆ بوونی سەرچاوەکان نەم ئەزانی کە بوونیان هەیە، و لە هەندێک حالەتیشدا دەردەکەوت کە یەکلاکەرەوە بوون لە شێوەپێدانی بیرکردنەوەکانم. بۆیە زۆر سوپاستان دەکەم!

من بە سوپاسگوزاریەکی تایبەت قەرزارم بۆ ملیسا بیسیل؛ چونکە بە دوو کار هەڵدەستا: یارمەتیدانم لە جێبێجەکردن و توێژەر، بۆیە بە شێوەیەکی زیرەکانە و جوان ئەوانەی جێبەجێ کرد کە زۆرجاران کارێکی هاوسەنگی ئەستەم بوو. هەروەها لارا بالو بە نەرم و نیانی و کارگەرانە یارمەتی دام لە ئیدارەکردنی چالاکیە جۆراوجۆرەکانم. دوو ساڵ لەمەوپێش لارا چووە پاڵ مارینا سپیندلەر لە بەڕێوەبردنی " گروپی پەنجا"، کە ڕێکخراوێکە سەرۆکایەتیم دەکرد، کە زۆر کاتی لە من دەبرد ئەگەر هەوڵەکانی مارینا و لارا نەبووایە. من سوپاسی ئەو سێ هاوڕێیە دەکەم کە ناتوانرێت دەست بەرداریان بیت.

من زۆر بە بەختم کە دوو کەسی پسپۆر و پێشەنگ لە بوارەکەیان هەڵسن بە بریکاری ئەدەبی و سەرنوسەری کتێبەکەم. چونکە بریکاری ئەدەبی کارەکانم بۆ ماوەیەکی زۆر، ریف ساگلین، بە هەموو ڕێز و جیگیریەوە یارمەتی دام لە دیاریکردنی بیرۆکەی ئەو کتێبەی کە ئەمویست بە شێوەیەکی زیاتر وورد بینووسم، پاشان بڵاوکەرەوەیەکی گونجاو و سەرنووسەری گونجاوی دۆزیەوە بۆ ئەم کتێبە. تێم بارتلێت، لە بڵاوکردنەوەی بیسیک بۆکس، کە زۆرێک لە گرنگترین کارەکانی ئەم دواییەی لەسەر دەسەڵات و گۆڕانەکانی نووسیوەتەوە، بە وردی سەرنجی ئەم پرۆژەیەی داوە و کاتێکی زۆری بۆ خوێندنەوە و لێدوان و دەستکاریکردنی ڕەشنوسەکان بەسەربردووە. من زۆر سوپاسگوزارم بۆ هەردووکیان. وە لە ماڵی بیسیک بوکس هەردوو یاریدەدەری تیم، سارا روسنتال و کیتلین زافونتی، ڕادەیەکی بێ وێنەیان پێشکەش کرد لە یارمەتی. هەروەها ساندرا بیریس

و کرستین جی ئاردین لە تیمی بەرهەم هێنان لە داری بیسیک بوکس یارمەتی بڵاوکردنەوەیەکی بێ وێنەیان پێشکەش کرد. وە میشیل جیکوب، بەڕێوەبەری ڕێکلام لە ماڵی بیسیک بۆکس و کیتلین گرافت، بریکاری ڕێکلامیم، لە پشتگیرە یەکەمە بەپەرۆشەکان بوون بۆ کتێبەکەم. من سوپاسی هەموو ئەندامانی تیمی بیسیک بوکس دەکەم بۆ پشتگیری کردنی ئەم کتێبە.

هەروەها دەمەوێت سوپاس و پێزانینی خۆم بۆ لویس ئەلبێرتۆ مۆرینۆ، ئێلسۆن ئۆرتیز، ڕۆبێرتۆ ڕیمێریس و ئەلبێرتۆ سلیزینگەر دەربڕم. ئەوان هۆکاری سوپاس و پێزانینی من دەزانن.

سوپاس و بەشی دڵسۆزانەی من بۆ سوسانای هاوسەرەکەمە و بۆ منداڵەکانمان ئەدریانا و کلاودیا و ئەندەرس، ئەو گروپەی کە جۆناتان و ئەندریو ئێستا بەشداریان تێدا کردووە. ئەوان خۆشەویستی و هێز و پشتیوانی بێ مەرجیان پێبەخشم کە وادەکات هەموو شتێک شایەنی گرینگی پێدان بێت و شایەنی هەموو ئەو هەوڵانەش بێت، بۆ ئەم مەبەستەش ئەم کتێبەیان پێشکەش دەکەم.

موسی نعیم

واشنتۆن، دی سی

ئازاری ٢٠١٣

## ناوەڕۆک

## کورتەیەک سەبارەت بەم کتێبە

موسی بن نعیم، لە کتێبەکەی کۆتایی سەردەمی هێز، تیشک دەخاتە سەر ململانێ لە نێوان ئەو هێزە گەورانەی کە لە ڕابردوودا زاڵ بوونە، و هەروەها ئەو هێزە بچووکە نوێیانەی کە خەریکن دەبن بە ئاڵنگاریەک بۆیان لە هەموو گۆڕەپانێک لە گۆڕەپانەکانی چالاکی مرۆڤایەتی.

نووسەر ئەوە ڕوونده‌کاتەوە، بە پشت بەستن بە توێژینەوە ڕەسەن و سەرنج ڕاکێشەکانی، کە چۆن ئێستا هێزە بچووکەکان، لە ڕێگای کەمپینەکان دژی دامەزراوەکان، توانای ڕووخاندنی ستەمکارانیان هەیە، و قۆرخکاریەکان لەناو دەبەن، و دەرفەتی نوێی نایاب دەرەخسێنن، بەڵام دەشکرێت ئەمە ببێتە بارێک لە ئاژاوە و پەککەوتن. نعیم بە لێهاتووی گۆڕانکاریە گەورەکانی ئێستا باس دەکات لە بوارەکانی بازرگانی و کارکردن و ئایین و فێرکردن و ناو خێزانەکان و هەموو بابەتەکانی جەنگ و ئاشتی.

نموونەش لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا زۆرن، لە ساڵی 1977، هەشتا و نۆ دەوڵەت هەبوون کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی تاکڕەوی، لە کاتێکدا زیاتر لە نیوەی دانیشتوانی جیهان ئەمڕۆ لە وڵاتانی دیموکراسیدا دەژین. هەروەها سەرۆکە جێبەجێکارەکان چیتر بۆ ماوەیەکی درێژ لە کۆمپانیاکان پارێزگاری لە شوێنەکانیان ناکەن، وایان لێهاتووە ماوەیەکی کەمتر بەسەردەبەن لەوانەی پێشە خۆیان. هەروەها ئامرازەکانی جەنگی مۆدێرن هەرزانتر و ئاسانتر بووە.


A123456789B

arta

بڵاوکراوەی دەزگای
ARTA